(أَلقِـدَّةُ (ج) قِـدَد وأَقِـدَّة): ١-قایش که له چەرمو به باری درێژیی ببڕێت ٢-پارچەی شتێك ٣-تیپێکی خەڵك که ئارەزوو جیا بن.

(«كُنّا طَرائِـق قِدَداً»): گەلێـك تیپی جیا حەزو جیا ئارەزوو بووین.

(-عنـد الكُتـاب): (لای نووسـەرەکان) کاغەزێکـی باریکـی درێژ بۆ کێشـانی هێڵی ڕاست بەکاردەهێنن.

(-عندَ البَنائين والنَّجّارين): لای خانەسـازو دارتاشـەکان ڕاسـته تەختەیەکـی درێژه که درێژیی و ڕاستیی ئەو شتەی پێ تاقیدەکەنەوە که دەیانەوێ.

(أَلقُداد): ژانەسك/ ئازارێك له سكدا.

(أَلقَديـد): ١-گۆشـتی بـه درێژیی بـڕراوو وشککراوە ٢-بەرگی دڕاو.

(أَلقُدَيد): پەلاسێکی بچووك.

(أَلقَديدِيُّون): کەسـانێکی پیشەسـازن دوای لەشـکر دەکەون وەك دەلاك و چەرچی و هیتر (کـه به ولاتدا دەگەڕێـن و بەرگی کۆن و دڕاو دەپۆشن).

(أَلقَدّ): ١-ڕێگا/ ڕێباز ٢-شوێنی تەختانی.

(أَلقِدّ والمُقَدّ والمِقَدَّة): پارچه ئاسـنێکه پێی شت ڕاستەبڕ دەکەن.

(أَلمَقدود) (عامية): لاوازی بێهێز.

٢-(إِسـتَقَدَّ- الأَمرُ): کارەکه سـەروەبڕ بوو/ بەردەوامبوو.

٣-(أَلقَداد) (ح): ١-گۆڕهەڵکەنه ٢-ژیشك.

قـدح: ١-(قَـدَحَ- في عَرضِـهِ): نامووسـی پایەماڵکردو ئابڕوویبرد/ نامووسـی شکاندو شتی خراپی خستەپاڵ.

(«قَدَحَ في ساقِ أَخيهِ»): قوڵی براکەیی بڕی گزیی لێکرد.

(قـادَحَ-هُ وتَقادَحا): خەوشـیان له یەکتری دەرهێنـاو یەکتریـان لەکـەدار کـرد یـان شەڕەبەڵگەو گفتوگۆیانکرد.

(أَلمِقداح) (عامية): ئاشووبگێڕو زمانبەد.

٢-(قَدَحَ- الدُودُ في الأَسْنانِ أَو الشَجَرِ قَدْحاً): کرم دایه دانەکان و درەختەکەو کولۆریکردن.

(أَلقَدْحَ) (مص): کولۆرکەری دان یان درەخت/ خۆرەی دان یان هی درەخت.

(أَلقادِح): ١-(فا) کرمی درەختخۆر یان خۆرەو ڕەشـکەرەوەی دان ٢-قڵیشـی چێو ٣-ئامووس شکێن و ئابڕووبەر.

(أَلقادِحَةُ (ج) قَوادِح): ١-مێی وشەی ( القادِح) ٢-(ح) کرمی درەخت یان خۆرەو ڕەشکەرەوەی دان.

٣-(قَدَحَ- في القِدحِ: قَدْحاً): ئاسـنی نووکی نێزەکەی پێداکرد.

(قَدَحَ) (عامية): کونیکرد.

(-خِتـامَ الخابِيَة): مۆری کووپەی مەیەکەی هەڵپچڕی.

(- الطَبيـبُ العَـينَ): پزیشـکەکه ئـاوە

زیانبەخشەکەی چاوەکەی دەرهێنا.

(-تِ العَینُ): چاوەکە بە قووڵداچوو.

(قَدَّحَ-تِ العَینُ): چاوەکە بەقووڵداچوو.

(-الفَرَسَ): چارەوێکەی (لەرکرد، تێقوپاند).

(اَلقِدح (ج) قِداح وأَقدُح واُقداح وقِدحان و (جـج) أَقادیح):١-تیر پێش ئەوەی نووك و پەری بۆ بکرێت ٢-کون (عامیە).

٤-(قَدَحَ-الشيءَ. قَدْحاً): شتەکەی بری/ هەڵییەنجا/ هەڵیلووشی.

(- المرق): شلەکەی هەڵێنجا یان هەڵلووشی.

(-القِدرَ): مەنجەڵەکەی بەتاڵکرد/ چی تێدابوو هەڵێنجا.

(إقتَدَحَ المَرَقَ): شۆرباکەی هەڵێنجا.

(-القِدْرَ): ئەوەی لە مەنجەڵەکەدا بوو هەڵێنجاو دەریهێنا.

(اَلقُدحَةُ مِنَ المَرَقِ): لە شۆربا (هەڵێنجان/ دەرهێنان).

(اَلقَدیح): شۆربا یان ئەوەی لە بنی مەنجەڵدا دەبێت و بە گران دەردەهێنرێت.

(اَلمِقْدَح والمِقْدَحَة): ئەسکوێ/ کەوچکی قووڵ.

٥-(قَدَحَ- بالزَندِ. قَدْحاً): دەستی بە چەرخەکەدا نا دایگیرسێنێت.

(«قَدَحَ الشيءُ في صَدري»): شتەکە ئاگری لە دڵمدا کردەوە/ کاری تێکردم/ ئاگری لە سینەم بەردا.

(«أَضِيءُ لي أَقْدَح لَك»): بۆم ببەو بۆت دەبم.

(إقتَدَحَ بالزَّنْدِ): چەرخەکەی لێدا تا دایگیرسێنێت.

(-الأَمْرَ): لە ئەنجامی کارەکەی ڕوانیو بە ئەنگیەوە هات.

(إسْتَقْدَحَ- زِنادَهُ): چەرخەکەی داگیرساندو ئاگری پێکردەوە.

(اَلقَدَح): چەرخلێدان.

(اَلقِدْحَةُ): جۆرە چەرخلێدانێك.

(حُمَّى قادِحَة): تایەکی ئاگرین.

(اَلقَدّاح): بەردە چەرخ/ بەردە ئەستێ ٢-ئەستێ (پۆڵایە) کە بە بەردە ئەستێکەدا دەدرێت و پوشوو لەسەر بەردەکە دەبێت ئاگر دەگرێت.

(القَدّاحَة):١-بەردە چەرخ ٢-چەرخ قوتوویەکی بچوکی کانزایەیە کە فتیلەیەکی بەنزیناویی تێدایە لە شوێنێکی تایبەتی قوتووەکەدا بەردە چەرخی تێدەخەن بە چەرخێك کە ئاگری لێدەبێتەوەو فتیلەکە ئاگرەکە دەگرێت.

(اَلأَقْدَح والقَدُوح (ح)): میش.

(اَلمِقْدَح والمِقْداح): ئەستێ (کە پۆڵایە).

٦-(اَلقِدح (ج) قِداح وأَقْدُح وأَقْداح وقِدحان و (جج) أقادیح): تیری قومار.

(اَلقَدَح (ج) أَقْداح): جام/ پیاڵە بۆ پێخواردنەوەیە بۆ گەورەو بچووکە کە چۆڵبوو پێی دەڵێن: قَدَح ئەگەر پڕبوو پێیدەڵێن «کأس» کاسە.

(«لاتَجْعَلونــي كَقَدَح الراكِب»): مەمکەن بە دۆلکەی ســوار (چونکە سوار دۆلکە بۆشەکەی بــە پشــتی ولاخەکەیــەوە دەبەســتێت واتا مەمکەن بە دواکەس.

(اَلقَدَحُ الفَرْدُ): (ئیدیۆمە) نارەســەن/ کەس نازانێت کوڕی کێیە.

(اَلقِداحَــةُ): ١-جامگەریــی/ کاســەگەریی ٢-چەرخسازیی.

(اَلقَدّاح): ١-پیاڵەســاز ٢-جامگەر/ کاسەساز/ چەرخســازو بەکارهێنــی هەمــوو ئەوانــە ٢-ســەری چــووزی ناســکی ڕووەك ٣-گوڵــی ڕووەك/ خونچــە پێش ئــەوەی دەمبکاتەوە ٤-بەردەنەســتێ ٥-ئەســتێ کە لەگــەڵ بەردە ئەستێدا ئاگری پێدەکرێتەوە.

٧-(اِقْدَحَــرَ- الرَّجُــلُ اِقْدِحــراراً): کابــرا ئامادەی بەدیو شەڕەجنێو یان بەگژداچوون و شەڕ بوو.

قدر: (قَدَرَ وقَدِرَ- على الشيءِ. قَدْراً وقُدْرَةً وقِــدرَةً ومَقْدَرَةً ومِقْداراً وقَــدارَةً وقُدُورَةً وقُــدُوراً وقِدْراناً وقَــدَاراً وقِــدَراً): توانای بەسەر شتەکەدا شــکا/ توانی شتەکە ئەنجام بدات.

(-على الشيءِ. قَدْراً وقَدَراً): توانای زاڵبوونی بەسەر شتەکەدا بو کۆیکردەوەو گرتی.

(-اللهَ): خوای بە مەزنگرت/ بە گەورە گرت.

(قَدِرَ- على الشــيءِ قَدراً وقُــدرَةً ومَقدِرَةً ومَقدَرَةً ومَقْدُرَةً وقَــدارَةً وقُدورَةً وقدوراً وقَداراً وقَدراً): توانای بەسەر شتەکەدا شکا.

(قَدَّرَ-على الشــيءِ): بە توانا بوو و شتەکەی کۆکردەوەو گرتی.

(-اللهُ فُلانــاً على كذا): خــودا توانای ئەوەی بە فیساردا کە دەسەڵاتی بەسەر ئەو شتەدا بشکێت.

(قــادَرَ-هُ ١-مقــادَرَةً): لــەو بەهێزتــر بوو ٢-ویستی وەك ئەو بکات/ لاسایی ئەو بکاتەوە.

(اَقْدَرَ-اللهُ فُلانــاً على كذا): خودا توانای بە فیساردا کە دەسەڵاتی بەسەر ئەوەدا ببێت.

(-الإنسانُ): مرۆڤەکە لە مەنجەڵدا چێشتی لێنا.

(اِقْتَدَرَ-عَلَيــهِ): دەرەقەتیهات و بەســەریدا زاڵبوو/ توانای بەسەردا هەبوو.

(-الرَّجُلُ): چێشتی لە مەنجەڵێکەدا لێنا.

(اَلقادر (فــا) (م) قادِرَة): ١-چێشــتلێنەر لە مەنجەڵدا ٢-ئەوەی لە مەنجەڵدا لێدەنرێت.

(«بَينَنــا لَيْلَــةٌ قادِرَة»): شــەوێکی شــێوە ڕۆیشتنی بێماندوویەتیمانهێکەوە هەبوو.

(اَلقَــدْر (ج) اَقْــدار): وزەو (توانــا/ هێــز) ٢-دارایــی/ دەوڵەمەندیی ٣-ڕێزو ســەنگینی ٤-پایەوپلە.

(اَلقِدر (ج) قُدور): مەنجەڵ.

(قُدَيرَةً وقُدَيرٌ): مەنجەڵۆکە بۆیە وا ناونراوە چونکــە شــتەکان کۆدەکاتــەوەو دەیگرێــت (مێیە).

(اَلقَدَر (ج) اَقدار): وزەو هێز.

(اَلقُـدْرَة): هێزو توانا كە بەسـەر شـتێكدا بشـكێتو بتوانرێـت بكرێـت يـان وازى لێبهێنرێت.
(قُدْرَةُ آلَةٍ ما): تواناى ئامێرێك لە چركەيەكدا كە چەند كار ئەنجامدەهێنێت، چركە يەكەى پێوانەى كاتە.
(اَلقُـدار): چێشـتلێنەر/ كەسـێكە كـە لـە مەنجەڵدا شتێك لێبنێت.
(اَلقَدار والقِدار= القُدرَة): توانا/ دەسەڵات.
(اَلقَـدارَة والقُـدُورَة): ١-توانايـى/ بـە دەسـتەڵاتبوون/ توانابـوون ٢-هێـز/ توانـا ٣-بەتوانايـىو بەدەسـەڵاتيى ٤-دارايـىو دەستڕۆيشتن/ دەوڵەمەنديى.
(اَلأَقْدَر (م) قَدراء): بەتواناترين.
(بَنوقَدراء): دەوڵەمەندەكان/دەستڕۆيشتووەكان/ داراكان.
(اَلقَدير: ذو القُدْرة): ١-بەتوانا/ دەسەڵاتدار/ خاوەندەسەڵات ٢-ناوێكى پيرۆزى خوداوەندە ٣-گۆشتى لێنراوى ناو مەنجەڵ.
(اَلمَقْدُور) (مفع): شـتى هێز پێشكاو/ شتێكە لە تواناى كردندابێتو ئەنجامبدرێت.
٢-(قَدَرَ- الشَيءَ بِالشـيءِ قَدْراً): ١-شتەكەى ئەوەندەى ئەويتر لێكرد ٢-شـتەكەى (بەويتر پێوا/ ئەندازەگرت).
(-الأَمرَ): بير لـە كارەكەو ئەنجامى كردەوەو تەگبيرى لێكرد.
(-لأَمـرِ كـذا): سـەرنجى دايـە كارەكـە/ لێكۆڵييەوەو ئەندازەيگرتو تەگبيريكرد.
(قَدَّرَ-الشيءَ بِالشَّيءِ): شتەكەى بە شتەكەيتر ئەندازە كرد، هێندەى ئەويترى لێكرد.
(-الرَجُـلُ): بـيرى لە چارەسـەرو تەگبيرى كارەكەيكردەوە.
(قـادَرَ-هُ. مُقـادَرَةً): ئەنـدازەو پێوانـەى هەردووكيانيكـرد تـا بزانێـت هەريەكەيان چەنـدەو وەكو ئەو ئەنجاميـدا/ وەكو ئەوى لێكرد.
(«فُـلان يُقادِرُني»): فيسـار دەيەوێت وەك منبێت/ بە من يەكسانبێت.
(تَقَـدَّرَ- الثَوبُ عَلَيـهِ): بەرگەكە بە بەرى خۆيبوو.
(تَقـادَرَ- الرجُلانِ): دوو پياوەكە ويسـتيان يەكسانبن/ وەك يەكبن.
(إِقْتَدَرَ الشيءَ بالشيءِ): شتەكەى بە ئەندازەى ئەويتر گرت/ بەويترى پێوا.
(إِنقَدَرَ): ئەندازەى گيرا/ بە پێى ئەندازە بوو.
(«قَدَرتُ الثَـوبَ فانْقَدَرَ»): جلەكەم پێوا بە پێى ئەندازەو پێويست دەرچوو.
(القَـدْر (مـص) (ج) أَقْـدار): ١-هێنـدە/ ئەوەنـدە/ بـرى ئەو بـە قەدەر ٢-شـتەكە يەكسانبێت بەهيتر بەبێ كەمو زۆر.
(«هذا قَدْرُ ذاك»): ئەمە وەك ئەوە. هێندەى ئەوە بەو يەكسانە.

أَلقَدَر (مص) (ج) أَقدار: بڕی شت.
(أَلتَقْدير (مص) (ج) تَقادير-عند النحاة): لابردنی وشەیەك بە وتن لە دڵدا هێشتنەوەی وەکو بڵێین: (مَن مَعَــكَ؟): کێت لەگەڵدایە؟ تــۆ وەڵام بدەیتەوە بڵێیت (أَخــي): براکەم. قسەکە لە خۆیدا: (مَعِي أَخي):یە.
(أَلمِقْــدار (ج) مَقاديـــر): بڕی ئەو شــتە. بە ژمارە بێت بە کێشان بێت بە پێوانە بێت.
(أَلمُقَــدِّر): کەســێکە کــە بــەری درەخــتو کشتوکاڵو شتیتر دەقەبلێنێت (عامیە).
٣-(قَدَرَ- الرزقَ. قَدْراً و قَدَراً): ڕۆژییەکەی بەشکرد.
(-اللهُ عَلَيــهِ الأَمــرِ): خودا ئــەوەی لە چارە نووسیوە/ ئەوەی بۆ بڕیارداوەو براندۆتەوە.
(-على عيالِهِ): ڕەزیلی دەربارەی خێزانەکەیکرد.
(-الشيءَ قَدارَةً): شتەکەی ئامادە کردو کاتی خۆی بۆ دانا.
(قَدَّرَ-اللهُ عليه الأَمرَ وقَدَّرَ لَهُ الأَمرَ): خودا ئەوەی بۆ بڕیوەتەوەو لەسەریدانە/ ئەوەی لە چارەنوسیوەو بڕیاری خوداوەندە.
(-على عيالِهِ): ڕەزیلیی دەربارەی خێزانەکەی کرد.
(تَقَدَّرَ- لَهُ كذا): ئەوەی بۆ ئامادە بوو.
(إِستَقْدَرَ- اللهَ خَيراً): چاکەو خێری لە خودا داواکردو بۆی برەخسێنێت.
(لَيلَــةُ القَــدرِ): شــەوی لەیلەتولقــەدر کە یەکێکە لە دە شــەوە دوایینە تاکەکانی مانگی ڕەمەــزان وەك (٢١ و ٢٣و ٢٥و ٢٧و ٢٩)ی ڕەمەزان، کە تیایدا کاروبارو هەموو شــتێکی تێدا دیاریدەکرێت.
(أَلقَــدَر (ج) أَقــدار): ١-ئــەوەی کــە خــودا بڕیویەتیــەوەو بڕیاری لەســەر داوە/ قەزاو قــەدەری خــودا ٢-خواســتی کردنــی کارو پەیوەندیی بەشتەوەو لە کاتی خۆیدا.
(أَلقَدَرِيَّــةُ): تیپێکــن دەڵێن شــت بە قەزاو قەدەر نییــە بڕوایان وایە کاروبــارو ڕووداو بە خواســتی مرۆڤ خۆیەتی خۆی دەیکاتو خۆیشــی واز لــەو شــتە دەهێنێــت. ئەمــە پێچەوانەی بڕوای تیپی (جەبر)ین کە دەڵێن مرۆڤ هیچی بەدەســت نییەو هەموو شتێکی ژیانی بەدەستی خودایەو ئەو بەڕێوەیدەبات.
(أَلتَّقديــر (ج) تَقاديــر): ئــەوەی خــودا نووسیویەتیو بڕیاری لەسەر دەدات.
(-عِندَ المُتَكَلِّمين): هەمیشەو بوونەوەرێك بە ئەندازەی خۆیەتیو بە سنووری خۆیەتی.
(أَلمُقَدَّرَة): ئەوەی کە بڕیاری خودای لەسەرەو دانراوە/ قەزاو قەدەر.
(أَلمَقْدور) (مفع): بڕیاری خودا لەسەر دراو/ ئەوەی خــودا بڕیویەتیەوە کــە دەبێت هەر ببێت.
٤-(قَدِرَ. قَدَراً): ملی کورتبوو.
(أَلقَدَرَةُ): سوراحیی ملباریکی بچووك.

(اَلأَقْدَر): پیاوی کورتەباڵا. وتراویشە: ملکورت.

٥-(اَلقَدر (ج) أقدار): سەرشان.

(اَلقُدار): ١-خەڵکی باڵاناونجییو چوارشانە ٢-(ح)ماری مەزن ٣-مێردمنداڵی ڕۆحسووك.

(اَلقَدّار): بەردێکە دەخرێتە سەر ناوەرێژەی ئاو.

(اَلقَدْراء): گوێچکە کە ئاسایی بێت نە گەورەو نە بچووکبێت.

(اَلمُقْتَدِر): ١-خەلفەی وەستا لە کاردا ٢-ناونجیی هەموو شتێك.

(«رجُلٌ مُقْتَدِرُ الطُول»): پیاوی چوارشانەی باڵا ناونجی.

(اَلمُقادَرَةُ): ناونجی.

(اَلمُقادَرَةُ): خانووی تەسك.

(اَلمُقَدَّر) (عامية): ناوچەوانبەستێکی جوانە کە ئافرەت ناوچەوانی خۆی پێدەبەستێت.

قدس:١-(قَدُسَ. قُدْساً وقُدُساً): پاكو پیرۆز بوو.

(قَدَّسَ- اللهُ فُلاناً): خوداوەند ئەوی پاككردو پیرۆزیکردو لە خراپە بەدووریگرت.

(-الرَجُلُ اللهَ): پیاوەکە خودای بە پاكو پیرۆزو بێگەرد ناسیو دانا.

(-للهِ): خواپەرستیی کردە پیشەو خۆی پاكو دوور لە خراپە ڕاگرت.

(«نحنُ نُسَبِّحُ بِحَمدِكَ ونُقَدِّسُ لَكَ»): تەسبیحاتی سوپاسگوزاریی تۆ دەکەین خۆمان بۆ قایلمەندیی بارەگات لە گوناه دەپارێزین.

(قَدَّسَ- الرَجُلُ): هاتە بەیتولوقەدەس/ قودس.

(-الكاهِنُ عِندَ النَّصارى): قەشەکە نانی ئێوارێی خودایی ڕازاندەوە.

(تَقَدَّسَ): خۆی پاكو دوور لە گوناه ڕاگرت/ پاكو بێگوناهبوو.

(اَلقُدْس) (مص): شاری قودس/ ئورشەلیم/ هەندێك نووسەری دیانەکان وشەی (قدس) لە بری (حەزرەت) واتا: بەرێز پیرۆز. بەکاردەهێنن دەڵێن (قدس الأَب العام): باوکی گشتیی پیرۆز.

(قُدسُ الأَقداس عند اليَهود: مكانٌ مِنَ الهَيكَل كان يدخُلُهُ عظيم الأَحبار عندهُم مَرةً في السَّنَة): لای جوولەکەکان لە پەرستگای جوولەکەدا پیرۆزترین شوێنە کە گەورەترین پێشەوایان ساڵیی یەکجار دەچێتە ناوی.

(حَظيرَةُ القُدْس): بەهەشت.

(القُدُس) (مص): گیانی پیرۆز.

(روحُ القُدْسِ والروحُ القُدُس عند النَّصارى): سیانەی کەسی دیانەکان.

(روحُ القُدُس عند المُسلمين): گیانی پیرۆز لای موسڵمانەنکان جبرائیلی فریشتەیە.

(اَلقَداسَة): ١-پاكژییو بێگەردیی.

(القَداسَـة): نازناوی پاپایە. دەڵێن (قداسـة

الحـبر الأَعظَم أَو صاحِبُ القَداسَـةِ): پاپای پیرۆز یان خاوەن پیرۆزیی.

(القادِس) = بیت الحرام: خانەی خودا.

(القُـدّاس (ج) قداديـس عنـد النَصارى): لای دیانـەکان قوربانیـی جەسـتەو خوێنی حەزرەتی عیسایە کە لە شێوەی نانو مەیدا لە نێوارەخوانی خودایدا دەیخۆنو دەیخۆنەوە.

(اَلقَـدُّوس والقُدُّوس): لە نـاوە پیرۆزەکانی خودایـە واتاکـەی: پاكو پـیرۆزو لە هەموو خەوشو ناتەواوییەك بەدوور.

(اَلقِدِّيـس (م) قِدِّيسَـةُ): خوداپەرسـتێکی گـەورە کە دوور لە هەموو ناتەواوییەكو لای خودا وەرگیراو. لای دیانەکان: خاوەنبڕوایەکە کە بە پاکیو پایەبەرزیی دەمرێت.

(المَقدِس): شوێنی پیرۆزو پاك.

(بَيتُ المَقدِس): مزگەوتی قودس.

(مَقدِسِي): خەڵکی قودس.

(اَلمُقَدِّس) (فا): زانا ٢-پارسا.

(البَيـت المُقَـدَّس= بَيـتُ المَقـدِس): بەیتولموقەدەس/ قودس.

(مُقَدَّسي): قودسیی.

(الأَرضُ المُقَدَسَـةُ): خاکـی پـیرۆز/ خاکـی فەلەستین.

(أَرضٌ مُقَدَّسَةٌ): خاکی پیرۆز.

٢-(القُـدْس): بەردێکە بـۆ زانینی زۆریو کەمیی ئاوی چاڵاو تێیدەهاوێژرێت.

(اَلقُدُس والقُدَس): پیاڵەیەکی بچووك.

(اَلقـادِس (ج) قَـوادِس): ١-پاپـۆڕی گەورە ٢-چەمو دەخرێتە ئاوەوە بۆ ئاودانی حوشتر.

(اَلقادوس (ج) قَواديس): ١-دۆڵیانی ئاش کە گەنمو جۆو شتیتری تێیدەکرێت تا بهاڕێت.

(اَلکُور) (عامية): دۆڵیانـی ئاش ٢-دەفرێکە ئـاوی لـە جۆگـە پـێ هەڵدەیەنجێنـن/ دەردەهێنن.

(اَلقُـداس): بەردێکە بۆ دابەشـکردنی ئاوی گۆلـی حوشـترەکان دەخرێتـە گۆلەکـەوە ئەنـدازەی ئاوەکەی پێدەگرن بـە پێی ئەوە لەناو خۆیاندا دابەشیدەکەن ٢-شتێکە لە زیوە وەك مرواریـی دروسـتدەکرێت ٣-مەزنییو سەروەرییەکی پارێزراوی باڵا.

(اَلقَدُوس): سەرچڵو جەربەزەیەکی بێهاوتا.

(اَلقَديس): دور/ مرواری.

قـدع: ١-(قَدَعَ- الفَـرَسُ قَدْحاً): چارەوێکە کەوتە غار.

(-الأَمَرَ): لەسەر کارەکە ڕۆیشتو جێبەجێی کرد.

(-الخَمسـينَ مِن عُمْرِهِ): تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕی.

٢-(قَدَعَ- السَـفينَةَ. قَدْعـاً): پاپۆڕەکەی لە ئاوەکەدا پاڵنا/ پاڵی بە پاپۆڕەکەوە نا.

(-مِـنَ الشَّـرابِ): شـەرابەکەی قـوم قـوم خواردەوە.

(تَقَـدَّعَ- لَهُ بِالشَـرِّ): بەرامبـەری خۆی بۆ خراپەکاریی ئامادە کرد.

(تَقـادَعَ- القَـومُ): ١-پاڵیان بـە یەکەوە نا/ یەکتریان هێناو برد/ شەڕە شانیانکرد ٢-یەك بە دوای یەکدا مردن.

(-القَـومُ بِالرِّماحِ): یەکتریان دایە بەر نێزە/ نێزەیان بەیەکتردا کرد.

(-علی الشـيءِ وفيهِ): هەڵپەی شتەکەیکردو بۆی شپرزە بوو.

(تَقادَعَ الذُبابُ في المَرَقِ): مێشـەکان کەوتنە ناو شۆرباکەوە.

(القَدُوع): هەڵپەکار.

٣-(قَدَعَ- فَرَسَـهُ باللِّجـامِ قَدْعاً): بە جڵەو چارەوێکەی ڕاگرت.

(-الذبـابَ عَنـهُ بِكَـذا): بەوە مێشـەکەی لێدەرکرد.

(-هُ عَـن كذا): بەری ئەوەی لێگرت. یان لێی دوورخستەوە.

(قَدِعَ. قَدَعاً): دوورکەوتەوە/ وازی هێنا.

(-ت عَينُهُ): لەبەر زۆر تەماشاکردن چاوی کز بوو.

(قَدِعَـت لي الخَمسـون): لە پەنجا سـاڵیی نزیکبوومەوە، خەریکم دەیگەمێ.

(قادَعَـهُ بَعيرُهُ): حوشترەکەی ڕەشمەکەی لە دەست ڕاکێشا.

(أقـدَعَـهُ عَن كذا): نەیهێشـت ئەوە بکات/ وازی لەوە پێهێنا/ بەری لێگرت.

(-الرَجُلَ): جنێوی بە پیاوەکەدا.

(تَقادَعَ- القَومُ): خوێشگەل پاشەکشەیانکرد/ گەرانە دواوە.

(إنْقَدَعَ): وازی هێنا/ دوورکەوتەوە.

(-عَنِ الشيءِ): شەرمی لە شتەکە کرد.

(القَدِع): زۆر ترسنۆکیی‌و تێشکان/ شکستهێنان.

(مـاءٌ قَـدِعٌ): ئاوێکـی تـاڵ‌و سـوێر کـە نەخورێتەوە.

(إمْرَأةٌ قَدِعَةٌ): ژنێکی شـەرمن/ بە شـەرم‌و شکۆ کەمدوو.

(القَدُوع): سەرشۆرشێك کە شکێنرابێت.

(إمْرَأةٌ قَدُوعٌ): ئافرەتێکی شەرمنی کەمدوو.

(المِقْدَعَةُ): ١-داردەسـتێك کە شتی لەخۆ پێ دووربخرێتەوە ٢-مێشـکوژ یان باوەشـێن یان شتێکی وەها کە مێشی پێدەربکرێت.

٤-(القَـدَع): چاوسـووربوون‌و تێکچوونی بە گریانی زۆر.

(القَدِع): گرینۆك/ هەمیشە چاوبەفرمێسك.

(القِدعَةُ): جبەیەکی کورتی پێش هەڵقلێشاو.

(المُقَدَّع): چرچ‌و لۆچبوو/ پێچراوە.

قـدف: (قَـدَفَ- المـاءَ. قَدْفـاً): ١-ئاوەکەی هەڵێنجا ٢-ئاوەکەی ڕۆکرد.

(-هُ) (عامية): پاڵـی پێوەنا یان بە فێڵ لەو شوێنەی کە لێیبوو بردی بۆ شوێنێکیتر.

(القُـدف): ١-گـۆزەی سـوور/ سـوورکراوە ٢-لەگەنی گەورە.

(اَلتَّقذيف- عند البَحريَّة): (وەرگێڕانی وشەیاَلتَقذیف )ە: سەوڵ لێدانی پاپۆڕەوان.

(اَلمِقداف): وەرگێڕانی وشەی(اَلمِقذاف): سەوڵ.

قدم: ١-(قَدَم- القَومَ قَدماً وقُدوماً): پێش خوێشکەلکەوت.

(قَدَّم- القَومَ): پێش خوێشکەل کەوت.

(-هُ): پێشیخست.

(-هُ إلى الحائِطِ): بۆ لای دیوارەکەی هێناو نزیکیکردەوە.

(-بَین یَدیهِ): هاتە بەردەستی/ بەردەمی.

(-یَمیناً): سوێندیخوارد.

(-إلَیهِ بِکَذا): فەرمانی ئەوەیدایە.

(اَقدَمَ فُلاناً): فیساری پێشخست/ هێنایە بەرەوە.

(-یَمیناً): سوێندیخوارد.

(تَقَدَّمَ): ١-پێشکەوت ٢-پێشکەوتوو بوو.

(-القَومَ): پێش خوێشکەل کەوت.

(-إلَیهِ بِکَذا): فەرمانی کردنی ئەوەیدایە.

(«فُلان یَتَقَدَّمُ بَین یَدَي أَبیهِ»): فیسار لە بەردەمی باوکیدا ئامادە دەبێت.

(إقتَدَمَ): پێشکەوت/ چووە پێشەوە.

(إستَقدَمَ- القَومَ): پێش خوێشکەل کەوت.

(قادِمُ الرَّحلِ): پێشەوەی کورتان.

(-الإنسانِ (ج) قَوادِم): سەری مرۆڤ.

(اَلقُدُم): بۆ پێشەوە ڕۆیشتن.

(«مَضی قُدُماً»): (بۆ نێرو مێ دەوترێت): بێلادانو وەستان بەرەو پێشەوە ڕۆیشت.

(اَلقَدَم= التَّقَدُّم): ١-پێشکەوتن ٢-پێشگرتن پێشهاتەی چاکە یان خراپە.

(لِفُلان في کذا قَدَمُ صِدقٍ أو قَدَمُ سوءٍ): فیسار لەوەدا بۆ چاکە یان بۆ خراپە هەر لە پێشەوەیەو پێشیگرتووە.

(«لِفُلانٍ عِندَ فُلانٍ قَدَمٌ»): فیسار لای فیسار کەس دەستی پیاوەتیی‌و چاکەی کۆنی هەیە دەستبالآیە.

(اَلقِدَم): پێشینە، ڕابوردوو/ زۆر کۆن.

(«لَه قِدَمٌ في هذا الأمرِ»): لەو کارەدا ڕابوردوویەهەیە/ زوو کۆن دەستی تێدابووە.

(اَلقُدمَة): پێشینە لە کارێکدا.

(اَلتَقدِمَة (ج) تَقادِم): ١-پێشەنگبوون ٢-پێشگرتن پێشکەوتن ٣-خەڵات، پێشکەشکردن.

(القادِمَة): پێشەنگی سوپا ٢-شاپەڕی باڵی باڵندە. باڵی باڵندە.

(ج) القَوادِم والقُدامی): ئەو شاپەڕانەی کە لە پێشەوەی باڵەکەیەو گەورەن.

(الخَوافي) پەڕە وردەکانە کە لە ژێر شاپەڕەکانداییە.

(قادِمَة الرَحلِ): پێشەوەی کورتانەکە.

(قادِمَةُ العَسکَرِ): ١-پێشەنگی سەربازەکان/ سوپا.

(اَلقَدمَةُ مِنَ الغَنَم): ئەو مەڕانەی کە بۆ

لەومر لە پێشەوەن.
(اَلقُدامــی): پێشــەنگی ســوپا: ئەوانەی لە پێشەوەن.
(قُدَّام): بەر/ پێشــەوە (پێچەوانەی دواوەیە) (وشەکە مێیە).
(قُدَیْدِیمَــة): تۆزێك لە پێشــەوە (مێیە) بە نێریش دەکرێت دەوترێت.
(قُدَیدیــم. لَقیتُــهُ قُــدَّامَ ذاكَ وقُدَیدیمَةَ ذاكَ): لە پێــش ئەوەدا پێیگەیشــتم تۆزێك پێشئەوەمیش پێیگەیشتمو دیم.
(اَلقُدَّام والقَــدَّام والقِدِّیم): ١-ســەرداری لە هەمووان شکۆدارتر ٢-ئاغاو گەورە ٣-پاشا.
(اَلقَیْــدُوم والقَیْــدام): ١-بەرەوە/ پێشــەوە ٢-پێشی شت/ لووتی شت.
(قَیْدوم الجَبَل): لووتی شاخ.
(اَلأَقْدَم): پێشتر/ پێشووتر/ بەرووتر.
(اَلتَقْدِمَة (ج) تَقادِم): خەڵات.
(اَلقَدِم (ج) مَقادِیم مِنَ الرَحلِ): پێشــەوەی کورتان.
(-مِنَ العَین): بەری چاو.
(-مِنَ الوَجْهِ): پێشەوەی ڕوو کە ڕووبەڕووت دەبێت.
(اَلمُقَدَّم فِي إِصطِــلاح أَهْلَ لُبنان): ئەو زاراوە پلەیەی خەڵکی لوبنان بــۆ ناو خۆیان داناوە ئەوەیــە کــە دوو پلــە لــە خــوار میرەوەیە گەورەتریــن پلە لە نــاو خێڵدا میرە پاشــان کوێخا پاشــان ســەرهەنگ پاشان پیری گەورە
٢-(ا ع) پلەیەکی سەربازییە/ سەرهەنگ.
(- عند المنطقیین): لای خاوەن گوفتەکان.
(اَلمُقَدَم (ج) مَقادیم مِنَ الرَحْل): پێشــەوەی کورتان.
(-مِنَ العَین): بەری چاو.
(-مِنَ الوَجه): پێشەوەی ڕوو کە ڕووبەڕووت دەبێت.
(اَلمُقَدِّمَة): ١-پێشــی سەر ٢-ناوچەوان/ تەوێڵ ٣-پێشــەکیی شــتێك کە ئەنجامی ئەو شــتە ئەوەیە کە شتێکی لەسەر بەندە، بەندبوونێکی ژیرانە یان ئاسایی یان دەستکار. وەکو بڵێیت: هەمــوو ئاوێتەیــەك گەنە. هەمــوو تەنێکی ئاوێتە گەنە کەواتە هەموو تەنێك گەنە. ئەم جۆرە پێشەکییە بە پێشەکی پێوەر ناودەبرێت ئەنجامەکەی بە پێی ئەو پێوەرە دەبێت.
(اَلمُقَدِّمَة- مِن کُلِّ شيء): پێشەکیی/ سەرەتای هەموو شتێك.
(اَلمُقَدَّمَة والمُقَدِّمَة- مِنَ الجَیش): پێشــەنگی سوپا.
(-مِنَ الکتاب): پێشەکیی کتێب/ پەرتووك.
(مُقَدِّمَةُ الرَحل): بەشی پێشەوەی کورتان.
٢-(قَدَمَ- علی قِرنِهِ. قَدْماً و قُدْماً وقُدُوماً): بە هاوکووفە ناحەزەکەیی وێرا.
(-علی الأمرِ): پرکێشی کردنی کارەکەیکرد/ وێرای بیکات.

(أَقْدَمَ- على قِرنِهِ): بە ناحەزەکەیی وێرا.
(-على الأمر): بە کارەکەی وێراو کردی.
(تَقَــدَّمَ واسْــتَقدَمَ): بوێـــرو پێشـــەنگبوو/ بێباکانە پێشکەوت.
(قَدوم): بوێرو پێشەنگ.
(إقتَدَمَ): بوێرانە چووە پێشەوە.
(اَلقُدْم والقُدُوم): ئازا/ دلێر نەبەرد/ بوێر/ چاونەترس/ بێپەروا.
(«هو يَمشي القُدُم»): بێسڵو بێباکانە بەرەو جەنگ بۆ پێشەوە دەڕوات.
(اَلقَدَم): ئازا نەبەرد/ بێباك (بۆ نێرو مێ بۆ تاك و كۆ).
(«رَجُلٌ قَدَمٌ وامرَأَةٌ قَدَمٌ ورجالٌ قَدَمٌ ونساءٌ قَدَمٌ»): پیاوێکی ئازا. ژنێکی ئازا/ پیاوانێکی دلێر/ ژنانێکی دلێر.
(«هوَ قَدَمٌ»): ئەو ئازایە.
(اَلقَدِم): زۆر دلێر/ زۆر بەجەرگ/ نەبەردێکی بەهەڵمەت.
(اَلقُدْمَةُ): بوێریـــی/ ئازایەتی/ بەجەرگیی/ پرکێشیی.
(اَلأَقْدَم) (ح): شێر.
(اَلقَدوم (ج) قُدُم): بوێری زۆر بە هەڵمەت.
(اَلقُدُميَّة): خۆبادان و گەنجەفەکردن.
(«فلان يَمشــي القُدُمِيَّة»): بــە گەنجەفەو خۆبادانەوە دەڕوات.
(اَليَقْدَمِيَّــة والتَقْدُمِيَّــة): کەســێك کــە لە جەنگدا بە جەرگانــە پەلاماری دوژمن بدات یان لە تەنگانەدا بۆ رزگارکردن و بۆ بالآبوون هەڵپــەکار بێت دەڵێن: (يَقــدُمُ وتَقدُمُ) نازو گەنجەفەی بالآدەستیی دەکات.
(اَلمِقْــدام والمِقدامَــة (ج) مقاديــم): زۆر نەبەردو بەهەڵپەو پەلامــاردەر (ئەو (ت)یە بۆ زیادرەوییە).
٣-(قَدُمَ قِدَماً وقَدامَةً): زۆر کۆن بوو.
(قَديمٌ وقُدامٌ): زۆر کۆن/ دێرین/ پێشین.
(تَقادَمَ): کۆنبوو/ دێرینبوو/ زۆری بەسەردا رۆیشت.
(اَلقَدْم): شکۆیی کۆن/ نگین و مەزنیی کۆن.
(اَلقِدْم): چاخی دێرین.
(«كان كذا قِدماً»): ئەوە لە سەردەمی کۆندا وابوو.
(اَلقِدَم): کۆنیی.
قِدَمُ العالَــم أَو أَزَلِيَّــةُ العالَــم): رێڕەوێکی فەلســەفانەیە دەڵێــن: گێتیــی هــەر بووەو هۆکاری بوونی تیپەو زۆر کۆنە.
(اَلقَديــم والقُدامــة (ج) قُدَمــاء وقُدامى وقَدائِــم (م) قَديمَة (ج) قَديمات وقَدائِم): کۆن/ دێرین.
٤-(قَدِمَ- المَدينَةَ. قُدوماً ومَقْدَماً و قِدْماناً): بۆ شار هات/ روویکردە شارەکە.
(-مِنَ سَــفَرِهِ): لــە گوزارەکــەی گەڕایەوە، هاتەوە.

(- إلى الأمر): روويكردە كارەكە.
(أَقْدَمَ-هُ البَلَدَ): ناردیبەدوایدا بۆ هاتنی/ بۆ شارەکە بێت.
(إسْتَقْدَمَ- الرَجُلَ): داوايكرد پیاوەكە بێت.
(القادِم (ج) قُـدُ وم وقُدَّام وقادِمون) (فا): هاتوو.
(العامُ القادِمُ): ساڵی (داهاتوو/ ئاینده).
(القادِمَةُ): مێی وشەی (القادِم).
(المَقْدَم): كاتی هاتن.
٥-(قَدِمَ وأَقْـدَمَ- على العَيبِ قُدوماً): قایلی نەنگیی‌و سووكیی بوو.
٦-(القَدْم): بەرگێكی سوور.
(القَدَم (ج) أَقْدام وقُدام): پێ/ قاچ/ پا.
(قُدَيْمَــةُ): پێــی بچووك (وشــەكە مێیە بە نێریش دەكرێت).
(القَدَم): بۆ پێوانە لە نووكی پەنجە گەورەوە تا پشتی پاژنەیە.
(«جَعَـلَ دِماءَهُم تَحـتَ قَدَمَيهِ»): خوێنی بەفیرۆ بردن/ خوێنی بە فیرۆدان.
(«إجْعَل ذلك تَحتَ قَدَمِكَ»): لێیخوۆشــبە/ لێیببووره.
(«وَضَعَ قَدَمَهُ في العَمَلِ»): دەستی بە كارەكە كرد.
(القَـدِم) (طا): زەوییەك بــەردی كونكونی ڕەشی تێدابێت وەك سووتابێت.
(القَدَمَةُ): بەردی ڕەشی گەورەی كونكون.

(القُدّام): سەربڕ/ قەساب.
(القَـدوم والقَـدُّوم) (ج) قُـدُم وقَدائِـم) (مؤنثة): تەشوێ.
٧-(القُدامِس): توند.
(«عِـزٌ أَو حَسَـبٌ رقدمـاسُ»): نگینی یان ڕەسەنایەتی كۆن.
(القُدْمُوس (ج) قَداميس): كۆن.
(عِــزٌ أَو حَسَــبٌ قُدْمــوس): ١-نگینــی یان ڕەسەنایەتیی كۆن ٢-توند ٣-تاوێرێكی گەورە ٤-پێشەنگی سوپا.
(جَيشٌ قُدْمُوس): سوپایەكی مەزن.
(القُدموسة): تاوێرێكی گەورە.
الملحق:
(قدم: (التَّقادُم): زۆر كونبوون/ تێپەڕبوونی ساڵانێكی زۆر بەسەر شتێكدا.
(«بَعد تَقــادُم العَهد»): پــاش تێپەڕبوون‌و كۆنبوونی سەردەم.
(«التَّقــادُم في القانــون»): كۆنبــوون‌و تێپەڕبوونی كات لە یاسادا ئەوەیە: ئەو ماوەیە دیاریكــراوە گەر تێپەڕی بە تێپەڕبوونی مافی ئەوە نامێنێت كە داوای ئەو مافە بكرێت یان بڕیاری دراو پیادە بكرێت.
(التَّقَـدُّمِيّ): ئــەوەی بۆ پێشــەوە دەڕوات (پێشدەكەوێت‌و پێشكەوتن بەدەست دەهێنێت یــان ئــەوەی وردە وردە بەرەو باشــتربوون‌و بەرەو پێشەوە دەچێت.

(«عَصرٌ تَقَدُّمِيّ»): سەدەیەکی پێشکەوتوو.
(«سَیرُ العِلم التقدُمِيّ»): ڕۆیشتنی بەرەو پێشەوەی زانست.
(التقدُّمِي): پێشکەوتنخواز.
(«حِزبٌ تَقَدُّمِي»): پارتێکی پێشکەوتنخواز.
(«مِن أنصار التَقَدُمِیَة»): سەر بە پێشکەوتنخوازانە/ لە یارانی پێشکەوتنخوازانە.
(اَلتَقَدُّمِيَّة): پێشکەوتنخوازیی/ نیشانەی پێشکەوتن/ نیشانەی بەرەو پێشچوون و باشتربوون و بە شێنەیی و وردە وردە.
(تَقَدُّمِيَّة سَيرِ العِلم): ڕێڕەوێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئابورییە ئامانجی بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگایە ئەویش بە چاکسازی لە ڕژێمە ئازادو تاکڕەوەکاندا.
قدن: (اَلقَدَن): بەسبوون/ بەس.
(قَدنُ زَيدٍ دِرهَمٌ): یەك (درهەم/ پەنجایی) بۆ زەید بەسەو بەشیدەکات.
قدو: ١-(قَدا. قَدْواً): ١-نزیکبووەوە ٢-لە گوزارەکەی هاتەوە.
(-بِه فَرَسُهُ): چارەوێکەی هەڵیگرت.
(اَقدى. إقداءً): تەواو پیر بوو/ نزیکی مردن بووەوە.
(-مِنَ السَفَر): لە گوزارە هاتەوە.
٢-(قَدا وقَدِيَ يَقدی الطَّعامَ. قَدْواً وقَدَیً وقَداةً وقَداوَةً): چێشتەکە چێژو بۆنی خۆشبوو.

(قَدٍ وقَدِيّ): چێشتی تام و بۆنخۆش.
(شَمَمْتُ قَداةَ القِدْرِ): بۆنی خۆشی مەنجەڵەکەم کرد.
اَقدی (- المَسْكُ إقداءً): بۆنی مسکەکە هات و بڵاوبووەوە.
(اَلقَدا): بۆنی خۆش.
(«ما أقدى طَعامَ فُلانٍ»): ئای کە بۆن و چێژی چێشتی فیسار خۆشە!
٣-(اَقدى. إقداءً): ڕێی چاکەخوازیی و خوداپەرستیگرت.
(تَقَدَّی- علی دابَّتِهِ. تَقَدِّیاً): بە سواری ولاخەکەیەوە ناوەڕاستی ڕێگەکەیگرت.
(-تِ الدابَّةُ بِراكِبِها): ولاخەکە بە سوارەکەیەوە ناوەڕاستی ڕێگەکەیگرت.
(اَلقَدوی): ڕاستڕەویی/ ڕێگەی ڕاستگرتن.
٤-(إقتَدَى بِفُلان في كذا إقتِداءً): لەو شتەدا پەیڕەوی فیساریکرد/ وەك ئەویکرد/ لاسایی ئەویکردەوە/ چاوی لێکرد.
(اَلقِدو (ج) اَقْداء): بنەچە/ بنە کە پەل و لکی لێدەبێتەوە.
(اَلقِدَة والقُدْوَة والقِدْوَة والقِديَة): ١-سەرمەشق ٢-نموونە کە شوێنپێی هەڵدەگرن و وەك ئەو دەکەن ٣-ڕابەر.
قدي: ١-(قدی- الطَّعامُ قَدیاً): خواردنەکە/ چێشتەکە بۆن و چێژی خۆشبوو.
٢-(قَدى- الفَرَسُ قَدَياناً): ئەسپەکە خێرایکرد.

(قــادى- الرَجُلَ مُقاداةً):پێشــبڕكێی لەگەڵ پیاوەكەدا كرد.

(اَلقادِيَةُ (ج) قَوادٍ):خوێشكەڵێك لە بیابانەوە بە ناچاریی گوزێزیان بۆ شوێنی ئاودار كرد.

(اَلقِدَة= القُدوَة):سەرمەشق/ نموونە.

(القِديَــةُ):١-جۆری نموونــەی پەیرەوكردن ٢-شێوازو چۆنیەتی هەڵسوكەوت.

(«خُذ في هِديَتِكَ وقِديَتِكَ»):ڕێگەی ڕاستی خۆت بگرەو شوێنی سەرمەشقەكەت بكەوە.

٣-(قَدّى- في هذا الأمرُ):ئەم كارەم بەسە.

(«هــذا يُقَــدّي») (عامية):ئەمە بەســە/ بەشدەكات.

(اَلقَدَى والقِدى):هێندە/ ئەوەندە.

(«بَينَهُما قَدى رِمــحٍ»): نێوانیان (درێژیی نێزەیەكە/ هێندەی نێزەیەكە).

٤-(تَقَــدّى): بــە كــەش‌و فشــەوە/ بــە لەخۆباییبوونەوە ڕۆیشت.

(اَلمُتَقَــدّي) (فــا):١-كەشوفشــكەر/ بەفیزو لەخۆبایی ڕۆیشتوو ٢-شێر.

٥-(اَلقِدَة (ج) قِداة (ح):جۆرە مارێكە.

قذ: ١-(قَذَ- الريــشَ قَذّاً):ئەملاولای پەڕی تیرەكەی بڕی‌و خواریكردەوە.

(-الرَجُلَ):كێشای بە پشتیملیدا.

(-السَهْمَ):پەڕی بە تیرەكەوە كرد.

(قَــذَّ وقَــذَّذَ- الشَــعْرَ): قژەكــەی بــڕی‌و ڕێكیكرد.

(أَقَذَّ- السَّهْمَ):پەڕی بە تیرەكەوە كرد.

(تَقَذَّذَ- القَومُ):پەرەوازەو بڵاوبوونەوە.

(«فُلان لايَدعُ شاذَةً ولا فاذَّةً»):فیسار كەس ناهێڵێــت هەرچی پــەرەوازە بێــت‌و نەبێت بیبینێت هەر دەبێ بیكوژێت.

(اَلقُــذَّةُ (ج) قُذَذ وقِذاذ):١-گوێی مرۆڤ یان چارەوێ ٢-پەڕی تیر.

(القُــذاذَةُ (ج) قُــذاذات): پارچــەی وردی قەراغی زێڕ كە لێیهەڵدەوەرێت یان هی پەڕە كە لێیدەبێتەوە/ پروشەی زێڕو پەڕ.

(«إنَ لي قُذاذاةٍ وجُذاذاتٍ»):پروشەی وردی وەریوی زێڕو هی زیوم هەیە.

(اَلقَذّان):١-ســپێتیی هەردوو لاجانگ لەبەر پیری ٢-سپێتیی لە هەردوو باڵی باڵندەدا.

(سَــهْمٌ أَقَذُّ (ج) قُذٌّ و (جــج) قَذاذ (ضد): ١-تیرێكی پەردار ٢-تیرێكی بێپەڕ.

(اَلمَقَذّ):١-پشتیمل كە لە نێوان هەردوو گوێدا بێت ٢-كۆتایی تووكی پشــتیمل‌و پێشەســەر ٣-شوێنی بڕینی قژیسەر لە پێش‌و پاشەوەی.

(اَلمِقَــذّ والمِقَــذَّة): ئــەوەی پــەڕی تــیری پێدەقرتێنرێت‌و دەبڕرێت وەك چەقۆو شتیتر.

(اَلمُقَــذّ و المَقذوذ):١-قژی بــڕراوو ڕێكخراو ٢-هەرچــی چاككرابێــت‌و ڕێكخرابێــت‌و جوانكرابێت ٣-تاشراوو ڕێكخراو.

(اَلمُقَــذَّذَةُ والمَقــذوذَةُ):گوێچكــەی خڕ وەك ئەملاولای قرتابێت‌و ڕێكخرابێت.

٣-(قَذَّ- الحَجَرَ أو كُلَّ غليظٍ قَذّاً): بەردە یان هەر شتێکی رەقیتری فڕێدا/ تووڕیدا.

٤-(اَلقُذَّة (ج) قِذّان (ح): کێچ.

(اَلقُذَذ) (ح): کێچ.

قــذح: (قــاذَحَ-هُ مُقاذَحَةً): شــەرەجنێوی لەگەڵدا کرد.

(تَقَــذَّحَ لِفلان بالشَــرِّ): شــەڕی بە فیســار فرۆشت.

قــذر: ١-(قَذَرَ. قَــذَراً وقَــذارَةً): پۆخڵبوو/ پیسبوو ٢-چەپەڵبوو.

(قَذْرٌ وقَذِرٌ وقَذَرٌ وقَــذُرٌ): چەپەڵ/ پیس/ پۆخڵ.

(-الشَيءَ): شتەکەی پیسکرد، وایلێکرد پیسبێت.

(قَذُرَز قَذَراً وقَذارَةً): پیسبوو، پۆخڵبوو.

(قَــذْرٌ قَــذِرٌ وقَذَرٌ قَــذُرٌ): پیــس/ پۆخڵ/ چەپەڵ.

(قَذِرَ قَذَراً وقَذارَةَ): پیسبوو.

(-الشَــيءَ- قَــذَاراً): ١-شــتەکەی پیســکرد ٢-شــتەکەی لا پیســبوو خۆی لێـلاداو بێزی لێکردەوە.

(قَذَّرَ- الشــيءَ): شتەکەی پیسکرد/ وایلێکرد پیسبێت.

(اَقْذَرَ-هُ): بە پیسی داناو زانی.

(-فُلاناً): فیساری بۆڕۆو بێزار کرد.

(تَقَذَّرَ- الشيءَ ومِنهُ): لەبەر پیسی شتەکە بێزی لێکردەوەو ڕقی لێبووەوە.

(اِسْــتَقْذَرَ- الشيءَ): ١-شتەکەی بە پیس هاتە بەرچاوو بە پیســی دانا ٢-لەبەر پیســی ڕقی لێبووەو بێزی لێکردەوە.

(اَلقَذَر) (مص) (ج): أقذار ومَقاذِر (ئەمەیان بــە پێی پێــوەر نییە): پیســیی/ چەپەڵیی/ پۆخڵیی. بە گویشــدەوتریێت (اَلقَذَر) پیسی/ پیسایی.

(رَجُلٌ قُذَرَةٌ): پیاوێك کە خۆی لە تەشــەرو توانج لابدات/ لە سەرزەنشت دووربخاتەوە.

(اَلقــاذُورَة (ج) قــاذُورات): داوێنپیســیی‌و ڕەفتاری ناپەسەند وەك زیناو شتی وەها.

(اَلقاذُورةُ والقاذُور وذُو القاذُورَة): ١-مرۆڤی بەدڕەوشــتو ســووك کــە لەبەر ســووکیی نەتوانێت تێکەڵ بە خەڵکبێت ٢-کەسێکە بێز لە خواردنێك بکاتەوەو نەیخوات.

(اَلقَــذُور وذو القَــذُور): ١-مرۆڤی ســووك‌و بەدڕەوشــت‌و تەریك لە خەڵــك ٢-مرۆڤی لە خواردنێك بێزکەرەوە.

(القــاذُور- مِــنَ النِّســاء): ئافرەتــی خۆ لە پیاوانپارێز خۆ لە گومانپارێز.

(رَجُلٌ مَقْذُرٌ (ج) مَقاذِر): پیاوێك کە خەڵك خۆی لێلابدا.

(اَلمَقــاذِر- الأَقــذار): پیســیی/ چەپەڵیــی‌و پۆخڵیی.

(اَلمُقَــذِّر (ج) مُقَــذِّرون): ١-ڕیاو ٢-ئەوەی کە ڕوو لە پیسیبێت.

٢-(القُــنْرُوف (ج) قَذاريف): خەوش، لەکە، ناتەواویی.

قــذع: ١-(قَذَعَ- هُ. قَذْعاً): جنێوی ســووكو پیسی پێدا نامووسی شکاندو برد.

(قَذَّعَ- ثَوبَهُ): جلەکەی پیسکرد.

(قاذَعَ-هُ): شــەڕە جنێوی ناشیرینو سووكو نامووسشکێنی لەگەڵدا کرد.

(اَقْذَعَ- فُلاناً): جنێوی سووکی بە فیسار داو نامووسیبرد.

(-لِفُلانٍ): دەربارەی فیســار قسەی ناشیرینو سووکی دەربڕیو وت.

(-القَولَ): قسەی خراپی کرد.

(-الرَّجُلُ): پیاوەکە جنێوی ناشیرینیدا.

(تَقَــذَّعَ- لَهُ بالشَّــرِّ): ئامادە بــوو خراپەی بەرامبەر بکات.

(اَلقَذْع): ١-جنێوو قســەی پیسو بێنامووسی ٢-پیسیی، پیسایی.

(اَلقَــذَع والقَذيــع والأَقْــذَع): داوێنپیــس/ بێنامووس.

(اَلقَذِع): پۆخڵ/ بەدڕەوشت.

(اَلقَذيعَة): جنێوی پیسو بێنامووسی.

(«رَمــاهُ بالمُقْذِعــات والمُقَذِّعــات»): جنێوی پیسو ئابڕوبەری پێیداو نامووسی شکاند.

٢-(تَقَذَّعَ- الرَّجُل): ڕقیبووەوەو بێزیکردەوە.

٣-(اَلقُذَعْمِل): حوشتری قەبە/ کەتە.

(اَلقُذَعْمِلَة): ژنی کورتەبنەی پیسەکە.

(«ماعِندَهُ قُذَعْمِلَةٌ»): هیچی نییە.

(«مافي السَّــماءِ قُذَعْمِلَةٌ»): پەڵە هەورێکیش بە ئاسمانەوە نییە.

قذف: ١-(قَذَفَ. قَذْفاً): ڕشایەوە.

(-المَلّاحُ): دەریاوانەکە بە سەوڵلێدان بەلەمەکەی پێشدا.

(-بِقَولِهِ): لە خۆیەوە بێبیرکردنەوە قســەی هەڵڕشت.

(-الحَجَرَ وبالحَجَرِ): بەردەکەی هەڵدا.

(-ە بِكَذا): ئەوەی تێگرت.

(-فُلاناً بالحَجَرِ): بەردی گرتە فیســار/ بەر بەردیدا.

(-الرَّجُلَ): پیاوەکەی گومانبارکرد/ تۆمەتی دایە پاڵی.

(قــاذَفَ-هُ): یەکتریان گومانبارکردو شەڕەجنێویانکرد.

(تَقاذَفَ الماءُ أَو الفَرَسُ): ئاوەکە یان چارەوێکە بە پڕتاو ڕۆیشت.

(-القَومُ): خوێشکەل شەڕەجنێویانکرد.

(-القَــومُ بالحِجــارَةِ): خوێشــکەل شــەڕە بەردیانکرد.

(-تِ بِهِ الأَمواجُ): شــەپۆلە ئاوەکان هێنایانو بردیان.

(«تَقاذَفَت بِهِ الأَبوابُ»): هەموو دەرگایەکی بەڕوودا داخرا.

(اِنْقَذَفَ): هاوێژرا.

(إِسْتَقْذَفَ- فُلاناً بِالحَجَرِ): فیساری بەر بەرددا.
(-الرَّجُلَ): ١-گومانی لە پیاوەکە کرد ٢-گومانبارێکرد.
(أَلقاذِف) (ف): هاوێژەر.
(ناقَةٌ قاذِفٌ): مێحوشترێکی ئازاو خێرایە خۆی دەهاوێتە پێش حوشترەکانیترەوە.
(أَلقاذِفَةُ (ج) قاذِفات): فرۆکەی بۆمباهاوێژ.
(القاذوف) (ا ع): هاوەن/ تۆپی بچووک.
(أَلقُذُف): شوێنی لێترازان و کەوتنەخوارەوە.
(أَلقُذُف والقَذوف): دوور.
(«فَلاةٌ أَونِيَّةٌ قُذُف»): بیابانێك یان ئاواتێك کە دوورت بخاتەوە.
(«بَلْدَةٌ قَذُوف»): ولاتێکی دوور خەرەوە لەبەر دووریی.
(«قَوسٌ قَذوف»): کەوانێکی تیر دوورهاوێژ.
(ناقَةٌ قُذُفٌ وقَذُوف): مێحوشترێکی چابوك/ ئازاو خێرا خۆی دەهاوێتە پێش حوشترەکانیترەوە.
(أَلقَذَف): ١-شوێنی پێخزان و بەربوونەوە ٢-دوور.
(أَلقِذاف): ١-هەرچی بهاوێژرێت. گوللەتۆپ و فیشەك و بۆمباو شتیتر ٢-خێرا رۆیشتن.
(ناقَةٌ قِذاف): حوشتری چابوك كە پێش حوشترەکانیتر دەکەوێت.
(أَلقَذّاف): ١-تیژوخێرا هاوێژ ٢-مەنجەنیق

٣-هەرچی شتی دووریی پێبهاوێژرێت ٤-کەشتی.
(أَلقَذيف): ١-دوور ٢-(ا ع) گوللە تۆپی دوور رۆیشتوو شێوەیەکی لوولەکی هێلکەیی هەیە لە مادەی تەقەمەنی پردەکرێت و بە ئامێرێك ئاگر دەدرێت و دەیهاوێژێت ئەوەیش تۆپە لەو شوێنەدا دەتەقێتەوە کە بۆی دەنێرن. یان لەو پنتەی رووی تێدەکەن.
(أَلقَذيفة (ج) قَذائِف): گوللە تۆپ، بۆمباو هەرچی دەهاوێژرێت.
(القَذيفَة اليَدَوِيَّة= رُمّانة): نارنجۆك.
(أَلمِقْذَف (ج) مَقاذِف والمِقْذاف (ج) مَقاذيف): سەوڵ کە بەلەمی پێ دەئاژوێت و پێی بەرەو پێش دەبرێت.
(أَلمَقاذِف): فەوتگەکان.
(أَلمُقَذَّف): ١-نەفرەت لێکراو ٢-هاوێژراو.
(«فارِسٌ مُقَذَّف»): سوارەیەکە کە زۆر بۆ پەلاماردان و هێرشبردن دەنێررێت و دەهاوێژرێتە مەترسییەوە.
(«فَرَسٌ مُتَقاذِف»): چارەوێیەکی خێرا/ تیژرەو.
(سَيرٌ مُتَقاذِف): رۆشتنێکی (خێرا/ گورجانە).
٢-(القُذَف والقَذَف والقُذُف): لا/ تەنشت، کەنار، سوێ.
(أَلقُذْفَةُ (ج) قِذاف وقُذَف وقُذُف وقُذُفات): ١-تەنشت و کەنار، لا ٢-بارکۆن ٣-لووتکە شاخ کە بەسەر ئەملاولادا دەروانێت.

(أَقْذافُ القَصْرِ): باركۆنەكانی كۆشك.
(اَلقَذّاف): جۆرەناوێك.
(اَلقَذّاف): ترازوو/ شایەن.
(اَلمُقَذَّف): زۆر قەڵەو/ گۆشتن.
قـــذل: ١-(قَـــذَلَ- هُ قذلاً): نشـــتی ملیكرد/ كێشای بە پشتی ملیدا.
(اَلقَذال (ج) قُذُل وأَقذِلَة): پشـــتیمل/ نێوان هەردوو گوێ لە سەردا.
٢-(قَذَلَ- هُ قَذْلاً): خەوشی لێگرت.
(اَلقَذَل): خەوش/ كەموكووڕیی.
٣-(قَذَلَ- هُ. قَذْلاً): شوێنیكەوت.
(-في الأَمـــرِ): بـــۆ كارەكـــە لێـــبڕاو كۆششـــی زۆریكرد.
٤-(قَذَلَ- فُلانٌ. قَذْلاً): لایداو لایكردەوە.
قذم: ١-(قَذَمَ- لَهُ مِنَ المالِ قَذْماً): پارەیەكی زۆری دایەو پێبەخشی.
(قَذِمَ- الماء. قَذَماً): ئاوەكەی هەڵقوراند.
(اَلقُذَم): گەورەی بەخشندە.
(اَلقُذَمَة): قومە ئاوێك.
(اَلقِذَم): گەورەی (جوامێر/ بەخشندە).
(اَلقِـــذَم والقُذام- مِنَ الآبـــار): چاڵاوی فرە ئاو.
(بِئـــرٌ قَذُوم (ج) قُـــذُم): چاڵاوێكی/ بیرێكی فرە ئاو.
(اَلقَذیمَةُ (ج) قَذائِم): برە پارەیەك كە پیاو ببیبەخشێت.

٢-(إِنْقَذَمَ): پەلەیكرد/ خێرایكرد.
قذي. (قَذی- ت عَینُـــهُ. قَذْیاً وقَذَیً وقُذِیّاً وقَذَیاناً): چاوی ڕیپۆقیكرد/ ڕیپۆقی دەردا.
(قَذِيَ-ت عَینُهُ): قذیً وقذیاناً وقَذْیاً: چاوی پوش‌و پەلاشی تێكەوت.
(قَذِیَـــة وقَذِیَّة ومَقْذِیَّةٌ): چاوی ڕیپۆقاوی/ پوش‌و پەلاش تێكەوتوو.
(قَذِيَ- الشَّرابُ): شەربەتەكە پوش‌و پەلاشی تێكەوت.
(قَـــذَّی عَینَـــهُ): ڕیپۆق یان پـــوش‌و پەلاش لەچاو دەرهێنا.
(أَقذی عَینَـــهُ): تۆزو پوش‌و پەلاشـــی كردە چاوی.
(إِقْتَـــذی- الطائِرُ): باڵندەكە خۆڵ‌و پوشـــی لـــە چاوی خۆی دەركرد بەوەی ســـەری خۆی خوراند.
(اَلقَذی (ج) قُذِيٌّ وأَقْذاء والقَذاة): ئەو پوش‌و پەلاش‌و خۆڵەی دەكەوێتە چاوو خواردنەوە.
(«فُـــلانٌ یُغضِي علی القَذی»): فیســـار ســـەر بۆ زۆرلێكردنی شۆڕدەكات‌و بەرگریی لە خۆی ناكات.
(«صارَ الأَمرُ قَـــذیً في عَینِهِ»): كارەكە بوو بە گرێی دڵی‌و تووشـــی دڵنەســـرەوتییكردو كۆششی لابردن‌و چارەسەری ئەومیكرد.
(اَلقَذی (ج) قُذِيٌّ وأَقْذاء): گەرد/ وردەخۆڵ.
(«رَجُلٌ قَـــذي العَینِ»): پیاوێـــك وردەخۆڵ چۆتە چاوی.

٢-(قَــذى- ت قاذِيَــةٌ قَذْيــاً وقَــذى وقَذْياً وقَذَياناً): كۆمەڵە خەڵكێك هاتن.

(اَلقَواذي: جمع القاذِية): ئەو خەڵكانەن كە يەكەم كەس ڕوو بە ڕووت دێن.

(اَلأَقْذَاء): ســووك‌و ڕِســواكانی نــاو خەڵك/ سەرسەری‌و شەلاتییەكان.

٣-(قــاذى –الرَجُــلَ. مُقــاذاةً): پاداشــتی پیاوەكەیدایەوە.

قرّ: ١-(قَرَّ- اليَومُ. قَرّاً): ڕۆژەكەی ساردبوو.

(-عَينُهُ. قُرَّةً وقَرَّةً وقُرورَةَ): چاوی‌گەشايەوەو ڕوونبووەوە/ شادبوو. فرمێسكەكانی وشكبوو.

(قَريرُ العَــين وعَينُهُ قَريرَة): دڵگەشــاوەو شادو چاوڕوونبوو.

(قَــرَّ القِــدرَ قَــرّاً): ئــاوی ســاردی كــردە مەنجەڵەكەوە.

(-عَلَيهِ الماءَ): ئاوی ساردی بەسەردا كرد.

(«قَــرَّ الــكَلامِ فِي أُذُنَيــهِ»): بــە گوێیــدا چرپاندی.

(قُرَّ. قَرّاً وقِرّاً): سەرما لێیدا/ سەرمابوو.

(أَقَرَّ. إقْراراً): كەوتە سەرماوە/ تووشی سەرما بوو.

(-اللهُ الرَجُــلَ): خــودا پیاوەكــەی تووشــی سەرمابوون كرد.

(الرَجُلُ المَقْــرور): پیاوی ســەرما (بردوو/ گرتوو) (وشەكە پێچەوانەی پێوانە ناوترێت (مُقَرّ).

(-اللهُ عَينَــهُ وبِعَينِــهِ): خودا چــاوی ڕوون كردەوەو شادیكردو ئەوەی ویستی دایە.

(تَقَرَّرَ- القُــرَّةَ): بنكــری مەنجەڵەكەیبردو بەنانەوە خواردی.

(اَلقُرَّة): بنكری مەنجەڵ.

(إقْتَرَّ- الرَجُلُ): ١-بە ئاوی ســارد خۆیشــت ٢-بنكری مەنجەڵەكەی بە نانەوە خوارد.

(اَلقارّ) (فا): ئارامگرتوو چەسپیو.

(يَومٌ قارّ): ڕۆژێكی سارد.

(عَينٌ قارَّة): (ئیدیۆم) چاوێكی ڕوونی دڵێكی خۆش.

(اَلقَرّ): سەرما.

(يَومٌ قَرٌّ): ڕۆژێكی سارد.

(لَيلَةٌ قَرٌّ): شەوێكی سارد.

(أَلقُرَّة) (مص): پێكردنەوەو گەشبوونەوە.

(«هُــوَ قُرَّةُ عَيني»): ئــەو ڕووناكیی چاومە كە چاوم پێی گەشــدەبێتەوەو دڵم پێی شــاد دەبێت.

(اَلقُرَّةُ أَو قُرَّةُ العَين (ن): كووزەڵە.

(أَبو قُرَّة) (ج): ناوی شاردراوەی خۆرپەرستە. چونكە ســەرمای هەمیشەیی لە گیانیایەتی‌و بۆ خۆر دەگەرێت‌و ڕووی لە خۆرە.

(لَيلَةٌ قَرَّة): شەوێكی سارد.

(اَلقَرَّتــان): بەیانیــی پێــش گزنگیی خۆرو ئێواران زەردەپەڕ.

(اَلقِرَّة): سەرما.

(«حِرَّةٌ علــى قِرَّة»): پەندێکــە بۆ یەکێکە پێچەوانەی ئەوە دەردەبڕێت کە لە دڵیدایەو نیازیەتی.

(اَلقَرَرَةُ والقِرارَةُ والقَرارَةَ والقُرارَةُ والقُرُورَة): ئاوێکــە کە دەکرێتەوە ســەر چێشــتەکە پاش پێگەیشــتنی بــۆ ئــەوەی بــە مەنجەڵەکــەدا نەسوتێت.

(الأقَرّ): ساردتر.

(«أيُّ الأيام أقَرُّ»): چ ڕۆژێك ساردترە.

(اَلقَرور): ئاوی سارد.

(اَلمَقْرُور): ١-سارد ٢-ئەوەی سەرمایبووبێت.

٢-(قَرَّ- فِي المَكانِ أو على الأمرِ قَراراً وقُرُوراً وقَــرّاً وتَقْــراراً وتَقِــرَةً): لــە شــوێنەکەدا ســتارەیگرت و جێگیر بوو یان لەسەر کارەکەو ئەنجامدانی ئارامیگرت.

(قَــرَّرَ-ەُ فِي المَــكانِ أو عَلــى العَمَــلِ): لــە شوێنەکەدا جێگیریکردو دایمرکاند یان لەسەر کارەکە ڕایگرت و هێشتیەوە.

(«قَــرَرتُ عِنــدَهُ الخَبَــر حتى اســتَقَرَّ»): هەواڵەکەم لا سۆراغکرد تا گەیشتمە ئەنجام.

(قَــرَّرَ-ەُ بالامــر): وایلێکرد پێ لــە کارەکە بنێت.

(-ەُ على الحَقِّ): وایلێکرد کە پێ لە ڕاســتیو مافەکە بنێت و ملی بۆ شۆڕ بکات.

(قــارَّ- فِي الصَــلاةِ. مُقارَّةً): لــە نوێژەکەدا ئارامو ستارەیگرت و نەجووڵا.

(-الرَجُلَ) لەگەڵ پیاوەکەدا گونجاو ڕێکەوت/ ستارەیگرت.

(أقَرَّ- فُلاناً فِي المَكانِ إقْراراً): لە شــوێنەکەدا فیساری جێگیری کردو دامەزراندو دامرکاند.

(-العامِلَ على العَمَلِ): کرێکارەکەی لەســەر کارەکە دامەزراند.

(-الرَجُلَ): پیاوەکە دامرکاو ملیدا.

(-بالحَقِّ): پێی لە مافو ڕاستییەکە ناو ملی بۆ شۆڕکرد.

(-الكَلامَ لَهُ): قســەکەی بــۆ ڕوونکردەوە تا تێیگەیشت و زانی.

(- القِــدرَ): مەنجەڵەکــەی کرانــدو ئەوەی پێوەی نووسابوو لێیکردەوە.

(-الطائِرَ فِي عُشِّهِ): وازی لە باڵندەکە هێنا لە هێلانەکەیدا بسرەوێت.

(-تِ الناقَةُ) باری مێحوشترەکە (بنجبەستبوو/ دامەزرا).

(مُقِرّ): جێگیرو قایم/ دامەزرا.

(تَقَرَّرَ): ١-ســاغبووەوە ٢-دامەزرا/ چەســپی ٣-بڕیاردرا.

(تَقارَّ- فِي المَكانِ): لە شوێنەکەدا جێگیر بوو/ ستارەیگرت.

(إقتَــرَّ- فُلانــاً فِي العَمَلِ وعَلَيهِ): فیســاری لەسەر کارەکە دامەزراند.

(إســتَقَرَّ- بِالمَكانِ): لە شــوێنەکەدا (جێگیر بــوو/ دامــەزرا/ ســتارەیگرت/ ئۆقرەیگرت)

٢-چەسپی/ بنجبەستبوو.

(اَلقارَّة) عند اهل الجغرافیا: کیشوەر/ پارچە زەوییەکی زۆر گەورەی لە یەك نەپچڕاو وەك کیشوەری ئاسیاو ئەورووپاو ئەفەریقاو ئەمەریکا.

(اَلقَرّ): ١-لە شوێنێکدا ستارەگرتن و جێگیربوون ٢-ستارەگا/ نشینگە.

(«وَقَعْتَ بِقُرِّك»): گەیشتیتە ئەوەی چاوەڕێیبووی و ئەوەی دەتویست/ بە ئامانج گەیشتیت (ئەمە بە تۆڵەسێنێك دەوترێت کە تۆڵەی خۆی سەندبێت).

(اَلقَرّ) (مص): کەژاوە یان باروبنە بۆ پیاو.

(یَومُ القَرّ): ڕۆژی دوای قوربانیکردن لە حەجدا چونکە لە (مونا)دا دەسرەوون.

(اَلقُرَّةُ والقَرَرَةُ والقُرَرَةُ والقُرارَة): بنکری مەنجەڵ.

(اَلقِرَّة): جۆرە کەژاوەیەکە بۆ پیاو/ باروبنەیە بەسەر وڵاخەوە بۆ سواربوون.

(اَلقَرار): ١-بڕیارو ڕا چەسپاندن (بۆ پرسە بابەتێك) ٢-زەویی نزم و تەخت و پتەو ٣-ئەوەی باری چەسپاو و جێگیربوونی خۆی وەردەگرێت.

(«صارَ الأَمرُ إلی قَرارِه»): کارەکە جێی خۆی گرت/ بنجبەستبوو/ کۆتاییهات: چەسپبوو.

٤-(مو) کۆتایی پارچە مۆسیقاکەیە کە گۆرانیبێژەکە بێدەنگدەبێت.

(اَهلُ القَرار): خەڵکی نیشتەنیی ناو ئاوەدانیی کە لە ماڵەکانیاندا نیشتەنین پێچەوانەی ئەمانە کۆچەرین/ ڕەوەندەن و هەر لە کۆچکردندان.

(دارُ القَرار): ئەوە دنیا/ جیهانی دووەم/ جیهانەکەیتر.

(اَلقَرارَة): ١-نزمە زەویی/ نشێوو پتەو ٢-چاڵی خڕ کە باراناوی تێدا کۆدەبێتەوە.

(اَلقَراریُّ): ١-بەرگدروو ٢-قەساب ٣-مرۆڤی شاریی و نیشتەنی کە کۆچەریی نییە.

(اَلقَرایِرِیّ) — عِندَ العامَّة- نیتشەنیی شارو ئاوەدانی (ئەمە وەرگێڕانی وشەی (اَلقَرارِیّ)یە.

(اَلقارُورَة (ج) قَوارِیر): ١-سوراحیی شەراب یان شووشەی بۆن و شتی لەو بابەتە. گومگومە ٢-بیلبیلەی چاو (لەبەر سافیی و پاکیی کە مرۆڤ ڕووی خۆی تێدا دەبینێت و بە شووشەی بۆن و شەراب چوێنراوە ٣-قاپی خورمای تەر/ فەریکە خورما یان خورما.

(اَلإقرار (مص) شَرعاً): بە پێی شەرع ئەوەیە کەسێك مافی کەسێکیتری بەسەرەوە بێت دانی پێدابنێت.

(اَلتَّقرار والتَّقِرَّة) (مص): نەگۆڕیی/ جێگیریی/ بنجبەستبوون/ نەبزوان/ چەسپبوون.

(اَلمَقَرّ (ج) مَقارّ والمُستَقَرّ): ١-بارەگا ٢-بنکە/ ستارگە/ نشینگە.

(مَقَــرُ البئرِ): چاڵێکه له بنی چاڵاودا که ئاو کەمبوو تیایدا کۆدەبێتەوە.

(اَلمَقَرَّة): ١ـگۆلی ئاو ٢ـگۆزە.

٣-(قَرَّ-تِ الحَيَّةُ. قَرِيراً): مارەکە فیشکاندی.

(-الدَّجاجَةُ. قَرّاً وقَرِيراً): مریشــکەکە لە گارمگار کەوت.

(اَلقُــرّ) (ج): قورناویلکــە/ زیندەوەرێکــی لاکێشەییە سەر ئاو دەکەوێت بۆیە وا ناونراوە چونکە دەنگێکی لێوە بەرزدەبێتەوە وەك بڵێ (قُرقُر). خەڵکە ڕەشۆکەکە پێیدەڵێن (پەتی قورناویلکە) لەبەر ئــەوەی خۆیان بەیەکەوە دەبەســتن‌و لەیەك گیر دەکەن وەك پەتێکبن وا دەنوێنن.

(اَلقَرَّةُ والقُرَّةُ والقِرَّةُ (ج): بۆق.

٤-(تَقَــرَّرَ واقْتَرَّ- تِ الإبلُ): ١ـحوشــترەکان تێربوون ٢ـزۆر قەڵەو بوون.

٥-(قَرُّ الثَوبِ): هەموو چرچ‌و لۆچییەکی جل.

(اَلقَرارَة): کورت.

(اَلقُــرَى): گرفتاریــی‌و لێقەومــان کە بەســەر خەڵکدا لەگەڵ خۆلێلادان‌و خۆلێپاراستندا دێت.

الملحق:

قَرّ» القارّي): کیشوەریی.

(حَربٌ قارِّيَةٌ): جەنگێکی کیشوەریی.

(اَلمَنــاخُ القــارِيّ): ئاووهــەوای ناوەڕاســتی کیشوەرەکان کە نیشانەکەی ئەوەیە جیاوازیی نێوان گەرمای هاوین‌و ســەرمای زستان زۆرە (بە هاوین زۆر گەرمەو بە زستان زۆر ساردە) و لە هاوینیشدا بارانێکی زۆری هەیە.

(اَلتَقرِير): ١ـناچارکردنــی پێڵێنانی کارێك‌و دانپێدانانــی ٢ـبڕیاردانــی کردنــی کارێك‌و ئــەوەی کــە پێویســتە جێبەجــێ بکرێــت. ٣ـلێکۆڵینــەوەی ئەنجامدانــی کارێــك کــە بڕیاردانی کۆتایی‌و جێبەجێکردنی بەدەست سەرۆکە.

(تَقرِيــر المَصــير): بڕیــاری چارەنووســیی وڵاتێك یان میللەتێــك کە خۆی جۆری ڕژێم بۆ خۆی هەڵبژێرێت‌و بــە ئازادیی پەیڕەوی بکات بەبێ ئەوەی هێزی دەرەکیی دەستی لەو هەڵبژاردنەدا هەبێت.

(حــق الشــعوب في تقريــر المصــير): مافی چارەنووسیی میللەتان. میللەتێك مافی ئەوەی هەبێت خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات‌و سەربەســتبێت/ بە ئازادیی بــژی‌و قەوارەی تایبەتیی خۆی هەبێت.

(اَلتَقرِير (ج) تَقارِير): ڕاپۆرت/ پەخشنامە/ ڕوونکردنەوە دەربارەی کێشەیەك یان ڕەوشێك یان چۆنیەتی قەومانێك‌و ڕووداوێك.

(«تَقرِير عَن سَيرِ العَمَل»): ڕاپۆرتێك لەسەر بەرێوەچوونی/ چۆنیەتی ڕۆیشــتنی کارێك‌و جێبەجێبوونی.

(«تقرير طبي»): ڕاپۆرتێکی پزیشکیی.

(تَقرِير): ڕاپۆرتێك/ پەخشنامەیەك لەسەر

ئـەو ئەنجامانەی کە ئەندامانـی لیژنەیەك پێیگەیشـتوون/ بۆیـان سـاغبۆتەوە کـە لە لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەو دەرخستنی کارێکی تایبەتیو پرۆژەیەك کە پێیان سپێردرابێت.

(«تَقرير لجنة نيابِيَّة»)ڕاپۆرتی لیژنەیەکی پەرلەمانیی.

(«تَقرير الخَبير»)ڕاپۆرتی پسپۆڕ.

قرأ: ١-(قَـرَأَ واقْتَرَأَ- الكِتابَ. قَـرْأً وقِراءَةً وقُرآناً)کتێبەکەی بە دەنگ یان بە چاو یان بە دڵ خوێندەوە.

(-عَلَيهِ السَّـلام قِـراءَةً)سـلاوی (لێکرد/ پێگەیاند).

(«إقْرَأْ عليه السَّلامَ»)سلاوی پێگەیەنە.

(قارَأَ-هُ. قِراءً ومُقارَأةً)پێکەوە خوێندیانەوە یان خوێندیان.

(أَقْـرَأَ- الرَجُـلَ. إقْـراءً)بـە پیاوەکـەی خوێندەوە.

(-هُ السَّـلامَ)سـلاوی پێگەیانـد (وەکو کە سـلاوی پێدەگەیەنێـت وایلێـکات ئەویش وەلامی سلاوەکە بداتەوە).

(تَقَرَّأَ)٢-بوو بە فەقێ ٢-زانای شەرع.

إِسْتَقْرَأَ- فُلاناً. إِسْتِقراءً)داوای لە فیسار کرد کە بخوێنێتەوە.

(-الأُمُورَ)لە کارەکانی کۆڵییەوەو سـەرنجی لێدان تا بارو نیشانەکانیان بزانێت.

(القِراءَة (مص) (ج) قِراءات)خوێندنەوەو چۆنیەتی ئەو خوێندنەوەیە.

(الأَقْـرَأُ)٢-ڕەوانترین خوێنـەرەوە ٢-ئەوەی کە زۆر ڕەوان دەخوێنێتەوە کەسـێکە کە زۆر بخوێنێتەوە.

(«أَقْرَأُكُمْ فُلاناً»)باشـترین خوێنەرەوەتان فیسارە.

(القَـرَّاء (ج) قَـرَّاؤُون)چاکخوێنەرەوە یان زۆر خوێنەرەوە.

(الإِسْتِقراء)بەدوادا گەڕانو سەرنجلێدان، لە شتی تایبەتی بۆ دۆزینەوەی شتی گشتی.

(- عِندَ المَنطِقيين)لای گوفتارەکان ئەوەیە کە چەسپاندنو سـەلماندنی بڕیاری تەواو بۆ گشتە بە هۆی سەلماندنی بۆ زۆربەی تاکەکانی ئـەو گشـتە: وەك: هەمـوو زیندەوەرێك لە خواردندا کاکیلـەی خـوارەوەی دەبزوێنێت چونکە مرۆڤو درنـدەو هەموو چوارپێیەك دەیبزوێنێت کەواتە سەلماندنمان کە زیندەوەر لە خواردنـدا کاکیلەی خوارەوەی دەبزوێنێت چونکە مرۆڤو درندەو چوارپێ بەشـی هەرە زۆری زیندەوەرن.

(المِقْرَأ)تەختەی خوێندنەوە ئەوەی لە کاتی خوێندنەوەدا کتێبی دەنێنە سەر.

(المَقْـرُوّ والمَقْـرِيّ والمَقْـرُوء): ئـەوەی خوێندراوەتەوە.

٢-(قَرَأَ- الشـيءَ. قَـرْأً وقُرآناً)شـتەکەی کۆکردەوەو دانیەدەمیەكو بەیەکیەوەنان.

(-تِ الناقَةُ)مێحوشترەکە ئاوسبوو.
(-تِ الحامِلُ)ئاوسەکە زا.
(أَقرَأَ- الأَمرُ. إقراءً)کارەکە نزیکبووەوە.
(-مِنَ السَفَرِ)لە گوزارەکە/ سەفەرەکە گەڕایەوە.
(القُـرآن) (مص)؟-خوێندنــەوە ٢-قورئانی پیرۆز.
٣-(أَقرَأَ- عَنهُ. إقراءً)بەجێیهێشت، وازی لێهێنا.
(-النَّجمُ)ئەستێرەکە ئاوا بوو.
٤-(أَقرَأَ- الحاجَةَ. إقراءً)پێداویســتیەکەی دواخست.
(-زَيدٌ)دواکەوت.
(-تِ الحاجَةُ)پێداویستیەکە دواکەوت.
٥-(أَقرَأَتِ الرِّياحُ. إقراءً)باکە لە کاتی خۆیدا هەڵیکرد.
(القُرء (ج) أَقراء وقُرُوء وأَقرُؤ)دەم/ کات/ حەل.
٦-(أَقرَأَ- الرَجُلُ. إقراءً)گۆشەگیری پەرستنی خودا بوو.
(تَقَرَّأَ)گۆشەگشیری خوداپەرستیبوو.
(القــارِيء (ج) قُــرّاء وقارِئــون وقَــرَأة): گۆشەگیری خوداپەرستی.
(القُرّاء (ج) قُرّاؤون وقَرارِيء)گۆشــەگیری خوداپەرستیی.
(المُتَقَرِّيء)گۆشەگیری خوداپەرستی.
٧-(القُرء (ج) أَقراء وقُرُوء وأَقرُؤ)پاشبەندی هەڵبەست/ سەروا.

(أَقراءُ الشِّـعرِ)جۆری هۆزان و کێشــەکانی و ئامانجەکانی.
(القِرَأَة)پەتای خراپ.
قرب: ١-(قَرَبَ- السَّيفَ قَرباً)١-شمشێرەکەی لە کێلان نا ٢-کێلانی بۆ شمشێرەکە کرد، بۆی پەیداکرد.
(قارِب)کەسێکە بۆ شمشێر کێلان پەیدابکات/ دروستبکات.
(السَّيفُ المَقروب)شمشێری کێلاندار یان لە کێلاننراو.
(أَقرَبَ. قِراباً)کێلانی دروستکرد.
(القِراب (ج) قُرُب وأَقرِبَة)کێلان.
(القِربَة (ج) قِرَب وقِربات وقِرِبات وقِرَبات): مەشکە بۆ شیرو دۆو ماستو کوندە بۆ ئاو.
(«لَقَيتُ مِنهُ عَــرَقَ القِربَة»)ئالآوی زۆری پێنۆشــیم/ توندوتیژیی زۆرم بەدەستیەوە. (خوارد/ نۆشی).
٢-(قَــرِبَ وقَرُبَ. قُربــاً و قُرباناً وقِرباناً): نزیکبووەوە.
(-مِنهُ وإلَيهِ)لێینزیکبووەوە.
(قَرَّبَ- هُ)نزیکیکردەوە.
(-هُ الأَميرُ)میر ئەوی لە خۆی نزیککردەوەو کردی بە پیاوە نزیکەکانی خۆی.
(-القُربانَ لِلّهِ)قوربانی بۆ خودا کرد.
(-الكاهِنَ فُلاناً)قەشەکە قوربانییەکەی بە فیساردا.

(-فُلانــاً): بە فیســاری وت: ســلاّوی خوات لێبێت‌و خودا نزیکت بکاتەوە.
(قــارَبَ- ەُ مُقارَبَــةً): ١-لێینزیکبــووەوە ٢-قسەی خۆش‌و ناسکی لەگەڵدا کرد.
(-فِي الأَمرِ): لە کارەکــەدا وازی لە زیادڕەویی‌و سەرکێشیی هێناو ڕوویکردە ڕاستیی‌و دروستی.
(أَقْرَبَ- الإنــاءَ): قاپەکەی نزیکــی پڕکردن کردەوە.
(-تِ الحامِلُ): کاتی زانی ئاوسەکە نزیك بووەوە.
(تَقَرَّبَ- تَقَرُّبــاً وتِقِرّابــاً): قوربانییەکەی وەرگرت.
(- الی اللهِ بِالقُربانِ): بۆ لە خودا نزیکبوونەوەو قایلبوونی قوربانییکرد.
(«تَقَرَّبْ یا رَجُل»): وەرە (پێشەوە/ بەرەوە/ نزیکبــەرەوە)، پەلە بکە هــۆ پیاوەکە (ئەمە تایبەتی فرمانی داخوازییە).
(تَقارَبا): لەیەك نزیکبوونەوە.
(-ەُ): هەردووکیان لێینزیکبوونەوە.
(-الزَرْعُ): کشتەکە نزیکی پێگەیشتن بوو.
(إِقْتَرَبَ- الوَعْدُ): کاتی بەجێهێنانی بەڵێنەکە نزیکبووەوە.
(-الشَیئان): دوو شتەکە لە یەك نزیکبوونەوە.
(إِسْتَقْرَبَ- الشيءَ): شتەکەی (بە نزیك زانی‌و/ هاتە بەرچاو) یان ویستی نزیك ببێتەوە.
(اَلقُرب والقَراب): نزیك.
(اَلقَــرَب (ج) أَقراب): چالاّویــك/ بیرێك کە ئاوەکەی نزیکبێت‌و قووڵنەبێت.
(أَلقُراب= القَریب): نزیك.
(قُرابُ الشــيءِ وقِرابُهُ): شتێك بە ئەندازەی نزیکیی شتێکیتر بێت.
(اَلقُرْبَةُ): لە شوێن یان پایە نزیکبوونەوە.
(اَلقُربَةُ (ج) قُرَب وقُرُبات): ئەوەی کە پێی لــە قایلبوونی خــودا نزیکبێتەوە کە کرداری چاکەو خوداپەرســتییەو مل شــۆڕکردنە بۆ فەرمانەکانی.
(اَلقُرُبَةُ): خزمایەتی‌و نزیکیی لەوەدا.
(«فِي الإِناءِ قُرُبَةٌ»): قاپەکە نزیکی پڕبوونە.
(اَلقُرُبَــةُ (ج) قُرَب وقُرُبــات): ئەو چاکەو خێــرو ملکەچییەی کە لــە قایلبوونی خودا نزیکتدەکاتەوە.
(اَلقُرابَة= القَریب): خزم/ خوێش/ کەس.
(ما هو بِشَــبیهِكَ ولا بقریب مِنك): ئەو نە لە تۆ دەچێت‌و نە خزمیشتە.
(اَلقُرْبی والقَرابَة): خزمایەتیی/ خوێشایەتی/ کەسێتیی‌و شتیتر.
(اَلقُربــان (ج) قَرابــین): ١-قوربانیــی کــە بۆ خــودا بکرێت‌و لــە ڕێی خــودادا بکرێت ٢-هاونشــینی تایبەتی شا لەبەر ئەوەی لێوەی نزیکە.
(اَلقَرْبــان (م) قَرْبی (ج) قِراب مِن الآنیة): ١-قاپێك کە خەریکی پڕبوونبێت ٢-هاونشینی تایبەتی شا.

(ألقارِب (ج) قَوارِب): بەلەم.
(ألقَريب (ج) أقْرِباء وقُرابى (م) قَريبَة (ج) قَرائِب): ١-نزيك (بۆ تاك و كۆ).
(«هو قَريبٌ وهم قَريبٌ»): ئەو نزيكەو ئەوان نزيكن ٢-خوێش/ خزم/ كەسی نزيك ٣-كێشێكە لە كێشەكانی هۆزان/ شيعر كە تايبەتە بە ناعەرەب كێشەكە.
(مَفاعيلن. مَفاعيلن فاعلاتن مَرَّتين).
(جاؤوا قُرابى): هاتن شان ب شانو نزيك بەيەك.
(قُرابى): كۆی وشەی (قريب)ە لەسەر پێوەر نييە.
(ألأقْرَب): نزيكترو نزيكترين.
(أقْرِباءُ الرَجُلِ وأقارِبُهُ وأقْرَبُوهُ): خزمە نزيكەكانی پياوەكە.
(ألمُقْرِب (فا) مِنَ الحَوامِل (ج) مَقارِب ومَقاريب): ئەو ئاوسانەی/ ئەو سكپڕانەی كە نزيكی منداڵبوونبن.
(ألمُقْـرَب (مفع) (م) مُقْرَبَة مِنَ الخَيل): ئەسپێك كە ئاخورو شوێنی بەستنەوەكەی نزيكدەكەن لەبەر چاكیی و خۆشەويستیی.
(ألمَقْرَب): كورتەرێ.
ألمَقْرَبة: ١-خزمايەتی ٢-كورتەرێ.
(ألمَقْرِبَة والمَقْرُبَة): خزمايەتی/ خوێشايەتی/ كەسايەتی.
(ألمُقارِب) (فـا): ١-مامناوەندیی نێوان چاك و خراپ ٢-گوزەران مامناوەندیی.
(ألمُقارَب (مفع) مِنَ المَتاع: كەلوپەلی هەرزان.
(ألمُتَقارِب) (فا): كێشـەيەكە لە كێشـەكانی شيعر كە كێشەكەی: (فَعولَن)ە هەشت جار.
٣-(قَرِبَ قَرَباً): هاواری كەمەريكرد.
(قَرَّبَ- الرَجُلُ): هاواری كەمەريكرد.
(تَقَرَّبَ الرَجُلُ. تَقَرُّباً وتِقِرّاباً): دەستی خستە سەر كەمەری.
(ألقُـرْب والقُرُب (ج) أقْراب) (ا ع): كەمەر/ كەلەكە.
٤-(قَرَّبَ- الفَرَسُ): چارەوێكـە لوقەيكرد جۆرە چوارناڵەيەكە.
(ألتَقريب): لۆقەكردنی ئەسپ.
٥-(أقْـرَبَ- الراعـي الإبِـلَ): شـوانەكە حوشترەكانی بەشـەو لێخـوڕی تـا بەيانی بيانباتە سەر شوێنی ئاودانيان.
(قارِب): شوانی حوشتر بردوو بەشەو بۆ سەر ئاوی بەيانی/ نزيكخەرەوە.
(الإبِلُ القَوارِب): حوشتری بەشەو لێخوڕراو نزيكخراوەی ئاوی بەيانی.
(ألقَرَب والقِرابَة): شەو ڕەو بۆ ئاوی زووی بەيانی.
(ألقارِب): ئاوخوازی شەو.
(ألمَقْرَب): بەشەو ڕۆيشتن/ شەوڕەو.
٦-(ألقَرنَبيُّ) (ح): قالۆنچەی شاخدار جۆرێكە لە قالۆنچە كە دوو قاچی درێژی هەيە.

(اَلْمُتَقارِب): پیاوی کورتەبنە.

٧-(اَلْقَرَبُوس (ج) قَرابیس): قەڵپوزی زین/ بەشی کەوانەیی بەرزی زینەکە کە لە پێش‌و پاشەوەی زینەکەدایە.

قـرت: ١-(قَـرَتَ- الـدَمُ. قَرْتـاً وقُرُوتاً): خوێنەکـە بەسـەر یەکەوە وشـکبوو یان لە برینەکەدا وشـکبووەوە یان بە هۆی لێدانەوە لەژێر پێستەکەدا شین هەڵگەڕا.

(قَرِتَ- الدَمُ- قَرَتاً): خوێنەکە بەسەریەکەوە وشـکبووەوە یان لەژێر پێستدا شین هەڵگەڕا بە هۆی لێدانەوە.

(-الظفَرُ): خوێـن لەژێر نینۆکەکەدا مەیی‌و مردو وشکبوو.

(-الرَجُلُ): ڕووی پیاوەکە بە هۆی خەفەتەوە یان لە تووڕەییدا هەڵبزڕکاو گۆڕا.

(اَلْقَرَت) (مص): وشکبوون/ مەیین.

(دَمٌ قارِت): خوێنێکی مەییو و وشکەوەبووی نێوان پێست‌و گۆشت.

٢-(قَرَتَ- الرَجُلُ. قُروتاً): بێدەنگبوو.

٣-(اَلقارِت): ئـەوەی هەرچی دەسـتکەوێت بیخوات.

(القارِت واَلقَرّات): باشترین جۆری مسک.

اَلْمُقْتَرِت: ئەو کەسـەی هەرچی دەسـتکەوێت بیخوات.

قـرث: (قَـرَثَ-هُ الأَمْـرُ. قَرْثـاً): کارەکەی لێسەختبوو.

(قَـرِثَ- الرَجُلُ. قَرَثاً): خـۆی زۆر ڕەتاندو ڕەنجیدا.

(اَلْقِرِّیث) (ح)= (الجِرِّیث): جۆرە ماسییەکە/ مارماسی.

قرح: ١-(قَرَحَ وقَرَّحَ-هُ قَرحاً): برینداریکرد/ زامداریکرد.

(قَرِح. قَرَحاً): برینی دەرکرد.

(«قَـرِحَ قَلْبُـهُ مِنَ الحُـزن»): خەفەت دڵی بریندار کرد/ دڵی بە خەفەت بریندداربوو.

(اَقْـرَحَ- هُ اللهُ): خـودا (دوومەڵـی لەلـەش دەرکرد/ تووشی برینی لەشیکرد).

(تَقَـرَّحَ- الجَسَـدُ): لەشـەکە برینی زۆری دەرکرد/ دوومەڵی دەرکرد.

(اَلقَرْح (مص) (ج) قُـروح: ١-برینی لێدانی چەك ٢-زیپکە ئەگەر پیسیکردو بوو بە برین ٣-جۆرە گەرییەکی پێسـتە بەچکە حوشـترو گوێرەکە دەکوژێت.

(اَلقَرَح) (مص): برینەدەرکردن یان بریندداربوون.

(اَلقَرِح): زامدار/ بریندار.

(اَلقَرحَة والقُرحَة): برینی پیسـبووی کۆن کە کێم‌و زووخ پەیدابکات.

(اَلقُرحان- مِنَ الناس): خەڵکی ئاولاوی (بۆ تالئو کۆیە).

(اَلأَقْرَح): زامدارتر.

(اَلقَریـح (ج) قَرحی وقَراحـی): زامدار/ بریندار.

٢-(أَقْرَى. إقراءً): هاواری پشتیکرد.
(ألقَرا (ج) أَقْراء وقِروان) (ا ع): پشت.
أَلقِروان (ج) قِروانات): پشت یان ناوەڕاستی پشت.
(ناقَـةٌ قَرْواء): مێحوشـترێکی کۆپارە درێژ، ناوترێت (جَمَلٌ أَقْرى).
أَلْمُقْروري: پشتدرێژ.
٣-(إسْـتَقرى- الدُمَّـلُ): دوومەڵەکـە کێمی پەیداکرد.
(ألقَـرْو (ج) قُرُوٌّ وأقْراء وأقْـرِ وقُرِيّ): ١-بنی دارخورما هەڵدەکۆڵرێت و مەیی تێدا دەگیرێتەوەو دروسـتدەکرێت/ دەترێتەوە ٢-دەفرێکی بچووک ٣-جامێکی/ کاسەیەکی دارین.
٤-(ألقَرا) (ن): کوولەکەی خواردن.
(ألقَرْو (ج) قُرُوّ وأقْراء وأقْرِ وقُرِيّ): ١-قامیشی بۆش ٢-زەویەیەك كە برینی زۆر گرانبێت.
(ألقَرْوَةُ): کشانی پێستی گون.
(قَرْوَةُ الراسِ): لای سەر.
(ألقَرواء): سمت/ پاش/ دواوە.
(ألقَرْوانِـيّ): قۆڕ بوو یەکێك پێسـتی گونی کشابێت.
(ألمَقْرى (ج) مَقار): تەوقەسەری گرد.
(شـاةٌ مَقْرُوَّةٌ): مەڕێك سـەری بـە دارێکدا کرابێت بۆ ئەوەی شیرەکەی خۆی نەخواتەوە.
قـري: ١-(قَرَى- الضَّیـفَ. قِـرى وقَراءً): میواندارێی میوانەکەیکرد.

(أَقْــرى. إقْــراءً): لــە یەکێکی خواســت کە میواندارێی بکات.
(إقْتَرى): لە کەسێك داوای میواندارێکرد.
(-الضَّیفَ): میواندارێی میوانەکەیکرد.
(إسْتَقری): داوایکرد میواندارێی بکەن.
(ألقِــرى): ئـەوەی پێشـکەش بـە میـوان دەکرێت.
(ألمِقْراء (م) مِقْراة ومِقْراء): ١-ئەو کەسـەی کە میواندارێی خەڵکانێك بکات/ میواندۆست کەسێکە میواندارێی خەڵك زۆر بکات.
(ألمِقْــرى (م) مِقْــراة ومِقْــراء= المِقْــراء): میواندۆست/ میواندار.
(ألمِقْری والمِقْــراة (ج) مَقارِ): لەگەنی گەورە کــە دەخرێتــە بەردەمی میــوانو خواردنی تێدەکرێت.
(ألمَقاري): مەنجەڵەکان.
٢-(قَرى- المــاءَ في الحَوضِ. قَــرىً وقَرياً): ئاوەکەی لە گۆلەکەدا کۆکردەوە.
(-البَیعرُ وكُلُّ ماإجْتَرَّ): حوشترەکەو هەموو ئەوانەی کە کاوێــژ دەکەن، خواردنی ورگیان دەهێننەوە ناودەمیان بۆ کاوێژکردن.
(-تِ المِـدَّةُ في الجِـرحِ): کێـمو زووخ لــە برینەکەدا کۆبوومەوە.
(أَقْرى. إقْــراءً): ١-لە (دێکــەدا/ گوندەکەدا) مایــەوە/ جێگـیر بــوو ٢-بە شـتەکەوە لکاو لێینەبوومەوە لەسەری هەتەر بوو.

(اَلقاري) (فا): لادێیی/ نیشتەنی لادێ.
(«جـاءَ في كُلِّ قارٍ وبادٍ»): هەرچی لە لادێو بیاباندا بوو هاتن.
(اَلقارِيَةُ (ج) قَوارٍ): ١-مێی وشـەی (اَلقاري) ٢-شوێنی کۆبوونەوەو چڕبوونی خەڵك/ ئاوەدانی.
(اَلقاراة (ج) قارَيات): شوێنی پڕ لە خەڵكو قەڵەباڵغ.
(اَلقِرى): ناوی کۆمەڵبووی ناو گۆل/ حەوز.
(اَلقَرْيَة والقِريَــة (ج) قُرى وقِرى): ١-دێ/ گوند.
(قَرَوِي وقَرَيّى): لادێیی/ گوندنشین/ دێنشین ٢-لادێ ٣-کۆی خەڵك/ شار/ ئاوایی چڕ.
(قَرْيَةُ النَّمل): شارە مێرووله.
(قَرِيَةُ الأَنصار): شاری مەدینە.
(اَلقَرْيَتان): مەککەو تایف.
(اَلقَرِيَّة (ج) قَرايا): شارە مێروله.
(اَلمِقْــرى والمِقْــراة): هەرچی بارانــاوی تێدا کۆببێتەوە.
٣-(قَرى- الجرحُ قَرىً وقَرْياً): برینەکە تەقی.
قَــرى وتَقَــرَّى واســتَقْرى- البِــلادَ: بــە هەموو وڵاتەکەدا گەڕاو ســەرنجی لە خۆیو خەڵکەکەیدا.
(اِقْتَرى- البلادَ): شوێن بە شوێنی وڵاتەکەی تەماشاکردو گەڕاو پشکنی.
(-فُلاناً بِقَولِهِ): شــوێن ئاخاوتنەکەی فیسار کەوتو لەسەر قسەکەی ئەوەوە قسەیکرد.

(اَلقَرِيّ (ج) اَقْرِيَة واَقْراء وقُريان): ١-جۆگەی ئاو لە بەرزاییەوە بـۆ باخچەکە ٢-جۆگەلەی بچووك.
(«جَرى الــواديُ فَطَمَّ القَرِيَّ»): کارەســاتی گــەورە ڕوویــداو هەمــوو شــتێکی باشــی ڕامالّــی وەك چــۆن لافاو جۆگــە بچووکەکان دادەپۆشێت.
٤-(اَلقارِيَةُ (ج) قَوارٍ): ١-دەمی تیژی شمشێر ٢-خوارەوە یان سەرەوەی نێزە.
(اَلقارِيَــةُ والقارِيَّةُ (ج) قَــوارٍ وقَوارِيٌّ (ح): باڵندەیەکــی قاچکورتی دەنووکدرێژی ســەر پشت سەوزە.
(«هُــمْ قَــواري الله»): ئــەوان بڕواپێکراوو شەهیدانی خودان.
(اَلقَرِيّ (ج) اَقْرِيَة واَقْراء و قُريان): ماست.
(اَلقَرِيَّــة (ج) قَرايا): ١-داردەســت ٢-دارێکی درێژە کە لە باری پانیی‌و لەسەرەوە دەدرێتە بەرچارۆکەی پاپۆڕی چارۆکەدار.
(اَلقِرّايَة): کورســییەکی درێژە کتێبی دۆعای دەخرێتە سەر لە کاتی خوێندنەوەیدا.
قَزّ: ١-قَزّ. قَزّاً: خۆی گرمۆڵەکرد/ کۆکردەوە تەکانیدایە خۆی بازبدات ٢-بازیدا.
(اَلقازّ) (فا): شەیتان.
(اَلقَزّان) (ح): مارێکی گەورە/ گەپ.
٢-(قَزَّ-ت نَفســي الشــيءَ وعَنِ الشيءِ): دڵم لە شتەکە شێواو دڵم لێی تێکەڵهات/ قێزم لێهاتەوە.

(قَزَّ وتَقَــزَّزَ- مِنَ الدَنَسِ وكُلّ مايُسْــتَقْذَر ويُسْتَخْبَث): لــه پیســایی‌و هه‌موو شتێك كه بێزی لێدێته‌وه دڵی لێشــێواو قێزی هاته‌وه‌و لێیدووركه‌وته‌وه.

(اَلقَــزّ والقِزّ والقَــزَز والقُــزّاز): قێزه‌ون/ شــتی (بێزلێكراوه كه دڵ بشێوێنێت)/ بێزی لێوه‌بكرێت.

(«مــافي طَعامِهِ قَــزٌ ولا قُزٌ ولا قَــزازَة»): لــه خواردنه‌كه‌یــدا شــتێك نییه كــه قێزی لێبكرێته‌وه.

٢-(اَلقــازُوزَة): ١-ســوراحیی بچووك ٢-جامی مس، تاسی مس.

(اَلقَزّ (ج) قُزُوز) (فارســیة): ١-ئاوریشــمی بانه‌دراو.

(دود القَزّ) (ح): كرمی ئاوریشم.

(اَلقَزّاز):ئاوریشمفرۆش.

(-عنــد العامة): پســپۆڕی پــه‌روه‌رده‌كاری كرمی ئاوریشم.

(اَلقُزَّيزَة) (ن) (عامية) = حشيشة الزجاج): گیاشووشه. گیایه‌كی ده‌شــته‌كیی پزیشكییه. شووشه‌یشی پێ پاكده‌كرێته‌وه.

الملحق:

قزّ: (القَزِّيّات): كۆمه‌ڵه مێروجه‌یه‌كه له‌وانه كرمی ئاوریشم.

(اَلقَزِيّــة): ره‌گــه‌زه مێروجه‌یه‌كه گرنگترین جۆریان (قَزِيّة التوت) كرمی ئاوریشــمه كه له سه‌ر گه‌ڵای توو ده‌ژی‌و قۆزاخه‌ی ئاوریشم دروستده‌كات.

الملحق:

قزب: (القــازِب): ئه‌وه‌ی له ئاوو وشــكانیدا ده‌ژی/ ده‌چێته هه‌ردووكیانه‌وه.

---

قزح: ١-(قَزَحَ- القِدْرَ قَزْحاً): به‌هاراتی كرده مه‌نجه‌ڵه‌كه‌وه.

(قَزَّحَ- القِدرَ): به‌هاراتی كرده مه‌نجه‌ڵه‌كه‌وه.

(-الحَديــثَ): ئاخاوتنه‌كــه‌ی بێــدرۆ كردن رازانده‌وه‌و جوان ده‌ریبڕی.

(اَلقَزْح): به‌هاراتێك.

اَلقِزح (ج) اَقْزاح: به‌هارات.

القَزّاح: به‌هاراتفرۆش.

اَلتَقازِيح: به‌هارات كه چێژو بۆنی خواردنی پێخۆشده‌كرێت.

(اَلمِقْزَحَة): به‌هاراتدان وه‌ك خوێدانه.

٢-(قَزَحَ- الشيءُ. قَزْحاً): شته‌كه به‌رزبووه‌وه.

(-تِ القِدرُ): مه‌نجه‌ڵه هه‌ڵچووه‌كه كه‌فوكوڵ‌و بڵقی سه‌ری هه‌ڵدا.

(سِعرٌ قازِح (م) قازِحَة (ج) قَوازِح): نرخێكی (به‌رز/ گران).

قَوازِحُ الماء: بڵقی ئاو.

(قَوسُ قُوزَح وقَوسُ قُــزَحَ): به‌لكه‌زێڕینه/ پرچی ئایشــێ‌و فاتمه. ڕووداوێكی ئاسمانییه له شێوه‌ی كه‌وانه‌یه‌كدا ده‌رده‌كه‌وێت له خوار هه‌وره‌وه‌و كاتی باران لــه‌م ڕه‌نگانه پێكدێت:

وەنەوشــەیی‌و شینی ئاســمانی کاڵ‌و سەوزی زەردبــاوو پرتەقاڵیی ســووربا‌و هۆکەیشــی شــیتەڵبوونی تیشــکی خــۆرە لــە خڕۆکــە ئاوییەکانــی هەورەکە کــە کاری ئاوێزەیەکی بلورین دەکات.

(قَوسُ القَدَح) (عامیة) = قَوسُ قُزَح. گوایا دەڵێن: (قُزَح)فریشتەی هەورە دەیشڵێن ئەوە شەیتانە یان خوایەکی ئەفسانەیە.

(ألقُزَحَــةُ (ج) قُــزَح): پەکێکــە لــە رێگە رەنگەکانی پەلکەزێرینەکە.

٣-(قَزَّحَ- الشَجَرَ): میزیکردە بنی درەختەکە بۆ ئەوەی باش پەل بهاوێت.

(ألقَزْح) (مص): میزی سەگ.

(تَقــزَحَ- النَبــاتُ أَو الشَــجَرُ): رووەکەکــە یــان درەختەکــە پەلی زۆر هاویشــت‌و پەلی لێبووەوە.

٤-(ألقِــزْح (ج) أَقْــزاح) (ز):١-تۆوی پیاز ٢- گووی مار.

قــزع: ١-(قَــزَعَ. قُزُوعــاً): ســـتییکرد/ خاوەخاویکرد.

(-الظَبْيُ) (ضد):١-ئاسکەکە لە هەڵاتنەکەیدا خاوبووەوە ٢-خێرا هەڵات.

(قَــزَّعَ- الفَــرَسَ): ١-چارەوێکــەی هانــی غارکردن‌و تاودانددا ٢- زۆر توند تاوی خۆیدا/ غاریکرد.

(- رَسولَ إِلَیهِ): فرستادەی بۆ نارد.

(قَــزَّعَ-هُ وأَقْــزَعَ-هُ لِلأَمــرِ): بــۆ کارەکــە تەرخانیکردو بەهیچیترەوە خەریکی نەکرد.

(تَقَزَّعَ- الفَــرَسُ): چارەوێکــە ئامادەی غار بوو.

(ألقَــزَّعُ):١-ســووکەڵەی چابــوك‌و خێرا ٢- مژدەدەر کە تەرخان کراوە بۆ مژدەگەیاندن.

٢-(قَزَّعَ- الشارِبَ): سمێڵەکەی کورتکردەوە.

(-راسَــهُ): ســەری تاشــی‌و تەنها ئەملاولای سەری هێشتەوە.

(تَقَزَّعَ- الرأسُ): ســەرەکە تاشراو ئەملاولای هێڵرایەوە.

(-القَومُ): خوێشگەل بلاوبوونەوە.

(-السَّحابُ): هەورەکە رەوییەوە.

(ألقَــزَع الواحِدَةُ. قَزْعَة):١-وەرگرتن‌و برینی بەشێکی قژو هێشتنەوەی هێندێکی ٢-هەموو شــتێك کە پەلپەلەو پارچە پارچەی جیاجیا بــن ٣-پەڵــە پەڵە هــەوری تەنــك‌و بچوك‌و بــڵاو ٤-ئەوەیە ســەری منداڵەکە بتاشــرێت بە شــێوەیەك هەندێکی بهێڵرێتەوە جیاجیا وەك پەڵــە پەڵەی هەوری جیاجیای ئاســمان ٥-پوش‌و پەڵاش‌و خاشــاکی ناو دۆڵ کە لافاو دەیهێنێت ٦-حوشتری بچووك.

(قَزَعُ السَّهم): پەری تەنکی تیر.

(ألقَزَعَةُ):١-شوێنی سەر کە قژەکەی پەڵەپەڵە دەبررێت‌و دەهێڵرێتەوە ٢-پەڵەیەك هەور.

(«ماعِندَهُ قَزَعَةٌ»): تا جلی شرپشی نییە.

(اَلقَزاع): پارچەیەك جلی شڕ.

(«مـاڤي السَّـماءِ قِـزاعٌ»): ئاسـمان پەڵـە هەورێکیشی پێوە نییە.

(اَلقُزَّعَةُ و القَزيعَةُ): کاکۆڵ/ تۆپەڵە قژێك کە لە ناوەڕاستی سەری کوڕەکەدا دەهێڵرێتەوەو ئەویتری دەتاشـرێت وەك ئەوانەی لەملاولای سەردا دەهێڵرێتەوە.

(اَلأَقزَح- مِنَ الكِباش): بەرانێك کە لە بەهاردا پارچە پارچـەی خوریـیەکـەی لێدەبێتەوەو ئەویتری دەمێنێتەوە.

(اَلمُقَزَّح): ١-کەسێکە کە تەنها تاڵ تالی بڵاوی قژی بەسەرەوە مابێت.

(-مِنَ الخَيل): ئەسپێك کە تووکی ناوچەوانی کەمبێت.

(رَجُـلٌ مُقَـزَّع): پیاوێکـە سـامانەکەی لەدەسـتچووبێت تەنها حوشتری بچووکی بۆ مابێتەوە.

٣-(اَقْـزَعَ- لَـهُ فِي القَـولِ): زماندرێژیـی بەرامبەر کرد.

٤-(اَلقَزَعَةُ): منداڵی زۆڵ.

قـزل: (قَـزَلَ. قَـزْلاً وقَزَلانـاً): ١-ڕاپەڕی، هەڵبەزییـەوە ٢-بـۆی لەنگـی/ وەك شـەل ڕۆیشت.

(قَزِلَ. قَزَلاً): زۆر شەلبوو.

(اَلقَزَل): شەلی تەواو.

(اَلقَزَل): ناشیرینترین شەلیی.

قزم: ١-(قَزَمَ-ةُ. قَزْماً): خەوشی لێدەرهێنا/ تیروتوانجی تێگرت.

(قَزِمَ. قَزَماً): دەروونبزم‌و نامەردو زمانبەد بوو.

(اَلقَـزْم (م) قَزْمَـة): مرۆڤـی دەروونـنزم/ ناپاك‌و نامەردو بەدزمان.

(اَلقَـزَم) (مص): ١-نامەردیـی ٢-بەدزمانیی ٣-خراپتریـن کاڵاو کەلوپەل ٤-کورتەباڵایی ٥-سـوك‌و ڕسـوای ناو خەڵك (بۆ تاك‌و کۆو بۆ نێرو مێ).

(«هـؤلاء قَومٌ قَزَمٌ مافيهم كَـرَم»): ئەوانە نەتەوەیەکی نامەردو خوێڕین پیاوچاکێکیان تێدا نییە (ئەمە بە دوو و بەکۆو مێ دەکرێت دەوترێـت:(رَجُـلان قَزَمان وامـراةٌ قَزَمَةٌ ورجالٌ قُزُمٌ وأَقْزام وقَزامى ونِساءٌ قَزَمات): دوو پیاوی نامەرد. ژنێکی بەدزمان‌و خوێڕی‌و سـووك/ پیاوگەلێکـی نامـەردو بەدزمـان‌و بستەباڵا.

اَلقَـزِم (م) قَزِمَـة: مرۆڤـی بەدزمـان‌و دەروونـنزم.

اَلقَزم (ج) قُزُم وأَقْزَام: ڕیوەڵەو کورتەباڵایەکی زمانبەدو نامەردی نەبوو.

(رَجُلٌ قَزَمَةٌ إمرَاَةٌ قَزَمَة): پیاوی کورتەباڵا/ ژنی کورتەباڵا/ بستەباڵا.

(اَلقُـزُم (م) قُزُمَة): پیاو یان ژنی زمانبەدی دەروونـنزم.

(اَلقِزام): زمانبەدان/ بەدخوازان.
٢-(تَقَزَّمَ): بێپەرواو بە پەرۆشەوە توند خۆی هاویشتە ناو کارەکەوە.
(القُزام): ١-کەسێکە کە کەس نەیبەزێنێت ٢-زوو مردن.
٣-(سُؤدُدٌ أقزَم): سەرورەرییەکی تازەیە، کۆن نییە.
٤-(اَلقَزْمَل): کورتەبالای ناشیرین/ بستەبالای رەزا قورس.
قــزو: (قَــزا- الأرضَ بِعَصـاهُ. قَــزواً): بە داردەستەکەی زەوییەکەی رێ رێ کرد.
(-الرَّجُــلُ): بێــزی لە خــەوش و ناتەواویی کــردەوەو لێیدوورکەوتەوە ٢-منداڵەکە جۆرە یارییەکیکرد کە هی منداڵانی عەرەب بوو.
(اَلقــزی): لەکــەدار بــوو کــە لەوەپێــش بێخەوشبوو.
(اَلقُزَّةُ (ج) قُــزات): ١-یارییەکی ناو عەرەبە ٢-مار.
(قزي: (قَزِّی- الرَّجُلَ): پیاوەکەی بە زەویدا داو کوشتی.
(اَلقِزْيُ): نازناو.
(«بِئْسَ القِــزْيُ هذا»): ئای کــە نازناوێکی ناشیرین و پیسە.
قــسّ: ١-(قَــسَّ. قَسّــاً وقُسّــاً وقِسّــاً): دووزمانییکرد/ بوختانیکرد/ دوورووییکرد.
(-القَومَ): بە قسەی ناشیرین ئازاریدان.
(قَسَّ وتَقَسَّــسَ- الشيءَ. قَسّــاً): لە شتەکە گەڕاو دوایکەوت.
(«تَقَسَّــسَ أصْواتَهم باللَّيلِ»): بە شەو گوێی بۆ دەنگیان هەڵخست.
(اَلقَسّاس): دووزمان/ پاشملەدوو/ بوختانکەرو ئاشوبگێڕ/ دووروو.
٢-(قَسَّ. قُسوسَةً وقِسِّيسَةً): بوو بە قەشە.
(اَلقَــسّ (ج) قُســوس): ١-قەشــە الكاهــن (سريانية): پیر.
(اَلقِسِّــيس (ج) قِسِّيســون وقُسّــان وأقِسَّة وقَساوِسَة): قەشە.
(اَلقُسُوسَــة والقِسِّيسة): قەشــەیی یان باری قەشەیی.
٣-(قَسَّ- ماعلى العَظمِ قَسّــاً): گۆشتی سەر ئێسقانەکەی خواردو کراندیەوە.
(اِقْتَسَّ- الأَسَــدُ): شــێرەکە بۆ شــتێك گەڕا بیخوات.
٤-(قَسَّ وقَسَّــسَ- الإبِلَ. قَسّاً): حوشترەکانی باش لەوەڕاند.
(اِقْتَسَّ- تِ الناقَةُ): مێحوشــترەکە بە تەنیا لەوەڕا.
(اَلقَــسّ): خاوەن حوشــترێك کە هەمیشــە بەدوای حوشترەکەیەوەیەو بەجێی ناهێڵێت و باش دەیلەوەڕێنێت.
٥-(قَــسَّ- السَّــيرَ قَسّــاً): خێــرا ڕۆیشــت و پەلەیکرد.

(اَلقُسُس): لێخورانی لێزانو کارامە.

٦-(اَلقَسّ): سەهۆڵ.

(اَلقُسُس): ژێروداناکان.

(اَلقُساس): ١-گەڵای وەریوو پوشو پەڵاش کە لافاو رایدەدات ٢-شاخێکە لە ئەرمەنستان کە کانی ئاسنی تێدایە.

(السُیوف القُساسِیَّة): ئەو شمشێرانەی لە ئاسنی ئەو کێوی ئەرمەنستانە دەکرێت.

(اَلقَسَّة): ١-گوندێکی بچووك ٢-مەشکۆڵەیەك.

(اَلقَسُّوس) (ن): لاولاو کە هەڵدەزنێت.

(اَلقَسِّي- مِنَ الدَّراهم): پارەی قەڵب بێبایەخ.

قسب: ١-(قَسَبَ- الماءُ قَسْباً): ئاوەکە کشاو خورەیهات.

(قَسیبُ- الماءِ): رۆیشتنی ئاوو خورەی.

٢-(قَسَبَ- تِ الشَمسُ قَسْماً): خۆرەکە داکەوتو خەریکی ئاوابوونبوو.

(قَسُبَ- الشيءُ. قُسُوباً وقُسُوبَةً): شتەکە رەقو پتەو بوو.

(اَلقَسْب): سەختو پتەو.

(قَسْبَة): شتێکی سەختو پتەو.

(اَلقَسیب والقَسْب): هەموو شتێکی زۆر درێژو توندو سەخت.

٤-(اَلقَسْب): خورمایەکی وشك کە لە دەمدا هەڵوەرێت/ خورمای قەسب.

(قَسْبَةُ): دەنکە خورمایەکی قەسب/ خورمای کوردکوژە.

(اَلقُسابَة): خورمای خراپ.

(القَسُوب): پێڵاو.

قسح: (قَسَحَ قَساحَةً وقُسُوحَةً): رەقبوو/ سەختبوو.

(-الحَبلَ): پەتەکەی/ گوریسەکەی بادا.

(قاسَحَ- هُ): وشكو رەقو توندوتیژ بوو لەگەڵیدا.

(اَلقاسِح والقُساح والمَقْسوح): ئەستووری سەخت.

(«ثَوبٌ قاسِح»): بەرگێکی ئەستوور.

(«رمحٌ قاسِح»): نێزەیەکی سەختو پتەو/ قایم.

قسر: (قَسَرَ واقْتَسَرَ-هُ على الأَمرِ): ئەوی ناچاری ئەنجامدانی کارەکە کردو بە زۆر کارەکەی پێکرد.

٢-(قَسْوَرَ- الرَجُلُ): تەمەنی گەورە بوو.

(-النَبتُ): گیاکە/ رووەکەکە زۆر بوو چڕی دایەیەك.

(اَلقَسْوَر (ج) قَساوِر وقَساوِرَة): ١-خانەدانو بەهێزی دەسەڵاتدار ٢-شێر ٣-هەرزەکاری بەهێزو ئازا.

(اَلقَسْوَرَةُ (ج) قَساوِر وقَساوِرَة= القَسْوَر): ١-بەهێزی دەسەڵاتدار ٢-شێر.

(اَلقَسْوَرَةُ (ج) قَساوِرَة وقَساوِر= اَلقَسور: ٢-زۆرینەی شەو ٣-(ن)رووەکێکی دەشتەکیی تەختانییە.

قسط: ١-(قَسَـطَ وأَقْسَـطَ الوالي. قِسطاً): والییەکە دادپەروەر بوو.
(«أقْسَطَ في حُكْمِهِ وأقْسَطَ بَيْنَهُم وإلَيهِم»): بڕیارەکەی دادپەروەرانە بوو/ لە نێوانیانداو بۆیان دادپەروەر بوو.
(قَسَّطَ-الشيءَ): شتەکەی جیاجیاکرد.
(-الأَغـراسَ): نەمامەکانی ناشـتو میانەی نێوانیان وەك یەککرد.
(-الدَّیـنَ): وامەکـەی بـەش بەشـکردو کاتبەندیکـرد بەشـی وەك یـەكو لە ماوەی دیاری خۆیدا بدرێت.
(«قَسَّـطَ الخـراجَ عَلَيهِم والمـالَ بَينَهُم»): باجەکـەی لەسـەر هەموویـان دیاریکـردو جیایکردەوەو بەشبەشیکرد.
(تَقَسَّـطَ- القَومُ- الشـيءَ بَينَهُم): خوێشگەل شتەکەیان بە یەکسانی لەناو خۆیاندا بەشکرد.
(إقْتَسَـطوا- المالَ بَينَهُـم): داراکەیان لەناو خۆیاندا بەشکرد.
(أَلقِسْط (ج) أقساط): داد.
(«هـوَ أو هُـمْ قِسـطٌ»): ئـەو یـان ئەوان بـەدادن/ دادپـەروەرن ٢-بـەشو بەرکەوت ٣-بڕ ٤-ترازوو (لە دادەوە ناونراوە) ٥-پێوەرێکە نیوەمەن بگرێت ٦-ڕۆژی ٧-بەشێکی ئەو وامەی بڕراوەتەوە لە کاتی خۆیدا بدرێتەوە.
(أَلقُسْطان): گەرد/ تۆز.
(أَلمُقْسِـط): لەنـاوە پیرۆزەکانـی خودایـە (واتاکەی دادپەروەر).
٢-(قَسَـطَ. قَسْطاً وقُسُوطاً): ستەمیکردو لە ڕاستییو هەق لایدا.
(قاسِـط (ج) قُسَّاط وقاسِطُون): لە ڕاستیو هەڵلادەر/ خواروخێچ.
(رَجُلٌ قَسْـطاء): پیاوێکی (ناڕاست، نالەبار/ خواروخێچ.
٣-(قَسِطَ-ت العُنُقُ. قَسَطاً): ملەکە باریکبووو وشکبووەوە.
(-تِ الدابَّةُ): وڵاخەکە/ چوارپێکە قاچەکانی ڕەپبوو.
(-تِ العِظامُ قُسوطاً): ئێسقانەکان لەلاوازیدا وشکهەڵاتن.
(أَقْسَطَ- تِ الريحُ العيدانَ): باکە چێوەکانی وشککردەوە.
(«هو قُسُطُ الرجْلِ وقَسِيطُها»): ئەو قاچی وشـكو ڕەق وەسـتاوە ڕەپبووە، ڕۆیشتندا نانوشتێتەوە.
(أَلقَسَـطُ) (مص): ڕەقبوون یان وشکبوونی ئەندامی لەش.
(أَلأَقْسَط (م) قَسْـطاء (ج) قُسْط): کەسێکی ئەندام وشكو ڕەقبوو/ ڕەپبوو.
(عُنُقٌ قَسْـطاء): ملێکی ڕەقبـوو/ ڕەپبوو/ وشکبوو.
(رکْبَـةٌ قَسْـطاء): ئەژنۆیەکی هەڵاوسـاوی وشکبوو بە شێوەیەك کە ئەنوشتێتەوە.

٤-(قَسَطَ- علی عيالِهِ): درێخيی لە خێزانەکەيکردو چروکيی بەرامبەر کردن.
٥-(القُسْط): چيلکەيەکە دەرمانی پێدەکەن.
(ألقُسْطان والقُسْطانَة والقُسْطانِيّ والقُسْطانِيَّة): پەلکەزێرينە.
٦-(قَسْطَرَ- الدراهِمَ): تەماشای پارەکانيکرد تا بزانێت کامەی ساغەو کامەی قەڵبە.
(ألقَسْطَر والقَسْطار): شارەزای پارەی ساغو قەڵبو جياکەرەوەيان.
(ألقَسْطَرِيّ (ج) قَساطِرَة): ١-جياکەرەوەی پارەی ساغو قەڵب ٢-شارەزای جۆری پارە ٣-کەتە، زەبەلاح.
٧-(ألقُسْطاس والقِسْطاس): ترازوو/ شايەن.
٨-(قَسْطَل (ج) قَساطِل): ١-تۆزی هەستاوی مەيدانی جەنگ ٢-گونج/ بۆريی ئاسن يان حەوتجۆش يان جۆشدراو بۆ هێنانی ئاو، دەيشوترێت (قَسْطَر وقَساطِر): ٣-(ن)شابەروو.
(أمُّ قَسْطَل): ١-نەهامەت/ لێقەومان/ کارەسات ٢-مردن/ مەرگ.
(قساطِلُ النَحيل): حيلەی ئەسپ.
(ألقَسْطَلَة): ١-بۆرەی حوشتر.
(قَسْطَلَةُ الماء): خورەی ئاو.
(قَسْطَلَةُ الحصانِ) (ن): شابەرووی ئەسپ/ کەستانەی ئەسپ درەختێکە گوڵێکی سپی يان پەمەيی دەگرێت بەرەکەی لە کەستانە دەچێت درکاویو تاڵە ناخورێت.
(ألقَسْطال والقُسْطول (ج) قَساطِل): تۆزو گەردی (کۆڕی/ مەيدانی/ گۆڕەپانی) شەڕ.
(نَهرُ قِسطالٍ): رووبارێکی بەهاژە.
(القَسْطَلان (ج) قَساطِل): تۆزی هەستاوی کۆڕی جەنگ.
(ألقَسْطَلانِيّ): پەلکەزێرينە/ پرچی ئايشێو فاتمە.
(ألقُسْطَلانِيَّة): ١-سووريی کاتی خۆرئاوابوون/ زەردەپەڕ ٢-تۆزی هەستاوی زۆر ٣-پەلکەزێرينە.
الملحق:
قسط: (ألتَقسيط): ژەمپارە، کرينو فرۆشتن بە قەرزو بە ژەم/ بە بەش بەشی پارەکەی لەکاتی خۆيدا بدرێت.
(«باعَ بالتقسيط»): بە ژەمپارە فرۆشتی.
(ألتَقسيط- في الزراعة): ناشتنی نەمامەکان بە ميانەی يەکسان لە يەك دوورييان لە يەکەوە وەك يەکبێت.

---

قسم: ١-(قَسَمَ- الشيءَ. قَسْماً): شتەکەی بەشبەشکرد.
(-الدَّهرُ القَومَ): رۆژگار خوێشکەلی پارچەپارچە کردو لەيەك جيايکردنەوە.
(قَسَمَ): (ن علی ك) (ع ح): نونی بەسەر کافدا دابەشکرد ژمارەيەکی تازە دەرچوو ئەگەر ئەنجامەکە بەسەر دابەشکراوەکە

بدەیت دابەشـەکە دەردەچێت ٢٠/ ٥= ٤ ، ٤×٥=٢٠.
(مَقْسُوم): دابەشکراو.
(اَلمَقْسُوم عَلَيه): بەسەردا دابەشکراو.
(حاصل القسمة): ئەنجامی دابەشکردن.
(قَسُـمَ- الغُـلامُ. قَسـامَةً): مێردمنداڵەکە جوانبوو.
(قَسَّمَ- الشيءَ): شتەکەی پارچەپارچە کردو جیایکردنەوە.
(«قَسَّـمَ الدَّهرُ القَومَ»): رۆژگار خوێشگەلی لەیەککردو بڵاویکردنەوە.
(قَسَّمَ- الشيءَ): جوانو چاکیکرد.
(قاسَمَ-هُ المالَ): داراکەی لەگەڵدا بەشکرد.
(تَقَسَّمَ- الشـيء): شتەکەی کەرت کەرتکردو جیاکردەوە.
(-الشيءُ): جیاو بڵاوبووەوە.
(«تَقَسَّمَتْهُ الهُموم): مەراق هۆشی بەملاولادا بردو لەسەرخۆی نەهێشت.
(تَقاسَـمَ وَاقْتَسَـمَ- القَومُ المالَ): خوێشگەل ماڵەکەیان لەناو خۆیاندا بەشکردو هەریەکە بەشی خۆی وەرگرت.
(إِنْقَسَمَ): بەشبەشبوو/ لەتلەتبوو.
(إِسْتَقْسَـمَ): داوایکردو شتەکە بەش بکرێت/ داوای بەشکردنیکرد.
(قاسم وعادُ عدد صحيح) (ن) (ع ج): ژمارەیەکە (ن)ی بەسەردا دابەشدەبێ بە بێماوەی ژمارە.

(اَلقاسـم الأكبر لعددما) (ع ح): گەورەترین هاوکۆڵکەی ژمارەیەك:
القاسم المشترك بين عدة اعداد: هاوکۆڵکەی هاوبەشی نێوان چەند ژمارەیەك.
القَسْم (مص): ١-بەخشش ٢-مەنجەڵ.
(حَصـاةُ القَسْـم): چـەوی پێدابەشـکردن دەخرێتـە قاپێکـەوە پاشـان ئـاو دەکرێتە قاپەکـەوە تا چەوەکە دادەپۆشـێت ئەو ئاوی قاپە دەدەن بە یەکێك دیسانەوە ئاودەکرێتەوە قاپەکە تا چەوەکە دادەپۆشـێت ئەو ئاوەیش دەدەن بەیەکێکیـتر بەو شـێوەیە ئەو ئاوەی هەیانـە دابەشـیدەکەن بەسـەر هەموانـدا ئەمە لە کاتێکدا دەبێـت کە لە کارواندا بن‌و ئاویان کەم پێمابێت بەو شێوەیە بە یەکسانی دابەشیدەکەن.
(اَلقِسْم (ج) أَقسام و (جج) أقاسِم): ١-بەشێك لەو شتەی دابەشدەکرێت ٢-بەرکەوتەی فەر.
(اَلقِسْمَة (ج) قِسَم): ١-بەشکردن ٢-بەرکەوتە/ بەش.
(اَلقَسَمَة (ج) قَسَمات والقِسِمَةُ (ج) قَسِمات): ١-روو/ دەموچاو ٢-جوانیی.
(اَلقَسـامَة): ١-بەشی بەشکەرەکە کە بۆ خۆی دادەنـێ ٢-زەکات کە بە هـەژارە داماوەکانی دەدەن.
(اَلقَسامِيّ): ١-ناوکۆیی دوو شت ٢-کەسێکە کە جلەکە یەکەم دەق دەشکێنێتەوەو لەسەر ئەو

دهقه جلهكه قهد دهكات.
(اَلقَسّام): باش بهشكهر.
(اَلقَسِم (ج) اَقسِماء): ١-بهش بهركهوت ٢-كهرتی شته بهشكراوهكه ٣-بهشكراو ٤-بهشكهر ٥-جوانو قهشهنگ.
(اَلقَسيمَة (ج) قَسائِم): مێی وشهی (اَلقَسيم) ٢-رووی جوان.
(الأقسومَة (ج) اَقاسِم): ١-بهش/ بهركهوت ٢-بۆ براوهو شانسی ههركهسێك ٣-بهشگه ٤-بهشكهرهكه ٥-نوێنهری میر كه تالآنییهكه بهشدهكات.
(اَلمُقَسَّم): جوانو قهشهنگ.
(رَجُلٌ مُقَسَّمُ الوَجْه): پیاوێكی دهموچاو قهڵهمرێكو جوان وهكو ههر شوێنهی بهشی رووی جوان وهكو ههر بهشێكی دهموچاوی بهشی خۆی جوانی وهرگرتبێت.
(شيءٌ مُقَسَّم): شتێكی چاكو جوانكراو.
٢-(قَسَمَ فُلانٌ أمرَهُ قَسْماً): كارهكهی تاوتوێكردو له چۆنیهتی ئهنجامدانی كۆڵییهوه.
(تَقَسَّمَ- فُلانٌ): بیریكردهوهو بهراوردی ئهنجامدانی دوو كاریكرد.
(إستَقْسَمَ): بیریكردهوهو بهراوردی ئهنجامدانی دوو كاریكرد.
(اَلقَسْم): ١-را ٢-گومان ٣-شتێك بێته دڵتهوهو وا بزانێت وایه پاشان ئهو بۆچوونهت له دڵدا چهسپبێتو ببێته بروا.

(اَلمُقَسَّم) (مفع): مهرافكردوو/ مهراقاویی.
٣-(قاسَمَ- هُ على كذا): لهسهر ئهوه پهیمانی لهگهڵدا بهست.
(اَقسَمَ- باللهِ): سوێندی بهخودا خوارد.
(تَقاسَمَ- القَومُ): خوێشگهل لهگهڵ یهكدا پهیمانیانبهست.
(إستَقْسَمَ- هُ باللهِ): سوێندی به خودا پێخوارد/ بهخودا سوێندیدا.
(القَسَم (ج) اَقسام): به خودا یان به هیتر سوێندخواردن.
(اَلقَسامَة): ١-كۆمهڵێك بۆ شتێك سوێند دهخۆنو پهیرهوی دهكهن ٢-سوێند به خودا خواردن پهیمانێكه كه خاوهن خوێنهكه دهیدهن.
(«حَكَمَ القاضي بِالقَسامَة»): دادوهر بریاری بهسهر خاوهن خوێنهكهدا كه سوێند به خودا بخۆنو پهیمانبدهن ٣-ئاگربهست/ شهر راگرتن.
(اَلتَّقْسيم (ج) تقاسيم عَلَى المَجْنون عِنْدَ النَّصارى): دوعاو سڵاواتێكه كه قهشه بهسهر شێتهكهدا دهیخوێنێتو دهیڵێت بۆ دهركردنی شهیتان له شێتهكه.
(اَلمُقسَم): القَسَم: سوێند.
٤-(القَسْم): ١-رهوشت ٢-خوو/ نهریت ٣-بارانو ئاو.
(اَلقَسِم والقَسَمَةُ (ج) قَسَمات والقَسِمَةُ (ج)

قِسمات): سەبەتولکەیەکی بەرگ تێگیراوە عەتار بۆنی تێدا دادەنێت.
(اَلقَسام): ئەوپەڕی تینی گەرما.
(اَلقَسیمَة (ج) قَسائِم): ١-سەبەتولکە بەرگتێگیراوەکەی عەتار ٢-بازاڕ.
قسن: (اَقْسَنَ- الرَجُلُ): پیاوەکە دەستی لە کاردا ڕەقبوو/ پیرەڵۆکبوو/ زبر بوو.
(اِقسَأَنَّ اِقسئناناً و قَسأَنینةً): چیلکەکە/ دارەکە وشك و ڕەقبوو.
(اِقسَأَنَّ الرجُلُ): پیاوەکە پیرو وشکەڵات.
(-فِي العَمَلِ): سەرومڕ کاریکرد.
(-اللیلُ): شەو تەواو تاریکبوو.
(اَلمُقسَئِنُّ): کەسێکە دوادوای گەنجێتیی و سەرەتای بەتەمەنبوونیبێت.
قسو: ١-(قَسا. قَسْواً وقَسْوَةً وقَساوَةً وقَساءَةً): پتەو/ توندوتۆڵ و نەستوور بوو.
(قاس (ج) قُساة): ١-پتەوو نەستوور بوو ٢-دڵڕەقبوو.
(قَسَا- اللّیلُ): شەو تەواو تاریکبوو/ بوو بە شەوەزەنگ.
(قَسّی وأقسَی- الشيءَز تَقسِیَةً وإقساءً): شتەکەی سەختکرد.
(قاسی- الأَلَمَ مُقاساةً): ئازاری چیشت و خۆی لەبەردا ڕاگرت.
(أَرضٌ قاسِیَة): زەوییەکی ڕەقەن کە هیچ نەڕوێنێت.

(لیلَةٌ قاسِیَة): شەوەزەنگ/ شەوی زۆر تاریك و نەموستەچاو.
(اَلقَسِيّ (ج) قِسیان): ١-سەخت/ ڕەق ٢-دڵڕەق/ بێبەزەیی.
(عَشِیَّةٌ قَسِیَّة): سەر لە ئێوارێیەکی زۆر سارد.
(«یَومٌ أَو عامٌ قَسِيٌّ»): ڕۆژێکی یان ساڵێکی ساردی تووش و سەخت، یان گەرمی سەخت یان ساڵێکی تووشی بێبەرهەم و باران و گرانیی.
(«سِرنا سَیراً قَسِیّاً»): ڕۆیشتنێکی/ پڕ ماندوویتیمانکرد/ تیژ/ گورج ڕۆیشتن.
(«هُوَ أَقسی مِنَ الصَّخر»): ١-ئەو لەبەرد ڕەقترە ٢- دڵی لەبەرد ڕەقترە.
(اَلمَقساة): ئەوەی کە شت ڕەقدەکات، کە دڵ ڕەقدەکات.
(«الذَّنْبُ مَقساةٌ لِلقَلْبِ»): گوناە دڵ ڕەقدەکات و بەزەیی لە دەرووندا ناهێڵێت.
٢-(قَسا- الدرهَمُ. قَسْواً وقَسْوَةً وقَساوَةً وقَساوَةً): پارەکە/ دراوەکە قەڵببوو/ نەچوو/ ساختە بوو.
(قَسِيّ): پارەی قەڵب/ ساختە.
(اَلقَسِيّ- مِنَ الدَّراهِم (ج) قِسیان): پارەی قەڵب/ ساختە/ نەچوو.
قش: ١-(قَشَّ قُشُوشاً): هات بە خۆیدا پاش بێهێزو پککەوتەیی/ چاکبووەوە.
(-فُلانٌ): وەك بێهێزێك بەرێدا ڕۆیشت.

(-مِـنَ مَرَضِـهِ): لـه نەخۆشـییەکەی (چاکبووەوە/ هەستایەوە).
(اَقَشَّ- مِنَ المَرَض): چاکبووەوە.
(اَلقِشَّةُ): پارچە خورییەکی قەتراناوی پاش بەکارهێنان فرێدراو.
(قَشَّ- النَّباتُ قَشّاً): گیاکە وشکبوو.
(-الثَوبُ الرطب وغَيرُهُ) (عند العامة): جلە تەڕەکـە یان شـتێتر کزر بـووەوەو خەریکی وشکەوەبوون بوو.
(قَشَـش الكُرسِـيَّ عِنـدَ المُحَنِّـين): لای تازەگەرییەکان پووشی خستە ناو کورسییەکەوە.
(اَقَـشَ-تِ الأَرضُ): گیـای بەشـی زۆری زەوییەکە وشکبوو.
(اَلقَشّ): ١-پووش/ لاسکی وشکەوەبووی گیاو رووەکیتر.
(اَلقَشَّـةُ): پووشـێك/ پەلاشـێك ٢-چیلکەو چێـوال‌و تویکڵـی قامیـش‌و حەیـزەران کە کورسی پێ دەنێاخنن.
(اَلمَقَشَّـةُ): شووشـەی پووشـبەندکراو بۆ ئەوەی نەشکێت/ پووش تێگیراو.
٣-(قَشَّ- الشيءَ. قَشّاً): شتەکەی کۆکردەوە.
(-فُـلان): چڵێسـیکردو لەهـەر لایـەك شـتێکیخوارد ٢-تـۆزە خێـری ئـەم‌و ئەوی خوارد.
(قَشَـتِ المَرأَةُ الـدارَ) (عامیـة): ژنەکە بە گەسك ماڵەکەی گەسکدا.

(«قَشَّـتِ الفَتاةَ الطاقَ علـى وجهِ القِدرِ»): کچەکـە سـەرکەی مەنجەڵەکەیگـرت تـا هەڵنەچێت (عامیە).
قَشَّش: لە هەر شوێنە شتێکیخوارد/ مڵۆموشی خواردنیکرد.
(-الأَرضَ) (ز): دڕکـی زەویەکـەی ڕاماڵـی/ پاکیکردەوە.
(تَقَشَّـش واقتَـشَّ- مـا وَجَـدَ): هەرچی دەستکەوت ماشییەوەو خواردی.
(اَلقَش) (مـص): ١-خۆڵ‌و خاشـاکی ناو ماڵ کە گەسکدەدرێت ٢-دۆلکەی گەورە ٣-خورمای خراپ.
(اَلقُشَـاش والقُشاشی والقَشیش): ئەوەی کە لەملاولا دەدۆزرێتەوە لەناو خۆڵ‌و خاشـاکی فرێدراو یان گوڵی گەنـم‌و جۆی وەریوی ناو پەرێز.
(اَلقَشَّـاش): ١-کۆکەرەوەی شـتی نـاو خۆڵ‌و خاشـاك‌و ئەمـلاولا ٢-کەسـێکە خواردنـی دۆزراوەو خراپی ئەملاولا دەخوات.
(اَلقَشـاش والقَشّـان والقَشَّوش): کەسێکە کـە خواردنـی دۆزراوەو خراپـی ئەمـلاولا دەچنێتەوەو دەیخوات.
(اَلمِقَشَّة= المِكنَسَة): گەسك.
٤-(قَشَّ- الشـيءَ قَشّـاً): بەدەست شتەکەی کراندو پاکبووەوە.
(اَلقشیش): خشەخشی پێستی مار کە لایەکی بەر لایەکیتری دەکەوێت.

٥-(قَشَّ وأَقَشَ- القَومُ. قَشّـاً): خوێشـگەل دەرپەڕینو خێرایانکرد.

(إِنْقَـشَ- القَـومُ): خوێشـگەل دەرپەڕینو ڕەویانکـرد پـەرەوازە بـوون/ پـەرش و بڵاوبوونەوە.

٦-(قَشَّشَ- ه بِكَلامِهِ): قسەی سووکی پێوتو ئازاری بە دڵی گەیاند.

٧-)اَلقِشَّـةُ) (ح): دایکە مەیمون یان بەچکە مێینەکەی.

(اَلقِشَّـةُ) (ج): ١-مێرووییەکـە وەك قالۆنچە ٢-کچۆڵەیەکی لەشبچووك/ وردیلە.

٨-(قَشـقَشَ-هُ مِـنَ الجَـرَبِ أَو الجُـدَرِيِّ فَتَقَشـقَشَ): لە گەرِو ئاوڵە چاکیکردەوەو چاکبووەوە.

(اَلقَشْقَشَـةُ) (مص): چزەچزی گۆشتی سەر ئاگر.

قشب: ١-(قَشَبَ- فُلاناً السُمَّ. قَشْباً): فیساری ژەهرخوار کرد.

(-هُ الدُخانُ): دووکەڵ لووتیگرت.

(«قَشَـبَنِي رِيحُهُ»): بۆنەکەی کاسـیکردمو ئازاریدامێ.

(-هُ المالُ): داراو سامان تێکیدا.

(-الشيءَ): شتەکەی گەنکرد/ خراپکرد.

(-لَهُ): ژەهری دەرخوارددا.

(-الطَّعـامَ بِالسُـمِّ): ژەهـری تێکـەڵ بـە خواردنەکە کرد/ خواردنەکەی ژەهراوی کرد.

(-تِ الرِيحُ فُلاناً): باکە فیسـاری کاسـکردو ئازاریدا وەك ژەهرخواردیکردبێت.

(اَلقِشْب (ج) أَقْشاب): ژەهر/ زەهر.

(اَلقَشَب (ج) أَقْشاب): ژەهر.

(اَلمُقَشَّب): ١-ناپوختە.

(حَسـبٌ مُقَشَّـبٌ ورَجُلٌ مُقَشَّـبُ الحَسَبِ): ڕەسەنێکی ناتەواو پیاوێکی ڕەسەن ناپوختە/ نارەسەن.

٢-(قَشَـبَ- السَّـيفَ قَشْباً): شمشـێرەکەی لووس و سافکرد.

(قَشُـبَ- الشـيءُ. قَشـابَةً): شـتەکە تازەو بریقەدار بوو.

(تَقَشَّبَ- السَّيفُ): شمشـێرەکە (ژەنگگرتی/ ژەنگاویبوو).

(اَلقِشب (ج) أَقشاب): ژەنگی سەر ئاسن.

(اَلقَشِب) (ضد): ١-تازە ٢-کۆن.

(سَـيفُ قَشِبٌ) (ضد): ١-شمشـێرێکی سافو بریقەدار ٢-شمشێرێکی ژەنگاوی.

(اَلقَشـيب (ج) قُشُب وقُشْب): ١-نوێ/ تازە ٢-پاك/ پوخت ٣-سپی.

(سَـيفٌ قَشـيب) (ضـد): ١-شمشـێرێکی لووس و سـافکراو/ بریقەدار کراو ٢-شیرێکی/ شمشێرێکی (ژەنگگرتوو/ ژەنگاوی).

(اَلقُشْبانِيَّة): بەرگێکی دڕاوو کۆن.

٣-(قَشَبَ- عَلَيهِ: قَشْباً): بوختانی (بۆ کرد/ بۆ هەڵبەست).

(-الرَجُـلَ): تيروتوانجـى گرتــه پياوەكــه/ خەوشــى لێگرتو دەرهێنا ٢-قسەی ناشیرینی پێوتو نازاریدا.
(-الرَجُلُ): پیاوەكە شایســتەی ســوپاس یان سەرزەنشتبوو.
(-فُلاناً بِسُــوءٍ): خراپەیەكی دایە پاڵو پێی لەكەدار كرد.
(-هُ بِشَــرٍّ): توانجــی خراپەیەكی تێگرت كە پێی ناسرابوو.
(قَشَّبَ- الشيءَ): شتەكەی پیسو گڵاو كرد.
(-فُلاناً بسوءٍ): لەكەداری شتێكی خراپیكرد.
قَشُــبَ وتَقَشَّــبَ- ت يَدُهُ أو شَــفَتُهُ) (طب) (سريانية): دەستی یان لچو لێوی قڵیشاو زبر بوو (بە هۆی سەرماو ساردییەوە).
(إِقْتَشَبَ): سوپاسو ستایشباربوو یان بەدناوو ناوزڕاو بوو.
(إِسْتَقْشَبَ- هُ): بە پیسو گڵاویدانا.
(اَلقاشِــب) (فا): دەروونزم ٢-كەسێكە خۆی كەموكووڕیــی هەبێــتو خەوش لــە خەڵك دەربهێنێت كە خۆی نەوەی هەبێت.
(اَلقَشْب): قێزەون/ بێزلێكراو.
(اَلقِشب (ج) أَقْشاب): دەروون.
(-مِنَ الطَعــامِ): خواردنێك كە خراپ بێتو قێزەونبێتو فرێبدرێت.
(«رَجُلٌ قِشبٌ خِشبٌ»): پیاوێكی بێفەڕ.
(اَلقَشَــب) (طــب): قڵیشــانو زبربــوونو كاڕهەڵدانی دەستو لچو لێو بە بای زۆر سارد هەروەهــا هەویریش بە بای ســاردو ســاردی دەقڵیشێت.
(اَلقِشــبَةُ): ١-شــتی بێفەڕ ٢-پیاوی پوشــتو ڕسوا/ نزمو بێكەڵك.
٤-(القِشــب (ج) أَقشــاب): وشــكی سەخت/ ڕەق.
٥-(قَشَبَر) (عامية): چیلكەو چێواڵو پوشو پەڵاشی كۆكردەوە.
قشد: (قَشَــدَ-هُ قَشْــداً): توێژەكەی لەسەر لادا/ لێیگرت.
(اَلقِشدَةُ): ١-سەرتوێژ كە چەورییەكی تەنكە ٢-(ن) گیایەكە شیر زۆر دەكات.
(اَلقِشدَة والقُشــادَة): خڵتەی ڕۆن كە لە بنی تیانەكەدا دەبێت كاتی خۆشكردنی.
قشــر: ١-(قَشَرَ وقَشَّرَ-هُ قَشْــراً): پاكیكرد/ توێكڵكــەی (لێكردەوە/ لێگرت). پێســتەكەی لێكردەوە.
(تَقَشَّــرَ وانقَشَــرَ): پاككرا/ توێكڵی گیرا یان پێستەكەی لێكرایەوە.
(إِقْتَشَــرَ الرَجُــلُ): ڕووتەوەبوو/ جلی بەری خۆی داكەند.
(مُقْتَشِرٌ): ڕووتو قووت.
(اَلقاشِــرَةُ): ١-مێــی وشــەی (اَلقاشِــر): پێستداماڵ/ توێكڵگرەوە ٢-یەكەمین برین كە پێســت دادەماڵێت ٣-ئافرەتی دەموچاوهەڵگر

بۆ ئەوەی جوان بنوێنێت.

(اَلقاشُور القاشُـــورَة مِنَ الأَعوام): ساڵانێکی بێبـــاران/ وشکەســـاڵ کـــە هەمـــوو شـــتێك وشکدەکاتەوەو خەڵك پەرێشاندەکات.

(سَـنَةٌ قاشُـورَةٌ وقاشُورٌ): ســـاڵێکی وشك‌و بێبەرو بێدەرامەت‌و گرانی.

(اَلقِشر (ج) قشور): ١-توێژ، توێکڵ بەرگ‌و پێـــست کە هەمیشەیی‌و سروشتی بێت یان بۆ ماوەیەك، کاژی مار ٢-بەرگی تێگیراو ٣-توێکڵی قەدو پەڵی درەخت کە دارەکەی دادەپۆشێت. توێکڵـــی هەندێـــك درەخت یـــان دەوەن وەك (بەروی فلـــین) هەندێـــك مـــادەی بەکەڵکی تێدایە.

(اَلقِشـــر والقُشْـــر) (ح): جۆرە ماســـییەکە هێندەی بستێك دەبێت.

(اَلقُشران): هەردوو باڵی کوللە.

(اَلقِشر والقَشیر): توێکڵ زۆر.

(تَمْرٌ قَشِـــر وقَشـــیر): خورمایەکـــی توێکڵ ئەستوور.

(اَلقُشْرةُ والقَشَـــرَةُ والقُشُرَةُ): بارانێك ڕووی زەوی بکرێنێت‌و گڵەکەی بەرێت.

(اَلقِشْـــرَةُ): توێکڵ بە تایبەتـــی وەك توێکڵی هێلکە.

(اَلقُشار): کاژی مار.

(اَلقُشـــارَةُ): ئـــەو (توێکڵـــە/ توێـــژە)ی کـــە لێکرابێتەوە.

(اَلقَشَـــر): ١-توێکڵگـــیراوە/ شـــتی پاککـــراو ٢-کەسێك‌گەرماتوێژی‌لووتی‌هەڵسێنێت/ ببات ٣-کەسێك پێستی زۆر سوور بێت وەك توێژی فرێدابێت ٤-بەڵەك.

(اَلأَقشَـــر- مِنَ الأَرض): زەوییـــەك پەڵەپەڵە بێت.

(شَـــجَرَةٌ قَشْـــراء): درەختێکـــە هەندێـــك شـــوێنی توێکڵی لێکرابێتەوەو شوێنەکانیتری لێنەکرابێتەوە.

(حَیَّةٌ قَشراء): مارێك کاژی فرێدابێت.

(اَلقَشُور): دەرمانێکە بۆ دەموچاو هەڵگرتن‌و لووسکردنی.

(اَلمُقَشَّر) (مفع): ڕووت‌و بێتوێکڵ.

(«جـــاء بِالجَوابِ المُقَشَّـــر»): وەڵامی ڕوون‌و ئاشکرای دایەوە.

(«رَجُلٌ مُقَشَّـــر»): پیاوێکی ڕووت‌و قووت/ هیچی لەبەردا نەبێت.

المُقَشُورَة: چێشتی گەنمە کوتاو/ گەنمەکەیە توێکڵی لێکراوەتەوەو دەکرێت بە چێشت.

(اَلقِشْـــرِیّات) (ح): توێکڵـــدارەکان کۆمەڵـــە گیاندارێکی جومگەدارن لەشیان بە توێکڵێکی ڕەق داپۆشراوە هەموویان یان زۆربەیان ئاوین لەوانە هەیانە فرە قاچن یان سەدەقدارن وەکو قرژاڵ‌و کوللەی دەریاو ڕوبیان کە هەندێکیان دەخورێن.

٢-(قَشَرَ وقَشَّرَ- القَومَ. قَشراً): بۆ خوێشگەل

بەدوومبوو و نەهامەتی بەسەرهێنان.

(أَلْقاشُور): بەدووم/ سەر بە نەهامەتی.

(اَلْقُشْرَةُ):بەدووم/ سەر بە نەهامەت.

٣-(أَلْقاشِـر والقاشـور مِنَ الخَيل): ئەسپی دواكەوتووی پێشبڕكێكە.

(اَلأَقْشَر):كەسێكی فرە پرسیار.

(اَلِمقْشَر): هەتەر لەسەر پرسیاركردن.

الملحق:

قشـر: (اَلِمقْشَـرَة (ج) مَقاشِـر): توێژگرە/ توێكڵگـرە: ئامێرێكـە توێكڵی بەرو شـتیتر دەگرێت وەك توێكڵی خەیارو پەتاتە.

---

قشط: ١-(قَشَطَ- هُ قَشْطاً): بەدار لێیدا.

٢-(قَشَـطَ- عَنهُ كذا): ئەوەی لەسەر لابردو دەریخست.

(قَشَطَ-الشـيءُ) (عامية): شـتەكە لە جێی خۆی ترازا.

(«قَشَـط الخاتِمُ مِن الخُنصُـرِ») (عامية): ئەموستیلەكە لە پەنجە تووتەكە هاتەدەریو كەوت.

(-قَشَّطَ-هُ الشـيءَ): بە زۆر شتەكەی لەژێر چنگ دەرهێناو داگیریكرد.

(مُقَشِّط) (عامية):٤-(اع):فیشەكدان٥-قایشی مەكینە كـە مەكینەی پێ دەسـوڕێنرێتەوە كـە لە نێوان بزوێنو تـەوەرەی مەكینەكەدا دەبێت.

(قَشَطَت السَماءُ) ئاسمان ڕوونبووەوە. بووبە سایەقە. هەوری پێوە نەما.

(القشـطة) (عاميـة): سـەرتوێژ، كـە چەورییەكی تەنكە بەسەر شیرو ماستەوەیە.

(القِشاط): ١-داماڵـین. چاككردن ٢-چەرمێكی باریكـە لایەكـی تەنگـەی ئەسـپی بەلاكەی تریەوە پێدەبەسترێتەوە ٣-پارچەیەك چەرم یان قوماش (دەكرێت بە پشـتوێن) (عامیە) ٤-فیشـەكدان ٥-قایشـی پانكـەی بزوێنەر بۆ گواستنەوەی جوڵە لە بزوێنەرەكەوە بۆ بەشە پێویستەكان.

(اَلقَشّاط): زەوتكەر/ ڕووتكەرەوە/ چەتە.

(اَلِمقْشَـط (ج) مَقاشِـط): توێكڵگـرەوە یان مەكینەی تەراش یان چەقۆی پێستداماڵین.

(اَلِمقْشَـطَة- عِنـدَ العَقّادیـن): شـانەی پاككردنەوەی تاڵی ئاوریشـم لـەوەی تێكەڵی بووە لای گوڵێنكەسازەكان.

قشع: ١-(قَشَـعَ- القَومَ قَشـعاً): خوێشكەڵی پەرەوازە كرد،/ پەرش‌و بڵاوكردەوە.

(-تِ الريحُ السَّحابَ): باكە هەورەكەی ڕاماڵی/ پەرش‌و بڵاویكردەوە.

(اَقْشَـعَ- القَـومُ): خوێشـكەل پـەرش‌و بڵاوبوونەوە.

(-القَومُ عَنِ الماءِ أَوِ المَكان): خوێشكەل ئاوەكە یان شوێنەكەیان بەجێهێشت/ وازیان لێهێنا.

(-الريحُ السـحابَ): باكە هەورەكەی پەرش‌و بڵاوكردەوە/ ڕاماڵی.

(-السحابُ): هەورەکە نەماو بوو بە سایەقە.
(قَشَعَ) (عامية): دی/ بینی.
(تَقَشَّعَ- القَومُ): خوێشگەل پەرش‌و بڵاوبوونەوە.
(-السَّحابُ): هەورەکە نەماو سایەقەیکرد.
(إنقَشَعَ- القَومُ عَن أماكِنِهِم): خوێشگەل کۆچیانکردو لە شوێنەکەیان دوورکەوتنەوە.
(-السَحابُ): هەورەکە نەماو سایەقەیکرد.
(-اللَّيلُ): شەو تێپەری.
(-الهَمُّ عَنِ القَلْبِ): مەراقەکە لە دڵ ڕەوییەوە.
(اَلقَشْع): ١-هەوری ڕەوییەوە نەماو/ ڕۆیشتوو.
(- (ج) قِشَع): پیاوی لاواز بووی گۆشت داکەوتوو بە هۆی پیرییەوە ٢-قوری وشکەوەبوو کە شەقیبردبێت.
(اَلقَشع والقُشع): پیسی ناو گەرماو.
اَلقِشع: ١-هەوری ڕەوان ٢-پیسی ناو گەرماو.
(اَلقَشعَة (ج) قِشاع): جارێک پەرش‌و بڵاوبوونەوە ٢-ڕەوینەوەی هەور ٣-پارچە قورێکی وشکەوەبووی زەوییەکی وشکەوە بوو ٤-بای باکوور ٥-پیرێکی لاواز بوو بە هۆی تەمەنییەوە.
(اَلقَشعَة والقِشعَة (ج) قِشَع): کەواڵە هەورێک کە پاش ڕەوینەوەی هەورەکان ئەو بمێنێتەوە.
(اَلقُشاعَة): بەڵغەمو چڵم کە فرێدەدرێت.

(اَلقَشيع- مِنَ الكلإ): پەڵە پەڵەی گیا.
٢-(قَشِعَ- الشيءُ. قَشْعاً): شتەکە وشکبووەوە.
(اَلقَشْع (ج) قُشوع): فەروەیەکی دڕاو ٢-دەوارێك کە لە پێستکرابێت.
(اَلقَشْع (ج) قِشَع): ١-پێستی وشکەوەبوو ٢-زەمیلە/ سەبەتە ٣-مەشکەی کۆنە.
(اَلقَشِع): ١-وشك/ وشکەوەبوو.
(اَلقَشْعَة (ج) قِشاع): پارچە فەروەیەکی دڕاو.
(اَلقَشْعَة والقِشْعَة (ج) قِشَع): پارچە پێستێکی وشکەڵاتوو.
(اَلقِشاع): ١-پارچەیەکی کۆن ٢-پارچە پەلاسێك.
(«ماعَلَيه قِشاعٌ): پەلاسە شرێکیشی پێوە نییە/ رووتە.
٣-(اَلقَشْع (ج) قُشُوع): ١-گەوج ٢-پەری وشترمرخ.
(اَلقَشع (ج) قِشَع) (ح): نێرە کەمتیار.
(اَلقَشِع): پیاوی حولحولی کە لەسەر شتێك ئۆقرە ناگرێت.
(أراكَةٌ قَشِعَة): داری سیواکی بەبەکداچووی پڕ گەڵا.
(شاةٌ قَشِعَة): مەرێکی لاواز.
(اَلقُشاع): دەنگی مێکەمتیار.
(«هو أقْشَعُ مِنهُ»): ئەو لەو خانەدانترە.
٤-(اِقْشَعَرَّ- جِلدُهُ): ١- پێستی کرژ بوو/

هەڵلەرزی ٢-کرژ بـــوو ٣-چووەیەك‌و زبر بوو ٤-ڕەنگی (پەڕی/ گۆڕا).

(مُقْشَعِرٌّ (ج) مُقْشَعِرُّون وقَشاعِر): ١-پێست کرژبوو ٢-ڕەنگ هەڵبزرکاو.

(إِقْشَعَرَّ- الشَعَرُ): لە ترساندا یا لە سەرماندا تووکی سەری (ڕەپبوو/ ڕاستبووەوە).

(-تِ الأَرضُ): زەویەکە لە بێبارانی‌و وشـــکی چووەیەك‌و ڕەق هەڵگەڕا.

(-ت السَنَةُ): ساڵەکە بێباران‌و سەختبوو.

(اَلقُشاعِر): زبر.

(اَلقُشَعْرِیرَة): مووچڕك‌و هەڵلەرزین.

(اَلمُتَقَشعِر= المُقْشَعِرّ): ١-مووچڕك پێداهاتوو/ لەرزیو ٢-زبر بوو ٣-کرژ بوو.

٥-(اَلقَشْعَم (ح) قَشاعِم وقَشاعِیم): ١-ژن یان پیاو یان داڵی پیر. ٢-هەموو شتێکی تەمەنداری قەبەو زلە ٣-شێر.

(اُم قَشْــعَم): جەنگ/ شــەڕ ٢-لێقەومان‌و چورتوم ٣-(ح)کەمتیار ٤-مەرگ/ مردن.

(اَلقِشْــعام القَشْعَمان والقُشْعُمان): ١-(ح) داڵە نێری زلە ٢-پیاوو داڵ‌و سیســارکە کەچەڵەی بەتەمەن.

(اَلقشعامَة): داو/ تەڵە.

(اَلقُشْــعُوم): ١-لەش بچووك، جووچکە لەش/ وردیلە ٢-گەنە.

قشــف: (قَشِــفَ وقَشُقَ قَشْــفاً وقَشــافَةً): ١-گوزەرانەکەی شــڕ بوو ڕەجــاڵ/ بێبەرگ‌و نەدارا بوو ٢-پیس‌و چەپەڵبوو.

(قَشْــفٌ وقَشِــفٌ وقَشَــفٌ): نەداراو ڕەجاڵ‌و گوزەران پەڕپووت‌و چەپەڵ.

(«قَشَّــفَ اللهُ عَیشَــهُ»): خـــودا گوزەرانـــی هەڵپێچاو ڕەجاڵ‌و پۆخڵیکرد.

(تَقَشّــفَ): ١-(گوزەرانبەد بوو دەســـتتەنگ‌و پۆخلچبوو ٢-دەستکورت‌و گوزەرانپەڕپووتبوو ٣-دەستیگرتەوە.

(-فِي لِباسِــهِ): ڕەجــاڵ‌و بەرگپینەپینـــەو چڵکنبوو.

(عامٌ اَقْشَف): ساڵێکی نەهات‌و بێدەرامەت.

الملحق:

قشف: (اَلتَّقَشُّف): شـــێوە گوزەران‌و ژیانێکی سادە بە دەستگرتنەوەو پەڕپووتیی ڕابواردن‌و لەخۆگرتنەوە.

(«عاش عیشَـــةَ تَقَشُّـــف»): ژیانێـــك ژیا بە دەستگرتنەوەو لەخۆگرتنەوەو سادەیی ژیان.

(اَلتَّقَشُّف): دوورلەنازو خۆشیی‌و ڕابواردنی جیهان/ وشکژیان.

(«تَقَشُّف الصوفي»): وشکە ژیانی سۆفیانەو دوور لە خۆشی‌و چێژی دنیا.

(اَلتَّقَشُّــف اِقْتِصادِیّاً): لە ڕووی ئابوورییەوە دەســـتگرتنەوەیەو داکەوتنـــە بە پێویســـتیە سەرەکییەکانی ژیان.

(«سیاسة التقشف»): ڕامیاریی دەستگرتنەوەو خۆگوشـــین، کە ئامانجەکەی لە بەختکردن‌و

دەســتگرتنەوەو سنوردانانی شــێوەو ڕێگەی گوزەراندا دەبێت.

قشل: (اَلقِشْلَة): قشــڵە/ لەشکرگە (نیتالییە دەڵێــن لــە وشــەی (قشــلاق)ی تورکییەوە وەرگــیراوە کــە واتــای (زســتانە هــەوار) دەگەیەنێت.

قشم:١-(قَشَمَ-الطَّعامَ.قَشماً):١-خواردنەکەی زۆر خوارد ٢- باشی خواردنەکەیخوارد.

(إقْتَشَمَ-هُ): لەملاولای چێشتەکەیخوارد.

(اَلقَشْــم (ج) قُشُوم): گۆشــتی پێگەیشتووی سوورەوەکراو.

(اَلقِشْــم (ج) قُشــوم):١-گۆشــتی کــوڵاوی سوورەوەکراو ٢-بەز.

(اَلقُشــام والقُشــامَةُ): بەرمــاوەی خواردنی سەرمێز/ سەرسفرە کە بێکەڵکە.

(اَلقَشيم (ج) قُشْم): بەرە وشکەی تەڕە وەك هی پاقلەو ماشە سپی.

(اَلمَقْشَــم): شــوێنو پەرێزی کشــتوکاڵ پاش دروونەوەو هەڵگرتنی.

(«ما أصابَتِ الإبلُ مَقْشَــماً»): حوشــترەکان پەرێزێکیان نەدی لێی بلەوەڕێن.

٢-(قَشَــمَ- الرَجُلُ في بَيتِهِ قَشْماً): پیاوەکە خوێکرد بە خانووەکەیدا.

(اَلقَشْــم والقِشْــم (ج) قُشُــوم): جۆگــە/ جۆگەلەی ناو.

٣-(اَلقِشــم (ج) قُشــوم):١-سروشت ٢-لەش/ تەن/ جەستە ٣-بارو شــێوە ٤-نەژاد/ ڕەسەن، ڕەچەڵەك، ڕیشە، بنەڕەت.

(اَلقَشيم): مردن.

٤-اَلقَشْــمَر:١-کورتەبنە ٢-ئەســتورێکی لەش نیشتووی سەریەك.

قشو: ١-(قَشا. يَقْشو وقَشّــي العُودَ. قَشواً): چیلکەکــەی پاککــرد/ توێکڵــی چیلکەکــەی (گرت/ لێکردەوە).

(-الوَجْهَ): دەموچاوەکەی سری.

(قَشّاهُ عَن حاجَتِهِ): دەستی بە ڕوویەوە ناو پێداویستیەکەی نەدایە.

(تَقَشّي- الشيءُ): شتەکە پاککرا/ توێکڵی گیرا.

(اَلقَشْوان- مِنَ الرجال (م) قَشْوانَة): پیاوی/ یان ژنی بوودەڵەو لاواز.

(اَلمَقْشوّ والمُقَشّي): توێکڵگیراو/ پاککراو.

٢-(اَقشى. إقْشاءً): هەژار کەوت کە لەوەپێش (دارا/ دەوڵەمەند/ بووە) بوو.

٣-(القاشي): فلسێکی قەڵب.

(اَلقُشاء): بەڵغەمو تف.

(اَلقَشْوَةُ (ج) قِشاء وقَشَوات): سەبەتۆلکەیەك کــە لە گەڵای دارخورمــا دەچنرێت ژن بۆنو شتی پێویستی خۆی تێدا دادەنێت.

(اَلقَشيّ- مِنَ الدَّراهِم): پارەی قەڵب.

قــص: ١-(قَصَّ- الشَــعَرَ ونَحْــوَهُ قَصّاً): لە قژەکــە یــان لــە شــتەکەیبری/ قژەکەی بە قەچیە هەڵپاچی.

(-النَسَّاجُ الثَوبَ): جلجنەکە پرووشی چنراوەکەی (قرتاند/ بڕی).

(-ەُ): کەناری گوێچکەیقرتاند.

(قَصَّ- الشيءَ): شتەکەی پارچەپارچە کرد.

(إنقَصَّ): پارچەپارچە بوو. یان لێیقرتا.

(ألقاص): کەسێکە پیشەی بڕینەوەی تووکی حوشترو ئاژەڵیترە.

(ألقَصّ (ج) قِصاص) (مص): سنگ یا ئێسکی تەختی سنگ.

(ألقَصَص (ج) قِصاص): سنگ یان ئێسقانی سنگ.

(قَصَصُ الشاةِ): ئەو خورییەی لە مەڕ بڕراوەتەوە.

(ألقُصَّةُ (ج) قُصَص وقِصاص): کاکۆل یان پەرچەم کە لەسەر ناوچەوانەو لێیدەبڕرێت.

(ألقُصة (ج) قُصَص وقِصاص): کاکۆڵ یان پەرچەم کە لەسەر ناوچەوانە یان قژی درێژ بە تایبەتی هی ئافرەت کە بەسەر پشتیدا بەریدەداتەوە.

(ألقَصَّةُ (ج) قِصاص): جارێك بڕینی قژ یان شتیتر جارێك هەڵپاچینی تووکی سەر.

(ألقُصاص): شوێندەمی قەیچی لە هەڵپاچینی قژی سەردا.

(قَصاصُ وقُصاصُ وقِصاصُ الشَعَرِ): شوێنی دەرهاتنی قژی سەر لە پێش‌و پاشەوەی سەر.

(ألقَصيص الواحِدة قَصيصَة (ج) قَصائص): شوێنی دەرهاتنی مووی سەرسنگ.

(ألقَصيصَة): دەستەیەکی کۆمەڵبوو لە شوێنێکدا.

(تَرَكْتُهُم قَصيصَةً واحِدَةً): کە جێمهێشتن کۆمەڵێکبوون لە شوێنێکدا کۆبووبوونەوە.

(ألمِقَصّ (ج) مَقاصّ): قەیچی، بڕنی مەقەست.

(ألمُقَصَّص) (مفع): ئەوەی تەوێڵی هەبێت قژی پێشە سەری هەبێت.

مُقَصَّص: سنگپان.

٢-(قَصَّ وأقَصَّ- تِ الشاةُ. قَصّاً): ئاوسیی مەڕەکە دەرکەوت.

(مُقِصّ (ج) مَقاص): مەڕی ئاوسیی دەرکەوتوو.

٣-(قَصَّ- عَلَيهِ الخَبَرَ قَصَصاً): هەواڵەکەی بۆ گێڕایەوە.

(-أثَرَهُ قَصّاً وقَصصاً): شوێنپێی ئەوی هەڵگرت پێبەپێی ئەو ڕۆیشت.

(تَقَصَّصَ- الكَلامَ): قسەکەی لەبەرکرد.

(-أثَرَهُ): شوێنپێی هەڵگرت/ دوایکەوت.

(إقتَصَّ- أثَرَهُ): شوێنپێی هەڵگرت/ دوایکەوت.

(-الحَديثَ): فەرموودەکەی گێڕایەوە.

(ألقاصّ) (فا): ١-گێڕەرەوەی چیرۆك ٢-چیرۆکنووس ٣-وتاربێژ کە لە وتارەکەیدا شت بگێڕێتەوە.

(اَلقِصَّة (ج) قِصَص): چیرۆك.
الأُقْصوصَة. أَقاصيص: ١-چیرۆکۆك ٢-سەربوردە/ سەرگوزشتە/ ڕوودواو/ ڕاز ٣-ڕەوش و بار.
(اَلقَصَّاص): کەسێکە لەناو خەڵکدا بۆ پارە وەرگرتن چیرۆك دەگێڕێتەوە.
(اَلقاص= القَصَصِيّ): چیرۆکنووس.
(اَلقَصیصَة): ١-حوشترێك دوای کاروان کەوتبێت و لە دواوە بێت ٢-چیرۆك.
(اَلمَقَصّ): شوێنپێ/ شوێنکار.
٤-(قَصَّ- المَوتُ. فُلاناً. قَصّاً): مردن/ مەرگ لە فیسار نزیکبووەوە.
(«ضَرَبَهُ حَتَّى قَصَّهُ على المَوتِ»): هێندەی لێدا تا نزیکی مردنی کردەوە.
(قاصَّ- هُ قِصاصاً ومُقاصَّةً): ١-سزایدا ٢-تۆڵەی لێکردەوەو ئەوەی بەرامبەر کرد کە ئەو بەرامبەری کردبووی.
(-الرَجُلَ بِما كانَ لَهُ قَبلَهُ): ئەوەی بەرامبەر کرد کە ئەو بەرامبەری کردبووی/ ئەوەی لێکرت کە ئەو لێیگرتبوو.
(أَقَصَّ- المَوتُ فُلاناً): مردن لە فیسار نزیکبووەوە.
(ضَرَبَهُ حتى أَقَصَّهُ على المَوتِ): هێندەی لێدا تا مەرگ گەیشتە سەری.
(-الأَميرُ فُلاناً مِن فُلانٍ): میر تۆڵەی فیساری لە فیسار کەس کردەوە.
(-الرَجُلَ مِن نَفسِهِ): خۆی خستە بەر تۆڵەی ناحەزەکەی و خۆی بە سزاخواردندا.
(تَقاصَّ- القَومُ): خوێشگەل هەریەکەیان مافی خۆی لەوی‌تر سەندو ژماردەی خۆی لەگەڵ ئەوی‌تردا پاککردەوە.
(إِقْتَصَّ- من فُلان): تۆڵەی خۆی لە فیسار کردەوە.
(إِستَقَصَّ- هُ): داوایلێکرد تۆڵەی لە ناحەزەکەی بۆ بکاتەوەو سزایبدات.
(اَلقِصاص): ١-سزادان لەسەر گوناهێك، خراپەیەك ٢-تۆڵە لێکردنەوە/ چی کردووە وای لێبکرێتەوە.
٥-(اَلقَصَّة (ج) قِصاص): بڕین و قرتاندن و ڕێکخستن.
(اَلقَصاص الواحِدة قَصاصَة (ن): پۆلکە خاتوونە کە هەنگ تێیدەئاڵێن.
(اَلقَصیص الواحِدَةُ قَصیصَة (ج) قَصائِص) (ن): ڕووەکێکە لە بنکی دومەڵاندا دەردێت ڕەنگە لە ئاوەکەی سەری پێبشۆرێت.
(اَلقَصیصَة): چوارپێیەکی ڕیوەڵە کە خواردنی سووکەڵەی لێدەنێن ئەویش لەبەر بێتوانایی.
٦-(قَصقَصَ- الشيءَ): شتەکەی شکاندو پارچەپارچەی کرد.
(-بِالجَرو): کوتکوتی لە تووتکە کرد/ بانگیکرد.

(تَقَصْقَصَ أَثَرَهُ): دوایکەوتو شوێنپێی هەڵگرت.
(-كَلامَهُ): قسەکەی ئەوی هەڵگرتو لەبەریکرد.
(حَيَّةٌ قَصْقاصٌ): مارێکی ژەهرداری کوشندە.
(أَسَدٌ أَو رَجُلٌ قَصْقاصٌ): شێرێك یان پیاوێکی ئەستوورو قەبە یان کورتە بنە.
(حَيَّةٌ قُصاقِصٌ): مارێکی کوشندەو وەزندەدار.
(أَسَدٌ أَو رَجُلٌ قُصاقِصٌ) (ج) قَصاقِص وقُصاقِصات وقُصْقُصٌ وقُصْقُصَةٌ): شێرێك یان پیاوێکی ئەستوور یان کورتەبنە.
(اَلْقَصْقَص): ١-شوێنی لێدەرهاتنی تووکی سەرسنگ ٢-دەنگ.
الملحق:
قصّ: (اَلْمُقاصَّة- في القانون): پاککاریی لە یاسادا/ ڕێگەیەکە بۆ دانەوەی ئەوەی کە پێویستە بدرێتەوە بەیەكو پاك لە پاکبن.
(«مَقاصَّة بَين دَيْنَين»): پاککردنەوەی وام وامکاریی لە نێوان دواندا.
(اَلْمَقاصَّة- في التِّجارَة): پاککردنەوە لە بازرگانیدا ڕێکەوتنی دوو وڵاتە لەسەر کردنەوەی تۆماری ژمێرە لە لایەن هەردووکیانەوە ئەو لایەنەی کەلوپەل دەفرۆشێت لای خۆی تۆماریدەکاتو ئەو لایەنەیش وەریدەگرێت، لای خۆی تۆماریدەکاتو کە بە وام وەریدەگرێت پاش تێپەڕبوونی ماوەی دیاریکراو لە نێوانیاندا وامەکە پاك دەکرێتەوەو پاك لە پاك دەردەچن.
قصب: ١-(قَصَبَ-ـُ. قَصْباً): لەتیکرد، بڕی.
(-الشاةَ): مەڕەکەی سەربڕیو کوتەکوتەیکرد.
(قَصَّبَ- الزَرعُ): کشتەکە لاسکدار بوو.
(-فُلاناً): هەردوو دەستی بە ملیەوە بەستەوە.
(-الشَعَرَ): قژەکەی لوولکرد.
(-البِناءُ الحَجَرَ): (في اصطلاح العامَّة) (ب): بەردەکەی داتاشیو ڕێکیخست.
(-المرأة شَعْرَها): ژنەکە تۆپەڵە قژێکی خۆی بادا بۆ ئەوەی ڕەپ وەك قامیشی لێبێت.
(أَقْصَبَ- المَكانُ): شوێنەکە قامیشی لێپەیدابوو/ بوو بە قامیشەڵان.
(اِقْتَصَبَ- الشَيءَ): شتەکەی پارچەپارچە کرد.
(اَلقاصِب) (فا) (ج) قُصّاب): ١-قەساب/ ئاژەڵسەربڕ/ ئاژەڵکوژ ٢-شمشاڵژەن ٣-هەورە گرمەیەکی بەرز بە برووسکەوە.
(اَلقُصب (ج) أَقصاب): ڕیخۆڵە (ع ا)، پشت.
(اَلقَصَب الواحِدَةُ قَصَبَة): قامیش/ جۆرە ڕوەکێکی ناوبیە جۆرێکی چوار مەتر بەرز دەبێتەوە ئەوە جۆرە گەورەکەیەتی لە

خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا زۆرە جۆرێکیـتری قامیشـی گەسـکە کە لە لێواری زەلکاوەکاندا بلاوە یا لە هی گۆمەکاندا. جۆرێکیتری رەق و ئەستوورە شمشـاڵی لێدروستدەکرێت یان بۆ سـەرگرتنی خانـوو بەکاردێت یـان قەڵەمی لێدروستدەکرێت.

(قَصَبُ السُـكَّر) (ا ن): قامیشی شەکر جۆرە قامیشـێکە لەوانەیە لە پێشدا لە هندستاندا بووبێت و بلاوبووبێتەوە. شەکر لە قەدەکەی دەگیرێت. تا سـەرەتای سـەدەی نۆزدەهەمین تەنیـا رووەکبوو کە شـەکری لێدەربهێنرێت پـاش ئـەوە چەوەنـدەری شـەکر بـوو بە سـەرچاوەیەکیتر بەڵام شـەکری قامیش زۆر لـە برەوترەو رواندنی لە وڵاتـە گەرمەکاندا گرنگییەکی زۆری هەیە لەوانە میسر. خەڵکە رەشـۆکەکە پێیدەڵێـن: («قَصَـبُ المص»): قامیشی مژین.

(القَصَب): ئێسـقانی دەسـت و قـاچ هەموو ئێسکێکی خڕو لاکێشەیی بۆش ٢-(ع ا) هەموو ئێسقانێکی مۆخدار/ مەغزدار (بە لێچواندنی بـە قامیـش) ٣-بۆرییەکانی گەروو شـوێنی هەناسە ٤-ئاوەڕۆی فرمێسـکی چاو ٥-هەموو گەوهەرێکی لاکێشەیی.

(«أَحْـرَزَ قَصَـبَ السَّـبَق»): سـەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئەمە لەوەوە هاتووە: لە کۆڕی پێشبڕکێدا قامیشێکیان دەچەقاند هەر کەسێك لە پێشەوە بگەیشتایەتە سەری و قامیشەکەی هەڵبکێشـایە ئەوە براوەو سـەرکەوتوو بوو ٦-کۆمەڵە دەزوو کە شـریتی زێـڕ یان زیوی پانکراوەی لەسەر هەڵدەپێچرێت.

(القَصَبَة): ١-قامیشـێك ٢-پرچێکی بادراوەی قژ.

(قَصَبَةُ الأُصبُع): ئێسقانی پەنجە.

(قَصَبَةُ المَريء): سوورێنچك/ بۆری خواردن.

(قَصَبَةُ الأَنف): ئێسقانی لووت.

(قَصَبَةُ الرئَة): بۆریی هەناسە.

(أَرضٌ قَصِبَةٌ): قامیشەڵان.

(القِصابَة): پیشـەی قەسابی/ ئاژەڵسەربڕین ٢-تۆپەڵە قژێکی لوولخواردوو.

(القَصَّاب): ١-قەسـاب ٢-بلوێرژەن و نەیژەن/ جوزەلەژەن.

(القُصَّابَـة (ج) قُصَّـاب): ١-تۆپەڵـە قژێکی لوول.

(القَصَّابَـة (ج) قَصَّـاب): ١-مێـی وشـەی (القَصَّاب): ٢-بلوێر/ نەی/ جووزەلە.

(القَصْبـاء الواحِـدَةُ قَصْبـاءَة): ١-کۆمەڵێك قامیش ٢-قامیشەجار/ قامیشەڵان.

(«أَجَمَةَ قَصْباء»): قامیشەڵانێکی چڕ.

(القَصُـوب- مِـنَ الغَنَـم): ئەو مـەڕەی کە خوریەکەی دەبڕرێتەوە.

(القَصيبَة (ج) قَصائِب): ١-لوولە ٢-تۆپەڵەیەك قژی لوول.

(اَلتَقْصِبَة والتَقْصيبَة (ج) تَقاصِب وتَقاصيب): تۆپەڵە قژێکی لوول.

(المَقَصبة): قامیشەجار.

(أَرضٌ مِقْصاب ومَقْصَبَة): قامیشەڵان.

(المُقَصَّب (مفع) — مِنَ الثِّياب): بەرگی چرچتێکراو/ شکاوە/ لوول/ قەدکراو.

(ثِيابٌ مُقَصَّبَة): بەرگێك لە شریتی زێرین یان زیوینی رازێنراوەو تێهەڵکێشکراوە.

(شَعْرٌ مُقَصَّب): قژێکی بە قامیش‌و هەڵپێچ‌و دەزوو هەڵپێچرابێت‌و لوولکرابێت.

(المُقَصِّب) (فا): براوەی پێشبرکێ.

٢-(قَصَبَ- البَعيرُ. قَصْباً وقُصُوباً): حوشترەکە مانی لە ئاوخواردنەوەکە گرت.

(-الإنسانَ وغَيْرَهُ): نەیهێشت مرۆڤ یان شتیتر ئاوەکەی بخواتەوە یان تێر ئاو بێت: لە ئاویکرد.

(أَقْصَبَ- الراعِيَ): حوشترەکانی لە ئاوەکە لایاندا/ نەیانخواردەوە.

(القاصِب والقَصيب- مِنَ الإبل): حوشترگەلێك کە ئاو نەخواتەوەو ئیتر سەرهەڵبڕێت/ دەم لە ئاوخواردن هەڵبگرێت.

(بَعيرٌ قَصيبٌ وناقَةٌ قَصيبٌ): حوشترێکی دەم لە ئاو هەڵگرتوو مێحوشترێکی خۆ لەئاو کردوو.

٣-(قَصَبَ- الرَجُلَ. قَصْباً وقُصُوباً): جنێوی بە پیاوەکە دا.

(قَصَّبَ-هُ): جنێوی پێدا/ پڕجنێویکرد.

(القَصّابَة (ج) قَصّاب): زمانبەدی شەڕنێنەوە.

٤-(القَصَب): ١-دوڕی تازە ٢-زمڕوتی تازەی بە یاقوت رازاوە.

(القَصَبَة): چاڵاوی تازە هەڵکەنراو ٢-شار یان گەورەترین شاری وڵات ٣-دێ یان ناوەڕاستی دێ.

(-في المَساحَة): پانتایی زەوییەك چل گەزو شەشیەکی گەزێك چوارگۆشە بێت.

(القَصَبِيّ): بەرگێکی ناسکی تەنکی کەتان.

(المُقَصَّب): ماستی فرە سەرتوێژ/ شیرێك کەف زۆری بەسەروە بێت.

قصد: ١-(قَصَدَ- الرَجُلَ ولَهُ وإليهِ. قَصْداً): نیازی لای پیاوەکەیکرد/ ڕوویکردە لای/ چوو بۆ لای.

(-إليهِ): پشتی بەو بەست/ متمانەی بەو کرد.

(-قَصْدَه): وەك ئەویکرد/ لاسایی ئەویکردەوە.

(«أَقْصَدَني إليكَ الأَمْرُ»: کارەکە منی بۆ لایتۆ بەکێشکردو ناچاری لای تۆیکردم.

(تَقَصَّدَ-هُ): ڕوویکردە لای ئەو/ نیازی ئەویکرد.

(القاصِد): نوێنەرێکی پاپایە بۆ هاوکڵێسەکانی خۆی دەنێرێت.

(القَصْد) (مص): ١-ڕووتێکردن ٢-نیاز ٣-ئارەزووکردنی لایەك یان لای کەسێك ٤-پشتپێبەستن‌و ڕووتێکردن.

(«هو قَصدُك»): لای ئەوت نیازەو بەرامبەرتە.
(ألقَصادَة الرَسُولِيَّة): ئەو شوێنەیە کە نوێنەری پاپای لێیە.
(ألقَصید): داردەست (چونکە داردەستەکە یارمەدەرەو رێپیشاندەریەتی.
(ألقَصیدَة (ج) قَصید وقَصائِد): داردەست.
ألمَقْصَد (ج) مَقاصِد: شوێنی رووتێکردن و نیازبوون.
(«بابُكَ مَقْصَدي»): رووم لە دەرگاکەی تۆیەو نیازی لای تۆم هەیە.
٢-(قَصَدَ- في مَشیِهِ. قَصْداً): رێك رۆیشت.
(-في الأمرِ): لە کارەکەدا هێمن و مامناوەندیبوو/ توندرەویی نەکرد.
(-في النَفَقَةِ):دەستبلاویی نەکردو دەستیگرتەوە/ مامناوەندیی ژیا.
(إقتَصَدَ- في الأمرِ): لە کارەکەدا مامناوەندی کردو توندرەویی نەکرد.
(-في النَفَقَةِ): مامناوەندیی ژیاو دەستی گرتەوە/ دەستبلاویی نەکرد.
(-في أمرِهِ): کار راست و دروستبوو/ راسترەو بوو.
(ألقاصِدُ (فا) (ج) قَواصِد): نزیك.
(-مِنَ السَفَرِ): گوزاری ئاسان و خۆش.
(طریقٌ قاصِدٌ): رێگایەکی تەخت و رێك.
(ألقاصِدَةُ (ج) قَواصِد): ١-مێی وشەی (ألقاصِد).

(«بینَنا وبَینَ الماءِ لَیلَةٌ قاصِدَةٌ»): نێوان ئێمەو ئاوەکە شەوێك رۆیشتنە نەخێراو نە لەسەرخۆ.
(ألقَصْد) (مص): ١-تەخت و راستیی رێگەکە ٢-مامناوەندی لە هەموو شتێکدا.
(«رَجُلٌ قَصْدٌ»): پیاوێکە لەش مامناوەندی نە باریکەو نە ئەستوور نە کورتەو نە درێژە.
(«طَریقٌ قَصْدٌ»): رێگەیەکی راست.
(«إنَّهُ علی قَصْدٍ»): پیاوێکی راستیخوازاو راستپەرستەو تێگەیشتووە.
(«علی اللهِ قَصْدُ السَّبیل»): گرتنی رێی راستی خودا کە رێی راستی و ئامانجە.
(رَجُلٌ مُقَصَّدٌ ومُقْتَصِدٌ): پیاوێکی لەش مامناوەندی نە کەتەیەو نە بچووك.
٣-(قَصَدَ-الشيءَ. قَصْداً): شتەکەی شکاند.
(-الشاعِرُ): هوزانڤانەکە/ شاعیرەکە: بێپچڕ خەریکی هەڵبەستدانانبوو.
(قَصَدَ- البَعیرُ. قَصادَةً): حوشترەکە قەڵەو بوو.
(-قَصَّدَ- الشيءَ): شتەکەی شکاند.
(-الشاعِرُ): هۆزانڤانەکە هەر خەریکی هەڵبەستدانانبوو، جوان و پاکیدەکرد.
(-القَصائِدَ): هەڵبەستەکانی رێکوپێك و چاککرد.
(أقْصَدَ- الشاعِرُ): شاعیرەکە/ هۆنەرەکە هەر خەریکی هەڵبەستدانانبوو.

(تَقَصَّدَ والقَصَــدَ- الرمحُ): نيزەكە/ ڕمەكە شكا.
(رمحٌ قَصِدٌ وأقْصادٌ): نێزەیەكی شكاو.
(القِصْدَةُ (ج) قِصَد): پارچە شتێكی شكاو.
(القَصيــد): ١-(مۆخــی/ مێژەلاكــی) چەور ٢-مێحوشتری تەمەنجوانی قەڵەو.
(-مِنَ الشِّــعرِ): هەڵبەست كە ســێ دێڕ یان زۆرتر بێت. تویشــیانە: لە شازدە دێڕو بەرەو ژوورتــر بێت هەروەهــا ئەوەی كــە نایابو پوختە بێــت. (ئەمە لــە مێژەلاكی -مۆخی- چەورەوە وەرگیراوە كە لەبەر زۆریی چەوریی شەقدەبێتو پارچەپارچە دەبێت.
(رمحٌ قَصيد): نێزەیەكی شكاو.
(القَصيــدَةُ (ج) قَصيــد وقَصائِد): مۆخی/ مێژەلاكی چەور.
(-مِنَ الشِــعر): ئەو هەڵبەســتەی لە حەوت دێڕ زۆرتر یان لە دە دێڕ پتربێت.
(القَصُود): مێژەلاكی/ مۆخی چەور/ مەغز.
٤-(قَصَدَ- فُلاناً على الأَمرِ قَصْداً): فیســاری ناچاری كردنی كارەكەیكرد/ بە زۆر كارەكەیی پێكرد.
٥-(أقْصَــدَ-ەُ): نێزەكەی پێدا كردو دەســتی هەڵەی نەكرد.
(-ەُ السَّــهْمُ): تیرەكە بەریكەوتو لە شوێنی خۆیدا كوشتی.
(-تِ الحَيَّةُ فُلاناً): مارەكە پێوەیداو كوشتی.
(تَقَصَّدَ-ەُ): لە شوێنی خۆیدا كوشتی.
(-الكَلْــبُ وغَيرُەُ): ســەگەكە تۆپی هیتریش هەروەها.
(المُقْصَد) (مفع): ئەوەی نەخۆشــدەكەوێتو زوو دەمرێت.
٦-(القَصَد): برسێتی.
(القَصَد الواحِدَةُ «قَصَدَة»):هەموو درەختێك كە دەروێتو لە سەرەتادا دڕكی دەبێت.
(-مِنَ العَوسَجِ نَحْوِە):پەلە نەرمە ناسكەكانی توترك و درەختی دڕكاویو لەو بابەتە.
(المُقَصَّدَة): نیشنەیەك لە گوێی حوشتردا.
٧-(القَصديــر القطعــة منــه قَصديــرَة): قورقوشم. پارچە قورقوشمێك (ك) (یونانیة) تەنێكی ســادەیە. كانزایەكی ســپیی زیوینە نەرمــە هەندێــك كانزایــتری پــێ ڕووكەش دەكرێــت بــۆ لە ژەنــگ پاراســتنی ئەچێتە پێكهاتنی زۆربەی داڕێژراوەكانەوە.
الملحق:
قصد: (الإقتصاد):دەستگرتنەوەو كەمخەرجكردن. مامناوەندیكــردن لە خەرجكردندا. جاری وا هەیە دەستگرتنەوە نزیكە لە ڕژدیی/ چرووكی.
(التَوفير): پاشەكەوتكردن.
(الإقتِصاد): ئابووری/ گشت ئەو چالاكیانەیە كە پەیوەندیی بە بەرهەمهێناو دابەشكردنی سامانو بەكاربردنەوە هەیە لە كۆمەڵگایەكی مرۆڤدا.

(الإقتصادُ الوطني): ئابووریی نیشتمانیی.
(الإقتِصادُ الحُرّ): ئابووری سەربەست/ ئازاد.
(الإقتصــاد السياســي): ئابــووری ڕامیاری.
زانســتێکە لــە پێویســتیەکانی تاکەکــەس و هــۆکاری بەرهەمهێنــان و ڕێکخســتن و دەستاودەستکردنی سامان و دابەشبوون و نرخ و خەرجکردنی پارەو پارە خۆی و ئاڵوگۆڕکردنی نێوان دەوڵەتان دەکۆڵێتەوە.
(الإقتصاد): کەم بەکارهێنان و دەستگرتنەوە مامناوەندیــی تێداکردنــی پاشــەکەوت و پاشەکەوتکردنی.
(الإقتصاد في الوقت): بەتەنگ کاتەوە هاتن و بە فیڕۆنەدانی.
(«الإقتصــاد في الوَرَق»): دەســتگرتنەوە لە کاغەزداو لە بەکارهێنانیاندا.
اَلإقتصادي): ئابوریانە/ ئەوەی پەیوەندی بە ئابوورییەوە هەیە.
(نشاط اقتصادي): چالاکیی ئابووریی.
(عالِم اقتصادي): زانای ئابووری.
(اَلرَخیص): هەرزان.
(اَلقلیل النَفَقات): کەمتێچوو.
(-مایُوَفِّــر التکالیف): ئەوەی پارەی تێچوون کەمدەکاتەوە.
(وَســیلَة نَقْلٍ اقتصادِیَّة): هۆی گوێزانەوەی ئابوریانە.
(«الإختِصاصِــي في عِلــم القتصــاد أو في الاقتصاد السیاســي»): پســپۆڕ لە زانستیی ئابوریدا یان لە ئابوریی ڕامیاریدا.
(اَلمُحِب لِلتَّوفیر والأَخذ بِهِ): ئەو کەسەی حەز لە پاشەکەوتکردن دەکات و لەسەری دەڕوات/ پەیڕەوی دەکات.
(اَلمُعْتَــدِل في مَصروفِــهِ): کەســێك کــە لە خەرجکردندا مامناوەندیی دەبێت.

---

الملحق:
قصدر: (قَصْدَرَ): بە قوڕقوشم ڕووپۆشیکرد.
(«قَصــدَرَ صَفیحــاً»): تەنەکەیەکــی بــە قوڕقوشم ڕووپۆشکرد.
(بَیِّض بالقَصدیر): بە قوڕقوشم سپیکارییکرد.
(«قَصْدَرَ آنِیَةً نُحاسِــیَّةً»): قاپێکی مســینی بــە قوڕقوشــم ڕووپۆشــکرد/ قوڕقوشــمی تێهەڵسوو.
قصر: ١-(قَصَرَ- الشــيءُ قَصُوراً):١-شــتەکە کەمیکرد ٢-هەرزانبوو.
(-عَنهُ الغَضَبُ أَو الوَجَعُ): ڕقەکەی نیشتەوە/ کەمبووەوە یان ئازارەکەی دامرکا/ نیشتەوە/ کەمبووەوە.
(-قَیْــدَ البَعــیرِ قَصْــراً): کۆتــی، پێوەندی حوشــترەکەی توند کــرد/ هێنایــەوە یەك/ کورتیکردەوە.
(-الصَّــلاةَ ومِنَ الصَّلاةِ): کــەم و کورتیی لە نوێژەکەدا کرد هەندێکی وازلێهێنا.
(«قَصــرَت بِکَــذا نَفْسُــكَ»): کەموکورتیت

(قَطَعاتُ الشَجَرِ): گرێکانی درەختەکە ئەگەر بڕرا هیتر دەردەکاتەوە.
(اَلقِطـاع): ١-بەشـێکی/ کەرتێکی شـەو لە سەرەتایەوە تا سـێیەکی ٢-کەرتێکی ئاوەدانی کە چـاك قایمکرابێتو لەژێر فەرمانەدیەکی تایبەتیدابێت ٣-پارە.
٤-(ج)قِطَعَة): ئامێری قرتاندن/ بڕین.
(اَلقَطّـاع): بـڕەری چـاك ٥-(ب) بەردتاش/ بەردبڕ/ بەردشکێن.
(اَلقَطّـاع الكـروِيّ) (هـ): برگـەی بازنەیی ئـەو تەنەیە کـە پەیدادەبێت لـە ئەنجامی سـووڕانەوەی بڕگەیەکـی بازنەیی بە دەوری تیرەی بازنەکەیداو نایبڕێت.
قطعة الدائرَة (هـ): ئەو ڕووەیە کە دەکەوێتە نێوان کەوانێکـی بازنەکـەو دوو نیوەتیرەی بازنەکەوە.
(اَلقَطّاعَة): ١-سـەرە بڕشـت، پڕوش، کە لە بڕیندا بەردەبێتەوە ٢-ئەوەی لە شت دەبڕرێت ٣- ئـەو پـارووەی کـە نیـوەی دەخورێـتو نیوەکەیتری دەهێڵرێتەوە.
(اَلقِطاعَة) (في اصطـلاح عامة النصارى): لـەلای هەمـوو دیانـەکان، ئەوەیـە کـە لە ڕۆژانێکـی دیاریکـراودا گۆشـتو هەندێـك خواردن نەخۆن.
(اَلقَطُوع): قرمبڕ/ چاکبڕ.
(-مِنَ النُوق): مێحوشترێك کە زوو شیرەکەی دەبڕێت/ وشك دەکات.
(إمرَاَةٌ قَطُوع): ئافرەتێکی سستە جووڵە.
(اَلقَطِيع): بەشـێکی شـەو لە سەرەتاوەیە تا سێیەکی شەوەکە.
(اَلقَطيـع (ج) قُطْعـان وقِطـاع وأقْطـاع و (جـج) اَقاطِيـع) ڕانە مەڕێك یـان ڕەوە حوشترێك یان گاگەلێك یان ڕەوە وڵاخێك یان پۆلە باڵندەیەك گەلە ئاژەڵێکیتر.
(اَلقَطيع (ج) قُطْعان وقِطاع وأقاطِع وقُطُع وقُطُعـات): ١-چێو/ لق/ چـڵ/ دار کە تیری لێدروسـتدەکرێت ٢-ئـەو پـەڵو پۆپەی لە درەخت دەکرێتەوە یان لە چلەکانی.
(اَلقَطيع (ج) قُطَعـاء وأقْطِعاء): هاو وێنە/ هاوشـێوە/ لێچوو/ وەك ئەو لە وێنەی ئەو/ چون ئەو/ چەشنی ئەو. هاوشان/ هاوتا.
(«هو قَطيعُـهُ»): ئەو لەو دەچێت لە لەشو باڵادا/ هاوکووفیەتی.
(رَجُلٌ قَطيـعٌ (م) قَطيـع): پیاوێکە لەناو دەستەکەیدا بۆشناخە یان ژنێکە هەروەها.
(اَلقَطيع): قامچییەکی سەرقرتاو.
(«هو قَطيعُ القِيام»):ئەو لەبەر قەڵەویی یان بێهێزیی ناتوانێت ڕاستبێتەوە/ هەستێت.
(إمْـرَاَةٌ قَطيـعٌ): ئافرەتێکـە درەنـگ ڕاستدەبێتەوەو خاوە.
(«امـراةٌ قَطيـعُ الـكلام»): ئافرەتێکـی کەمدووە/ زمانپاراوو زماندرێژ نییە.

(ألقطيعة (ج) قطائع): ١-ليكبران/ جيابوونەوە ٢-بەجێهێشتن ٣-پەیوەندیپچڕانی نێوان دوو وڵات ٣-فەرمان/ کارمەندیی ٤-ئەو زەویەی بۆ باجو خەراج دادەبڕێت ٥-زەوی کە بۆ سەربازەکان تەرخان دەکرێت بە رووبوومەکەی بخۆن و بژین.

(«إتَّقوا القُطيعاء»): دوور بن لە (لە یەکپچڕان/ لە یەکبوون).

(ألأقطع (م) قطعاء (ج) قُطع وقُطعان): ١-دەستقرتاو ٢-کەر.

(رَحمٌ قطعاء): خزمانێکی لەیەکپچڕاو.

(ألإقطاعَة (ج) إقطاعات): پارچە زەوییەکە بۆ بژێویی سەربازەکان تەرخاندەکرێت و بۆیان دەبڕرێتەوە کە زەویی باجو خەراجە.

(ألأُقطوعَة): شتێکە کەنیزەکێک بۆ یەکێکیتری دەنێرێت نیشانەی پچرانی پەیوەندیی نێوانیان دەبێت.

(ألتَقطیع) (مص) (ج) تَقاطیع): ژانە سك.

(تَقطیعُ الرَجُل): بەژن/ باڵاو ناوقەدی پیاوەکە.

(ألمُقطِع): بەڵگەو بیانوو نەماو.

(ألمُقطَع): ١-نەناس ٢-کەسێکە لە دیوانی بەخششدا ناوی نەبێت یان بەخشش بۆ هاورێکانی بڕرابێتەوە بۆ ئەو نەبڕرابێتەوە.

(مُقطَعُ النَهر): بواری رووبارەکە کە لێیدەپەڕنەوە.

(ألمَقطَع (ج) مَقاطِع): ١-شوێنی بڕینی شت یان پچڕانی ٢-برگە/ پیتێکە بە بزوێنەوە یان دوو پیتن دووەمیان زەنەدارە.

(«شَرابٌ لَذیذُ المَقطَع»): شەربەتێکە دواییەکەی خۆشە.

(مَقطَعُ الحَقِّ): ئەوەی راستی پێیدەسەلمێنرێت و ناراستیی پێ پووچەڵدەکرێت.

(مَقطَعُ الحَرف): شوێنی دەرچوونی دەنگی پیت لە گەرو یان زمان یان لێوەوە.

(مَقاطِع الأنهار): بواری رووبارەکان/ شوێنی پەرینەوە.

(-الكَلام): شوێنی تێدا وەستانی ئاخاوتن.

(ألمِقطَع): ١-نموونەی لەسەر بڕینی چەرم یان شتیتر ٢-پێبڕی چەرم/ گازنە/ چەرمبڕ.

(سَیفُ مِقطَع): شمشێری تیژی بڕەر.

(ألمِقطاع): کەسێکە زۆر بەتەمەنگ دۆستایەتییەوە نەیەت.

(بِئرُ مِقطاع): چاڵاوێکە زوو ئاوەگەی ببڕێت/ وشك بکات.

(مِقطاعُ الكَلام): قسە بە خەڵکبڕ.

(ألمَقطَعَةُ): شوێنی بڕین و هۆی بڕینەکە.

(ألهَجـرُ مَقطَعَةٌ للوُدِ): کۆچ و لێکبڕان مایەی نەمانی خۆشەویستییە.

(ألمُقَطَّعَةوالمُقَطَّعات): بەرگی کورت (ئەمە تاکی نییە بە هەموو جلێکی کورت وا دەڵێن).

(أَلثِّياب المُقَطَّعَة) (عند العامة): جلى شڕو وڕو كۆن.
(أَلمُقَطَّعات مِن الشِّعر): هەڵبەستى كورتو كورتە دێڕ.
(مُقَطَّعاتُ- الشَّيءِ): پارچەكانى شتێك كە جيادەكرێنەوەو پێكەوەيشدەنرێنەوە.
(أَلمُتَقَطِّع) (فا): كورت/ كورتوكۆڵ.
(غُرَّةٌ مُتَقَطِّعَة): سپێتيى سەرلۆزى چارەوێ لە كونە لووتيەوە تا دەگاتە چاوى.
(أَلحُمَّى المُنقَطِعَة) (طب): تاى ناوبەناو/ سێبەرۆ.
(أَلمُنقَطِع) (فا): لێبڕاو بۆ شتێك.
(«هو مُنقَطِعُ العقالِ في الشَّرِّ»): ئەو بۆ خراپەو خراپەكاريى لێبڕاوەو هيچ نايگێڕێتە دواوە.
(هو مُتَقَطِعُ القَرينِ): ئەو بێوێنەيە/ نموونەى نييە.
(أَلمُنقَطِعونَ عِندَ النَّصارى): لاى ديانەكان، ئەو مردوانەن كە كەسێكيان نييە نوێژو دوعايەكيان بۆ بكات يان خيرێكيان بۆ بكات كە گوناهەكانيانى پێهەڵوەرێن.
(أَلمُنقَطَع مِن الوادي ونَحْوَهُ) سەرى ئەوسەرى دۆڵەكە/ كۆتايى دۆڵەكە يان هيتر.
(أَلأقطاع): هەموو رژێمێك كە دەسەلات بە خاوەن زەويوزارە گەورەكان دەدات بە ئارەزووى خۆيان زەويوزارەكانيان هەڵسووڕێننو ئەوانەى كە لە زەويەكانيشدان بيانچەوسێننەوە.
(أَلإقطاعِيّ): دەرەبەگ.
(«قصر إقطاعِي») ١-كۆشكێكى دەرەبەگايەتى/ هى سەردەمى دەرەبەگايەتى ٢-كۆشكى دەرەبەگ.
(«العَهْدُ الإقطاعِي»): سەردەمى/ چاخى دەرەبەگايەتى.
(الإقطاعِي (ج) الإقطاعيون): ١-دەرەبەگ ٢-سەر بە دەرەبەگايەتيبوون وەك بيروبڕواو هەڵسوكەوت.
(أَلإقطاعِي- على التَشبيه): (بە لێكچواندن) خاوەنموڵكێكى زۆر/ خاوەنزەويزارێكى فراوان.
(أَلإقطاعِيَّة): دەرەبەگايەتيى.
(النظام الإقطاعِي): رژێمى دەرەبەگايەتى.
(إقطاعِيَّة مُجتَمَع): كۆمەڵگايەكى دەرەبەگايەتى.
(أَلتَّقاطُع): ١-لێكهەڵوەشانى پەيوەنديى نێوان/ لەيەكدووركەوتنەوە ٢-بەيەككەيشتن يان يەكبڕينى دوو هێڵ لە پنتێكدا.
(نُقطةُ التَقاطُع): پنتى يەكتربڕين يان بەيەككەيشتن.
(تقاطع طَريقَين) شوێنى لەيەك جيابوونەوەيە دوو ڕێگا.
(نُقطَة التَقاطُع في سكة الحَديد): شوێنى بەيەك گەيشتنو لەيەك جيابوونەوەى هێڵى شەمەندەفەر.

(اَلمَقطوعِيَّــة): بڕی ئــەو خۆراكە/ خواردنە یان ئەو بەرهەمپیشەسازییە یان هەر شتێكیتر لــەو بابەتانە كــە لە ماوەیەكــی دیاریكراودا بەكاردەبرێت/ كاردەكرێت.

(«مَقطوعِیَّةُ الكَهرباء»): بڕی كارەبای كاركراو.

قطــف: ١-(قَطَــفَ وقَطَّــفَ-هُ قَطْفــاً): رووشاندی/ ڕنی.

(اَلقَطْــف (مــص) (ج) قُطُــوف): ڕنــین/ رووشاندن/ رووشاو.

(اَلقَطَف (ج) قُطوف): شوێنكار.

٢-(قَطَــفَ- الثَمَــرَ. قَطفــاً): (میوەكــە/ بەرەكە)ی چنی/ ڕنی.

(-الشيءَ): شتەكەی خێرا فڕاندو ڕاپسكاند.

(-مُغَسَــلَتَهُ): كووره هەنگەكــەی بەتاڵكردو هەموو هەنگوینەكەی دەرهێنا.

(قَطَّفَ- الثَّمَرَ): میوەكەی (چنی/ ڕنی).

(-الشيءَ): شــتەكەی خێرا/ گورج ڕاپسكاندو فڕاند.

(-الدَّقيــقَ) (عامیــة): ئاردەكــەی زۆر نەبێژایــەوە، تا كەپەكەكەی بگرێت و تێكەڵی ئاردە پاكەكە نەبێت.

(-الجــزّارُ اللَّحــمَ) (عامیــة): قەســابەكە گۆشتەكەی لە ئێسقانەكە داماڵی.

(أَقطَفَ- الكَرمُ): میوەكە كاتی ڕنینی هات.

(إقتَطَفَ- الثَمَرَ): بەری دارەكەی/ میوەكەی چنی.

(-الشيءَ): خێرا شتەكەی (ڕاپسكاند/ فڕاند).

(-الكَلامَ): كرۆكی ئاخاوتنەكەی وەرگرت.

(اَلقِطْف (ج) قِطاف وقُطُوف): ١-میوەی چنراوو ڕنراو ٢-هێشوو دەمی ڕنینی/ كاتی ڕنینی.

(اَلقِطَــاف والقَطَــاف): ١-دەمــی میوەڕنین ٢-ڕنینی میوەو چنینی بەری درەخت.

(اَلقُطافَة): بۆڵەترێ یان هێشووی وەریو كاتی ڕنینی.

(اَلقَطیف= المَقطوف): ڕنراو/ چنراو.

(اَلمَقْطَف (ج) مَقاطِف): ســەبەتە/ تاسەوی و هەر شتێك كە میوە چنراوەكەی تێدەكرێت.

(اَلمِقطَف (ج) مَقاطِف): ١-داســولكە كە بەری درەختــی پێ دەچنن و دەبڕن ٢-بنی هێشــوو ٣-هێڵەكی والأبێژ كە لە ئاوریشمەو ئاردی پێ دەبێژرێتەوە.

٣-(قَطَفَ- الفَــرَسُ وغیرهُ قِطافاً وقُطوفاً): چارەوێكــە هەنگاوەكانی كورتكــردەوەو خاو ڕۆیشت.

(أَقْطَفَ- الرَجُلُ): بــوو بە خاوەن وڵاخێكی خاوو خلیچك.

(اَلقَطُوف مِنَ الدَّواب (ج) قُطُف): (وڵاخێك/ چوارپێیــەك) كە بــاش نــەڕوات و خاوەخاو بكات.

٤-(اَلقَطَف) (ن): ١-سەوزە.

(-الواحدةُ قَطْفة): ١-ســەوزەیەك/ سپێناخە كێویلە ٢-درەختێكی شاخە دارەكەی سەختە.

(اَلقِطْفَــةُ) (ن): ســەوزەیەکی دڕکاوییــە ناوەوەی سوورەو گەڵاکە خاکییە.

(اَلقَطیفَةُ- سالِفُ العُروس) (ن): گوڵە قەیفە زۆر جۆری بەوە ناســراوە کە گەڵاو لاســک و گوڵەکەی ڕەنگێکی ئەرخەوانیی هەیە لەوانە (قطیفةُ النیل): گوڵە قەیفەی کلکاوی کە بۆ جوانیی دەڕوێنرێت.

(اَلقَطیفةُ (ج) قُطُف وقَطائِف): بەتانییەکی تووکنە پیاو بە خۆیدا دەدات.

(اَلقَطائِف): جۆرە حەڵوایەکە.

(اَلمُقَطَّفَةُ): پیاوی کورتەبالا.

قطل: ١-(قَطَلَ- الشيءَ. قَطْلاً): شتەکەی بڕی.

(-عُنُقَهُ): کێشای بە ملیدا/ لە ملی دا.

(قَطَّلَ-الشَيء): شتەکەی بڕی.

(-هُ): دایبەزەویداو بەلادا خستی.

(تَقَطَّلَ- الجِذعُ): قەدی درەختەکە لە بنەوە قرتا.

(اَلقُطُل والقَطيل- مِنَ الشَجَرِ): درەختی لە بنەوە بڕراو.

(نَخْلَــةٌ قَطيــلٌ وجِــذع قُطُــلٌ وقَطيلٌ): دارخورمایــەك یان قەدی دارێك کە لە بنەوە برابێت یان قرتابێت.

(اَلقَطيلَة): پارچە پەڕۆیەکە ئاوو شتی وەهای پێ وشکدەکرێتەوە.

(اَلمِقطَلَــةُ (ج) مَقاطِل): پارچە ئاســنێکە پێیدەبڕرێتەوە.

(اَلمُقَطَّل) (مفع): لێنراو/ کولاو.

٢-(اَلقَطلَب الواحِدَةُ قَطْلَبَة) (ن): تووترك. ڕووەکێکی گەڵا هێلکەیــی گەورەیە گوڵەکەی سپییە لە شێوەی زەنگۆڵەدایە بەرەکەی شێوە ترێییە، جۆرێکی لە هەندێ وڵاتی خۆرهەڵاتی نزیکدا زۆرە.

قطم: ١-(قَطَمَ- اللَّحْم وغَيرَهُ قَطْماً): حەزی لە گۆشت و شتیتر کرد.

(قَطِمَ قَطَماً): حەزی لە گۆشت یان شتیتر کرد.

(قَطِم): دڵۆچووە سەر گۆشت و شتیتر.

(اَلقَطــام) (ح): هەڵــۆ یان هەڵۆی چەشــەی گۆشت.

(اَلقَطامِي والقُطامِيّ) (ح): هەڵۆیەك چاوی تیژ بێت و بۆ ڕاو سەری بەرزکردبێتەوە.

(رَجُــلٌ قَطامــيٌّ): پیاوێکــی کەللەڕەقە لە کاروباردا.

(اَلمِقْطَم (ج) مَقاطِم): چنگی باڵندە.

٢-(قَطَمَ-هُ قَطْماً): گازی لێگرت و چەشتی.

(-العُــودَ): دانی بە چێوەکەدا نــا تا بزانێت نەرمە یان ڕەقە.

(-الشيء): شتەکەی بڕی.

(قَطَّــمَ- الشــارِبُ): شــەربەتخۆرەکە شەربەتەکەی چەشــت و لای ناخۆشبوو، گرژ بوو ناوچەوانی بەیەکدادا.

(اَلقُطامَــةُ): ئــەوەی دەجێڕرێــت و پاشــان تفدەکرێتەوە.

(اَلقَطامِيّ والقُطامِيّ): شەرابی تیژ.

(اَلقَطِم): تووڕە.

(اَلقَطيمَةُ): ١-شیر یان ماستی (چێژ/ تام) گۆڕاو ٢-لەت لەتی نان یان شتیتر ٣-تۆزێك چێشت.

(«شـيءٌ مُـزٌّ المَقْطَم»): شتێكی چێژ/ تام مزر.

٣-(اَلقِطْمار والقَطْمير) (ز): توێژاڵی تەنكی ناوەوەی خورما كە لە نێوان ناوكە خورماكەو گۆشتی خورماكەدایە.

قطـن: ١-(قَطَـنَ- في المَكانِ وبِـهِ قُطُوناً): لە شوێنەكەدا نیشتەنیبوو/ نیشتەجێبوو.

(-الرَجُلَ): خزمەتی پیاوەكەیكرد.

(قَطَّـنَ- هُ بِالمَـكانِ): لـە شـوێنەكەدا نیشتەجێیكرد/ نیشتەنییكرد.

(اَلقاطِن (فا) (ج) قُطّان وقاطِنه وقَطين): نیشتەنیی شوێنێك.

(«قاطِناتُ مَكّة وقُطّنُها»): كۆترەكانی شاری مەكە.

(اَلقَطَـن (مـص) (ج) أقطـان): شـوێنی نیشتەنیبوون.

(اَلقَطانَة): مەنجەڵ/ قازان.

(اَلقُطنِيَّـة والقِطْنِيَّـة (ج) قَطانِـيّ): ئەو دانەوێڵانـەی كە لە مەنجەڵـدا دەكوڵێنرێت وەك نیسـكو نۆكو پاقلـە (بۆیە وا ناونراوە چونكە لـە ماڵـدا هەڵدەگیرێـتو ماوەیەك دەمێنێتـەوە یـان لەبەر ئەوەی لـە ماڵدا بۆ هەمووانەو دەبێت بخورێت.

(اَلقَطّانِيّـات) (ن): پەڵـە ڕووەكێكە كە دوو خەپلەن گەڵێـك ڕووەك دەگرێتەوە بەشـی زۆری یان خواردنی مرۆڤە یان دەكرێتە ئالفی ئاژەڵ وەكو پاقلەو نۆكو نیسك.

(اَلقَطين): كۆی وشەی (اَلقاطِن)ە.

(اَلقاطِـن)ە ١-نیشـتەنییەكان ٢-دانیشـتەی خانوو ٣-نۆكەرو كارەكەرو دەستوپێوەند (بۆ تاكو كۆیە) بۆ كۆكەی: (قُطُن).

(«هؤلاءِ قَطينُ فُلان»)ئەوانە دەستوپێوەندی فیسارن.

(«قَطينُ اللهِ»): نیشـتەنیی مەككەو دەوری كەعبە.

(اَلقَطينَة): دانیشتووی ناو خانو.

٢-(قَطِنَ- ظَهْرُهُ. قَطَناً): پشتی كۆمایەوە.

(اَقْطَن): پشتكۆم.

(اَلقَطَن (ج) أقطان): خوارووی پشتی مرۆڤ كە ڕاستو تەخت دەبێت/ سێبەندە.

٣-(قَطَّـنَ- الكَرمُ): مێوەكە ڕشـایەوە، واتە گرێی ورد وردی هێشووەكانی دەركرد.

(-الطَّعامُ ونَحْوَهُ) (عند العامة): خواردنەكە كەرووێكرد كە شتێكە وەك لۆكە.

(اَلقُطن) (ن): لۆكە.

(قُطْنَة): پارچە لۆكەیەك.

(ج) (اَقطان): لۆكـەكان، ڕوەكێكە تۆوەكەی

بــه لۆكەیەكــی چــڕ داپۆشــراوە كــە تاڵی ڕیشــووی باریكەو سپی، دەڕێســرێتو جلو بەرگی لێدروســتدەكرێت، لــە گێتیدا ئەمڕۆ گرنگترین ڕووە كە لەناو ڕێشــودارەكانداو لە وڵاتــە گەرمەكانــدا دەڕوێنرێت/ ئەمەریكای باكوور گەورەترین وڵاتی بەرهەمهێنەریەتی. شــوێنێكی باڵای لە كشتوكاڵی میسرو توركیاو سوریاشــدا هەیەو بۆ دەرومش دەنێررێت. لە پەموانەكەی (تۆوەكەی) شلە ڕۆن دەگیرێت بۆ چێشت كەم بەكاردێت بەڵام كەڵكیتری هەیە.

أَلقُطُن- القُطْن.

(القَطّان): لۆكەفرۆش.

(أَلقُطنِيَّة والقِطنِيَّة): جلوبەرگی لۆكە.

(أَلقِيطان): چنراوێكە لە ئاوریشــمو لۆكەیە وەك پەت تاڵەكانی بادەدرێت/ قەیتان.

(أَلمَقطَنَة): زەوییەك لۆكەی تێدا بچێنرێت.

٤-(أَلقَطَــن (ج) أَقطــان): ١-بنكلكی باڵندە٢-نێوان هەردوو سمت/ ناوگەڵ.

أَلقِطنَة): كلاوقازی كە بەشێكی ورگە.

(أَلقَطِنَةُ): ١-كلاوقازی ٢-گۆشتی ڕان.

(أَلقِطان (ج) قَطَن): داری كەڕاوە.

(أَليَقْطين الواحِدَةُ يَقْطينَة) (ن): ڕووەكێكە كــە قەدی بۆ ســەروە هەڵناســێت دەكشــێت وەك خەیــارو كوولەكە. بە زۆریی بە كولەكە دەڵێن.

قطــو: ١-(قَطــا. قَطْواً): بە پێی ڕۆیشــتنی گرانبوو/ سستەپێبوو.

(-الماشِــي): ڕۆیشــتووە كــە هەنگاوەكانــی كورتكرد یــان گورجانە ڕۆیشــتو هەنگاوی كورتنا.

(-تِ القَطا): (كــوركــورەكــە/ قەتێكە) خوێندی.

(تَقَطّى): خاو ڕۆیشت/ خاوەخاویكرد.

(اِقْطَوطــی): هەنگــاوی كورتینــا یان گورج ڕۆیشتو هەنگاوی كورتینا.

(القَطــاة (ج) قَطاً وقَطَوات وقَطَيات) (ح): كوركور/ قەتێ. باڵندەیەكە هێندەی كۆترە (بۆ شــارەزاییو بەڵەدیی بە نموونە دەیهێننەوە) (دەڵێن لەبەر قورســەپێی یان بۆ دەنگەكەی وا ناونراوە).

(«ذَهَبُــوا في الأَرضِ بِقَطــىً»): ڕۆیشــتنو پەرشوبڵاوبوونەوە.

(أَهدى مِــنَ القَطا): لە كوركــوڕ بەڵەدترە/ شارەزاترە.

(أَلقَطوان والقَطَوان): هەنگاو كورتو پێگران لە ڕۆیشتندا.

(أَلقُطَوطــى): ١-هەنگــاو كــورتو پێگــران ٢-قاچدرێژ.

٢-(تَقَطّی- الفَرَس): سواری سمتی یان سەروو كلكی ئەسپەكە بوو/ سواری پاشووی بوو.

٣-(تَقَطّى لأَصحابِهِ): خۆی لە دۆســتەكانی ماتداو هەڵیخەڵەتاندن.

(-بِوَجْهِـهِ عَنهُ): ڕووی لـێ وەرگێڕاو خۆی لێلادا.
قعّ: ١-(قَعَّ-ـَ قَعّاً): بە قسە نیشتە سەری.
(أقَعَّ- القَومُ): هەڵیانکەند گەیتشـنە ئاوێکی زۆر تاڵو سوێرو پەلاماری ئاوەکەیاندا.
(ألقُعّ والقُعاع- مِنَ المِیاه): ئاوێکی وا سـوێر کە وێنەی نەبێت.
٢-(قَعْقَعَ- السِـلاحُ قَعْقَعَةً): چەکەکە تەقەی لێبەرزبووەوە/ لێوەهات.
(-الشيءَ اليابِسَ): شتە وشکەکەی ڕاوەشاند/ جووڵاندو دەنگی لێپەیداکرد.
(-القِـداحَ): لـە قومارەکـەدا تیرەکـەی هەڵسوڕاند.
(-ت عُمُدُهم): گەورەکانیان کۆچیانکرد.
(-في الارضِ): کەوتـە گـەڕان بـە زەویـدا/ ڕۆیشت.
(«فـلان مایُقَعْقَـعُ لَهُ بِالسِـنان): ڕووداوی ڕۆژگار سەر بە فیسار شۆڕناکاتو باکی هاشەو هوشەی نییە.
(تَقَعْقَعَ):١-شـڵەژاو کەوتە بـزوان ٢-جووڵاو دەنگی پەیداکرد.
(-ت عُمُدُهم): گەورەکانیان کۆچیانکرد.
(ألقُعْقُـعُ): (ح): قەلەباچکە/ جۆرە قەلێکە ڕەنگ سپیو ڕەشەو کلکدرێژە.
(ألقَعْقـاع): ١-دەنگـی بەریەککەوتنـی چـەك ٢-خورمای وشـکەوەبوو ٣-تایـەك کە مووچرك بەلەشدا بهێنێتو دان بهێنێتە چۆقە ٤-ڕێگەیەکی سەختی کە زۆر بە گران پیایدا بڕۆن.
(ألقَعقَاع والقَعْقَانِيّ): کەسـێکە کە ڕۆیشـت جومگەی قاچی تەقەیبێت.
(ألقَعْقَعَةُ): کیڕەیدان.
(ألقَعاقِعُ): هەورەگرمەی لەسەریەکی توند.
(قَعْقَعَةُ): هەورە گرمەیەکی توند.
(ألقَعاقِعُ): فرەدەنگ/ دەنگزۆر.
قعـب: ١-(قَعَّبَ- فُلانٌ في الـکلامِ): بە بنی قورگ قسەیکرد.
(-الحافِـرُ): سـمەکە باریـك بـووەوە وەك چووبێت بە ئاوا.
(ألقاعِب): گورگی لوورەلوورکەر.
(ألقَعْـب (ج) أقْعُب وقِعـاب وقِعَبَة): جامی گەورەی ئەستوور.
(قَعْبُ الكلام): قووڵایی قسـەکە/ گەوهەری قسەکە.
(ألقُعْبَةُ): چاڵی ناو شاخ.
(ألقَعيب): ژمارەی زۆر.
٢-(ألقَعْبَـل): جامـی گەورەکە شـیری تێدا دەدۆشن.
(ألقَعيـل والقِعيل) (ن):١-جۆرە دومەلانێکە ٢-(ن)قارچك.
قعث: ١-(قَعَثَ- لَهُ مِن الشَيء. قَعْثاً وقَعْثَةً): تۆزێکی لە شـتەکە دایـێ/ لەوێچێکی دایێ/ پێدا.

(أقْعَثَ- في مالِهِ): دەستبڵاویی لە داراکەیدا کرد.
(-لَهُ العَطِيَة): خەڵاتی زۆری دایێ/ پێدا.
(إقْتَعَثَ- الحافِرُ): بیرهەڵکەنەکە گڵێکی زۆری لە بیرەکە دەردا.
(-لَهُ العَطِيَّة): پەخششی زۆری دایێ/ پێدا.
(ألْقعْث): باران و لێزمەو لافاوێکی زۆر.
٢-(قَعَثَ وقَعُثَ- الشيءَ. قَعْثاً وقَعْثَةً): شتەکەی لە بێخ هەڵکەند/ لە بن دەرهێنا.
(إنْقَعَثَ): لە بن دەرهات.
(-الحائِطُ): دیوارەکە لە بنەوە رووخا/ رما.
٣-(القَعيث): سووك و ناسان.
قعد: (قَعَدَ. قُعودا ومَقْعَداً): بەپێوە بوو دانیشت.
(-قُعوداً) (ضد): ١-هەستا ٢-دانیشت.
(-بِهِ): داینیشان.
(-ت الفسيلَةُ): نیچوولەی دارەکە قەدی پەیدا کرد کە لە سەری بوەستێت.
(قَعَدَ): دەستی پێکردو خەریکبوو/ ئامادەبوو.
(«قَعَد يشْتُمُني»): دەستیکرد بە جنێودانم خەریکبوو جنێوم پێبدات.
(قاعَدَ- هُ. مُقاعَدَةً): لەگەڵیدا دانیشت/ لەلایەوە دانیشت/ هاونیشنیبوو.
(أقْعَدَ-هُ): داینیشان.
(-بالمَكانِ): لە شوێنەکەدا دانیشت و تیایدا مایەوە.
(-الرَجُلَ): پیاوەکەی لە شوێنەکەدا هێشتەوەو داینیشاند.
(-البِئْرَ): چاڵاوەکەی هێندەی دانیشتنی زەلامێك هەڵکەند یان نەگەیشتە ئاوو وازیلێهێنا.
(أُقْعِدَ): دەردێکیگرت و گردەنشینبوو/ لەپێکەوت/ کەنەفتبوو/ گوڵۆڵە بوو.
(إقْتَعَدَ- الدابَّةَ): سواری چوارپێکە بوو یان بۆ سواربوون تەرخانیکرد.
(القاعِد (فا) (ج) قُعُود): ١-دانیشتوو ٢-جەواڵی پڕ دانەوێڵەو لەسەر بن وەستێنراو.
(القاعِدَة (ج) قَواعِد): ١-بنکە/ بنچینە/ شێواز ٢-(ع ج) دەستورێکی بیرکارییە بە دەربڕەیەکی جەبر کورتکراوەتەوە پێیدەڵێن دەستوور/ یاسای نەگۆڕ ٣-(ك) تفت.
(-مِنَ البَيت): بناغەی/ بنچینەی خانوو.
(-مِنَ الهَودَج): تەختەیەکی کەژاوەکە.
(-مِنَ البلاد): گەورەترین شاری وڵاتەکە پایتەختە.
(قاعِدَةُ الطائِرات): بنکەی فڕۆکەخانەکە تیایدا دەنیشێتەوەو لێوەی هەڵدەسێت.
(القاعِدَة في الاصلاح): دەستورو بنکەو ڕاگرو یاسایەك کە هەموو پارچەو بەشەکانی شتێك دەگرێتەوە.
(القاعِدَة عِندَ الكُتّاب): لای نوسەرەکان دەستوورو نموونەیە بۆ فێربوونی خۆشنووسین و نووسین.

**(قاعِد التِمثال)**: بنكی پەیكەر.
**(اَلقَعْـــدَةُ (ج) قُعُدات)**: شـــوێنی دانیشـــتنی سەرزین و كورتان و شتیتر ٢-(ح) كەر كە پیاو سواریدەبێت.
**(مِن الإبِل)**: حوشـــترەكە شـــوان بـــۆ هەموو پێویستیەكی سواریدەبێت.
**(اَلقَعْدَة)**: ١-جارێك دانیشـــتن ٢-ئەوەی مرۆڤ ســـواریدەبێت ٣-ئەوەی لەســـەری دادەنیشیت وەك كلیم و حەسیرو شتیتر.
**(اَلقِعْــدَة والقَعْــدَة)**: ئـــەو شـــوێنەی كە لە دانیشتنێكدا دەگیرێت.
**(ذو القَعْـــدة وذو القِعْدَة)**: مانگی ناوجەژنان كە مانگی یازدەی ساڵی هیجرییە كە دەكەوێتە نێوان مانگی (شوال) شەشەڵان و (ذي الحجة) مانگی قوربانەوە. ژمـــارەی رۆژەكانی (٣٠)یە (بۆیە وا ناونراوە چونكە عەرەب لەو مانگەدا نە شـــەریاندەكرد نە بۆ ئازوخە دەچوون نە بۆ لەوەڕ دەگەڕان.
**(بِئرُ قَعِدَةٌ)**: چاڵاوێكە قوڵیی/ بڵندی هێندەی مرۆڤێكی دانیشتوو.
**(اَلقُعَـــدَةُ)**: زۆر دانیشـــتە/ ئـــەوەی زۆر دائەنیشێت.
**(«هـــو قُعَدَةٌ ضُجعَةٌ»)**: ئەو زۆر دانیشـــتەی پاڵكەوتەیە.
**(اَلقَعَدَةُ)**: ٣-ئەوەی خەڵك سواری دەبێت ٢-رایەخ وەك كلیم و فەرش و حەسیرو شتیتر.

**(الأَقْعَـــاد والقُعَاد) (طـــب)**: دەردێكە مرۆڤ گردەنشیندەكات/ كلۆڵەی ئەكات/ لە پەلوپۆی ئەخات.
**(اَلقِعاد)**: ژن/ هاوسەر.
**(القُعْـــدِيُّ)**: ١-زۆر دانیشـــتوو ٢- پەككەوتـــە (وەكو هەر حەز بە دانیشتن بكات).
**(القُعْدِيَّة والقِعْدِيَّة)**: زۆر دانیشتوو.
**(القَعَـــدِيّ (ج) القَعَدِيَّـــة)**: دانیشـــتوویەكی خەواریجەكانـــە لـــە ناو موســـوڵمانە ناحەزە دوژمنەكانیاندا.
**(اَلقَعُود (ج) لَقْعِدَة وقُعُد وقِعدان وقَعائِد)**:
١-جوانوی حوشـــتر تا دانی دووەمی پێشەوەی دەردێت ٢-بەچكە حوشتر یان گوێرەكە.
**(اَلقَعُود والقَعُودة (ج) لَقْعِدَة وقُعُد وقِعدان وقَعائِد- مِنَ الإبِل)** ئەو حوشترەی كە شوانەكە بۆ هەموو كارو بارێكی سواریدەبێت.
**(اَلقَعِيـــد)**: (بـــۆ یـــەك و كـــۆو نێـــرو مـــێ) ١-هاونشـــین و هاودەم ٢-كوللـــەی پێكورە/ كە هێشـــتا باڵی تـــەواو نەكردبێـــت ٣-پارێزگار/ چاودێر.
**(«قَعِدَكَ اللهَ وقَعْدَكَ اللهَ»)**: بە خودا سوێندت ئەدەم، وترۆیشـــە: وەك ئـــەوەی خوا لەگەڵتا دابنیشێت، واتە خوا بتپارێزێت.
**(«فُلان قَعيدُ النَّسَـــبِ»)**: فیسار بە كەمترین پشـــت دەچێتـــەوە ســـەر باپـــیرە گـــەورەی بنەماڵەكەی.

(قعيدا كُلّ أَمرٍ): دوو پارێزەری هەموو کارێك لە ڕاستو چەپەوە.

(اَلقَعيــدَةُ (ج) قَعائِــد): ١-ژنی دانیشــتووی ماڵ ٢-ئەوەی لەســەری دادەنیشن ٣-کیسە یان شــتێکی وەها کە برژاوو چــۆرەكو ئەوانەی تێبکرێت.

(القُعَيد): هاونشینی بچووك.

(اَلأَقْعَد النَّسَــب): بە نزیکترین پشت بگاتەوە سەر باپیرەگەورەی.

(اَلمُقْعَد): ١-تووشــبووی دەردی گردەنشــینی/ گوڵۆڵە/ لەپێکەوتە. کەفتەکار ٢-(ح)بەچکەی داڵەکەرخــۆر ٣-مەمکــی قــوت کــە هێشــتا نەنیشتبێت.

(«فُلان مُقعَــدُ الأَنفِ»): لووتی نیشــتووەو لووت فشە.

(«فُلان مُقعَدُ الحَسَبِ»): فیسار ناوەجاخزادەیە.

(اَلمُقعَدَةُ): ١-مێی وشەی (اَلمُقْعَد): ٢-چاڵاوێك هەڵکەنرابێتو نەگەیشتبێتە ئاو.

(اَلمُقْعَدات) (ح): بەچکە کورکور/ قەتێ پێش ئەوەی هەستێت ٢-(ح) بۆقەکان.

(اَلمَقْعَد (ج) مَقاعِد): نیشتگە/ شوێنی لەسەر دانیشتن/ کورسی.

(اَلمَقْعَــدَةُ): ١-نیشــتگە ٢-قنــگ ٣-قەعــدەی پیسایی.

٢-(قَــعَــدَ- عَــن حــاجَــتِــهِ قُــعُــوداً): لە جێبەجێکردنی پێداویستیەکەی دواکەوت.

(-تِ النَخْلَــةُ): دارخورماکــە لەبــەر گرتندا سســتیکرد ســاڵێك بەریگرتو ســاڵی دوایی هیچی نەگرت.

(قَعَدَبيَ عَنكَ شُــغْلٌ»): کارێك دەستیگرتم بێمەلات/ کارێك لە تۆی کردم.

(قَعَّدَ- هُ عَن كذا): نەیهێشتو ڕێگەی ئەوەی لێگرت.

(اَقْعَدَ-هُ عَنِ الأَمرِ): ڕێگەی کارەکەی لێگرت.

(تَقَعَّدَ): وەستا.

(-هُ): هێشتیەوەو نەیهێشت پێداویستیەکانی جێبەجێبکات.

(-عَــنِ الأَمــرِ): وازی لــە کارەکــە هێناو بە تەنگیەوە نەهات.

(تَقاعَــدَ- بِهِ فُــلان): هیچی لــە مافەکەی نەدایێ/ پێی نەدا.

(إقْتَعَدَ): بەری کارەکەی لێگرت.

(ماإقْتَعَدَكَ عَنْهُ): ڕێگەی ئەوی لێنەگرتوویت.

(اَلقَعَد): ١-خەواریجەکان ٢-ئەوانەی بۆ جەنگ ناچن/ دانیشتووەکانن.

(اَلقُعْدُد): ١-زیرەکردوو/ زۆر ترسنۆك چونکە بۆ شــەڕ ناچن ٢-ســســتو تەمەڵ ٣-کەســێکە چاکەو پیاوەتی نەکات ٤-بەد.

(رَجُــلٌ قُعْــدودَةُ): پیاوێکــی زیرەکردوو/ زۆرترسنۆك.

٢-(قَعَدَ- فُلانٌ بِقِرْنِهِ قُعوداً): فیسار هاوشانی هاوڕێکەیبوو.

(-لِلحَــرْبِ): هاوشــانەکانیو پێویســتی بــۆ جەنگ ئامادە کرد.
(أَلقَعَد): ئەو جەنگاوەرانەی کە موچەیان بۆ تەرخان نەکراوە.
٤-(قَعَدَ-تِ المَــرأَةُ. قُعُوداً): ژنەکە پیاوەکەی لەدەستچوو/ بێوەژنبوو.
(أَلقاعِــد (ج) قُعود): ژنێك نە منداڵی بێتو نە پیاویشی هەبێت.
٥-(قَعَّدَ-هُ): کاری بۆ گوزەراند/ خزمەتیکرد.
(قَعَّدَ أَبــاهُ): باوکی بەخێوکردو نەیهێشــت برەنجێت.
(أُقْعَدَ- الرَجُلَ): خزمەتی پیاوەکەیکرد.
(-أَباهُ): باوکی بەخێوکرد.
(تَقَعَّــدَ-ه): چــوو بــەلای کاری ئــەوەوەو سەرپەرشتییکرد.
(تَقاعَدَ فُــلانٌ في الاصطلاح): لــە زاراوەدا: خانەنشینبوو و موچەیەکیشی بۆ بڕرایەوە.
٦-(القَعیــد): باڵندەیــەك یــان ئاســكێك لــە پشــتتەوە بێت، بــە بەدوومــی دادەنێن (پێچەوانەی (ألنطیح) واتا بەختهێن.
٧-(القُعْدُد والقُعْــدَد والقُعْدُود (ضد): ١-بە چەند پشــتێکی کەم دەگاتــە باپیرە گەورەی ٢-باپیرەگەورەی زۆر لێوەی دوورە.
قعر: ١-(قَعَرَ-ه. قَعْراً): دایبەزمویدا.
(تَقَعَّرَ): بەزمویدا دراو هەڵگێڕرایەوە.
(إِنْقَعَرَ): مرد.

٢-(قَعَــرَ- البِئرَ. قَعْــراً): ١-تا بنی چاڵاوەکە ڕۆیشت ٢-چاڵاوەکەی قووڵکرد.
(قَعَــرَ- الإِنــاءَ): هەرچی لە قاپەکــەدا بوو خواردیەوە.
(-الشَجَرَةَ): درەختەکەی لە بێخ هەڵکەند.
(قَعَرَ- الماءُ. قَعــارَةً): ئاوەکە (قووڵبوو/ بنی دوور بوو).
(قَعَّرَ- البِئرَ): بیرەکەی قووڵکرد.
(-الشيءَ): شتەکەی قوپاند بردی بەناودا.
(-الشــيءُ): شــتەکە قوپــاو بەنــاودا چوو/ قووڵبوو.
(-الرَجُلُ): هاواریکرد.
(-في كَلامِهُ): قسەکەی بە قوڕگکرد.
(أَقْعَرَ البِئرَ): چاڵاوەکەی قووڵکرد.
(-النَجْمُ): ئەســتێرەکە لە بنــی لەگەنەکەدا یان قاپێتردا دەرکەوت.
(تَقَعَّرَ): قووڵبوو.
(في كَلامِهِ): قسەکەی بە قوڕگکرد.
(إِنْقَعَرَ): لەبنو بێخ هەڵکەنرا.
(القَعْر (مــص) (ج) قُعُور): ١-لەگەن ٢-چاڵی نزمو قووڵ/ شیوی قووڵو نزم.
(-مِن كُل شــيءٍ): ئەوپــەڕی قووڵاییو بنی بنی ئەو شتە.
(قَعْرُ الفَم): قوڵایی ناودەم.
(«رَجُلٌ بَعیدُ القَعْرِ»): پیاوێکە چاك دەچێتە بنجو بناوانی شتەوە.

(«جلَسَ الرَجُلُ في قَعْرِ بَيتِهِ»): (ئيديۆمه): خـۆی لەناو خانووەکەیدا گـیرداوە/ پیاوەکە خزایە کونی ماڵەکەیەوە.
(اَلقُعْرَةُ= الوَهْدَةُ): چاڵێکی قووڵ.
(اَلقُعْـرَةُ والقَعْـرَةُ): ئـەوەی بنـی لەگەن دادەپۆشێت و دەگرێت.
(إناءٌ قَعران): قاپێکی قووڵ.
(قَدَحٌ قَعران): جامێکی قوپاو.
(قَصْعَةٌ قَعرى): لەگەنێك کە شتێکی تێدابێت بنەکەی گرتبێت و داپۆشیبێت.
(اَلقَعُور والقَعير): قووڵ/ بندوور.
(اَلمِقْعَار): کەسێکە بە قورگ قسە بکات.
(إناءٌ مِقْعار): قاپێکی قووڵ.
(قَعْبٌ مِقْعـار): جامێکـی فراوانی گەورەی قووڵ.
(القَيْعَـر والقَيْعَار): ئەوەی بە قورگ قسـە بکات.
(اَلمُقَعَّر): ١-قووڵ/ چاڵ/ بەناوداچوو/ قوپاو.
(مِن- الخُطوط): هێڵی قوچاو/ بەناواچوو.
٣-(قَعَرَ-تِ الشـاةُ. قَعْراً): مەڕەکە بەراویتە بوو.
(قَعَّرَ-تِ الشاةُ): مەڕەکە بەراویتە بوو.
٤-(القَعـر (ج) قُعور): ئـاوەزی پڕ/ دانایی/ ژیریی تەواو.
قعس: ١-(قَعَسَ. قَعْساً): لە ڕۆیشتندا سنگی دەرپەڕی و پشتی بۆ ناوەوە چوو.

(-الشيءَ): شتەکەی نوشتانەوە/ چەمانەوە.
(-قَعْساً): لە ڕۆیشتندا لاسایی سنگدەرپەڕیوو پشت تێقوپاویکردەوە.
قَعِسَ. قَعَسـاً: سـنگدەرپەڕیوو پشت بەناودا چووی زگماکبوو (پێچەوانەی کۆم).
(قَعِس (ج) قَعْسـان وأقْعس (م) قَعْساء (ج) قُعْس): سنگدەرپەڕیوی پشت بەناوداچوو.
(تَقاعَسَ): سنگی دەرپەڕاند.
(-فُـلانٌ): فیسـار خـۆی ڕەپکـردو سـنگی دەرپەڕاند.
(بَعـيرٌ أقْعَـس): حوشـتری سـەرو پشـتو ملخوار.
(فَـرَسٌ أقْعَسُ): چارەوێیەکی خۆشـڕەوتو نەرم.
٢-(أقْعَسَ): دەوڵەمەند بوو.
٣-(تَقاعَـسَ العَـزُّ): نگینەکـە/ هێژاییەکە پایەدار بوو.
(اَلأقعس (م) قَعْساء): قایمو زۆر بەهێزو نەبەرد.
(«عِـزٌ أقعَـسُ»): هێژاییەکـی/ نگینێکـی پایەدارو هەمیشەیی.
(عِزَّةٌ قَعسـاء): سـەروەرییەك/ نگینییەکی پایەدارو هەمیشەیی.
(لَيلٌ أقْعَسُ): شەوێکی درێژ وەك نەبڕێتەوە وایە.
(اَلمُقْعَنِس (ج) مَقاعِس ومَقاعيس): ١-توندو سەخت ٢-ملنەدەر.

٤-(تَقاعَسَ- عَنِ الأَمــرِ): ١-خۆی له كارەكه دواخستو تەمەڵییكرد ٢-دواكەوت.
(-الفَــرَسُ وغَــيرُهُ): چارەوێكــه یــان هیتر سەركێشییكرد ملی بۆ سوارەكەی نەدا.
(إِقْعَنَــسَ- الرَجُــلُ): دواكــەوتو گەڕایەوە دواوە.
٥-(القُعَاس): دەردێكه مەڕی پێمرداردەبێتەوە.
٦-(تَقَعْوَسَ- الشَــيخُ): پیرەكه تەواو گەورە بوو/ تەمەنی زۆر بوو.
(-البَيتُ): خانووەكه ڕما/ ڕووخا.
(-الرَجُلُ عَنِ الأَمرِ): لــه كارەكه دواكەوتو نەچووەوە بەلایدا.
(-القَعُوس): ١-پیری ئیفتــادە/ زۆربەتەمەن ٢-هەموو شتێكی ئەستوورو پشتقایم.
٧-(قَعْسَرَ- هُ. قَعْسَــرَةً): لەگەڵیدا توندوتیژ بوو.
(-الشيءُ): شتەكە/ ڕەقو توندو پتەو بوو.
(-عَلَيهِ): لەگەڵیدا ڕەقو توند بوو.
(أَلقَعْسَــرِيُّ) (ح): ١-حوشتری كەتەی قایمو توند ٢-دەسكی دەستار كه دەستارەكەی پێ خولدەدرێت.
(عِزٌّ قَعْسَرِيٌّ): (هێژاییەكی/ نكینێكی) كۆن.
قعش: ١-(قَعَشَ- الشــيءَ قَعْشــاً): شتەكەی كۆكردەوە.
(-الحائطَ): دیوارەكەی ڕووخاند.
(إِنْقَعَشَ): ڕووخا/ ڕما.
(-القَومُ): خوێشگەل ڕۆیشتن.

(أَلقَعْش (مص) (ج) قُعُوش): بارگەوبنه بۆ ژنان كه وەك كەژاوە وایه.
٢-(قَعْوَشَ-هُ): دایبەزەوییدا.
(-البِناءَ): خانووەكەی هەڵوەشاند.
(تَقَعْــوَشَ- البَيــتُ): خانووەكــه (تەپــی/ ڕووخا).
(-الجذْعُ): قەدی دارەكه چەمییەوە.
قعص: ١-(قَعَــصَ وأَقْعَــصَ- هُ قَعْصاً): ١-له شوێنی خۆیدا كوشتی ٢-هەموو لەشی زامدار كردو كوشتی.
(قُعِــصَ-تِ الشــاةُ قَعَصــاً): تووشــی دەردە مرداربوونەوە بوو.
(إِنْقَعَصَ): له جێی خۆیدا مرد.
(أَلقَعْــص) (مــص): ١-مردنی لەپــڕو خێرا ٢-خانووی لێهەڵوەشاو.
(أَلقُعاص) (طب): ١-دەردێكه مەڕ دەیگرێتو هــەر زوو مــردار دەبێتــەوە ٢-دەردێكــه له سنگدایه وەكو ملی بشكێنێت وایه.
(أَلقَعَّاص والمِقْعَص والمِقْعاص): شــێر كه زوو دەكوژێت.
٢-قَعِصَ-تِ الشــاةُ. قَعَصــاً): مەڕەكه فێری لەقه وەشاندنبوو.
(القَعُــوص): مەڕێكی لەقەوەشــێن لەقه له دۆشەرەكەیدەداتو ناهێڵێت بیدۆشێت.
٣-(إِنْقَعَصَ- الشــيءُ): شتەكەی پێچیخوارد/ نوشتایەوە.

قعض: (قَعَـضَ- الغُصْنَ قَعْصاً): (چڵەکەی/ لقەکەی) چەماندەوە.

(إنْقَعَضَ): نوشتایەوە/ چەمایەوە.

(ألقَعْـض) (مـص)= المَقْعُوض): نوشـتاوە/ چەماوە.

(عـودٌ قَعْضٌ= مَعْطـوف): چێویکی، چڵێکی نوشتاوە/ چەماوە.

قعـط: ١-(قَعَـدَ. قَعْـداً): قیژانـدی/ توند هاواریکرد.

(-فُلاناً): دەریکردو دای بە زەویدا.

(-عَلَیهِ): لێیتووڕە بوو.

(قَعِـطَ. قَعَطـاً): سەرشـۆڕو ڕسـوا بـوو/ سووکبوو.

(قَعَّطَ- فِي القَولِ): قسەی قۆڕو دزێویکرد.

(أقْعَطَ): قیژاندی.

(-هُ): سووکیکردو ڕسوایکرد.

(-فِي القَولِ): قسەی ناشیرینو سووکیکرد.

٢-(قَعَطَ- الشَيءَ قَعْطاً): شتەکەی ڕاست ڕاگرت.

(-العمامَةَ): مێزەرەکەی بەست.

(قَعَطَ وقَعَّـطَ- الدابَّـةَ): وڵاخەکەی خێرا (دایەپێش/ لێخوری).

(قَعَّاط): خێرا لێخوڕ/ لێخوڕێکی توندوتیژ.

(-علـى غَريمِهِ): بـۆ وەرگرتنەوەی وامەکە تەنگـی بـە (وامەوەرگرەکـە/ قەرزارەکـە) هەڵچنیو زۆری بۆ هێنا.

(أقْعَطَ- فِي أثَرِهِ): بەدوایدا تیژ بوو/ توند گەڕا.

(إقْتَعَـطَ- العَمامَةَ): (سـەرو بەسـتەکەی/ مێزەرەکەی) بەسەر خۆیەوە توند کرد.

(ألقاعِط) (فا): زۆربۆهێنی قەرزارەکە.

(ألمِقْعَط والمِقعَطَة): سەروبەست/ مێزەر.

٣-(قَعَطَ. قَعْطاً): زیڕەیکرد/ زۆر ترسا.

٤-(قَعَـطَ- عَن وَجْهِـهِ. قَعْطاً): ڕووی خۆی (هەڵماڵی/ دەرخست).

(أقْعَـطَ- القَـومُ عَنـهُ): خوێشـان لێـوەی دەرکەوتن.

(تَقَعَّـطَ وانقَعَـطَ- السَّـحابُ): هەورەکـە ڕەوییەوە.

٥-(قَعَطَ. قَعْطاً): وشکبوو.

(ألقَعَّـاط والمُقَعِّـط): لووتبەرزی/ وشـکی/ بەفیزی ناشیرین.

٦-(القَعْط): ڕانەمەڕ.

٧-(قَعْطَـبَ- الشَـيءَ): شـتەکەی (بـڕی/ لەتکرد).

٨-(قَعْطَرَ-هُ): ١-دایبەزەوێدا ٢-بەستیەوە.

(-الإناءَ): قاپەکەی پڕکرد.

(إقْعَطَرَّ): هەناسەی بڕا.

٩-(قَعْطَلَ-هُ): دایبەزەویدا.

(-على غَريمِهِ): تەنگی بە (وامەرگرەکەی/ قەرزارەکەی) هەڵچنی.

(ألقَعْطَل): خێرا/ چابوك/ گورج.

قعف: ١-(قَعَفَ- التُرابَ قَعْفاً): لە ڕۆیشـتندا خۆڵەکەی ڕادا.

(النَخلَةَ): دارخورماكەی لەبن هەڵكێشا.
(-ماقي الإِناءِ): هەرچی لە قاپەكەدا بوو هەمووی هەڵلووشی.
(-المَطَرُ الحِجارَةَ):بارانەكە هەموو بەردەكەی رادا.
(قَعِفَ- الحائِطُ. قَعَفاً): دیوارەكە رما/ كەوت.
(تَقَعَّفَ وانْقَعَفَ- الحائِطُ): دیوارەكە بنكەندبوو و رما.
(-الجُرفُ): كەندەكە رووخاو داكەوتە خوارێ.
(-الشيءُ): شتەكە لە شوێنی خۆی خزا.
(إقتَعَفَ- الحائِطُ والجُرْفُ والشيءُ): دیوارەكە لە بنەوە كەوتو كەندەكە رماو شتەكە داخزایە خوارەوە.
(-الشيءَ): شتەكەی بە (تاسووقەوە/ بە حەزێكی زۆرەوە) وەرگرتو برد.
(ألقاعِف) (قا): لێزمە باران.
(سَيلٌ قُعافٌ): لافاوێكی رامالی هەموو شتێك.
٢-(ألقَعَف): كۆمەڵە چیای بچووكی یەك لەسەریەك.
٣-(قَعْفَزَ- الرَجُلُ): ئەژنۆی هەڵناو وەك بیەوێت شتێك بكات.
(-في المَشي): بە هەنگاوی ورد رۆیشت.
(-له الكَلامَ): بە قسەو هەرەشە ویستی لە خۆی دووربخاتەوە.
(تَقَعْفَزَ- الرَجُلُ): چۆكیدادا.
(إنْعَنفَزَ): دانیشت.
(جَلَسَ القَعْفَزى):وا دانیشت وەك خەریكی راپەرینبێتو پەلاماردانبێت.
قعل: ١-(أقْعَلَ وأقْعأَلَّ- النَورُ. إقْعِئْلالاً): مێوەكە كەوتە رشانەوە.
(إقْتَعَلَ- القُعالَ): بەدەستی خۆی مێوە رشاوەكەی راوەشاند تا لێیبێتەوە.
(ألقُعالَة): ١-وردە دەنكێكی رشانەوەی گوڵی مێو.
(ألقُعال): گوڵی مێو كاتێك دەردەكەوێتو مێوەكە دەرشێتەوە.
(ألقُعالَة): تووكی وەریوی حوشتر.
٢-(إقْعَألَّ- الراكِبُ): سوارەكە (راستبووەوە/ قنجبووەوە).
قعم: ١-(قَعَمَ- السِنَّورُ قَعْماً): پشیلەكە میاواندی.
(أقْعَمَ-تِ الشَمسُ): خۆر بەرزبووەوە.
٢-(قُعِمَ- الرَجُلُ. قَعَماً): پیاوەكە دەردێكی كوتوپڕیگرت/ لێیهاتو مرد.
(أقْعَمَ-تِ الحَيَّةُ فُلاناً): مارەكە بە فیساریەوە داو كوشتی.
(أُقْعِمَ- الرَجُلُ): پیاوەكە دەردی كوتوپڕیگرتو مرد.
٣-(ألقَعَم): خواریی لووت.

(الأَقْعَم): لووتخوار.

(قُعْمَـةُ المـال): مالـی (چـاكو بەبەهـا/ هەڵبژاردە).

(القُعْمُوط والقُعْموطَة (ج) قَعامِيط): قوماتی ساوا/ پەرۆیەکە ساواکەی تێوەدەپێچرێت.

(قُعْمُطـةُ المال): هەڵبـژاردەو ناوێزەی ماڵ/ دارا.

قعـن: (قَعِنَ- الأَنْفُ): لووتی کورتو داتەپیو بوو یان کونەلووتی بەرزو فشبوو.

(أَقْعَن (م) قَعناء (ج) قُعْن): لووت داتەپیوو یان کونەلووتفش.

(قُعَين): لووت کەم تەپیو.

(القَعْن): تەشتی هەویر شێلان.

قعـي: ١-(قَعِـيَ. يَقعـى. قَعـا): پەرەکەی لووتـی بەرزبـووەوە بەلای ئێسـکی لووتیدا خواربووەوە.

(أَقعى (م) قَعْواء): لووتداخوار.

(أَقعى أَنْفُهُ): پەرەکەی لووتی قنج بوو بەلای ئێسکی لووتیدا خوار بوو.

(-الكَلْـبُ): سـەگەکە چیچکەیکرد/ لەسـەر سمتی دانیشت.

(-فَرَسَهُ): چارەوێکەی پاشەوپاش گێڕایەوە.

٢-(القَعْو (ج) قُعِيّ): تەوەرەی ئاسن.

(القَعْـوان (ج) قُعِـي): دوو تەختـە یان دوو پارچە ئاسـن تەوەرە لە نێوانیاندا دەبێت یان بەکرمیەکیان لە نێواندا دەبێتو دەخولێتەوە.

(القَعْوَةُ (ج) قَعىً) (ع ا): بنی ڕان/ بنڕان.

قفّ: ١-(قَفَّ- العُشـبُ أَو الشَجَرُ): گیاکە یان درەختەکە وشکبوو.

(-تِ الأَرضُ): زەویەکە سەوزییەکەی وشکبوو.

(-الشـيءُ): شـتەکە بەیەکداچوو و کرژبوو وەك سەبەتەی لێهات.

(-الثَوبُ): پاش شتن جلەکە وشکبووەوە.

(أَقَفَّ): لەوەڕو پاوەنی وشکی دۆزییەوە.

(إِسْتَقَفَّ): کرژ بوو چوومیەكو تۆپەڵە بوو.

(أَلقُفّ (ج) قِفاف وأَقفاف): ١-کورت ٢-کۆمەڵە بـەردی بەیەکدا چـوو کە گـڵو نەرمیی لە نێوانیاندا نەبێت.

(القَفّ): سەوزەی وشکەوەبوو.

(القُفَّةُ (ج) قُفَف): ١-درەختیوشك٢-كوولەكەی وشـك ٣-سـەبەتەکە بە گـەڵای دارخورما لە شێوەی کوولەکەدا دروستدەکرێت.

(القُفَّـة والقَفَّـة- مِـنَ الرجـال): ١-پیاوی کورتەبالا ٢-بێهێز.

(القِفَّة): جۆری وشکبوون.

(القَفيف): گیاو هەموو سەوزمیەکی وشکبوو.

٢-(قَفَّ- الشَـعْرُ. قُفُوفاً): قژەکە لە تۆقینـدا ڕاستبووەوە/ ڕەپبوو.

(القَفَّةُ القُفَّةُ والقِفَّةُ): موچركو لەرزی تا.

٣-(قَفَّ- الصَيرَفِـيُّ. قُفُوفاً): پارە گۆڕەوەکە لە ژێرەوەو ناو پەنجەیەوە پارەیدزی.

(القَفّـاف): پارەگـۆڕەوەی دز لـە نێـوان

پەنجەکانیەوە.

٤-(أَقَفَّ-تِ الدَّجاجَةُ): مریشکەکە لە هێلکە چووەوە.

(-تِ العَينُ): چاوەکە فرمێسکی وشکبوو.

٥-(القُفّ (ج) قِفاف وأَقْفاف): ١-پشـتی شت ٢-کونی تەور یان تەشـویْ ٣ هەڵەت/ بەرزیی زەویـی ٤-هـەوری کەلەکبـوو کە وەك شـاخ دەنوێنێت.

٥-(-مِنَ الناس): خەڵکی (سووك‌و خوێڕیی/ هەرچی‌و پەرچی).

(قُفُّ- البِئْرِ): سەکۆ کە بە چوار لای بیرەکەدا دەکرێت.

(أَلقُفَّـةُ (ج) قُفَف): ١-درەختێکـی بەر تاڵە ٢ شتێکە وەك تەور ٣-هەڵەت/ بەرزیی زەوی.

(أَلقِفَّة): مارمزا/ ئەوەی کە یەکەمجار ساوای تازەبوو دایدەنێ وەك پیسایییە.

(أَلقَفّان): دەستپاك/ جێی بروا.

(«أَتَيتُـهُ على قَفّان ذلك»): پـاش ئەوە لە کاتی خۆیدا هاتمە لای.

(«هذا قَفّانُهُ»): ئەمە کاتی خۆیەتی.

٦-(قَفْقَفَ وتَقَفْقَفَ. قَفْقَفَةً): لەسـەرماندا یان لەبەر شتێتر هەڵلەرزی.

(-النَبْتُ): رووەکەکە وشکبوو.

(قَفْقَفا- الطائرِ): هەردوو باڵی باڵندەکە.

(-البَعيرِ): ئێسقانی چەناگەو هەردوو کاکیلەی حوشترەکە.

قفيء: (قَفِيءَ- المَكانُ قَفْأً): گیای شـوێنەکە باران دایرزاند یان خۆڵی لەسـەر کەڵەکە بوو فەوتاندی.

(إِقْتَفَـأَ- الخَـرْزَ): دووبـارە بەسـەر کونی مووروووەکاندا چووەوە.

قفـث: (قَفَثَـلَ- الشَـيءَ): شـتەکەی خێرا رامالی.

قفح: (قَفَحَ-هُ): رِقی لێبووەوەو وازی لێهێنا/ بەجێیهێشت.

(-الشَيءَ): شتەکەی وەك دەرمان بەکارهێنا.

(-عَنِ الشَـيءَ): نەچـوو بەلای شـتەکەدا/ نەیویست.

(أَلقَفيحَة): کـەف‌و چەوری ئەو جامەی کە مەری لەسەر دەدۆشرێت.

قفـخ: (قَفَـخَ-هُ قَفْخـاً و قَفاخـاً): لێیدا (لێدانەکە هەر لە شـتی بۆش‌و وشك‌و سەری مرۆڤ دەدرێت).

(أَلقَفيخَة): چێشت/ خواردن/ خۆراك.

قفد: ١-(قَفَدَ- الرَجُلُ قَفْداً): کارەکەی کرد.

(«مازلت أَقْفِدُ لك مُنـذُ اليَوم»): بەردەوام لەم رۆژەوە کارت بۆ دەکەم.

٢-(قَفَدَ-هُ. قَفْداً): بە بەری دەسـتی کێشای بە پشتی ملیدا.

٣-(قَفَـدَ. قَفْـداً): سـەروپێچەکەی تـەواو بەست‌و کلکی پێچەکەی شۆڕنەکردەوە.

(«إِعْتَـمَّ القَفْـداءَ أَو القَفَـدَ): مێزەرەکەی

بەستو كلكی مێزەرەكەی شۆڕنەكردەوە.
٤-(قَفِدَ. قَفَداً): ملشل یان مل ئەستوور بوو.
(ألأَقْفَد (م) قَفْداء): ١-ملشل یان مل ئەستوور ٢-كەسێكە لەسەر سنگی پێی دەڕواتو پاژنە دانانێت ٣-دەستو قاچ كورتو كرژو پەنجەكۆڵی زكماكی.
٥-(القَفَدان والقَفَدانَة) (فارسیة)١-كلدان ٢-توورەكەیەكی لە چەرم بۆنو عەتری تێدەخرێت.
قفر: ١-(قَفَرَ وتَقَفَّرَ واقْتَفَرَ- الأَثَرَ): شوێن پێكەی هەڵگرت/ بەدوای ئاسەواریدا گەڕا.
٢-(قَفِرَ- مالُهُ. قَفَراً): دارای كەمبوو.
(قَفِرُ المال): كەسێكی دارا كەم/ نەبوو/ دەستكورت.
(-الطعامُ): خواردنەكە بێپێخۆر بوو.
(أقْفَرَ- الرَجُلُ): ١-كابرا بێخواردنبوو/ خواردنەكەی ڕۆیشت ٢-خواردنی هیچ نەما ٣-بەرەو بیابانی وشك ڕۆیشت.
(-المكانُ): شوێنەكە چۆڵبوو نە كەسی تێدا بوو، نە ئاوو نە لەوەڕگا.
(-الرَجُلُ): ١-كابرا برسیبوو ٢-نانی ڕووتیخوارد.
(-الرَجُلُ مِنْ أهلِهِ): لە خێزانەكەنی تاكبووەوەو بە تەنیا بوو.
(-رَأسُهُ مِنَ الشَعرِ): سەری ڕووتایەوە بێموو بوو.
(-البَلَدَ): شارەكەی دی چۆڵو هۆڵبوو.
(-العَظمَ): هیچی بە ئێسقانەكەوە نەهێشت.
(إقْتَقَرَ- العَظمَ): ئێسقانەكەی داماڵیو گۆشتی پێوە نەهێشت.
(ألقَفْر (ج) قِفار وقُفُور): بیابانی چۆڵو بێئاوو بێلەوەڕو بێئاوەدانیو خەڵك.
(أرْضٌ قَفْرٌ وأرْضٌ قِفارٌ): زەویی چۆڵو بێئاوەدانیو ئاوو لەوەڕ.
(«نَزَلْنا بِبَني فُلان فَبِتْنا القَفْرَ»): لەلای فیسار بەرە دابەزین، وشكوبرنگبوون، میوانداریان نەكردین.
(«باتَ فُلانٌ القَفْرَ والوَحْشَ»): فیسار مایەوە بێخواردنو بێكەس.
(ألقَفر): نۆبەن ئەگەر لە دایكەكەی دوور بخرێتەوە بۆ ئەوەی جوتی پێبكرێت.
(«خُبزٌ قَفْرٌ وقَفارٌ»): نانی بێپێخۆر/ نانی وشكو ڕووت (لە وڵاتێكی وشكو برنگەوە هاتووە).
(ألقَفَر) (مص): قژی سەر/ تووك.
(القَفِر): كەمتووك ٢-گورگی بیابان.
(ألقَفْرَة (ج) قَفَرات): چۆڵەوانیی وشكو برنگو بێئاوو ئاوەدانییو لەوەڕ.
(ألقَفیر (ج) قُفْران): نانی بێپێخۆر.
(أرضٌ مِقْفار): زەوییەكی چۆڵ.
٣-(قَفَرَ- التُرابَ ونَحْوَهُ): خۆڵەكەی كۆكردەوە.

(القافُــور والقَفُور والقَفُّــورَة): هەلآڵەدانی دارخورما.

(ألقَفــير (ج) قُفْــران): ١-ســەبەتە/ زەمیلە ٢-کوورەی هەنگ (عامیە).

قفز: ١-(قَفَزَ. قَفازاً وقَفَزاناً وقِقازاً وقُفُوزاً): مرد.

٢-قَفَــزَ- الغَــزالُ. قَفْــزاً وقَفَزانــاً وقِفازاً وقُفُوزاً: ئاسکەکە بازدیدا/ قەڵەمبازیبرد.

(قَفَّزَ-هُ): بازدی (پێبرد/ پێدا).

(تَقافَــزَ- القَــومُ): بازیــان بــۆ لایەکــتردا/ بازبازێنیان کرد.

(ألقافِزَةُ (ج) قَوافِز): مێی وشــەی (ألقافِز) ٢-چارەوێی گورج/ چابوك/ خێرا ٢-(ح) بۆق.

(ألقَفَزی): بازدان/ باز.

(عَدَتِ الخَیلُ القَفَزی»): بەبازدان غاریانکرد.

(ألقَفّاز): بازدەری چاك.

(ألقُفَیــزی): یارییەکــی منــداڵان: دارێــك هەڵدەنێنو بەسەریدا بازدەدەن.

٣-(قَفِزَ- الفَــرَسُ قَفَزاً): چارەوێکە هەردوو دەستی تا ئەژنۆی سپیبوو قاچی وا نەبوو.

(تَقَفَّزَ- بالحَناء): دەستو قاچی نیگارکێشی (خەنە کرد/ دەستو قاچی لە خەنە گرت).

(ألقُفّــاز (ج) قَفافیــز): ١-پاوانــەو بــازن ٢-دەستکێش.

(ألکُفوف) (عامیة): دەستکێش.

(ألأقْفَــز والمُقَفَّز- مِنَ الخَیل): ئەســپێك کە هەردوو دەســتی تــا ئەژنۆی ســپیبێت وەکو دەستکێشی لەدەســت کرابێت بێئەوەی قاچی هیچی هەبێت، وا بێت.

٤-(القَفیز (ج) أقْفِزَة وقُفزان): پێوەر.

(-مِنَ الأرض): بڕی ســەدو چـلو چوار باڵ زەوی.

الملحق:

قفز: (ألقَفْز): باز/ قەڵەمباز.

(«القَفزُ في الهَواء»): بە ئاسماندا خۆهەڵدان.

(«القَفْــزُ بالمِظَلَّــة»): بــە پەرەشــۆت هاتنەخوارەوەو خۆهەڵدان.

(ألقَفْز- في الالعاب الرياضية): لە وەرزشــدا: بازدان/ جووڵەیەکە لــەش بەرزدەبێتەوە بۆ خۆهەڵدانو تێپەڕبوون بەســەر شتێکدا یان بگاتە دوورترین جێ لەو خۆهەڵدانەدا.

(«القَفز بالعَصا»): بازدان بە هۆی دارەوە.

(القَفــز الطَويل): بازدی درێــژ/ یەکباز یان سێباز.

---

قفس: ١-(قَفَسَ- الشــيءَ. قَفْســاً وقُفُوساً): شتەکەی بە زۆرو دەگەنگ لە چنگ دەرهێناو داگیریکرد.

(-فُلانــاً): قــژی فیســاریگرتو ڕایکێشــاو دایبەزەویدا.

(تَقَفَّسَ- الظَبيُ): ئاسکەکە بازدیدا.

(تَقافَسَ- الرَجُلان بِشُعُورِهما): دوو پیاوەکە پەلاماری یەکتریانداو قژی یەکتریان ڕاکێشا.

(ألقافِسَةُ): مێی وشەی (القافِس).
٢-(قَفِسَ. قَفْساً وقُفُوساً): مرد.
٣-(قَفَسَ. قُفاساً): تووشی دەردی جومگە بوو وەك كرژبوونی جومگە.
(-الظَبيَ قَفْساً): هەردوو دەستو قاچی ئاسكەكەی بەست.
٤-(قَفِسَ. قَفَساً): لای پەرەكەی لووتی گەورە بوو.
٥-(القافِسَةُ): زمانبەدەكان/ بەدەكان.
(قَفاس): ئافرەتی كۆیلەی بەدزمان.
(ألأَقْفَس): ١-كوری ژنی كۆیلە ٢-هەرچی بالایكردو نوشتایەوە/ چەمایەوە.
(عَبدٌ أقْفَس): كۆیلەیەكی بەدزمان/ ناپاك.
(ألقَفْساء): ١-مێی وشەی (ألأقْفَس) ٢ كچە كارەكەری بەدزمان ٣-گەدە یان سك.
قفش: ١-(قَفَشَ- الطعامَ. قَفْشاً): بە پەلە خواردنەكەیخوارد.
(-الناقَةَ): خێرا مێحوشترەكەی دۆشی.
(-ماڤي الضَرْعِ): شیری هیچ لە گواندا نەهێشتەوە.
(القَفْش) (مص): چالاكیی.
٢-(قَفَشَ-هُ بالعَصا): بەدار لێیدا.
٣-(قَفَشَ. قَفْشاً وقُفُوشاً): مرد.
٤-(قَفَشَ- الشَيءَ. قَفْشاً): شتەكەی بردو كۆیكردەوە.
(إنْقَفَشَ واقْتَفَشَ واقفَتَششَ- العَنكَبوتُ ونَحْوُهُ): جالْجالۆكەكە یان هاوشێوەی، قاچەكانی گرمۆڵە كردو خۆی بە كونەكەیدا كرد.
٥-(القَفْش) (فارسیة): كەوشی كورت.
(ألقَفَش): دزەكان.
قفص: ١-(قَفَصَ- الظَبيَ قَفْصاً): دەستو پێی ئاسكەكەیگرتو بەستی.
(-الشيءَ): شتەكانی خستە پاڵ یەكو لە یەكی نزیككردنەوە.
(-اليَعسوبَ): شاهەنگەكەی لە كوورەكەدا بە پەت بەستەوە بۆ ئەوەی دەرنەچێت.
(قَفِصَ. قَفَصاً): لەسەرماندا خۆی گرمۆڵە كردو لەشی كرژ بوو.
(قَفِصٌ): گرمۆڵەو كرژ بوو لەسەرماندا.
(قَفَّصَ- الظَبيَ): دەستو پێی ئاسكەكەی یەكخستو بەستنیەوە.
(أقْفَصَ- الرَجُلُ): بوو بە خاوەنی قەفەزێك باڵندە.
(تَقَفَّصَ): كۆبووەوە.
(تَقافَصَ): بەیەكداچوو و گرمۆڵە بوو.
(ألقافِصَةُ (ج) قَوافِص): مێی وشەی (ألقافِص).
(ألقُفُص والقَفْص): تێكچرژاوو بەیەكداچوو.
(ألقَفَص= القُفص): تێكچرژاوو بەیەكداچوو.
(ألقَفَص (ج) أقفاص): قەفەزی باڵندە ٢-دەفرێكە گەنمو شتی وەهای تێدەكەنو پێیدەگوێزنەوە.

(ألقُفاص): دەردێکە تووشــی چوارپێ دەبێت چوارپەلی وشکدەگات.
(ثوبٌ مُقَفَّص) (مفــع): بەرگێکی میلدار لە شێوەی قەفەزدا.
٢-(قَفَصَ- الرَجُلَ. قَفْصاً): ئازاری پیاوەکەیدا.
٣-(قَفِصَ. قَفَصاً): سووکەڵەو چالاکبوو.
(-الفَرسُ): چارەوێکە لــە غاردا تەواو تینی نەدایە خۆی چوارناڵەیکرد.
(قَفِص): غارکردەی شێنەیی/ چوارناڵە.
(ألقُفَــاص) (ح): بزنەکێــوی (لەبــەر قەڵەمبازەکانی وایپێدەڵێن).
٤-(القافِصَةُ): بەدزمانەکان/ دوزمانەکان.
الملحق:
قفص: (ألقَفّاص): کەســێکە پیشــەی قەفەز دروستکردنبێت/ قەفەز دروستکەر.
الملحق:
قفــط: (ألقُفْطان): بەرگێکــی درێژی فش و فۆڵــە پێشــەکەی هەڵقلیشــاوەو بە پشــتێن بەلەشەوە قایمدەکرێت لە ئاوریشم یان لۆکە دروستدەکرێت.
قفــع: ١-(قَفَعَ- هُ. بالمِقْفَعَةِ. قَفْعاً): بە داری لێدانەکە لێیدا.
(-هُ عَــن کــذا): بــەری ئــەوەی لێگــرت/ لێقەدەغەکرد.
(إنْقَفَــعَ- عَنــهُ): بەلایدا نەچــوو/ توخنی نەکەوت.
(ألقَفّاع): چاکلێدەر/: چاککوت.
(ألمِقْفَعَــة): تەختەیەکــە بەدەســتو قاچدا دەکێشرێتو پێیلێدەدرێت.
٢-(قَفِعَ-ت الأُذُنُ قَفَعاً): قەراغی گوێچکەکە کرژبو لوولبوو.
(قَفْعاء): گوێ قەراغ کرژو لوول.
(أقْفَــع): کەســێکە قەراغــی گوێــی کــرژو لوولبێت.
(-تِ الرِجْلُ): پەنجــەی قاچەکان بۆ ناوەوە چەماوەتەوە.
(-تِ الشاةُ): مەڕەکە دووگەکەی کورتبوو.
(قَفَّعَ- الشيءَ): شتەکەی خستە قاپەوە.
(-البَــردُ أصابِعَهُ): ســەرما پەنجەکانی لەگۆ خستو وشککردو کرژیکرد.
(تَقَفَّعَ-تِ الأُذُنُ والرِجلُ والشــاةُ): گوێچکە کــە قەراغەکــەی کــرژو لوولبــوو. قاچەکە پەنجەکانی بۆ نــاوەوە خواربووەوە. مەڕەکە دووگەکەی کورتبوو.
(-الشيءُ): شتەکە چوومیەك و کرژبوو.
(إنْقَفَعَ- النَّباتُ): رووەکەکە وشکورەقبوو.
(ألقَفَــع. الواحِدَةُ قَفَعَــة) (ا ع): ئامێرێکی کۆنی شەڕە/ جەنگەو سەرگیراوە وەك ژوورێك ســەرباز دەچووە ناوی لە گەمارۆدانی قەلای دوژمنــدا بەکاردەهێنرا قەلاکەیان کوندەکرد بێئەوەی دوژمن بە خۆی بزانێتو دەچوونە ناو قەلاکەوە.

(أَلقَفَع) (مص): ١-تەنگانە ٢-ماندوێتیی.
(أَلقَفْعَـةُ (ج) قَفَعَات وقَفَعَات): سـەبەتەی فیردراو بنەكەی پانو دەمەكەی تەسكبوو.
(أَلقُفَّاع والقُفاع): شـەڵكە كە تووشـی پێی ئاژەڵدەبێت خوارو شەلیدەكات.
(ألأَقْفَـع (م) قَفْعـاء (ج) قُفْع): ١-كەسـێكە قەراغی گوێ لوولو كرژە ٢-كەسێكە پەنجەی قاچی بەناوەدا چووبێت ٣-كەسـێكە هەمیشە سەری داخستبێت ٤-كلككورت.
(أَلقَفْعاء) (ن): گیایەكە قوڵفەیەك دەردەكات بەلام داخراو نییەو وەك ئەموستیلەیە.
(شاةٌ قَفعاء): مەرێكی دووگ بچكۆلە.
(أَلمُقَفَّع): هەمیشە سەرشۆڕ.
(رَجُـلٌ مُقَفَّــعُ اليَدَين): پیاوی دەسـتكرژو دەستكوور.
(مُقَوقِع) (عامية): كوور.
٢-(أَلقَفْعَةُ): پۆلە كوللە.
(أَلقُفَّاعَـةُ): شـتێكە لـە پەلـی خورمـا دروسـتدەكرێت، دەگیرێتە باڵنـدەو پێی ڕاو دەكەن.
قفـل: ١-(قَفَـلَ. قَفْلاً وقُفُـولاً): لە گوزار/ سەفەر/ گەڕایەوە (بە تایبەتی بۆ گوزارە).
(-الأَميرُ الجُندَ): میر سەربازەكانی گێڕایەوە.
(أَقفَلَ- الجَيشُ): سوپاكە گەڕایەوە.
(-القَومَ): بە چاو شوێن خوێشكەل كەوت.
(أَقْفَلَهُــم عَن مَبْعَثِهِــم): گێڕانیەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەیهاتبوون.
(إِنْقَفَلَ- الغُزاةُ): داگیركەرەكان پاشـەوپاش گەڕانەوە.
(-الرَّجُلُ): لەسـەر كارەكـەی یان ئەوەی كە تیایدا بوو ڕۆیشت.
(أَلقافِل (ج) قافِلَة وقُفَّال): گەڕاوە.
القافِلَـةُ (ج) قَوافِل: مێی وشـەی (القافِل): كاروان ٢-ئەوەی لەگەڵ گوزاكەرەكەدا بووبێتو گەڕابێتەوە یان خەریكی گەڕانەوە بێت ئەوە گەشـبینی بۆ زوو گەڕانـەوەی گوزاركەرەكە نابێت.
(أَلقُفل) (عامية): كاروانی ئێستر.
(أَلقَفل) (مص): كاروان.
(أَلقَفْلَةُ): پشتمل.
٢-(قَفَلَ وتَقَفَّلَ- فِي الجَبَلِ قَفلاً وقُفولاً): بە شاخەكەدا هەڵزنا/ سەركەوتە سەر شاخەكە.
٣-(قَفَلَ- الشـيءَ. قَفْلاً وقُفُولاً): شـتەكەی خەملاند.
(-الطَّعـامَ): خۆراكەكـەی كۆكـردەوەو دەسـتی بەسەردا گرد، بەسـتمەندیكرد، بۆ گرانفرۆشتن شاردیەوە.
(أَقْفَـلَ- القومَ على الأَمـرِ): بۆ ئەنجامدانی كارەكە خوێشكەلی كۆكردەوە.
(أَلقُفْل- مِنَ الغَـزلِ) (عامية): گوڵۆڵەیەكی ڕێسراو.
٥-(قَفَلَ- الفَرَسُ. قَفُولاً): چارەوێكە تێقوپا/

لاوازبوو، لەڕبوو.

(قافِل): تێقوپاوو لەر.

(قَفَلَ وقَفِلَ- الجلدُ. قُفُولاً وقَفَلاً): پێستەکە وشکبووەوە.

(أَقْفَلَ- الجلدَ): پێستەکەی وشککردەوە.

(القافِــل (فــا) (ج) قافِلَة وقُفَّال): دەســت وشکەوەبوو یان پێست وشکەوە بوو.

(خَيلٌ قَوافِل): ئەسپە تێقوپاوەکان/ لەڕەکان.

(أَلقَفْل (مص) والقَفْلَــة والقَفَلَة): ١-ئەوەی لە درەختەکە وشکدەبێت ٢-قامچی (لەوانەیە بۆیە وا ناونراوە چونکە لە پێستی وشکەوەبوو دروستدەکرێت.

(جِلْــدٌ قَفيــلٌ): پێســتێك کــە دیاربێــت وشکبووبێتەوە.

٦-(قَفَّلَ- الأَبــوابَ): دەرگاکانی (داخســت/ کولۆمکرد).

(أَقْفَــلَ- البــابَ وعلــى البــاب): دەرگاکەی کولۆمدا/ قفلی لە دەرگاکە دا.

(-البابَ): دەرگاکەی داخست.

(تَقَفَّــلَ وانقَفَــلَ واقتَفَلَ البــابُ): دەرگاکە داخرا.

(إسْتَقْفَلَ- البابُ): دەرگاکە داخرا.

(-الرَجُلُ): ڕژد بوو/ چرووکبوو.

(إسْتَقْفَلَت يَداهُ): دەستی قووچا/ چرووکبوو.

(«هو مُسْتَقْفِلٌ»): دەست قووچاوو ڕژدە.

(أَلقُفل وقُفُول): قفل/ کولۆم.

(أَلقُفَلَة): بیر تیژ/ کەسێکە هەرچی ببیسێت لەبەریبکاتو بیری نەچێتەوە.

(أَلقَفَّال): زۆر بیرتیژ.

(أَلقَفيــل): دەرەی تەنــگ/ تەســك (وەکــو داخرابێتو دوژمن لێوەی نەیەت).

(رَجُلٌ مُقْفَــلُ اليَدين ومُتَقَفِّلُها ومُقْتَفِلُها): پیاوێکــی بەدخــوازی وا کە هیچی لەدەســت نەبێتەوە زۆر ڕژد بێت.

٧-(قَفَّــلَ- الشَّــجَرَة) (عامية): ســەرپۆپی درەختەکەی بڕی.

(أَلقيفــال) (ع ا): ڕەگێکــە لــە قۆڵــدا هەڵدەدرێت.

٨-(أَقْفَلَ- المالَ): سەرجەم بە جارێك هەموو پارەکەیدایە.

(أَلقَفْلَةُ): دانی شتێك بەیەکجار.

(«أعطــاكَ أَلْفاً قَفْلَةً»): بــە جارێك هەزاری دایتێ.

٩-(القُفْلُــوط) (ن) = الكَعرَّات الاندَلُســي: کــەوەری ئەندەلوســی/ ســەوزەیەکە بۆنــی تیژە وەك ســیر. هەیانە ســاڵانەن هەیشیانە تەمەندرێژن لە وڵاتە فێنکەکاندا دەچێنرێت لاسکەکەی بە کوڵاویو بە زەڵاتە دەخورێتو بۆ میزپێکردنیش باشە.

قفن: ١-(قَفَنَ-هُ قَفناً): ١-کێشای بە پشتملیدا ٢-بەداردەست یان قامچی لێیدا.

(-الشاةَ): مەڕەکەی لە پشتملەوە سەربڕی.

(قَفِينَة): مەڕی لە پشتملەوە سەربڕراو.
(قَفِنَ قُفُوناً): مرد.
(قَفَّنَ- رَأْسَهُ): سەری قرتاند/ بڕی.
(أَقْفَـنَ واقْتَفَـنَ- الشـاةَ): لـە پشـتملەوە مەڕەکەی سەربڕی.
(أَلقَفْـن) (مـص): ١-مـردن ٢-جەنگکردن/ شەڕکردن.
(أَلقَفَن والقَفَنّ): پشتمیل.
(شاةٌ قَفِينٌ): مەڕی سەربڕاو.
٢-(قَفَنَ- الكَلبُ. قَفناً): سەگەکە ئاوەکەی بە زمان خواردەوە.
٣-(أَلقِفَنّ): مرۆڤی وشکی کەرترو نەزانداووی گەوج.
(أَلقَفَّـان): ١-دەسـتـو دڵپـاك ٢-قەپـان کە پێیدەکێشن.
(قَفَّانُ كُلِّ شـيءٍ): ئەوپەڕی سـۆراغکردنو گەڕان بۆ زانینی هەموو شتێك.
قفو: ١-(قَفـا. يَقْفُو- الرَجُلَ. قَفْوا وقُفُوّاً): کێشای بە پشتملیدا.
(-أَثَرَهُ): دوایکەوت/ سۆراغیکرد.
(-اللهُ أَثَـرَهُ): خـودا شـوێنەواریبڕیو فەوتیکرد.
(قَفَّى- فُلاناً زَيداً وبِزَيدٍ تَقْفِيَةً): فیسـاری خستە دوای زەید.
(«قَفَّيتُ على أَثَرِهِ بِفُلان»): فیسارم شوێنخست.
(-عَلَيهِ): لەناویبرد.

(تَقَفَّـى- الرَجُـلَ): شـوێن پیاوەکە کەوت/ شوێنپێی هەڵگرت.
(-الأَكَمَةَ): چووە سەر گردەکە.
(تَقَفَّى واسْتَقْفَى- فُلاناً بِالعَصا): لە پشتەوە بەدار کێشای بە پشتملیدا.
(إقْتَفَى- هُ): شوێنیکەوت.
(أَلقافِيَة (ج) قَوافٍ): ١-پشـتی (گەردن/ مل) ٢-سەرواى پاشـبەندی هەڵبەسـت یان دێڕی هەڵبەسـت/ دوا وشـەی دێڕی هەڵبەستەکە یان لەدوا وشـەوە کە بێدەنگبێت تا یەکەمین بێدەنـگ کـە لـە دوای ئـەو بێـت لەگـەڵ سەروبۆرداری پێش بێدەنگەکە وەکو.
(«ماأَطْـوَلَ اللَّيلَ على مَنْ لَمْ يَنَم»): لێرەدا سەرواکە (لَمْ يَنَم).
(أَلقافِيَة- مِن كُلِّ شيءٍ): (دواییني/ پاشەوەی/ کۆتایی) هەموو شتێك.
(«أَتَيتُـهُ علـى قافِيَـةِ الشـيءِ»): بە دوای شتەکەدا هاتم.
(أَلقَفا والقَفاء (ج) أَقْفٍ وأَقْفِيَة وأَقْفاء وقُفِيّ وقِفِـيّ وقَفُون): پشـتی مل (وشـەکە نێرە دەیشکرێت بە مێ).
(لا أَفْعَلُهُ قَفا الدَهـر»): بە درێژایی ڕۆژگار ئەوە ناکـەم/ هەرگیزاوهەرگیز ئەوە ئەنجام نادەم.
(أَلقُفيَـةُ): ئەو چاڵـەی ڕاوکەر خـۆی تێدا دەشارێتەوە.

(«هــو قَفيُّهُــم وقَفِيَّتُهُم»): ئەو پاشــینی ئەوانە.
(لا أفْعَلُهُ قَفِيَّةَ الدَهر): بە درێژایی ڕۆژگار/ هەتاهەتایە ئەوە ناکەم.
(شــاةٌ قَفِيَّــةٌ): مەڕێــك کە لە پشــتملەوە سەربڕرابێت.
(ألتَقْفِيَــة (مــص) عنــد الشــعراء): لای هۆزانڤانــەکان ئەوەیــە پیتــە دواییەکانی دێڕەکان یەکبن/ سەرواکانیان یەکبن.
(الــكَلامُ المُقَفَّى): گونجانــی پیتە دواییەکان لەگەڵ یەکدا/ بە ئاوازو سەروایەکبن.
(ألمُقَفيَ- مِــنَ الغَنَم): مەڕی لە پشــتملەوە سەربڕاو.
٢-(قَفَا- الرجُــلَ. قَفْواً وقُفُــوّاً): بە ناڕەوا پڕجنێویکردو بەداوێنپیس و بێئابڕووی دانا/ گومانبارێکرد.
(تَقافــى- الرَجُلَ): بە ناڕەواو درۆ پیاوەکەی گومانبار کردو بوختانی بۆ هەڵبەست.
(-القَومُ): جنێویان بەیەکدا/ شــەڕەجنێویان کرد.
(ألقِفْوَة): ١-گومانباریی ٢-شتی دزێوو ناشیرین خستنە پاڵ ٣-گوناه.
(ألقِفيَــة): خــەوش/ لەکــە/ ناتەواویــیو شوورەیی.
((ألقَفِيّ): دۆستو برادەرانێکت کە گومانبار کرابن.

٣-(قَفا- الرَجُلَ بأَمرٍ. قَفاً وقُفُوّاً): پیاوەکەی بۆ ئەنجامدانی کارێك لە پێشگرتو هەڵبژاردو بە تایبەتی بەویسپارد.
(أقْفَــى- الرَجُــلَ بأمرٍ): بۆ کارێــك پیاوەکەی هەڵبژاردو لەپێشیگرتوو بە تایبەتی بەویسپارد.
(-كذا على كذا): ئەوەی لەوە بەباشتر دانا.
(تَقَفَّى- الشيءَ): هەڵیبژارد.
(-بِفُــلانٍ): ڕێزێکــی بێئەندازەی لە فیســار گرت.
(إقتَفى الرَجُلَ بأَمرٍ): بۆ ئەنجامدانی کارەکە پیاوەکــەی هەڵبــژاردو ئەوی لەپێشــگرت/ بەویسپارد.
(-الشيءَ): شتەکەی هەڵبژارد.
(-بِفُلانٍ): فیساری بۆ خۆی هەڵبژارد.
(ألقَفــاوَة): ١-بــە گەرمیی پێشــوازیکردنو میوانداریکردنــی گەرمی میــوان ٢-خواردنی چاك پێشــکەش میوان بکرێت ٣-بەخشندەیی پشتاوپشت لە باووباپیرەوە بۆ بەجێماوە.
(«بِئــسَ القَفْــوَةُ قَفْوَتَــكَ»): خراپتریــن هەڵبرژاردن هینەکەی تۆیە.
(ألقَفِيّ): ١-کەسێکە ڕوویخۆش زۆر بە خەڵك بدات ٢-میوانــی ڕێزلێگیراو ٣-ئــەو خواردنە باشــەی کە میوانداریی پێدەگیرێت ٤-باشترین برادەرانی هەڵبژاردەو لێوە نزیکت.
(ألقَفِيَّة): ١-نیشانەی چاکت لە چاو خەڵکیتردا ٢-خواردنی هەڵبژێرراو بۆ میوان.

(رجُـلٌ مُقَفًّـى ومُقْفـىً بـِهِ): پیاوێکی له پێشگیراوی رێزلێنراو.
٤-(قَفَّى- تَقْفِيَةً): ملیناو هات.
٥-(ألقَفوَةُ): تۆزێکی تەنك که بارانی پەلەیان یەکەم باران هەڵیدەستێنێت.
(ألقَفِيَّة): لا/ کەنار.
(قَفِيَ قَفى- الرَجُلَ. قَفِياً): شـتی ناشیرین و داوێنپیسیی دایه پاڵ پیاوەکه.
(ألقَفِيَـة): چاڵێـك کـه راوکەر خـۆی تێدا دەشارێتەوه.
قفـل: (ألقافلَـةُ أو الهـالُ) (ن): رووەکی هێل رووەکێکی هندسـتانییه بۆنێکی خۆشی هەیەو چێژێکی تایبەتی. دەنکەکانی بەهێزکەری لەشەو بۆنخۆشه له هندسـتان وەك بەهارات بەکاردێت له هەندێك ولاتانی خۆرهەلاتدا دەکرێته قاوەوە ٢-بەری حێڵ که بۆن و بەرامەی حێله.
(ألقاقُلَّى) (ن): تەرەتیزەی دەریا. رووەکێکی تامسوێرە.
فقـم: (ألقاقـم والقاقـوم) (ح): (وشـەکه عەرەبـی نییـه): زاڵ/ ژاڵ/ ئـاس/ دەڵەکی سپی. زیندەوەرێکه سەرو روو جوان له سمۆره دەچێت بەلام گەورەتره گۆشتخۆره بۆگەنێکی پیسی لێدەردەچێت پێسـتەکەی دەکرێت به فەرووی زۆر به نرخ.
قلّ: ١-(قَـلَّ. قِلاًّ وقُـلاًّ وقِلَّـةً): کەمبوو/ کەمیکرد (ما) پێوە دەلکێت.

قَـلَّ دەبێته (قَلَّما): زۆر کـەم/ به دەگمەن/ کەمجار.
(«قَلَّما جِئتُكَ»): کەمجار سەرم لێداویت.
(قَلَّ- الرَجُلُ): کەمدارابوو دارای کەمیکرد.
(-الجِسْـمُ): لەشـەکه پووکایەوەو کەمیکرد بچووکبووەوه.
(«هُوَ يَقِـلُّ عَن كذا»): ئەو لەوە بچووکترە/ کەمترە.
(قَلَّلَ- الشـيءَ): ١-شـتەکەی کەمکـردەوە ٢-بچووکیکردەوە.
(قَلَّـلَ- الشـيءَ فِي عَـينِ فلان): شـتەکەی لەبەرچاوی فیسـار کـە منواند/ بـە کەمی پیشاندا.
(«قالَّ لَه العَطاءَ»): بەخششەکەی که ئەیدایه کەمیکردەوە.
(أقَلَّ- الشيءَ): شتەکەی کەمکردەوە.
(-الرَجُـلُ): ١-کەمهێنـا ٢-نـەدارا بوو هەژار کەوت.
(تَقَلَّـلَ- الشَـيءَ): شـتەکەی به کـەم هاتە بەرچاو/ بەکەمیدانا.
(تَقالَّ- الشيءَ): شتەکەی بەکەم دانا.
(إسْتَقَلَّ- الشيءَ): شـتەکەی بەکەمدا ناو به کەم هاتە بەرچاوی.
(ألقِلّ): دیواری کورت.
(ألقِلّ والقُلّ): کەم/ کەمبایەخ.
(-مِن الشيءِ): کەمترینی شتەکه.

(رَجُلٌ قُلٌّ): پیاوێکی تەنهاو بێکەسە.
(«هو قُلٌّ إبن قُلٍّ»): کابرا بێکەســە نە خۆی دەناسرێت‌و نە باوکی.
(اَلقِلَّـةُ (ج) قِلَــل): کەمینــە/ کەمایەتــی (پێچەوانەی زۆرینە).
(اَلقُلِّي): کەنیزەکی (کورتە باڵا/ کورتەبنە).
(اَلقَليــل (ج) قَليلُون وأَقِــلاَّء وقُلُل وقُلُلُون (م) قَليلَــة (ج) قَليــلات وقَلائِــل): ١-کەم/ کەمەکێك نەختێك/ تۆزێك ٢-باریك.
(«رَجُــلٌ قَليلُ الخَــيرِ»): پیاوێکی کەمفەرو چاکەیە/ کەمخێرە.
(«قَليلٌ مِنَ الرجالِ يَقولُ ذلك»): کەم پیاو هەیە ئەوە بڵێت.
(«ماأَخَــذْتُ مِنــهُ قَليلَــةً ولاكثــيرَةً»): نە کــەم‌و نــە زۆرم لێوەرنەگرتــووە/ هیچــم لێوەرنەگرتووە.
(القُلَــل- مِــنَ الناسِ): تاکە تاکــەی خەڵك/ کەمکەمەی خەڵك/ پەرەوازەی خەڵك.
(اَلقَلال والقُلال (ج) قُلُل): کەم.
(اَلأَقَلّ): کەمتر یان/ کەمترین.
(اَلأَقَلّ والمُقــلّ): هەژارێك کــە ئاهێکی تێدا مابێت.
(قَــومٌ أَقِلَّة): خوێشــگەلێکی رِســواو بێرێز/ نزم.
٢-(قَلَّ- الشيءُ. قَلاًّ وقُلاًّ وقِلَّةً): بەرزبووەوە.
(-الشيءَ قَلاًّ): شتەکەی هەڵگرت.
(-هُ عَنِ الأَرضِ): شــتەکەی لــە زەوی بری‌و بەرز کردەوە.
(أَقَلَّ- الشيءَ): شتەکەی هەڵبری، بەرزیکردەوە.
(-تْــهُ الرِعْــدَةُ): تووشــی لەرزینبــوو/ لەرزگرتی.
(تَقالَّ-تِ الشَمسُ): خۆر بەرزبووەوە.
(إِسْــتَقَلَّ- الشــيءَ): شــتەکەی هەڵگــرت‌و بەرزیکردەوە.
(-الطائِرُ في طَيَرانِهِ): باڵندەکە لە فرینەکەیدا بەرزبووەوە.
(-القَومُ): کۆچیانکرد.
(-السَّحابُ): هەورەکە بەرزبووەوە.
(-فلانٌ غَضَباً): لــە تووڕەییدا بەرزبووەوەو لە شوێنەکەی خۆی دەرچوو.
(-تْــهُ الرِعْدَةُ): لەرز بە لەشــیدا هات/ لەرز گرتی.
(-بالأَمــرِ): توانای بەســەر کارەکەدا شــکا/ تابوشتی کارەکەیبوو.
(-برَأيِهِ): هەر بە رِای خۆیکرد.
(-بِكَــذا): بە تەنیا ئەو شــتەی گرتە خۆی‌و کەسی تێدا بەشدار نەکرد.
(اَلقِلّ): لەرزو مووچرکە.
(اَلقُلَّــة (ج) قُلَــل وقِلال): ١-(تەوقەســەر/ لووتکە/ پۆپە)ی ســەری مرۆڤ‌و شــاخ‌و هــی هەمــوو شــتێك ٢-کووپــەی زۆر گکــەورە ٣-گۆزەڵە.

(قُلَّةُ السَّـيف): زيو يان ئاسـن كه به دەسكى شمشێرەكەوە بێت.
(ألقِلال): كۆلەكەكانى دارمێو كه له زەويەكەى پـێ دەبـڕنو بەرزیدەكەنەوە/ داربەسـت/ كەپرى مێو.
(ألقَلَّـة): كۆلەكەى بەرزكردنـەوەى دارمێو/ داربەست/ كەپرى مێو.
(ألقِلَّة (ج) قِلَل): ١-له نەخۆشیی یان هەژاریی هەستانەوەو ڕزگاربوون ٢-لەرز.
(«رَجُـلٌ طویـلُ القِلَّـة»): پیاوێكى بەژنو بالآبەرز.
(قِلالَة الجَبَل»): پۆپەى شاخ/ لووتكەى شاخ.
(الإسـتِقلال) (مـص): سـەربەخۆیی وڵات ولآتێك خۆى خۆى بەڕێوەبەرێت.
(ألمُسْتَقِل) (ف): سەربەخۆ.
(«هـو مُسْـتَقِلٌ بِنَفسِـهِ»): لـە كاروبارى خۆیدا سەربەسـتە/ ئازادەو پشـت بە كەس نابەستێت.
(«بلادٌ مُسْـتَقِلَّة»): ولآتێكى سـەربەخۆیەو خۆى خۆى بەڕێوە دەبات.
(ألمُقَلَّل (مفع) مِن السُـیُوف): شمشێرێك كه دەسكەكەى زیو یان ئاسنى پێوە بێت.
٣-(القُلَّة (ج) قُلَل وقِلال): كۆمەڵە خەڵك.
(ألقِلِّیَّة): پەرستگایەكى وەك خەڵوەتگا.
(«رَحَلـو بِقِلِّیَّتِهِم»): بـە جارێك هەموویان كۆچیانكردو هیچیان بەجێنەهێشت.
(«أكَلَ الضَبُّ بِقِلِّیَّتِهِ»): به پێستو ئێسقانەوە مارمێلكەكەیخوارد.
(أخَذَ-هُ بِقِلِّیَّتِهِ وبِقِلِّیلَتِهِ بِأقلیلاهُ وقِلّاهُ): (بەسەرو بەرەوە/ سەرتاپا) هەمووى برد.
٤-(قَلْقَلَ. قَلْقَلَةً): دەنگى لێوە هات.
(-الحُـزنُ دَمْعَـهُ. قَلْقَلَةً وقِلْقـالاً وقَلْقالاً): خەفـەت/ پـەژارە فرمێسـكى پێڕشـت/ گریاندى.
(-الشيءَ): شتەكەى جوڵاند.
(-فِي الأرضِ): بـە زەویـدا كەوتـە گـەڕانو پێدارۆیشتن.
(تَقَلْقَـلَ): ١-جووڵا/ بزوا/ جما ٢-سـوكەڵانە پەلەیكرد/ خێرایكرد.
(-فِي البـلاد): بـە ولآتەكـەدا ئەمسـەرو ئەوسەریكرد/ گەڕا.
(ألقَلْقال): گەڕۆك.
(ألقُلقُل): له گوزاركردندا سووكەڵەو چابوك.
(ألقُلقُل والقُلاقِل): یاریدەدەرى بەدەستوبردو چابوك.
(ألقِلْقِل والقُلقُـلان) (ن): ڕەگەزە دارێكه له هەنار دەچێت بەرێك دەگرێت ڕەشو لووسو خرە هێندەى دەنكه ئاڵەتێك دەبێت.
(حروف القَلْقَلَة): پێنج پیتن:
(ب. ج. د. ط. ق).
الملحق:
قل: (ألأقَلِّیَّة): كەمایەتى/ كەمینە.

(اَلذيــن أَدْرَكُوا ذلِكَ كانــوا أَقَلِّيَّة): ئەوانەی کە هەســتیان بەوە کردو تێیگەیشتن کەمینە بوون.

(مجموعــة مِــنَ الأَصــوات هي أَقَــلُ عدداَ في انتخابــاتٍ): لــە هەڵبژاردنێکــدا لە کۆی دەنگەکانــدا دەنگێکی کەمبوو کە درابوون بۆ هەڵبژاردنێك.

(«أَقَلِّيَةُ الناخبين»): کەمینەی هەڵبژێرەکان/ کۆمەڵێك یان پارتێك کە بەشــی هەرە زۆری دەنگیان لە هەڵبژاردندا نەهێنابێت.

(«الأَقَلِيَّة البرلمانية»): کەمینە لە پەرلەماندا.

(الأَقَلِّيَّــة): کۆمەڵــە خەڵکێکن کــە بە ئاین یــان رەگــەز یــان رەنگــی پێســت جیابن و لــە کۆمەڵگایەکــدا بژین ژمــارەی ئەوانەی وەك ئــەوان نین زۆرتربن کە لــەوان جیان و لەگەڵیاندا دەژین.

(الأَقَلِّيَــة البيضــاء في روديســيا): کەمــە نەتەوایەتییە سپیەکان کە لە رۆدیسیادا دەژین لە کۆمەڵگایەکدان کە زۆرینەی رەشپێستن.

(حقوق الأَقَلِّيَات): مافی کەمە نەتەوایەتیەکان/ مافی کەمینەکان.

---

قلب: ١-(قَلَبَ- الشــيءَ: قَلْباً): روو یان باری شتەکەی گۆڕی و وەریگێڕا ٢-سەرەوخواریکرد/ سەرەوژێریکرد ٣-ئاوەژوویکرد.

(-القــومَ): خوێشــگەلی بەرێکردو دەســتی بیوەنان/ دەریکردن.

(«قَلَــبَ المُعَلِّــمُ الصبيــانَ»): مامۆســتاکە منداڵەکانــی بــەرەڵا کــردو بــۆ ماڵــەوە بەرێیکردن.

(-البُسرَةُ): دەنکە خورماکە سوورهەڵگەڕا.

(-المَجْنُونُ عَينَهُ): شێتەکە چاوی زێرەو ژوور کرد واتە توورە بوو.

(-الأَرضَ للزراعَــة): زەویەکــەی هەڵگێــڕو داگێڕ کرد/ بۆ کشتوکاڵ کێڵای.

(«قَلَــبَ الأَمرَ ظَهــراً لِبَطــن»): (کارەکەی هەڵگێــڕو داگێڕ کرد/ ئەمدیوو ئەودیو کرد) و تاقیکردەوە.

(-هُ قَلْباً): تووشیی دڵیبوو/ بەردڵیکەوت.

(-النَخلَــةَ): (ناوەڕۆکــی/ کورۆکــی) دارخورماکەی دەرهێنا.

(-اللهُ فُلاناً إليهِ): خودا فیساری مراند.

(قَلِبَ. قَلَباً): لچی هەڵگەڕاوە بوو.

(أَقْلَب): لچهەڵگەڕاوە بوو.

(-تِ الشَفَةُ): لچەکە هەڵگەڕایەوە.

(قَلْباء): لچهەڵگەڕاوە.

(قُلِبَ- البَعيرُ): حوشترەکە تووشی دەردەدڵبوو.

(قَلَّــبَ-هُ): زۆر هەڵگێــڕو داگێڕیکــرد/ زۆر ئەمدیوو ئەودیویکرد.

(«أَصْبَــحَ يُقَلِّبُــهُ كَفَّيــهِ»): هــەر دەســتی بەدەستدا دەدا واتا پەشیمانبوو.

(«قَلَّــبَ الأُمورَ»): بیری لەو ســەری کارەکەو ئەنجامەکەیکردەوە/ هەڵگێڕو داگێڕیکرد.

(أَقْلَبَ- الشيءَ): ڕووی شتەكەی وەرگێڕا.

(-الخُبزُ): كاتی هەڵگێڕانەوەی نانەكە هات.

(-العِنَبُ): پێستی ترێكە وشكهەڵگەڕا.

(-القَـومُ): حوشـترەكانی خوێشـگەل دەردەدڵیانگرت.

(-هُ اللهُ إليهِ): خودا مراندی.

(تَقَلَّبَ): ڕووی وەرگێڕا/ هەڵگەڕایەوە.

(-على فراشِـهِ): لەسەر جێگەكەی ئەمدیوو ئەودیویكرد/ تلاوتلیكرد/ تلیدا.

(-في الأُمـورِ): لەسـەر كارێـك نەمایـەوە/ هەردەمە لەسـەر كارێكبوو/ لەسـەر كارێك ستارەینەگرت.

(«أَنـا أَتَقَلَّـبُ في نَعمائِـهِ»): من لـە نازی بەخشـراوی خـودادام چێـژی لێوەردەگرمو دەبینم. هەرچۆنێك بسووڕێتەوە.

(إنْقَلَـبَ): ١-وەرگـەڕا/ سـەرەوژێر بـوو/ هەڵگەڕایـەوە/ ژێـرەوژوور بـوو ٢-ڕووی وەرگێڕاو/ گەڕایەوە.

(ألقالِب (فـا) (ج) قَوالِب): ١-قاڵبی پێڵاو ٢-خورمای سورو.

(«شـاةٌ قالِبُ لَـونٍ»): مەڕێكە ڕەنگی لە هی دایكی ناچێتو ڕەنگەكەی گۆڕیوە.

(ألقالِب والقالَب (ج) قَوالِب): قاڵبی دارشتنی زێڕو زیوو شتیتر تاوەكو قاڵبەكە دەرچێت.

(القُلاب) (طب): جۆرە دەردە دڵێكە.

(ألقَلْـب) (مـص) (ج) قُلـوب: ١-(ع ا) دڵ/ ئەندامێكـە وەك بەری سـنۆبەر وایە لەلای چەپی سـنگدایەو گرنگترین ئەندامی بزوەی خوێنـە (ئەڵین بۆیـە وا ناونـراوە، چونكە هەردەمە لـە سـەر بارێكـە) ٢-دڵ ٣-ئاوەز/ ئەقڵ.

(قلب الجيش): ناوەڕاسـتی سوپا/ جەرگەی سوپا.

(قَلْبُ كُلِّ شَـيءٍ): جەرگەو كورۆكو پوختەو ساغیی هەموو شتێك.

(جِئتُـكَ بهذا الأَمـرِ قَلْباً): ئـەم كارەم بە پوختیو ساغیی بۆ هێناویت.

(«رَجُلٌ قَلْبٌ»): پیاوێكی تەواو ڕەسـەنە (بۆ نێرو مێو كـۆ وەك یـەك بەكاردەهێنرێت) لەوانەیە بیشوترێت/ («إمْرَأَةٌ قَلْبَةٌ»): ژنێكی زۆر (ڕەسەنە/ جسنە/ خانەدانە).

(قُلوب ظَنَّ) گومـانو هاوەڵەكانیەتی (أفعال القلوب هي ظن واخوانها): كارەكانی گومانو (ظن) هاوەڵەكانیەتی.

(ألقَلْب (ج) أقلاب وقُلوب وقِلَبَة- مِنَ الشَّجَرِ): كورۆكو ناوەوەی درەختەكە نەرمە.

(قَلْبُ النَخْلَةِ= جُمّارها): كورۆكی دارخورما.

(ألقَلْـب والقِلْب (ج) أَقـلاب وقُلوب وقِلَبَة- مِنَ الشَّجَرِ): كورۆكی نەرمی درەخت.

(ألقُلْبَةُ): ١-ڕەنگی خوێنین یان سووری وا بێت ٢-(ط) گەنمی كوڵاو/ دانوله (عامیە).

(ألقَلَبَة): دەردێك كە مرۆڤ وا لێبكات لەسەر

نوێنەکەی هەر گینگڵ بدات/ تەپاوتل بکاتو خەوی لێنەکەوێت.
(ألقُلَّب= المُتَقَلِّب): لەسەر لایەك بارێك ستارە نەگرتوو/ حولحولی ٢-تلاوتلکەر.
(«رَجُلٌ حُوَّلٌ قُلَّبٌ» أو حُوَّلِيٌ قُلَّبِيٌ): کابرایەکی حولحولییە/ بە فێڵو تەڵەکەبازەو بە پێی قازانجیی هەڵدەگەڕێتەوە/ بێبارە.
(ألقَلُوب): بێبار.
(ألقَليب (ج) قُلْب وقُلُب وأقْلِبَة): چاڵاو/ بیر. وتراویشە: بیری کۆن (مێیە دەیشکرێت بە نێر)- بۆیە وا ناونراوە چونکە گڵەکەی هەڵگێڕو داگێڕ کراوە.
(ألمِقلَب): گاسن یان بێل کە زەوی پێ هەڵدەگێڕرێتەوە بۆ کشتوکاڵ ئامادە دەکرێت.
(ألمَقْلُوبَة) (مفع): گوێ.
(ألمُنقَلَب) شوێنی لێهەڵگەڕانەوە/ لێگەڕانەوەو سەرەوخواربوونەوە.
(كُلُّ امرِيءٍ يصيرُ الى مُنقَلَبِهِ»): هەموو کەسێك دەگاتەوە شوێنی هەڵگەڕانەوەی، واتە دەمرێت.
٢-(قَلْبُ العَقْرَب) (فك): یەکێکە لە هەوارگەکانی مانگ.
(ألقُلْب): ١-بازنی ئافرەت ٢-(ح) ماری سپی.
٣-(ن) القُلْب= کاسر الحَجَر: گیا قەیتەران جۆرە گوڵێکی جوانە ڕووەکگای بەشی ژووروی گۆی زەوییە لە کێوە بەرزەکاندا زۆرە کە ساردەو لە وڵاتە ساردەکاندا بۆیە وا ناونراوە چونکە لە نێوان بەردەکانی کێوەکەدا دەردێت یان یارمەتی توانەوەی بەردی ناو میزڵدان دەدات.
(ألقَلُوب والقِلاب) (ح): گورگ.
(ألقَلُّوب والقِلَّوْب والقِلَّيب) (ح): ١-گورگ ٢-شێر.
الملحق:
قلب: (ألإنقِلا ب): وەرگێڕان/ هەڵگەڕانەوە/ سەرەوژێربوون.
إنقِلاب الوعاء: سەرەوژێربوونی قاپەکە/ هەڵگێڕانەوەی/ نوخونبوونەوەی.
(الإنقِلاب) (فك): لادانی خۆرخواربوونەوە یان گەڕانەوەی لە برجێکەوە بۆ بورجێکیتر.
(إنْقِلاب الشّتاء وانقلاب الصيف): وەرگەڕانی زستانو وەرگەڕانی هاوین.
(-فِي السِّياسَة): لە رامیاریدا: وەرگێڕانی فەرمانڕەوایی‌و گۆڕینی‌و دەست بەسەر دەسەڵاتداگرتن بە ڕێگەی نائاسایی‌و نادەستوورییانەو بە بەکارهێنانی هێز.
(إنقِلاب عسكري): کۆدەتای سەربازیی.
(ألإنقلاب): کردەیەکی بوێرانەیە بۆ گۆڕینی بارو ڕەوشێك کە هەبێت.
(«تغيرٌ جذري»): گۆڕینێك لە بنەڕەتەوە.
(«هذا انقلابٌ في سياسة الدَولَة»): ئەمە گۆڕانێکی بنەڕەتیی ڕامیاریی دەوڵەتەکەیە/ وەرگەڕانێکی بنەڕەتییە.

الملحق:

أَلقَلبَق (ج) قَلابِق): كلاويكه وەك فيستە لە فەرو دروستدەكريت (تركيه).

---

قلت: ١-(قَلِتَ. قَلَتاً): فەوتا/ لەناوچوو.

(أَقْلَتَ-هُ): لەناويبرد/ فەوتاندى/ مراندى.

(-هُ فَقَلِتَ): گەنيكرد/ خراپيكردو گەنبوو.

(-تِ المَــرأةُ وكُلُّ أنثــى): ژنەكــە يــان هەر مێيەكيتر منداڵێكى بوو/ يان بەچكەيەكيبوو ئيتر هيچيترى نەبوو. يان ژنو هەر مێينەيەك منداڵو بەچكەى بۆ نامێنێت.

(أَلقَلَــت): منداڵو بەچكە بــۆ نەمان يان لە سكێك زياتر نەكردن.

(أَلمِقلات (ج) مَقاليت): ئەو ژنو مێينەى كە منداڵى يان بەچكەى بۆ نامێنێت يان يەكێكى دەبێتو هيچيترى نابێت.

(أَلمَقْلَتَةُ): ١ فەوتگە ٢-شوێنى ترسناك.

٢-(القَلْت (ج) قِلات): ١-چاڵى تاوێر يان چاڵى چاو ٢-هەموو چاڵييەك لە ئەندامى لەشدا.

(«طَعَنَهُ في قَلــت خاصِرَتِهِ»): تيغەكەى بە قەبرغەيدا كرد.

(رَجُــلٌ قُلْــتٌ وقَلِــتٌ): پياوێكــى لاواز/ كەمگۆشت.

(أَلقَلْتَــةُ): چاڵــى نێوان ئەمبــەرو ئەوبەرى سمێڵ: چاڵى سەر لێوو بەرلووت.

(شاةٌ قَلْتَة): مەرێك شيرەكەى خۆشنەبێت.

قلــح: ١-(قَلِــحَ- قَلَحــاً): دانەكانــى (بەڵغى زەرديى پەيدا كرد/ زەرد هەڵگەرا).

(-ت أَسنانُهُ): دانەكانى بەڵغى زەرديگرت.

(قَلِح وأَقْلَح وهــي قَلِحَة وقَلْحاء (ج) قُلْح): دانبەڵغگرتوو.

(قَلَّــحَ- هُ): زەرديــىو بەڵغــى لــە دانەكانى كردەوە/ پاكيكردەوە.

(تَقَلَّحَ): جلەكەى پيسبوو.

(أَلقَلْح) (ح): كەرى پير/ پيرەكەر.

(أَلقِلْح): بەرگى پيس.

(أَلقَلَــح والقُلاح): ١-بەڵغى زەردى ســەردان/ زەرديــى دان ٢-ســەوزييەكى نێــوان دانــى حوشتر.

(أَلأَقْلَح) (ح): قالۆنچە خلينكە. قالۆنچەيەكى رەشە.

(رَجُــلٌ أَقْلَــح): پياوێكــى خاوەنئەزموونو دنياديدە كە شتى زۆر بەسەر هاتبێت.

٢-(تَقَلَّــحَ- البِــلادَ): لــە ســاڵى نەهــاتو وشكەساڵدا رەنجى لە وڵاتەكەدا داو دەرامەتى پەيداكرد.

٣-(إِقْلَحَمَّ- الرَجُلُ): ئيفتادە بوو/ زۆر پير بوو.

(شَيخٌ قِلحامَةٌ): پيرێكى ئيفتادە.

(أَلقِلْحَم): ١-پيرێكى بەساڵداچوو ٢ خۆبەگەورەزان.

(أَلقَلْحُوْن) (ز) (عامية) (سريانية): چووزى ناسكى دارى توو.

قلــخ: (قَلَــخَ- الشَــجَرَةَ قَلْخــاً وقَليخــاً): درەختەكەى لە بن هەڵكێشا.

(-البَعيرُ. قَلْخاً وقَليخاً وقُلاخاً): حوشترەکە بۆراندی.

(قَلَّخَ-هُ بالسَّوطِ): دایە بەر قامچیو لێیدا.

(-النَبتُ): ڕووەکەکە (قایمبوو/ خۆیگرت).

أَلقَلْخ: ١-(ن) قامیشی بۆش ٢-(ح) پیرەکەر.

(أَلقَلْخ والقُلاخ): کەتمیەکی قەبە/ زەبەلاح/ چەتەوڵ.

قلد: ١-(قَلَدَ- الماءَ في الحَوضِ أَو الشَــرابَ في البَطنِ): ئاوەکەی لە گۆلەکەدا کۆکردەوە یان شەربەتەکەی کردە سکیەوە.

(-الزَرعَ): ئاوی کشتەکەیدا.

(-تِ الحُمَّى فُلاناً): تا، فیساری هەموو ڕۆژێك گرت/ هەموو ڕۆژێك تای لێهات.

(أَقلَدَ- البَحــرُ عَليهم): دەریاکە خنکاندنی/ نوقمیکردن.

(تَقالَــدَ- القَومُ المــاءَ): بەســەرە ئاوەکەیان وەرگرت.

(إِقتَلَدَ- الماءَ): ئاوەکەی هەڵێنجا بەدەست یان هەر شتێکیتر.

(إِقْلَــوَّدَ- النُعــاسُ فُلاناً): وەنەوز فیســاری گرت/ وەنەوز بردیەوەو خەوی لێخست.

(أَلقِلْــد (ج) أَقلاد):١-بەشــە ئاو ٢-تاگرتووی چــوارەم ڕۆژ کــە هەر بە چــوار ڕۆژ جارێك بۆیبێت ٣-ڕۆژی ئاودان ٤-ئاودان لە ئاسمانەوە باران بارین.

(«سَقَتْنا السماءُ قِلْداً في كُلِّ أُسبوعٍ»): هەموو حەفتەیەك جارێك بارانمان بۆ دەبارێت وەك سەرەی بارانمانبێت.

(أَلقَلُود): چاڵاوی فرە ئاو.

(أَلمِقْلَد): قــاپ/ دەفــر ٢-توورەکەی وڵاخ کە ئالیکی بــۆ تێدەکــەنو بەســەریەوە دەکەن ٣-پێوەری شت پێپێوان.

٢-(قَلَدَ- الحَبلَ. قَلْداً): (پەتەکە/ گوشــەکە/ گوریسەکە)ی بادا.

(-الحَديدَةَ): ئاســنەکەی تەنککردو بەســەر شتێکدا لوولیدا یان بەسەر پارچەیەکی وەکو خۆیدا لوولیدا.

(- الشَــيءَ): پێچی بە شــتەکە دا/ شتەکەی لوولدا.

(أَلقَلْــد (مــص) (ج) أَقْلاد وقُلُــود): بازنی مارپێچ.

(«سوارُ قَلْدٌ»): بازنی مارپێچ ٢ هێزی هەمو تاڵی پەتێك هێزی تاڵێکیتری لەگەڵدایە.

(أَلقِــلاد والإِقليدد): تاڵێکی مــس یان زەرد پاندەکرێتەوەو لە گوارە یان ئەموستیلەیەکەوە دەئاڵێنرێت.

(القَليد والمَقْلُود): بادراو/ پێچدراو.

(أَلمِقْلَد): گۆچان/ گۆپاڵ.

٣-(قَلَدَ- الرَجُلَ- السَيفَ قَلْداً): شمشێرەکەی کردە ملی پیاوەکە.

(قَلَّدَ- هُ السَّــيفَ): شمشــێرەکەی (بە ملیدا هەڵواسی/ کردە ملی).

(قَلَّدَ- هُ القلادة): ملوانكەكەی كردە ملی.

(-البَعيرَ): پەتێكی كردە ملی حوشترەكە تا بە كێشیبكات.

(«قُلِّدَ حَبلَهُ»): پەتەكە لە ملی داماڵرا/ بەرەڵا كرا.

(-هُ العَمَلَ): كارەكەی خستە ئەستۆی ئەو/ بەویسپارد.

(-هُ الدِّينَ): وامەكەیدایەوە دەست.

(-فُلاناً القَضاءَ في بلد كذا): فیساری كرد بە قازیی ئەو شارە.

(«قَلَّدَ- هُ في كذا»): لەوەدا كوێرانە لاسایی ئەویكردەوە.

(تَقَلَّدَ- السَّيفَ): شمشێرەكەی (كردە ملی/ هەڵیگرت).

(- الأَمرَ): ١-كارەكەی گرتە ئەستۆی خۆیو خۆی لێ بەرپرسیار كرد ٢-بەرگەی ئەوەیگرت/ خۆیی بۆ ڕاگرت.

(-تِ المَرأَةُ القلادَة):ژنەكە گەردانەكەی كردە ملی خۆی.

(أَلقِلْد): جڵەوی كار.

(«أعطيتُهُ قِلْدَ أمري»): جڵەوی كارەكەمم بەو سپارد.

(أَلقَلاَّدَة) (ن): ڕەگەزە ڕووەكێكە بۆ ڕازاندنەوە لە بنچینەدا لە ئەمەریكای باشوورەوە هاتووە بنەكەی خۆراكی تێدایەو گەڵاكەی ڕەنگاوڕەنگە.

(أَلقَلادَة (ج) قَلائِد وقِلاد):گەردانە، گەردنبەند، ملوانكە.

(أَلقِلادَة (فك):ناوی شەش ئەستێرەیە بە (كەوانە) ناودەبرێن.

(قَلائِدُ الشِعر)ئەو دێڕە هەڵبەستە ناوێزانەی كە لەبەردەكرێنو هەرگیز لەبیرناچنەوە.

(أَلقِلّيد):گەنجینە.

(الإقليد (ج) أَقاليد) (يونانية):كلیل.

(أَلتَقليد (مص) تَقاليد وتَقليدات): ١-ئەوەی كە سوڵتان یان میر بۆ كاربەدەستێكی دەنووسێت كە دایدەمەزرێنێتو ڕێگەی كار بەڕێوەبردنی دەداتێ ٢-شوێنكەوتنو پەیرەوكردنو چاولێكردنی ئەو بیرو بڕواو نەریتو زانیاریو پیشەو كارانەی كە لە باووباپیرەوە ماوەتەوە یان هی كۆمەڵە یان مامۆستا وتویەتی.

(أَلتَقاليد عند النَّصارى):ئەو نەریتو شێوە خوداپەرستییەیەكە دیانەكان پشتاوپشت بۆیان ماوەتەوە یان ئەو زانیارییەیە كە خودا بە وەحی بۆ كەنیسەكەی ناردووە بێئەوەی لە كتێبە پیرۆزەكەدا نوسرابێت.

(أَلمِقلاد (ج) مَقاليد):گەنجینە.

(أَلمِقلاد والمِقْلَد (ج) مَقاليد):كلیل.

(«ضاقَت مَقالِدُهُ أو مَقاليدُهُ»):كارەكانی لێهاتە بەستو شپرزە بوو.

(«أَلقى إليهِ مَقاليد الأُمور»)كلیلی كارەكانی

بەو سپاردو کردیه قەبەڵی/ خستیه گەردنی/ ئەستۆی ئەو.

(أَلْقَلَّد) (مفع): ١-سـەرومرو گەورەی نەتەوە کـە کاروبـاری نەتەوەکـەی پێسـپێردراوە ٢-ئەسـپی براوەی پێشبڕکێ شـتێکی دەکەنە مل نیشـانەیە بۆ براوەیی ٣-شوێنی گەردانە لە ملدا ٤-شـوێنی هەڵواسینی شمشێر لەسەر شان.

(مُقَلَّـداتَ الشِـعْر): ئـەو دێـرە نایابانەی هەڵبەسـت کـە لەبەردەکرێـتو هەرگیـز لەبیرناچێتەوە.

٤-(أَلقِلْد (ج) أَقلاد): کۆمەڵە خەڵك.

(أَلقِلْدَة): ١ خلتەی رۆن ٢ خورما.

(أَلقَلْدَةُ): چاڵی بەر لووت ناوەراستی سمێڵ.

قلز: (قَلَـزَ- الرَجُل. قَلْـزاً): ١-بە هەڵمژین خواردیـەوە ٢-چالاکبـوو قەڵەمبازدیـدا ٣-شەلیی.

(-هُ الماءَ): ئاوەکەی پێهەڵقوراند/ قومە قومە پێیخواردەوە.

(تَقَلَّـزَ- الوَعْـلُ): ١-کەڵەکێوییەکـە غاریدا ٢ چابوکبوو.

(إِقْتَلَزَ- الـكَأسَ): (جامەکەی/ کاسـەکەی) قومە قومە خواردەوە.

(أَلقَلْز- مِنَ الرجال): پیاوی سووکەڵەی لاواز.

(أَلقِلَـز (م) قِلِزَّة والقُلُز (م) قُلُزَّة): پیاو یان ژنی توندو رەق.

٢-(قَلَزَ-هُ. قَلْزاً): لێیدا.

(-الأَرضَ بعَصاهُ): داردەسـتەکەی کێشـا بە زەویداو کاری تێکرد.

(-بسَـهْمِهِ أَو بقيئِـهِ): تیرەکـەی یـان رشانەوەکەی هەڵدا.

(قَلَزَ وقَلَّزَ وأَقْلَزَ- الجَرادُ): کوللەکە کلکی بە زەویەکەدا کرد گەرای تێدا دابنێت.

٣-(أَلقِلْز والقُلُز (م) قِلِزَّة وقُلُزَّة): مسێك کە ئاسن کاری تێنەکات.

٤-(قَلْزَمَ-الشيءَ): شتەکەی قووتدا.

(تَقَلْزَمَ- الشيءَ): شتەکەی قووتدا.

(-الرَجُلُ): لە چرووکیدا مرد.

(أَلقِلْزِم): بەدزمان/ بەدخواز/ دووزمان.

(أَلقُلْزُم): دەریای سوور.

(أَلقَلْزَمَـة): ١-بەدخوازیـی/ زمانبەدیـی/ ناپاکیی ٢ هەراوزەنا/ هاتو هاوار.

قلس: ١-(قَلَسَ- الرَجُلُ. قَلْسـاً وقَلَسـاناً): خواردنەکـە یان ئاوی گـەدەی هاتە دەمیەوە ئەگەر زێفی لێبسـێنێت دەرشێتەوە ٢-مەیی زۆر خواردەوە.

(-تْ نَفسُهُ): دڵی تێکەڵهات/ هێڵنجیدا.

(-تِ الكَأسُ بالشَّـرابِ): جامەکـە لێوانلێوی شەراب بوو/ سەریکردو لێیرژا.

(-الإناءُ): قاپەکە (پڕبوو/ لێیرژا).

(قَلَسَ البَحْرُ بالماءِ والطَعْنَةُ بالدَّم): دەریاکە سـەریکردو بەملاولایدا ئاو هـات، برینەکە

خوێنەکەی سەریکرد.
(-النَحلُ العَسَلَ): هەنگەکە هەنگوینەکەی رژانە سەر دەوروپشتی.
(-تِ السحابَةُ الندى): هەورەکە وردەبارانێکی باراند/ ڕشێنەیەکی کرد.
(-القالِس): ئەوەی خواردنی ناوسکی لە گەروویەوە بێتە دەرێ/ ڕشاوە/ قولپهێن.
(ألقَلْس): ١-خواردن یان خواردنەوەیەك لە گەدەوە هاتبێتە ناودەمی/ بە زۆریی گەدەپڕیو قەبزیی/ گرتن تووشی ئەوەی دەکات ٢-ڕشانەوە.
(قَلْسُ البَحر): هەور.
(القَلاّس): زۆر هێلنجدەر.
(بَحرٌ قَلاّس): دەریایەکی هەستاوو بەهێز کە کەف هەڵداتە سەر ڕۆخ.
(ألقَليس) (ح): ١-هەنگ ٢-هەنگوین.
٢-(قَلَسَ- الرَجُلُ قَلْساً وقَلَساناً): ١-بە گۆرانییەوە کەوتە سەماو هەڵپەڕین ٢-گۆرانییەکی چاکی چڕی.
(قَلَّسَ): دەف لێداو بە دەمیەوە گۆرانییوت.
(-القَومُ): خوێشگەل بە دەفلێدانو گۆرانیو هەڵپەڕینەوە بەپیر گەورەهاتووەکانەوە چوونو پێشوازییانکردن.
٣-(قَلَّسَ): کورنووشیبرد.
(-لَهُ): دەستی بە سنگیەوە گرتو سەری بۆ دانەواند.

٤-(قَلَّسَ- الرَجُلَ): کلاّوی لەسەر پیاوەکە کرد.
(تَقَلَّسَ): کلاّوی لەسەر کرد.
(ألقَلاّس): کلاّودروو/ کلاّودروستکەر.
٥-القَلس (ج) قُلُوس وأقْلاس) (یونانیة): گوریسێکی گەورەو ئەستووری پاپۆرە.
٦-(قَلْسى- الرَجُلَ): کلاّوی کردە سەر پیاوەکە.
(تَقلسي تَقلْسِياً): کلاّوی لەسەرکرد.
٧-(ألأنْقَليس والإنْقليس) (ح) (یونانیة): مارماسی.
قلش: (ألقَلاش): بچکۆلەی گرمۆڵە/ خۆکرژکەر.
(القَلاشَة): کورتیی و بچووکیی.
(ألقَلاّش والأقْلَش) (فارسیة): کەلەکباز: فێڵباز/ فێلاّوی.
قلص: (قَلَصَ- الرَجُلُ قُلُوصاً): بازدیدا.
(-القَومُ): کۆبوونەوەو کەوتنە (ڕێ/ ڕۆیشتن).
(-الماءُ): ئاوەکە بەرزبووەوەو ڕۆیشت.
(-الغُلامُ): مێردمنداڵەکە هەرزەکار بوو/ پێگەیشت.
(-تِ البئرُ): ئاوی بیرەکە سەرکەوتە سەرێ.
(-ت نَفسُهُ): هێلنجیدا/ دڵی تێکەڵهات.
(-القَومُ عَنِ الدار): خوێشگەل لە خانووەکە هاتنە دەرێ یان ئامادەی دەرچوونبوونو کاتی دەرچوونیانبوو بڕۆن.

(-الظِّلُّ عَن كذا): سێبەرەکە لەوە کشایەوە.
(قالِص): سێبەری کشاوە.
(-الثَّوبُ بَعدَ الغَسْلِ): جلەکە بە شتن چوومیەك و کورتبوومەوە/ کرژبوو.
(-ت الشَفَةُ): لچەکە سەرەوژوور هەڵگەڕایەوە.
(قَلَصَ-ت نَفسُهُ.قَلَصاً): دڵی تێکەڵهات/ هێڵنجیدا.
(قَلَّصَ-تِ الناقَةُ بِراكِبِها): ١-مێحوشترەکە سوارەکەی هەڵگرت/ خێرا بردی ٢-بێپشوو/ سەرومر ڕۆیشت.
(-القَومُ): سواری حوشترە جوانەکان/ کەمتەمەنەکان بوون.
(-تِ الدِرعُ): زرێکە گردبوومەوە بەیەکداچوو.
(-قَميصَهُ فَقَلَّصَ هو): کراسەکەی هەڵکردو بەرزکردەوە کراسەکە هەڵچوو و بەرزبوومەوە.
(أَقْلَصَ-تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە شیرەکەی سەرکەوتو برا.
(-البَعيرُ): کوپارەی حوشترەکە شتێك بەرزبوومەوە.
(تِ الناقَةُ): مێحوشترەکە لە هاویندا قەڵەو بوو.
(تَقَلَّصَ): ١-کرژ بوو/ چوومیەك ٢-لەیەك نزیکبوومەوە.
(-في عِلم الطبيعِيَّات): کرژبوو/ چوومیەك.
(القَلَصَةُ (ج) قَلَص وقَلَصات): ئاوی بیرەکە کە بەرز دەبێتەوە.
(ماوجِدتُ فِي البِئرِ إلاّ قَلَصَةً مِنَ الماءِ): کەمەکە ئاوێکم لە چاڵاوەکەدا دی دەسکەوت.
(أَلقَلاَّص): مێحوشتری جواندۆش/ کەسێکە مێحوشترێك بدۆشێت کە کەمتەمەن بێت.
(-مِنَ المِياه): ئاوی سەرکەوتوو.
(أَلقَلُوص): ١-مێینەیەك کە جوانبێت/ کەمتەمەنبێت/ گەنجبێت ٢-(ح) (بەچکە/ بێچووە) چێرگ ٣-ڕووبارێکە پیسی تێبچێت و خەوش و خاشاکی بکرێتە سەر.
(-مِنَ الإبِلِ (ج) قَلائِص وقِلاص وقُلُص وقُلْصان): ١-حوشتری لۆقن// لاقدرێژ ٢-حوشتری گەنج یان حوشترێك هەر کاروان بکات و بتوانێت بێت و بچێت ٣-مێحوشترێك کە تازە سوارییبن.
(أَلقَليص): زۆر/ فرە.
(-مِنَ المِياهِ): ئاوی سەرکەوتوو/ بەرزەوەبوو.
(أَلمِقلاص): کەسێکە مێحوشتری (جوان/ گەنج) بدۆشێت.
(-مِنَ النوق): مێحوشترێ لە هاویندا قەڵەوبوو.
(فَرَسٌ مُقَلِّص): چارەوێی لۆقن/ لۆقدرێژ.
قلط: (قَلَطَ-هُ (عند العامة). قَلْطاً: (سريانية): خۆڵ و خاشاك و پیسی لێلابرد.
(القَلْطِيّ والقِيْلِيط): پیاوی بەدی زەبەلاح.
(أَلقَلْط) (عند العامّة) (سريانية): خۆڵ و پیسی و خاشاك لابردن.
(أَلقُلاط): مرۆڤی بستە باڵاو سەگ و پشیلەی زۆر بچووك.

(القُلَيـط) (عنـد العامـة- سـريانية): سەرەلوێنك.
(ألقِليط): باگونە.
(ألقَلَّيطَـة) (عاميـة- سـريانية): جـۆرە ئیشێکی هەویرە.
(ألقَيْلَط والقَيلِط): گونەهلاوساو.
قلع: ١-(قَلَعَ-الشـيءَ. قَلْعاً): ١-شتەکەی لەبن دەرهێنا ٢-لە شوێنی خۆی گوێزایەوە.
(-الوالـي فُلانا): والی فیسـاری لەسـەر کار لابرد.
(قلِعَ- الراكِبُ. قَلَعاً وقَلَعَةً): سـوارەکە خۆی بەسەر زینەکەوە نەگرت.
(-المُصـارِعُ): زۆرانبازەکـە لـە زۆرانەکـەدا پێیترازاو پێی بە زەویەکەوە نەگرت.
(قُلِعَ- الرَجُلُ. قَلْعاً): خۆی لەبەر گورزەکەدا یان لەسەر زینەکە نەگرت.
(-قَلَّعَ-الشيءَ): شتەکەی لەبن هەڵکەند.
(قالَعـا مُقالَعَةً): ئـەو دوانـە هەریەکەیان ئەویتری لە جێگەی خۆی ترازاندو هەڵکەند.
(أَقْلَعَ- الأَمـيرُ): میر قەلایەکـی (پێکەوەنا/ دروستکرد).
(-الشيءُ): شتەکە روونبووەوەو دەرکەوت.
(-أَصحـابُ السَـفينَةِ): خاوەنپاپۆڕەکـەو کەشتینشینەکان ڕۆیشتن.
(-المَـلاّحُ السَـفينَةَ): پاپۆڕەوانەکە لەنگەری پاپۆڕەکەی هەڵبڕیو پاپۆڕەکە کەوتە ڕۆیشتن.

(-عَن كذا): وازی لەوە هێناو لێیگەڕا.
(-تِ الحُمَى عَن فُلان): تاکە فیساری بەردا.
(«یا سَـماءُ أَقلِعي»): ئەی ئاسمان بارانەکەت راگرە.
(تَقَلَّعَ): لەبن هەڵکەنرا.
(-في مَشْيِهِ): وا ڕۆیشت وەك تلبێتەوە.
(إقْتَلَعَ): لە بن هەڵکەنرا.
(-الشيءَ): ١-شتەکەی لەبنو بێخ هەڵکەند ٢-شتەکەی بە زۆر داگیر کرد.
(إنْقَلَعَ): لەبن هەڵکەنرا.
(القُلّـع): پیـاوی لـە ڕۆیشـتندا (چابوك/ بەپێ).
(ألقَلْـع (ج) أَقْلُـع وقُلُـوع): ١-تەشـوێی خانەسـازیی/ بەنایـی ٢-دەفرێکـە نـانو کەلوپەلی شوانەکەی تێدایە.
(قَلْع الحُمَى): ڕۆژی نەمانی تاکە.
(«تَرَكتُـهُ في قَلـع مِـن حُمّـاهُ»): کاتێـك بەجێمهێشت کە تاکە بەریدابوو.
(ألقِلْع): ١-پیاوێك کە خۆی بەسـەر ئەسپەوە نەگرێت ٢-چارۆکەی پاپۆر ٣-ڕۆژی تابەردان.
(«تركته في قِلع حُمّاهُ»): کاتی تابەردانەکەی جێمهێشت.
(ألقَلَع): ١-توێژو کرێشـی سـەر پێستی گەڕ ٢-لانەی گیانەوەر کە لەژێر تاوێردا دەبێت.
(-مِنَ الحُمَى): ڕۆژی نەمانی تا.
(ألقَلِع): ١-کرێشـدارێکی پێستی گەڕیی ٢-ئەو

کەسـەی کە لە بەرمنگاریدا یان لەسـەر زین خۆی راناگرێت.
(شـیخٌ قِلَعٌ): پیرێك کە بـروات وەك پێ لە قوردا دەربێنێت.
(ألقُلْعَةُ): ١-ئەوەی کرێشـی سەرپێستی گەری هەبێت ٢-کەسێکە کە بێتواناو بوودەڵە ئەگەر لێیاندا بەرگریی لە خۆی نەکات ٣-دارایەك کە نەمێنێتەوەو زوو لەدەست بچێت ٣-پارمیەکی رووت کـە ئەگەر دات بە یەکێك بە مەرجێکە کە بۆت بهێنێتەوە ٤-درەختی لەبن دەرهاتوو.
(ألقُلْعَةُ): رۆیشتن/ نەمان لە شوێنێکدا.
(«هوَ علی قُلْعَةٍ»): ئەو لەسەر کۆچە.
(«مَنزِلُنـا مَنـزِلُ. قِلْعَةٍ وقُلْعَـةٍ»): ماڵمان هەمیشە بە کۆڵەومیە/ ماڵی کۆچاوکۆچە.
(«هـذا المَنزِلُ مَنزِلُ قُلَعَـةٍ»): ئەم ماڵە هی تێـدا نیشـتووەکەی نییە/ ماڵـی بارکردنە. ئەگەر یەکێکهات لەم کرێچیەی لەپێشـتر بوو یان خاوەنەکەی ویستیو پێویستیبێت جار لە دوای جار تێدانیشتووەکە دەبێ بروات.
(ألقَلْعَـةُ (ج) قِلاع وقُلـوع): ١-قەڵا ٢-براله/ خەڵـف بێچوولـە کە لـە بنـی دارخورماکە دەردەهێنرێت و لێی دەکرێتەوە ٣-(توێشوبەرە/ دەفر)ی شوان.
(-الطائِرَة): فڕۆکەیەکی گـەورەی جەنگەو بۆمباهاوێـژە شـوێنەکانی دوژمـن و قـەڵاو سـەنگەرو عەمـارو کورەکانـی بـەر بۆمبا گەروەکانی دەدات.
(ألقِلْعَـةُ (ج) قِلَـع): ١-جـۆرە هەڵکەندنێك کەرتی خانەیەك/ بەشـێك لـە خانوویەك/ لەتێك.
(ألقَلَعَـةُ (ج) قِـلاع وقَلَـع): گاتاوێرێك لە کێومکە هەڵکەنرێت و بەربێتەوە سـەرکەوتن بەسەریدا گراندەبێت.
(- (ج) قَلَـع): ١-بانـی مـەزن ٢-قـەڵا ٣-پەڵەهەورێکی گەورە کە وەك شاخ وابێت.
(القُلَعَةُ): ١-کەسـێك کە پێستی کاژی گەریی هەڵبدات ٢-بێئۆقرە/ کەسێك کە لە شوێنێکدا ستارە نەگرێت.
(«مَجالِسُ قُلْعَةٌ»): ئەنجومەنی ستارە لەبەر بـراو، چونکە هەرکە یەکێکی لەپێشـتر هات دەبێت شوێنەکە بۆ ئەو کەسە چۆڵ بکرێت.
(«مَنزِلُنـا مُنـزِلُ قُلْعَـةٍ»): ماڵەکەمان هی یەکێکیترە/ هی ئێمە نییە.
(ألقُلاع): توێـژی زەوی هەڵدەتۆقێت کاتێك دوومەلانەکە خەریکـی دەرچوونبێت بەوەدا دوومەلانەکە دەدۆزنەوە.
(القُـلاع الواحِـدَةُ قُلاعَة): ١-قـوری زەوی. لەبەر وشکیو بێئاوی زەویەکە شەقار شەقار دەبێت ٢-تامیسك/ زیپکە کە لەناو دەمو زمان دەردێت.
(قُلاعُ الأُذنِ): گوێبرە/ برینە لە پشـتو بنی گوێدا پەیدا دەبێت و ئاوو زرکاوی لێدێت.

(القُلاعَــةُ): بەردێك یــان تۆپەڵــە قورێكی بێبەرد لە زەوی هەڵكەنرێتو بهاوێژرێت.

(«رُمــيَ بقُلاعَةٍ»): بــە بەردێك دەمكوتكرا واتا بە بەڵگەیەك بەزێنراو بێدەنگكرا.

(ألقِلاعَة): چارۆكەی پاپۆڕ.

(ألقَــلاَّع): ١-خێــرا بەزیــو یان خۆ بەســەر زینەوە نەگرتــوو ٢-پۆلیس/ بالباز ٣-گفندز/ گۆڕهەڵــدەرەوە ٤-گــەواد/ دەیــوس/ دەویت ٥-درۆزن ٦-دانهەڵكێش ٦-قســە هەڵبەســتو بوختانكەر/ قســەچن بەدزمان لەلای میرانو كاربەدەســتان بۆ لابردنی كارمەندو كەسێك لەو شوێنەی كە تیایدایە.

(ألقَلُــوع (ج) قُلُــع (ح): مێحوشــتری كەتە ٢-كەوانی ترازاو لە كاتیی بەكارهێنانیدا.

(إقلاعُ الحُمَّى ومَقْلَعُها): بڕانی تا و نەمانی.

(ألمَقلَع (ج) مَقالِع): كانە بەرد.

(ألمِقْــلاع (ج) مَقاليــع): قۆچەقانیــی/ بەردەقانی.

٢-(قَلِــعَ- الرَجُــلُ قَلَعــاً وقَلْعَــةً): گەمژە/ بێمێشــكبوو/ قســە نەدەچووە مێشــكیەوەو تێنەدەگەیشت.

(ألقَليــع): بێمێشــك/ كــەودەن كــە قســە وەرنەگرێت.

٣-(القَلْعُ): كانزایەكە دەڵێن قورقوشمی چاك لەوەیە.

(رَصاصٌ قَلْعِي وقَلَعِي): قورقوشمی قەلعی.

(ألقِلْــع): بەركــۆش كــە پیاو دەیپۆشــێتو دەیبەستێت.

(ألقَلَع): خوێن.

٤-(تَقَلْحعتَ في مَشْــيِهِ): لە رۆیشــتندا وەك خۆی لە قوڕ دەرهێنێت وا دەڕوات/ لەنجە لە رۆیشتندا دەكات.

٥-(إقْلَعَدَّ- الشَعَرُ): قژەكە زۆر لوولبوو.

(-فُلانٌ): ســەری خۆی هەڵگــرتو بە وڵاتدا كەوتە گەڕان.

٦-(قَلْعَــطَ-هُ فَتَقَلْعَــطَ) (عنــد العامــة) (سريانية): زۆر پیسیكرد. ئیتر پیسبوو.

ألقَلْعَطَةُ (عند العامة- سريانية): پیسبوون.

(ألمُقَلْعَط) (عند العامة- ســريانية): پیسی ڕژد/ چرووك.

٧-(إقْلَعَطَّ- الشَعَرُ): قژەكە لوولو ڕەقبوو.

(ألقَلْعَطَةُ): زۆر لوولبوونی قژ.

(ألمُقَلْعِــطُ) (فا): ســەرێكی قژ لــوولو كرژی بەیەكداچووی لە لوولیدا نەنوێنێت زۆر كورت.

٨-(ألمُقْلَعِطُّ): هەڵاتووی ترساو.

٩-(إقْلَعَــفَ- الشَــيءُ): شــتەكە كرژبــوو بەیەكداچوو.

(-ت أنامِــلُ فُــلان): دەســتی لــە گــۆ چوو پەنجەكانــی كووڕ بوون لەســەرماندا یان لە بەر پیری.

قلــف: ١-(قَلَــفَ الشَــجَرَةَ. قَلْفــاً): توێكڵی دارەكەی لێكردەوە/ دارەكەی ڕووتكرد.

(-الظفـرَ): نینۆکەکـەی بـڕیو لـە بنەوە لێکردەوە.
(-الـدَنَّ. قَلْقـاً وقَلْفَةً): قورەکەی لـە کووپەکە کردەوە.
(-القَلْفَةَ. قَلْفاً): پێستی چووکەکەی بڕی.
(قَلِـفَ- الصَبِـيُّ. قَلَفاً): کوڕەکـە خەتەنە نەکراوە یان پێستی چووکی درێژو زۆر بووە.
(صَبيٌ أَقْلَف): کوڕێکی خەتەنەنەکراو.
(قَلَّفَ- الجَزورَ): ئاژەڵە سـەربڕاوەکەی کوتە کوتە کرد.
(تَقَلَّفَ- القشـرُ عَنِ الشَـجَرِ): توێکڵەکە لە درەختەکە بووەوەو کرایەوە.
(إقْتَلَفَ- الظفرَ): نینۆکەکەی بڕیو لە بنەوە هەڵیکەند.
(أَلقِلْف الواحِدَةُ قِلْفَة): توێکڵی درەخت.
(أَلقِلْفَة): نینۆکێك کە لە بنەوە دەرهێنرابێت.
(أَلقُلْفَةُ والقَلَفَةُ (ج) قُلَف): پێسـتی چووك/ کێر.
(القُلافَة): توێکڵی درەختو هیتر.
(أَلقَلِيـف): کووپەیـەك کـە قورەکـەی لێکرابێتەوە.
(أَلقَليف الواحِدَةُ قَليفَة): ١-خورمای دەریایی توێکڵەکەی لێبوو بێتەوە ٢-میوەی وشك.
(أَلقَليـف (ج) قُلُـف والقَليفَـة (ج) قَليف والمَقْلوفَـة (ج) مَقلوفـات): سـەبەتەیەکی قیرینی گەورە کە خورمای تێدەکەن.

(أَلأَقْلَـف (م) قَلْفـاء (ج) قُلْـف): ١-خەتەنە نەکراو ٢-نێرینەیەك. کوڕێك پێستی چووکی درێژو زۆر بێت.
(«هو أَقْلَفُ القَلْبِ»): ڕێی چاکە نازانێت.
(«عامٌ أَقْلَف»): ساڵی هاتو بە فەڕ.
(«عَيشٌ أَقْلَـف»): ژیانێکی تێرو تەسـەلو خۆش.
(أَلتَقْليف): خورمای ناوکدەرهاتووی لەپووشگیراو/ لە دەفری پووشنراو.
(أَلمَقْلوف): کووپەی قوڕ لێکراوە.
٢-(قَلَفَ- الشيءَ. قَلْفاً): شتەکەی هەڵگێڕایەوە.
٣-(قَلَـفَ وقَلَّفَ- السَـفينَةَ. قَلْفـاً وقَلْفَةً): درزەکانـی پاپۆڕەکـەی بە لۆکەو ڕیشـوو و شتیتر خنیو قیری تێکرد.
(أَلقِلافَة): درزی پاپۆڕگرتن.
٤-(إنْقَلَفَـ تِ السُـرَّةُ): ناوکەکە لە قەڵەویدا بەناوداچوو.
(أَلقِلْف الواحِدَةُ قِلْفَة): شوێنی زبر.
(أَلقِلفَةُ- مِنَ الشِفاه): لچی ئەستوور.
٥-(قَلْفَـحَ- الطَعـامَ): (چێشـتەکەی/ خواردنەکەی) هەموو لووشدا/ خوارد.
٦-(تَقَلْفَحَ- عَنهُ الشيءُ): شتەکەی لێبووەوە.
(أَلقِلْفح والقِلفِح): ١-قوڕی شەقارشـەقار بوو بە هۆی وشـکبوونەوە ٢-ئـەو پارچانەی کە لە ئاسـن دەبێتەوە کاتێك دەکوترێت شێوەی پێدەگیرێت.

(اَلقِلْعَــةَ): ١-دوومــەڵان ٢-تویــژی زەوی کە دەرچوونی دوومەڵان بەرزیدەکاتەوە ٣-گەمرە کــە بە حوشــترەوە دەبێت کە وەکــو توێکڵی پارچە پارچەی گەورە گەورە دەبێت.

قلــق: ١-(قَلَــقَ- الشــيءَ قَلْقــاً): لەقەلەقی بە شــتەکە کــرد/ جووڵــە جووڵــی پێکرد/ بزواندی.

(قَلِــقَ. قَلَقاً): دڵخوردو نائارامبوو/ شــپرزە بوو.

(قَلِقٌ ومِقْلاقٌ وهيَ قَلِقَةٌ ومِقْلاقٌ): دڵخوردو نائارام/ شپرزە.

(أَقْلَقَ-هُ): جارسیکرد/ هەراسانیکرد/ سەری لێسەندو شپرزەیکرد ٢-دڵخوردو نارامیکرد.

(-الشــيءَ مِــن مَكانِهِ): شــتەکەی لەقکرد/ بزواندیو لە شوێنی خۆی هەڵیکەند.

(-القَومُ السُــيُوفَ في الغِمْدِ): شمشێرەکانیان لە کێلاندا بزواند پێش ئەوەی هەڵیکێشن بۆ ئاسانکردن هەڵکێشان.

٢-(القُلقاس) (ن) (یونانیة): سێوە زەمینی/ سێوی بنعەرز رووەکێکە لە بنەوە سەلکدەکات لــە هندســتانەوە هاتــووەو زۆر دەمێکــە لە خۆرهەڵاتــی ناوەراســتدا دەچێنرێت. گەلای گــەورە گەورەیەو ســەوزە. ســەلکەکەی کە دەیگرێتو لە بن زەویدایە نیشاستەدارە وەك پەتاتەیە بەڵام کەمتر خۆشە دەیشکوڵێنرێت.

(اَلقُلقاس الرُومي أَو اَلكَنكَر) (ن): سەوزەیەکی ســەلگرە لە ئەمەریکای باکــورەوە هاتووە لە ئەوروپا لە ســاڵی (١٦٠٠)ەوە دەســتکراوە بە چاندنی گرنگیەکی زۆری هەیە، بەڵام پەتاتە بایەخی کەمتر کردۆتەوە.

قلم: (قَلَمَ وقَلَّمَ -الشــيءَ قَلْماً): شــتەکەی بڕیو نووکەکەی تیژکرد.

(-الظفــرَ): نینۆکەکەیکــرد/ دەرچووەکەی بــڕیو فڕتانــدی هەرچیــش تــۆزە تــۆزە لێتــبڕیو نووکت تیژکرد یــان فڕتانت ئەوە قەڵەمتکردووە.

(اَلقَلَم (ج) أَقْلام وقِلام): ١-خامە/ پێنووس/ قەڵــەم/ قەڵەمــی قامیــش ئــەو قامیشــی پێنووســینە تــا دانەدرێت پێیناڵێــن قەڵەم پێیدەڵێــن قامیش، پاندان، قەڵەمئوج ٢-تیری قومار کە قومارباز،کان یاریی پێدەکەن (بۆیە واپێیدەڵێــن چونکە وەك قەڵــەم نووکەکەی دادرێــت وەك ســنجووق) (وشــەکەیش لــە قەلەموســی یونانیەوە وەرگــیراوە کــە بە قامیش دەوترێت).

(اَلقُلامَة): تەڵاشی شتی دادراو.

(قُلامَةُ الظفر): پارچەی نینۆکی فرتاو (بۆ بێنرخیو بێرێزی) بەکاردێت.

(اَلإِقلیــم (ج) أَقالیم) (یونانیــة): هەرێم/ وڵات/ خاکێکە لە شــوێنانیتر جیادەکرێتەوە چونکە لە خاکەکانیتر بــڕاوە کە لە پاڵیدایە وەك میســرو شــام کە هەریەکەیان وڵاتێکی

جيانو لەوانیتر براون.
(ألإقليمـيّ): هەرێمگەریی/ ولاتی جیاخواز/ ولاتگەریی.
(ألإقليميّـة= ریجیونالیـزم): رێڕەوێکـه بانگـەوازی هەرێمگەریـی دەکات تاکـو ولاتە هاوسنوورو نزیکەکان کۆببنەوە/ هەرێمگەری.
(ألتّقليم= التّشـحيل): هەڵپاچینی درەخت بـۆ جوانکـردنو بەهێزکـردنو بەرهـەم زۆرکردنـی بە برینی پەلە وشـکەکانیو لقە نەویستەکانی.
(المِقْـلام= المِقراض): ١ـقەیچـەی هەڵپاچین ٢ـنینۆککەرە/ قرتێنەر.
(ألمَقْلَمَة (ج) مَقالِم): قەڵەمدان.
(مَقالِمُ الرمح): گریکانی نێزەکە.
(«فُـلان مَقلـومُ الظَفر ومُقَلَّـمُ الظَفر»): فیسار نینۆککراوە؛ واتا لاوازو سەرشۆڕ کراوە. بێدەسەلاتە.
٢-(ألقالِـم (ج) قَلَمَـة): بێهاوسـەر/ بێژن/ رەبەن.
(ألمُقَلَّمَة): بێوەژنێك مێردەکەی مردبێت.
(«سـارَت ألفٌ مُقَلَّمَةٌ»): هەزار سەربازی پڕ چەكو ئامادەو چەکهەڵکێشاو رۆیشت.
٣-(قَلْمَعَ- رَأسَهُ): لێیداو سەری پەڕاند.
(-الشيءَ): شتەکەی لە بنو بێخ هەڵکەند.
(ألقَلْمَعَـةُ) (مـص): نامـەردو پووشـت/ ناکەسبەچەی ناوخەڵك.

الملحق:
قلـم: (أَقْلَـمَ- الحَيَوانَ أَوِ النَّبـاتَ): هەرێم ژینیکـرد/ ئاژەڵەکە یـان ڕووەکەکە بە ئاوو هەوایەکـی ڕاهێنـا کـە هـی هەرێمی خۆی نەبێت.
(تَأَقْلَـمَ): هەرێمژینبوو/ بە ئاووهەوای تازە ڕایهێنا.
(تَأَقلُم= التَبَلُّـد): ڕاهاتن بە ئاووهەوای ئەو شوێنەی بۆیچووە.

---

قلَنَ: (قَلنَسَ- هُ): کڵاوی لەسەر کرد.
(-الشيءَ): شتەکەی داپۆشیو سەرینایەوە.
(ألقَلَنْسُوَة والقُلَنسِيَة (ج) قَلانِس وقَلانيس وقَلاسٍ وقَلاسِـيّ): کڵاو، تەپلە/ کڵاو فووج. جۆرە بەرگێکی سەرە جۆری زۆرە.
(قلوسة) (لاتينية (عامية): جۆرەکڵاوفوچێکە/ تەپلەیەکـە قەشـەی دیانـە خۆرهەڵاتییەکان لەسەریدەکەن.
قُلَينِسَـة وقُلَيسِيَة): کڵاوۆك: تەپلۆك/ کڵاوی بچووك.
٢-(قَلْنَسَ- الرَجُلُ): دەستی بە سنگەوە گرتو بە پێوە وەك (زەبوونێك: کەساسێك) وەستا.
قلـو: ١-(قَلا- الرَجُلَ قَـلاً وقَلاءً): قینی لە پیاوەکە بوو/ حەزی لە چارەی نەکرد.
(تَقَلّی- إليهِ): قینی بەرامبەر دەربڕی.
(تقالی الرجلان): قینو نەیارییان بەرامبەر یەك دەربڕی، قینیان لە یەك بووەوە.

(«بَينَهُم تَقالٍ»): رِقو ناحەزییان لە نێواندا هەیە.

٢-(قَــلاَ- اللَّحْــمَ وغَيرَهُ قَلْواً): لــە تاوەکەدا گۆشتەکەو شتیتری سوورکردەوە.

(قَلاَّء): گۆشتو شتیتر سوورکەرەوە.

(أَللَّحْمُ المَقْلَوّ): گۆشتی سوورکراوە.

(تَقَلَّــى- على فِراشِــهِ): لەســەر نوێنەکەی تەپاوتلیکرد.

(إقْلَوْلَى. إقلِيلاءً): ١-لە شــوێنەکەدا سرەوتی نەبــوو ٢-چوویەكو كرژ بوو ٣-ســەری خۆی هەڵگرتو رۆیشتو دڵخورد بوو شپرزە بوو.

٣-(قَلا- الإبلَ. قَلواً): حوشترەکەی دەرکردو دایە پێش خۆی.

(-القُلَّةَ وبالقُلَةِ): دار هەلووکەکەی هەڵدا.

(أَلقُلَــة (ج) قُــلاَت وقُلُون وقُلُــون والمِقْلى والمِقْــلاء): دارو هەلــوك (دوو دارە منــدالآن یاریی پێدەکەن).

(أَلقِلْوَ): ١-هەموو شــتێکی ســووکەڵە ٢-کەری تەمەنکەمی ئازاو سووکەڵە.

أَلقِلْــوَة: چوارپێیــەك کــە گورجبێــتو خاوەنەکەی پێشبخات.

٤-(إقْلَولى- الطائرُ إقليلاءً): ١-باڵندەکە بەرزبوەوە/ بەرز فری ٢-کەوتە سەر پۆپەی درەختەکە.

(-هُ): سەرپشتیکەوت.

(-في الجَبَــلِ): ســەرکەوتە ســەر پۆپــەی/ لووتکەی شاخەلەو لەوێوە روانی.

(القَلولَــى): باڵندەیــەك کە لــە فرینداا زۆر بەرزبێتەوە.

٥-(أَلقُلَة): داوی گرتنی ئاسك.

أَلقِلْو: شــتێکە لە ســووتاندنی گیای ترشۆکە دەستدەکەوێت.

قلي: ١-(قَلى. يَقلي- اللَّحْمَ وغيرَهُ): گۆشتەکە یان هیتری سوورکردەوە.

(قَلاَّء): تاوەســاز/ کەسێکە لە تاوەدا گۆشتو شتیتر سووردەکاتەوە.

(اللَّحْمُ المُقلي): گۆشتی سوورەوەکراو.

(أَلقِلاَّء): ١-تاوە دروستکەر ٢-کەسێکە لە تاوەدا گۆشت سووردەکاتەوە.

(أَلقَــلاَّءة): ئــەو شــوێنەی تــاوەی تێــدا دادەنرێت.

(أَلقَلِيَّــة (ج) قَلايــا (ط): ١-ســوورەوەکراو کــە لەگەڵ چێشــتدا دەخورێتو چێشــتەکە خۆشدەکات ٢-شلەیەك کە لە گۆشتی سەربڕاو دەکرێت.

أَلمِقْلــى والمِقلاة (ج) مَقالٍ: تاوە کە گۆشــتی تێدا سووردەکرێتەوە.

(أَلمَقلاة): شوێنی دروستکردنی تاوە.

(المَقْلِيّ): سوورەوەکراو.

٢-قَلَى. يَقلي- فُلاناً قَلْياً: کێشــای بەســەری فیساردا.

(أَلقُلَــة (ج) القُلــى): ١-تەوقــە ســەری پیاو ٢-تەوقە سەری شاخەکان.

٣-(قَلـى يَقلي وقَلِـيَ يَقلـى- الرَجُل. قِلى وقَلاءً ومَقلِيَةً): رقى له كابرا بوومەوە.

(قال): رقليومبوو. كەسێكە حەز لە چارەی یەكێك نەكات.

(مَقلي): بێزراو/ نەویستراو.

٤-(اَلقِلى والقِلْيُ): شتێكە لە سووتاندنی گیای ترشۆكە پەیدادەكرێت.

(اَلقِليَةُ) (یونانیة): خەلوەتخانەی دنیانەویست یان ژووری پارسا.

(اَلقِلاّيَة) (یونانیة): خانووی قەشە.

الملحق:

قَلـيَ: (القِلْوي): تفت تایبەتییە كە بە شتە تفتەكان.

(«محلول قَلَوي»): گیراوەی تفت.

(«مَعادِن قِلْوِيَّة»): ١-كانزا تفتەكان ٢-تفتیی تێدا هەیە.

(«مِلحٌ قَلَوي»): خوێی تفت.

(اَلقلي أو القِلي) (ك): مادەی سووتێنەرە لە ناودا دەتوێتەوە. پێكاتەیە لە كانزاو ئۆكسجین وەك سۆدیۆمو پۆتاسیۆم.

---

قَمّ: ١-(قَـمَّ- البَيـت. قَمَـاً): (خانووەكەی/ماڵەكەی) گەسكدا.

(قام وقَمّان): گەسكدەر.

(-شارِبَهُ): سمێڵەكەی پاكتاشیی.

(-ما على المائِدَةِ): چی لەسەر خوانەكە بوو خواردی/ ماشییەوە.

(تَقَمَّـمَ ما علـى المائِدَةِ): هەرچی لەسەر خوانەكە بوو خواردیو هیچی لێنەهێشتەوە.

(إقْتَمَّ ما على المائِدَة): ئەوەی لەسەر خوانەكە بوو خواردی.

(اَلقُمَّة): ١-گلێنجانە/ سەرەنوێلك ٢-ئەوەی كە شێر بە دەمیەوە دەگرێت.

(اَلقُمامَـة (ج) قُمَـام= الكناسَـة): خـۆڵو خاشاكو پیسی.

(اَلقَميم): ئاردی زۆر وردی گەنمو جۆ.

(اَلمِقَمّ والمُقْتَمّ) ئەو كەسەی كەچی لەسەر خوانەكە بێت بیماشێتەوەو هیچی لەسەر نەهێڵێت.

(المِقَمَّة (ج) مَقامّ): گەسك.

(اَلمِقَمَّـة والمَقَمَّة): لچو لێوی ئاژەڵی سمدار (چونكـە بـە لـچو لێـوی خواردنەكـەی دەماشێتەوە).

٢-(قَـمَّ- الشـيءُ قَمّاً): شـتەكە وشـكبوو/ وشكبووەوە.

(قَمَّمَ-هُ): وشكیكردەوە.

(اَلقَميم): سەوزەی وشكەوەبوو.

٣-(قَمَّـمَ- النَجـمُ): ئەسـتێرەكە كەوتـە ناوەراسـتی ئاسـمانەوە كە تەماشـاتكرد بە ژوورسەرتەوەیە.

(تَقَمَّـمَ- الشـيءَ): شـتەكەی بڵندكـرد/ بەرزكردەوە.

(-النَّخلَـةَ): بـە دارخورماكـەدا هەڵزنـا تا گەیشتە پۆپەكەی.

(-الرَجُلُ قِرنَهُ): پیاوەکە بەسەر هاورێکەیدا سەرکەوت.

(أَلقِمَّــة (ج) قِمَــم): ١-(لووتکــەی پۆپەی/ تەوقەسەری) هەموو شتێك ٢-لەش/ جەستە ٣-بەژن/ بالاّ.

٤-(إقْتَــمَّ- الشــيءَ): ١-شــتەکەی چاککــرد/ چارەسازیکرد ٢-رووپێکردو بە هەڵەدا نەچوو.

٥-(أَلقِمَّة (ج) قمام): کۆمەڵە خەڵکێك.

٦-(قَمقَمَ- مــا على المائِــدَةِ. قَمْقَمَةً): چی لەسەر خوانەکە بوو کۆیکردەوە.

(رَجُلٌ قَمقامٌ): پیاوێکی خوازلۆك و پیسخۆرو دەروونتزم.

٧-(تَقَمْقَمَ): نوقمی ئاوەکە کرا تا خنکا.

(-الشيءَ): سەر شتەکە کەوت.

(القِمْقِم): پەڕ.

(أَلقَمْقام): کاری سەخت و دژوار.

(أَلقُمقــام والقُماقِــم): ژمارەیەکــی زۆرو بێئەندازە ٢ دەریا یان بەشــی زۆری دەریاکە ٣-(ح) سج (چونکە دەدەنە پاڵ یەك و سەریەك دەکەون بەسەر لەشی ئاژەڵەکەوەن).

(- (ج) قَماقِــم وقَماقِمَة): گــەورە پیاوێکی زۆر بەخشندەو بەدەست و دڵ.

(أَلقُمْقُمــان): ١-ژمارەیەکــی زۆر ٢-دەریا یان بەشی زۆری دەریاکە ٣ بیچووی سج.

٨-(تَقَمْقَــمَ- مِنهُ) (عامية): لێیوەرســبوو/ هاواری لەدەست هەڵسا.

٩-(أَلقُمْقُم): ١-قــورگ ٢-گۆزە ٣-قاپێك کە لە مســەو ئاوی تێدا گەرمدەکرێت ٤-قاپی عەتار ٥-گومگومە (فارســیە)= گولاوپرژێن کە گولاو بەسەر میوانانداپێ دەپرژێنرێت.

(أَلقُمْقُمــة = القُمْقُــم. أَلقِمْقِــم): خورمای وشکەوەبوو.

(أَلقَمْقــام والقُمْقــام والقُماقِــم والقُمْقُمان الواحِدَةُ قُمْقُمانَة) (ح): جۆرە ئەسپێیەکە.

(أَلقَماقِم): ڕۆژانێکی دوادوای مانگی سەرماوەز ئەوەندەی مانگەکانی ساڵەکە. ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن.

(أَلبَواخير): بە پێی ئەو ڕۆژانە سەرماو گەرمای ساڵە داهاتووەکە دادەنێن و چاوەڕێدەبن.

قمــأ: ١-(قَمَــأَ- الَمــكانَ وبِــهِ قَمْــأً): چووە شوێنەکەوەو تیایدا نیشتەجێبوو.

(قَمأَ وقَمُؤَ-تِ الماشِــيَةُ قُمُــوءَةً وقَمْأً وقَماءً وقُمُوءً): ئاژەڵەکە قەڵەو بوو.

(-تِ الإبِلُ بالَمكانِ): حوشترەکان لە شوێنەکەدا مانەوە لەبەر لەوەڕی زۆر قەڵەو بوون.

(قامَأَ-هُ مُقامَأَةً): گونجا/ ڕێککەوت.

(«ماقامَأَهُ المَكانُ»): شوێنەکە بۆی باشنەبوو/ نەلووا -پێی نەکەوت-.

(أَقمَأَ- الشــيءُ أَو الَمكانُ فُلاناً): شتەکەی یان شوێنەکەی بەدڵبوو.

(-تِ الماشِــيَةُ): ئاژەڵەکە گۆشتیگرت/ قەڵەو بوو.

(تَقَمَّأَ- فلانٌ المكانَ)شوێنەکەی بۆ لواو تیایدا نیشتەجێبوو.
(ألقــمْءِ):ئــەو شــوێنەی کــە مێحوشــترو حوشــتریترو ئــاژەڵ هەروەهــا ژن‌و پیاو بە مانەوەیان تیایدا قەڵەو بن.
(ألقَمْأَة):پیت‌و فەڕ.
(ألقَمْأَة):پیت‌و فەڕ.
(ألقَمــأَة (ج) قِماء ولِقْماة والمُقوَّة)شــوێنی نسرم کە هەتاو لێینادات/ نسێ.
٢-(قَمأَ-ەُ. قَمأً):دایمرکانەوە/ سەرکوتیکرد.
(قَمــأَ وقَمُؤَ. قَمــأَةً وقُمْأَةً وقِمْــأَةً وقَماءَةً): سەرشۆڕو زەبوون‌و بچووکبوو.
(قَميء (ج) قُماء وقِماء):سەرشــۆڕو داماوو بێرێزو لەبەر چاو بچووك.
(أَقْمَــأَ- الرَجُــلَ): پیاوەکــەی سەرشــۆڕو کەساسکرد.
(ألقَمْأَةُ والقُماَةُ):داسەکنان/ هێمنبوون.
(القَمــيء):زەبــوون‌و سەرشــۆڕی بچووك‌و ڕسوا.
٣-(تَقَمَّــأَ- الشــيءَ):١-شــتەکەی تۆزمتۆزە کۆکــردەوە ٢-باشــترین شــتەکەی هەڵبژاردو برد.
(إقْتَمَأَ-الشيءَ)شتەکەی کۆکردەوە.
قمــح: ١-(قَمَحَ وقامَــحَ وانقَمَــحَ- البَعيرُ. قُموحــاً):حوشــترەکە تێرئاو بوو و ســەری هەڵبڕی.

(قامِح (ج) قِماح وقُمَّح)حوشتری سەرهەڵبڕ پاش تێرئاوبوون.
(قَمَّحَ- فُلاناً):بە شتێکی کەم پاڵی پێوەنا لە بری زۆر کە دەبوو بیداتێ.
(أقْمَــحَ- الرَجُلُ):پیاوەکە ســەری هەڵبڕی‌و چاوی لانا.
(-بأنفِهِ):لووتی بەرزکردەوە.
(-الغِلُ الأسَــير):کۆتەکــەی گەردنی وای لە دیلەکە کرد سەری بڵند کاتەوە.
(تَقَمَّــحَ- البَعــرُ):حوشــترەکە تێرئاو بووو سەری هەڵبڕی.
(-الشَّــرابَ ومِــنَ الشَّــراب):شــەرابەکەی لەبەرچاو کەوت‌و ڕقی لێبوو.
(شَــهرا قُماحٍ وقِمــاحٍ):مانگی کــەو بەدارو مانگــی ڕێبەندان (بۆیــە وا ناونراون چونکە حوشــتر کە هاتە ســەر ئاوخواردنەوە لەبەر ساردی ئاوەکە سەرهەڵدەبڕێت.
٢-(قَمِحَ وتَقَمَّحَ واقتَمَحَ- السُّــوَيقَ. قَمْحاً): قاوتی وشکیخوارد.
(-الشَرابَ)شەربەتەکەی بە مشت خواردەوە.
(أقْمَحَ- فُلانٌ)فیسار شەرابیخواردەوە.
(ألقُمْحَة):گوپێك ئاو یان دەرمان‌و شتیتر.
(رَجُــلٌ قَمُــوحٌ لِلنَّبيذ)پیاوێکــە مەی زۆر دەخواتەوە. شەرابخۆرێکی بەدفەرە.
(ألقَميحَة):قاوت یان دەرمان‌و شــتی هاڕراو کە بەوشکی دەخورێت.

٣-(أَقْمَحَ- السنبلُ): گوڵە گەنمەکە یان گوڵە جۆکە شیلەی گرت دانی تێچوو.

(-البُـرَّ): گوڵەگەنمەکـە بـوو بـە گەنمـی پێگیەشتووی تەواو.

(أَلقَمْح): گەنم.

(حَبَّة قَمح): دەنکەگەنمێك.

(أَلبُرُّ): گەنم، دەهاڕرێتو دەکرێت بە نان.

(أَلقَمحِيَّــة= القِلْبَة) (ط): جۆرە حەڵوایەکە لە ئاردی گەنمو شەکرمو گوڵاوی تێدەکرێتو دەنکە هەنارو شتیتری تێدەچێنرێت.

٤-(أَلقَمْحَـةُ والقُمْحــان والقُمَّحــان) (ن): زەعفەران.

(أَلقَمْحانَــة): نێوان ئێسـکە هەسـتاوەکەی پشتملو چاڵی پشتی مل.

٥-(أَلقَمَحْــدُوَة (ج) قَماحِد): ١-ئێسـقانێکی بەرز هەستاوە لە پشـت ملداو بە بەرزییەوە لە پشـت هەردوو گوێوە ٢ پشـتی مل نێوان هەردوو گوێ.

الملحق:

قمح: (أَلقَمحِي): گەنمڕەنگ.

(«بَقَــرَةٌ كَسْـوَتُها قَمحِيَّــة)»: مانگایـەك پێستەکەی گەنمڕەنگە.

قمد: (قَمَدَ. قَمْداً وقُمُوداً): ١-ملینەداو خۆی بەدەسـتەوە نەدا ٢-لـە چاکە یـان خراپەدا سەروەر بوو/ بەردەوامبوو.

(قَمِدَ. قَمَداً): ملی ئەستوورو درێژ بوو.

(أَقْمَد (م) قَمْداء): ملئەستوورو ملدرێژ.

(أَقْمَدَ- الرَجُلُ): ملی هەڵبڕی.

(القُمُد والقُماد): ١-توند ٢-ئەستوور.

(أَلقُمُــدَّةُ والقُمُــدُ والقُمُدَّانِيَّــة): ملدرێــژ (دەیشڵێن: ملدرێژو ملئەستوور).

قمر: ١-(قَمَرَ. قَمْراً): گرەوو قوماریکرد.

(-الرجُلَ): قومارەکەی لێبردەوە.

(-الرَجُلَ مالَهُ): ماڵەکەی لێزەوتکرد.

(قامَرَ- هُ مُقامَــرَةً وقِماراً): گرەوو قوماری لەگەڵدا کرد.

(تَقَمَّرَ- الرَجُلَ): قومارەکەی لێبردەوە.

(تَقامَرَ- القَومُ): گرەویانکردو یاریی قوماریان لەگەڵ یەك کرد.

(أَلقِمــار) (مص): قومار، هەموو یارییەکە کە براوە کە شتێك لە دۆڕاوەکە وەربگرێت سا ئیتر یارییەکە بە کاغەز بێت یان بە شتیتر بێت.

(أَلقَمير (ج) أَقمار): قومارچی/ قومارکەر.

(«هو قَميرُكَ»): ئـەو لەگەڵتدا قومارکەرە/ قومار دەکات.

٢-(قَمِــرَ- الشَــيءُ. قَمَــراً): شـتەکە تەواو سپیبوو.

(-الرَجُــلُ): ١-پیاوەکـە بەفـر بـردیو لـە بەفرەکەدا چاوی نەبینا ٢-لە شەوی مانگەشەودا خەوی لێنەکەوت/ خەوەکەی زڕا.

(أَقْمَــرَ- اللَّيلُ): شـەوەکە مانگەشــەو بوو/ بەشەوقی مانگ ڕووناکبووەوە.

(-الهِلالُ): مانگی یەکشەوە کەوانە مانگەکە پڕ بوو/ بوو بە مانگی پڕ.
(-القَومُ): ١ مانگ لە خۆیشگەل هەڵات ٢-چاوەڕێی هەڵاتنی مانگیانکرد.
(تَقَمَّرَ): بە مانگە شەو ڕاویکرد.
(-الرَّجُلَ): بە مانگەشەو بۆ لای هات.
(-الطَيرَ): بە ئاگر باڵندەکەی بە شەوارە خست بۆ ئەوەی بیگرێت.
(-الطَيرَ والظباءِ): بە مانگەشەو باڵندەو ئاسکی ڕاوکرد.
(إقْمارً- إقْميراراً): سپیبوو وەك ڕەنگی مانگ.
(ألقَمَر (ج) أقْمار) (فك): مانگ/ هەیف. هەسارەیەکە تیشکی خۆی لە خۆر وەردەگرێت و دەیداتەوەو دەگاتە زەوی و تاریکی شەو لادەبات، پاش سێ شەو تا کۆتایی پێیدەڵێن مانگ، سێ شەوی یەکەمی پێیدەڵێن: (هِلال) کەوانە مانگ، داسەمانگ لەبەر سپێتی وای پێدەڵێن.
(ألقَمَران) (فك): خۆرو مانگ.
(الأقْمار التَّوابِع) (فك): ئەستێرەی ئاسمانە بە دەوری/ خولی هەسارە سوڕدەرەکاندا دەخولێنەوە، وەك مانگ کە خولی زەوی دەدات، هەروەها ئەستێرە پاشکۆکانی خولی بارام و پەرچیس و کەش.
(أقمارُ العِلم وشموسِهِ): مانگ و ڕۆژەکانی زانستی واتا زاناکانی زانستی.

(ألقُمْرَةُ): ١-ڕەنگی سپی مەیلەو سەوز ٢-سێهەمشەوی مانگ.
(لَيلَةٌ قَمِرَةٌ): شەوێکی مانگەشەو.
(الحروف القَمَرِيَّة): چواردە پیتی عەرەبییە لە دەربڕینیدا (ال) لەگەڵیدا دەردەکەوێت وەك (ألقَمَر)
(ألأَقْمَر): ١-سپی ٢-ئەوەی ڕەنگی سپیی مەیلەو سەوزە.
(وَجْهٌ أقْمَر): ڕووی وەك مانگ/ لەمانگچوو.
(ألقَمْراء): ١-مێی وشەی (الأقْمَر): ٢-تریفەی مانگەوشەو/ شەوقی مانگ.
(ألقُمْرِيّ (ج) قُمْر وقَمارِيّ) (ح): قومری کە باڵندەیەکی دەنگخۆشەو لە کۆتر دەچێت.
قُمرِيَّة: مێی قومری.
(ألقَمْرِيَّة): پەنجەرەی بچووك.
(ألقَمَرِيَّة) (ن): ١: ڕووەکێکی کەپرییە لە ئەمەریکای باکوورەوە بڵاوبۆتەوە بەرەکەی تۆوێکی وەك کەوانە مانگە بۆ جوانیی دەروێنرێت ٢-ڕەگەزە گوڵێکە دوو جۆرە یەکێکیان تەمەندرێژەو بۆنی خۆشە ئەویتریان ساڵانەیە بێبۆنە، لەبەر بۆن و بەرەکەی وا ناونراوە.
(لَيلَةٌ مُقمِرَةٌ ومُقمِرٌ): شوێکی مانگەشەو.
(«أنْشَطُ مِن ظَبيٍ مُقمِر»): لە ئاسکی مانگەشەو چابوکترە (چونکە ئاسك لە مانگەشەودا یاریدەکات و چالاکانە دێت و دەچێت.

(«أَغَـرُّ مِـن ظَبِـي مُقمِـر»): له ئاسكی مانگەشەو لەخۆبایيترو بـه فەوتان دەچێت (چونكه درنده به ئاسانيی دەيدۆزێتەوەو دەيخوات).

٢-(قَمِـرَ- الكلأُ والمـاءُ وغَيرُهما): گياو ئاوو شتيتر زۆر بوو.

(أَقْمَرَ- تِ الإبلُ): ١-حوشترگەل تێرئاو بوون ٢-له لەوەری زۆرو چاكدا لەوەڕان.

(الماءُ القَمر): ئاوی زۆر.

(سَحابٌ أَقْمَر): هەوری چڕوپڕ.

٤-(أَقْمَـرَ- الثَمَرُ): ١-بەرەكە، ميوەكە نەگەيشت تا سەرمای بەسەردانەهات ٢-ميوەكە پێش پێگەيشتنی سەرماڵيداو شيرنييەكەی بری/ برد.

٥-(قَمْرَةُ- المَركَب (عند المَلاّحين)): نوێنگەی/ خەوگەی دەرياوانەكان له (كاميـرا)ی ئيتاليیەوە وەرگيراوە.

(أَلمَقمُـور) (مفـع): بەديی و خراپەو ڤينلەدڵيی.

(«وَضَعْتُ يَدی بَيـنَ إحدی مَقمو رَتَين»): دەستم خستە ناو يەكێك لە دوو خراپەكەوە.

قمز: ١-(قَمَزَ- الشيءَ. قَمْزاً): ١-شتەكەی كۆكردەوە ٢-بەسەری پەنجە شتەكەی هەڵگرت، برد.

(أَقْمَـزَ- الرَجُلُ): شتێكی، ماڵێكی بێكەڵكی پەيداكرد.

(أَلقَمَز): ئاژەڵ ماڵياتی بێكەڵكو خراپ.

(أَلقُمْزَةُ (ج) قُمَزٌ): ١-چنگێك خورما ٢-بەرگی/ توێكلی دانی ڕووەك.

٢-قَمَزَ. قَمْزاً: بازدیدا (به پێی بەكارهێنانی خەڵكه ڕەشۆكەكه).

قمس: ١-(قَمَسَ-ه في الماءِ. قمساً): كردی به ژێر ئاوەكەوە، له ئاوەكەی هەڵكێشا.

(-تِ الدَلـوُ في الماءِ)دۆلكەكـه نوقمی ئاوەكه بوو.

(-بِهِ في البئرِ): هەڵيدايه ناو چاڵاوەكەوە.

(-الوَلَدُ في البَطنِ): منداڵەكه له سكی دايكيدا شپرزه بوو.

(-في الماءِ. قَمسـاً وقُموسـاً): خـۆی نوقمی ئاوەكه كرد.

(قَمَّسَ- الرَجُلُ): حوشترەكانی ئاودا.

(قامَـسَ- هُ. قِماسـاً ومُقامَسَـةً): لەخـۆ نوقومكردنـی ئاوەكەدا بەزاندی/ لەو باشـتر خۆی نوقومكرد.

(أَقْمَسَ- الكَوكَبُ): هەسارەكه ئاوابوو.

(أَقْمَـسَ- هُ في المـاءِ): نوقمـی ئاوەكەيكرد/ كردی بەژێر ئاوەكەوە.

(-الوَلَدُ في البَطن): كورپەكه له سكيدايكدا شپرزه بوو.

(تَقامَسـوا- في الماءِ): پێكەوە خۆيان نوقومی ئاوەكه كرد.

(إنقَمَـسَ-في المـاءِ): لـه ئاوەكـەدا خـۆی نوقومكرد.

(-فِي الركبةِ): خۆی هەڵدایە بیرە ئاودارەکەوە.

(-الكوكَبُ): هەسارەکە ونبوو.

(القاموس (ج) قَواميس): ١-دەریا ٢-زۆربەی دەریاکەو قووڵترین شوێنی ٣-فەرهەنگی فەیروزئابادی (لەبەر فراوانیو قووڵیی لە رووی زمانەوە وا ناونراوە).

(قاموس= مُعجَم): فەرهەنگ.

(أَلقِماس): زۆریی ئاو لە چاڵاودا.

(أَلقَمّاس): بندەریاگەر/ ژێرناو چوو.

(أَلقَمُوس): چاڵاوی فرەئاو کە دۆلکەی تێدا نوقومبێت.

(أَلقَميس): دەریا.

(أَلقِمِّيْسُ (ج) قَماميس): دەریا.

(أَلقَومَس (ج) قَوامِس): ١-زوربەی ئاوی دەریاکە.

٢-(القَوامِس): چورتوم/ ئاپۆرە/ بەڵا.

٢-(قامَسَ-هُ. قِماساً ومُقامَسَةً): پێکەوە سەرنجیان/ گۆڕییەوەو راڤەیانکرد.

(«هو يُقامِسُ حوتاً): لەگەڵ یەکێکدا سەرنج دەگۆڕێتەوەو لێدەکۆڵێتەوە کە لەخۆی زاناترو بەرزترە.

٣-(أَلقُمَّس (ج) قَمامِس وقَمامِسَة): گەورەیەکی مەردو ئابروودار.

(أَلقَومَس (ج) قَوامِس): میر.

قمش: (قَمَشَ وقَمَّشَ القُماش. قَمْشاً): کوتاڵی لەملاولا کۆکردەوە.

(تَقَمَّشَ): هەرچی دەستکەوت باخراپیش بێت خواردی.

(إِقْتَمَشَ- القُماشَ): هی ئەملاو لای خوارد گەرچی گەندیش بێت.

(أَلقَمْش) (مص): گەندەی هەموو شتێك.

(أَلقُماش (ج) أَقْمِشَة): وردە شتی رزیوو بێکەڵکی کەوتووی سەرزەوی.

(قُماشُ كُلِّ شيءٍ): ورتکەو پرتکەی بێکەڵکی هەموو شتێك/ گەندەو چرووكو پاتاڵی هەموو شتێك.

(قُماشُ الناس): سووكو رسوای ناو خەڵك/ ناکەسبەچە.

(قُماشُ البَيتِ): کەلوپەلی ناوماڵ.

(قُماشُ الثَّوب) (ت): کوتاڵ. چنراوی جلو بەرگ.

(«هذا الثَوبِ جَيدُ القماش»): ئەم بەرگە چنراوەکەی سفتو چاکە/ کووتاڵەکەی باشە.

(ثَوبُ مُقَمَّش): بەرگێکە کوتاڵ سفتەو چاك چنراوە.

(أَلقَمّاش): فرۆشیاری کوتاڵو کەلوپەل/ بازرگان.

قمص: ١-(قَمَصَ- الفَرَسُ وغَيرُهُ. قُماصاً وقِماصاً وقَمْصاً): چارەوێکە یان وڵاخێتر هەردوو دەستی پێکەوە بەرزکردەوە دانەواندنەوەو قوری شێلا، کەوتە چەپۆکان.

(-البَعيرُ): حوشترەکە راپەڕیو هەڵات/تەرە بوو.

(-منـهُ قَمْصـاً): هەڵسـڵەمییەوەو لێـی دوورکەوتەوەو خۆی لێلادا.

(-تِ الناقَـةُ بالرَّديـف): مێحوشـترەکە سـوارەکەو هاوەڵە سـوارەکەی پشـتەوەی بە ئاسانیی هەڵگرتو برد.

(-وقَمَّـصَ البَحـرُ بالسـفينَةِ): دەریاکـە پاپۆڕەکەی ڕافڕاند وەك حوشترێك غاربکات.

(ألقِماص) (مـص): دڵخوردیی/ نارەحەتیی دڵ/ نائارامی.

(أَلقَمُوص)١-ولاخێکەئازایانەبەسوارەکەیەوە هەڵدەتیزێنیچت ٢-(ح) شێر ٣-دڵخوردێك کە ئارامی لەبەر بېرێتو نەسرەوێت.

(«فُلان قَموصُ الحُنجَرَة»):فیسار درۆزنە.

(أَلقَميـص): چوارپێکـە/ ولاخێکـە بـە سوارەکەیەوە هەڵدەتیزێنێت.

٢-(قَمَّصَ-هُ):کراسی لەبەرکرد.

(-الثَوبَ):کراسێکی لە کوتاڵەکە بڕی.

(تَقَمَّـصَ):١ کراسـی لەبـەر کرا ٢-کراسـی لەبەرکرد.

(«تَقَمَّصَ الولايَةَ والأَمـارَةَ. وتَقَمَّصَ لباسَ العِزّ»): ولاتنشـینەکەو میرییەکەی بە بالای خۆی بـڕیو وەریگرت. ونگینیەکەی پۆشـی (ئەمە خوازەیە).

(تَقَمَّصَ-تِ الروحُ):گیانەکە جەستە گوێزییکرد. گوایـە هەندێك بڕوایان بـەوە هەیە کە گیان کە خاوەنەکەی مرد بۆ جەستەیەکیتر دەگوێزێتەوە.

(أَلقَميـص (ج) أَقْمِصَـة وقُمُص وقُمْصان): ١-کـراس (بە مێو نێر دەکرێـت) ٢-وێڵداش/ هاوەڵمنداڵ ٣-پەردەی دڵ.

(«هَتَكَ الخَوفُ قَميصَ قَلبِهِ»):ترس پەردەی دڵی (دراند/ شەقپێبرد).

٣-(القَمَص الواحِدَة قَمصَة) (ح):١-کوللە کە لە هێلکە دێتە دەرەوە/ پێکورە ٢-(ح) مێشولە وردەکە بەسەر ئاوەوە دەفرێت.

قمط: ١-(قَمَطَ وقَمَّطَ-هُ. قَمْطاً): دەسـتو پێی بەسـتەوە وەك چۆن منداڵ لە بێشکەدا شەتەکدەدرێت.

أَلقِمـاط (ج) قُمُـط:١-پەتێـك شـەتەکی پێدەدەن ٢-دەسـرازەی کورپە کە لە پێشکەدا پێیدەبەستنەوە.

(ألقِماط والقَمْط):گوشێکە/ پەتێکە دەستو پێی مەڕی پێدەبەستنەوە (کاتی سەربڕینی).

(ألقَمَّاط):دەسرازە هۆنو دروستکەری.

٢-(قَمَـطَ وقَمَّطَ- طَعْـمَ الشَـيءِ قَمْطاً): شتەکەیچەشت.

(-الشيءَ):شتەکەی برد.

(أَلقَمَّاط):دز.

(أَلقُمَّاط):دزەکان.

٣-(قَمَطَ وقَمَّطَ- الإبلَ. قَمْطاً):حوشترەکانی یەك بە دوای یەکەوە بەست/ قەتاریکردن.

٤-(عـامٌ قَميطٌ):سـاڵێکی ڕەبەق/ خشـت/ ساڵێکی تەواو.

(«أَقَمتُ عِندَهُ حَولاً قَميطاً أَو شَهراً قَميطاً»): سالێکی رەقە/ سالێکی تەواو یان مانگێکی تەواو لەلای مامەوە.

٥-(قَمْطَرَ- الشيءُ. قَمْطَرَةً): شتەکە گرموڵە بوو/ کۆبووەوە.

(-الشيءَ): شتەکەی کۆکردەوە.

(-القِربَة): ١-مەشکەکەی بە بەنەکە شەتەکدا ٢-پڕیکرد.

(إِقْمَطَرَ): چوومیەك/ کرژ بوو.

(-لِلشَّرِّ): ئامادەی خراپە بوو.

(-عَلَيهِ الشيءُ): شتەکەی لەسەر کەڵەکە بوو.

(أَلقِمطَر والقِمَّطْر (ج) قَماطِر): ١-کتێبدان/ دۆڵابی پەرتووك/ کتێب ٢-دارێکە تەختەیەکە دەکرێتە پێی تاوانباران ٣-پیاوی کورتەبنەی کەتە (بە نێرو مێ دەکرێت) لەوانەیە بۆ مێ (هـ) بخرێتە سەر دەوترێت: إِمْرأةٌ قِمَطْرَةٌ

(القِمَطْری): ١-پیاوی کورتی قەبە ٢-بە کۆمەڵ رۆیشتن.

٦-(قَمْطَرَ- العَدوُّ. قَمطرَةً): دوژمن هەڵات/ رایکرد.

(إِقْمَطَرَّ): بڵاوبووەوە.

٧-(إِقْمَطَرَّ- اليَومُ): رۆژەکە سەختبوو.

(أَلقُماطِر والقَمْطَرير): رۆژانی سەختو دژوار یان پڕ لە خراپی.

قمع: (قَمَعَ-هُ. قَمْعاً): ١-رێی نیازەکەی لێگرتو نەیهێشت بیگاتێ ٢-بەزاندیو سەرشۆڕو زەبوونیکرد ٣-بەدار یان ئاسن لێیدا/ بیرازیکرد ٤-کێشای بە تەوقەسەریدا.

(-البَردُ النَّباتَ): سەرما رووەکەکەی برد.

(-قَمِعَ-تِ الظَبيَةُ): مێشەگەزە چووە لووتی ئاسکەکەوەو خستیە سەرلەقێ.

(أَقْمَعَ-هُ): بەسەریدا زاڵبوو سەرشۆڕیکرو گێڕایەوە.

(«أَقْمَعْتُهُ»): بەرەو روومهات شکاندمو گێڕامەوە/ لە خۆم دوورخستەوە.

تَقَمَّعَ): سەرشۆڕو کەساسبوو.

(-الذُباب): مێشەکەیدەرکرد.

(«تَركْتُهُ يَتَقَمَّعُ»): بەجێمهێشت مێشەکان لە خۆی دەرکات کە دەستبەتاڵبوو/ بێئیش بوو.

(إِنْقَمَعَ): سەرشۆڕو کەساسبوو.

(أَلقَمَعَةُ (ج) مَقامِع) (ح): مێشەگەزە/ جۆرە مێشێکە لە گەرمای زۆردا دەداتە حوشترو ئاسك‌و هیتر.

(أَلمِقْمَعَةُ (ج) مَقامِع): تەختەو دارێکە یان پارچە ئاسنێکە بۆ زەبوونکردن لە مرۆڤی پێدەدەن.

(أَلمَقْمُوع) (مفع): سەرشۆڕو زەبوونکراو/ داماوکراو.

٢-(قَمَعَ- القِربَةَ. قَمْعاً): دەمی مەشکەکە یان کوندەکەی بەدیوی دەرەوەدا شکاندەوە.

(-في الشيء): چووە ناو شتەکەوە.

(-تِ المَرأةُ بَنانَها بالحَنَّاء): سەری پەنجەکانی لە خەنەگرت، بۆیان وەك كڵاوی لێهات.
(-مافي السقاءِ): چی لە جەوەندەکەدا بوو بە پەلەو شپرزانە خواردیەوە.
(-الشرابُ): یەکسەر شەربەتەکەی خواردەوەو بە گەروویدا چووە خوارێ بێقوملێدان.
(-سَمْعَهُ لِفُلان): گوێی (بۆ شلکرد/ بۆ هەڵخست).
(-الوَطْبَ): ڕەحەتیەکەی خستە سەر دەمی مەشکەکە تا شیرەکەی تێبکەن.
(قَمِعَ- فُلانٌ الدواءَ. قَمْعاً): فیسار دەرمانەکەی خواردەوە.
(قَمَّعَ- البُسرَةَ ونَحوَها): سەری (خورماکەی/ كڵاوەکەی) لێکردەوە.
(-تِ البسرةُ ونَحوَها): (كڵاوی/ سەری) خورماکەو شتی لە بابەتە وەك كڵاوی بەروو لێبووەوە.
(إِقْتَمَعَ- مافي الإناءِ): چی لە قاپەکەدا بوو هەڵیقوراند/ خواردیەوە.
(أَلقَمْعُ والقِمْعُ والقِمَعُ (ج) أَقْماع): ١-ڕەحەتی ٢-(ز) كڵاوی/ سەری خورماو كڵاوی بەروو شتی لەو بابەتە کە بە دارەکەوە یان هێشوەکەوە دەبێت ٣-ئەموستیلەی درومان.
(أَلقَمَع) (ع ا): ١-سەری قورقوراگە یان بۆریی هەناسە بۆ سی ٢-قورتەمی قورقوراگە.
(أَلقُمْعَةُ (ج) قُمَع): پەتی بەستنی دەمی هەمانە.

(أَلقَمَعَةُ (ج) قَمَع): سەری قورقوراگە.
قَمَعَةُ الذَنَب: سەری کلك.
(أَلقَميعَةُ (ج) قَمائِع): سەری کلك.
أَلقِمْعِيَّة) (ن): ڕەگەزەگوڵێکە گەڵا ڕەنگینەکەی لوولەییە لە ئەوروپاو ئاسیاو بەرازیل دەروێت لە بەناوبانگەکانی ئەرخەوانیە ڕووەکێکی جوانە بەلام ژەهراوییە گوڵەکەی ئەرخەوانییە لە شوێنە زەبەنگەکاندا کە گەچین نەبێت زۆرە، دەرمانی (دیجیتالین)ی لێدەردەهێنرێت دەرمانێکە باش میزدادەدەتو هێمنکەرەوەیە، بەلام بەکارهێنانی مەترسیی لەگەڵدایەو نەخۆشیی دڵی پێ چارەسەر دەکرێت.
٣-(قَمَعَ- الكُتُبَ ونَحْوَها. قَمْعاً): پەرتوکە باشەکان یان شتە باشەکانی هەڵبژاردو ئەوەی خراپبوو لێیگەرا.
(تَقَمَّعَ واقتَمَعَ- الشيءَ): شتەکەی هەڵبژارد.
(أَلقَمْعَةُ والقُمْعَةُ – مِنَ المالِ): هەڵبژاردەی ماڵو دارا.
(أَلقُمْعَةُ (ج) قُمَع): هەڵبژاردن.
(-مِنَ المالِ): ماڵو دارای هەڵبژاردە.
(قَمَعَةُ- الشيءِ (ج) قَمَع): هەڵبژاردەو ناوێزەی شت.
(أَلقُموع- مِنَ المالِ): ئەوەی چاكو هەڵبژاردەکەی براوە.
٤-(قَمِعَ-تْ عَينُهُ قَمَعاً): چاوی سوور بووەوەو تووشی سیچکەسلاوە بوو.

(قَمِعَة): چاوی هەڵاوساو تووشی سیچکەسڵاوە بوو.

(اَلقَمِعَة (ج) قَمَع (طب): سیچکە سڵاوە کە لە چاودێت‌و چاوتێکدەدات.

(طَـرَفٌ قَمِـعٌ): قنچکـی چاوێـك زیپکەی تێدابێت.

(اَلقَمَعَةُ (ج) قَمَعٌ) (طب): سیچکەسـڵاوەی چاو.

(اَلأَقْمَـع (م) قَمْعـاء (ج) قُمْـع والقَمُوع): چاوێـك کـە هەڵاوسـابێت‌و تێکچووبێـت‌و سیچکەسڵاوەی گرتبێت.

٥-(قَمِـعَ-تِ الفَـرَسُ. قَمَعـاً): چارەوێکـە ئەژنۆیەکی لەویتری ئەستوورتر بوو.

(-عَرقوبُ الفَرَسِ): سەری دەماری پشت پێی چارەوێکە هەڵاوسا.

(اَلقَمَع): ئەسـتوور بوونـی ئەژنۆی چارەوی یان سەری دماری پشتی پێی.

(اَلقَمِـع- مِنَ الخَیل): ئەسـپێك ئەژنۆیەکی هەڵاوسابێت.

(سَنامٌ قَمِعٌ): کۆپارمیەکی زۆر گەورە.

(اَلقَمَعَةُ (ج) قَمَع): سەری کۆپارەی حوشتر.

(اَلأَقْمَع- مِنَ الخَیل (م) قَمعاء (ج) قُمْع): ئەو ئەسپەی کە ئەژنۆیەکی ئەستوورتر بێت.

(اَلقَمیعَـةُ- مِـن الـدَّواب): هەڵتۆقانێك لە نێوان هەردوو گوێی وڵاخدا.

٦-(تَقَمَّعَ): بە تەنیا هەڵتروشکا.

(اِنقَمَعَ- الرَجُلُ): بە تەنیا دانیشت.

٧-(تَقَمَّعَ): سەرسامبوو/ حەپەسا.

٨-(قَمْعَـلَ- النَبـتُ. قَمْعَلَـةً): گۆپکـەی دەرکرد.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە سـەرۆکی میللەتبوو یان سەرۆکی شوانەکانبوو.

(اَلقِمعال): ١-سەرۆکی میللەت یان خوێشگەل ٢-سەرۆکی شوانەکانن.

(اَلقُمْعُـل (ج) قَماعِـل وقَماعیـل): تیانی گەورەی دەمتەسك.

(اَلقُمعُل والقُمُـول (ج) قَماعِل وقَماعیل): پەرداخی گەورە.

(اَلقُمْعُولَـة (ج) قَماعیـل): ١-(ز) گۆپکـەی رووەك/ گۆپکەی گوڵەکەی ٢-گرێ لەسەردا.

قمل: (قَمِلَ- القَومُ. قَمَلاً): ژمارمیان زۆر بوو ٢-وەچەیان زۆر خستەوە/ تۆویان زۆر بوو.

(-فُلانُ): فیسار پاش لاوازیی قەڵەو بوو.

(-بَطْنُهُ): ورگی گەورە بوو/ ورگی لێهات.

(-رَأْسُهُ): سەری ئەسپێ تێیدا یان ئەسپێکەی زۆر بوو.

(قَمِلَ): سەری ئەسپیداویبوو/ ئەسپێونبوو.

(قَمِلَ وأَقْمَـلَ- المَرعی): لەوەرگاکە چڕو پڕ بوو چنگی دایە یەك‌و ڕەش داگەڕا.

(تَقَمَّلَ- الرَجُلُ): پیاوەکە کەمێك قەڵەو بوو بە خۆیدا هات.

(اَلقَمْلَةُ (ج) قَمْل) (ح): ئەسـپێ مۆریانێکە

مشــەخۆرە بێباڵە ســێ جۆرە بــە مرۆڤەوە دەنووسێت‌و خوێنەکەی دەمژێت‌و جۆرێکیان ئەسپێی سەرە دووەم هی لەشە سێهەم چنگنە هی بانەگایە. جۆر هەیە هی ئاژەڵە. ئەسپێی لەش، نەخۆشیی ڕەشە گرانەتا بڵاودەکاتەوە.

(«دَبَّ قَمْلُهُ»): تۆوی قەڵەو بوو.

(قَمْلُ قُرَيش): تۆکی درەختی کاژ.

(ألقمال (ح)= القَمْل): ئەسپێ.

(ألقُمَّــل الواحِدَةُ قُمَّلَــة) (ح): ١-مۆریانێکە وەك گەنەو ســج کــە دەداتە حوشــتری لەڕ ٢-(ح) وردەمێرووله.

(ألمَقْمَلُ): کەســێکە پاش هەژاریی دەوڵەمەند بێت.

(قمن: ١-(تَقَمَّنَ- الأَمــرَ): نیازی بۆچوونو کردنی ئەو کارمیکردو هەر بۆ ئەوە چوو.

(-الشيءَ): خەریکبوو شتەکە بەرێت.

(ألقَمَن): ١-نزیك ٢-شایســتە (بۆ مێ‌و نێر بۆ تاك‌و جووت‌و کۆ هەروا بەکاردێت.

(هــذا المَنزِل لَــك مَوطِنٌ قَمَنٌ): ئــەم ماڵە شایستەی تۆیە تێدا بژیت‌و دانیشیت.

(جِئــتُ بِالحَديثِ على قَمَنِهِ): ئاخاوتنەکەم بــە پێــی خۆی‌و بــە ڕێگــەو شــێوەی خۆی گێڕایەوە.

(ألقَمِــن): ١-شایســتە/ شــیاو (ب) دەخرێتە دوایەوەو دەخرێتە پێشی ئەو وشەیەی کە لە دوایەوە دێت هەروەها (ل) (مِن) دەوترێت.

(«هوَ قَمِنٌ بِكَــذا أَو مِن كذا أَو لِكَذا»): ئەو شایســتەیە بەوە یان بۆ ئەوە شایســتەیە ئەو شیاوی ئەومیە ٢-خێرا/ گورج ٣-نزیك.

(ألقَمــين (ج) قُمَناء وقَمينــون (م) قَمينَة (ج) قَمينــات وقَمائِــن): ١-خێــرا/ گورج ٢-شایســتەو شــیاو (لەوانەیە لــە (تَقَمَّن)ەوە وەرگیرابێت واتــا خەریکە وەریگرێت‌و بیبات یان لە (ألقَمِــن)ەوە واتا خێرا گورج بە دوای (قَمــين)دا (ب) یــان (مــن) یــان (ل) دێت دەوترێت. (هو قَمينٌ بكذا ومِن كذا ولِكَذا): ئەو شایستەو شیاوی ئەومیە.

(أَقْمِنْ بهذا الأَمر): شیاوی ئەم کارەیە.

(«هــذا الأَمــرُ مَقْمَنَــةٌ لِذاك»): ئــەم کارە (شایستەی ئەومیە/ ئەوە هەڵدەگرێت).

٢-(رائِحَةٌ قَمِنَةٌ): بۆنێکی بۆگەنە.

(ألقَمــين (ج) قَمَناء وقَمينــون (م) قَمينَة (ج) قَمينات وقَمائِن): توونی گەرماو.

(أَلمُقْمَئِن): کرژبوو و چوومیەك.

قمه: ١-(قَمِهَ- البَعيْرُ. قُمُوها): حوشــترەکە سەری بەرزکردەوەو ئاوی نەخواردەوە.

(-الشيءُ في الماءِ): شتەکە بنئاوو سەرئاو کەوت.

(ألقامِه (ج) قُمَّه) (فا): سەرئاوو بنئاوکەوتوو.

(ألقَمَهُ): دڵگیران/ حەز لە خواردن نەکردن.

٢-(تَقَمَّهَ- في الأَرض): بەسەر زەویدا گەڕا.

(«خَــرَجَ فُلانٌ يَتَقَمَّــهُ»): دەرچوو نەیزانی ڕوو لە کوێ بکات.

٣-(إِقْمَهَدَّ): ١-پەلەیکرد/ خێرایکرد ٢-مرد.
(إِقْمَهَدَّ- الرَجُلُ أَو البَعيرُ): پیاوەکە یان حوشترەکە سەری (بلند کردەوە/ بەرزکردەوە).
(-بالمَكانِ): لە شوێنەکەدا مایەوەو دەرنەچوو.
(أَلقَمْهَد): پیاوی (نارەسەنی/ ناجسنی بەدفەسالّ/ ڕوو ناشیرین).
قمي: (قامی-ە مُقاماةً): لەگەڵیدا ڕێککەوت/ بۆی لووا.
(«مايُقامِيني هذا الشيءُ»): ئەم شتەم بۆنالوێت.
قنَ: ١-(قَنَّ- في الجَبَلِ قَنّاً): لە تەوقەسەری شاخەکەدا بوو.
(إِقْتَنَّ واقْتَأَنَّ. إِقْتِناناً واقتِئناناً): ڕاست ڕاوەستا/ قنج بووەوە.
(إِسْتَقَنَ- بالأَمرِ): لە کارەکەدا سەربەخۆ بوو/ سەربەستبوو.
(أَلقُن): گچکە شاخ/ شاخی بچووك.
(أَلقُنَّةُ (ج) قُنَن وقِنان وقُنُون وقُنات): ١-شاخی بچووك ٢-پۆپەی شاخ.
(قُنَّةُ كُلِّ شيءٍ): (تەوقەسەر/ پۆپە)ی هەموو شتێك.
٢-(قَنَّ. قَنّاً): داری وەشاند.
(إِقْتَنَّ): کۆیلەیەکی پەیداکردو ڕاگرت.
(أَلقِنّ): کۆیلەیەك خۆیو باوكو دایکی بە کۆیلە کراونو ڕاگیراون (بۆ نێرو مێو تاكو کۆیە: دەشێت کۆبکرێتەوە بوترێت.
(أَقْنان وأَقِنَّة. أَلقَنانَة والقُنُونَة): کۆیلەیەتیی/ بەندایەتی.
٣-(قَنَّ. قَنّاً): ١-بەچاو بۆ شت گەڕاو شوێنی کەوت ٢-دوای هەواڵەکان کەوتو بۆیان گەڕا/ سۆراغیکرد.
٤-(إِقْتَنَّ): بێدەنگبوو/ کپبوو.
٥-(إِسْتَقَنَّ): لەگەڵ مەڕەکانیدا مایەوەو شیرەکەی دەخوارنەوە.
٦-(أَلقُنّ): دەمی قۆڵی کراسو جل یان سەرقۆڵی کراس.
(قُنُّ الدجاجِ) (عامية سريانية): کولانەی مریشك.
(أَلقِنَّةُ (ج) قِنَن): ١-داوێکی/ ڕیسێکی (پەت/ گوریس) ٢-دەرمان.
(أَلقَنَن): ڕێگەو نموونەو چۆنیەتیی کردنی کارێك.
(أَلقُنان): بزمەی کراس/ دەمی قۆڵی کراس.
(أَلقِنِّينَة (ج) قَنانِيّ وقَنانٍ): قاپی شووشەی شەربەت.
(أَلقانُون (ج) قَوانين): ١-بنکە/ بنچینە ٢-پێوەری هەموو شتێك ٣-(مو) قانون کە نامێرێکی ژێداری مۆسیقایە ٤-یاسا ئەو یاساو دەستوورو شەریعەتو ڕێسایانەیە کە پەیوەندیی ناو کۆمەڵ ڕێکدەخات (ج) لە

نێوان خەڵکەکاندا یان لە ڕووی داراو ماڵەوە. یاسا جۆری زۆرە گرنگترینیان: (اَلقانون الاساسي أو الدستوري): یاسای بنچینەیی/ بنەڕەتیی/ دەستووریی.

(اَلقانون التِجاري): یاسای بازرگانی.

(اَلقانون الجَزائي): یاسای سزادان.

(قانون العُرْف والعادَة): یاسای ڕێساو نەریت.

(اَلقانون المَدَني): یاسای شارستانی.. هتد.

(اَلحَقُ القانُونيّ): مافی یاسایی، کۆمەڵە شەریعەتێکی کڵێسەیە (لە کانونی یۆنانییەوە هاتووە).

(اَلقانون) (ع ج): یاسایەکی بیرکاری کە بە دەربڕەیەك کورتکراوەتەوە پێشی دەوترێت دەستوور یان ڕێسا.

الملحق:

قنّ: (قَنَّنَ): یاسایدانا.

(-الشيءَ): سنووری بەکاربردنی شتەکە بە پێی یاسا دیاریکرد.

(«قَنَّنَ الخُبزَ وقَنَّنَ البَنزِينَ»): بەکاربردنی نانو بەنزینیان بە پێی یاسا دیاریکرد.

(اَلتَّقنين): ١-یاسادانان ٢-تەقەلاو ئەنجام کارییەکە کاربەدەستان بۆ کەمکردنەوەی بەکاربردنی کەلوپەلو بەرهەمێك کە لە وڵاتدا هەیە دەیدەنو دەیگرنو ئەو بەکارهێنانە دیاری دەکەن.

(«تَقنين الخُبز»): بەشداریکردن/ بەشبڕینەوەی نان.

(«تَقنين البَنزين»): دیاریکردنی بەشی بەنزین بە پێی یاساو ڕێنماییەکان.

قنأ: ١-(قَنَأَ-تِ اللِّحْيَةُ مِنَ الخِضابِ. قُنوءً): ریشەکە بە بۆیە/ بە وسمە ڕەشبوو.

(-الشيءُ): شتەکە زۆر سوور بوو/ تۆخبوو.

(-اللَّبَنُ قَنأً): ئاوی تێکەڵ شیرەکە کرد.

(-لِحيَتَهُ): بە وسمە یان ڕەنگیڕەش ڕیشی ڕەشکرد.

(قَنِيءَ الأَديمُ. قُنوءً): پێستەکە بۆگەنیکرد.

(قَنَّأَ- لِحْيَتَهُ تَقْنِئَةً وتَقنيناً): بە وسمە یان ڕەنگی ڕەش ڕیشی ڕەشکرد.

(أَقْنَأَ- الأَديمَ): پێستەکەی خراپو بۆگەنکرد.

(أَحْمَرُ قانِيء): سووری تێر/ تۆخ.

(اَلمَقْنَأَة والمَقنُوَةُ): شوێنی نسرمو سێبەر کە هەتاو لێینادات.

٢-(قَنَأَ- الرَجُلَ. قَنْأً): پیاوەکەیکوشت یان ناچاریکرد خەڵك بیکوژێت.

(قَنِيءَ قُنُوءً): مرد.

(أَقْنَأَ- الرَجُلَ): پیاوەکەیکوشت.

(-الشيءُ فُلاناً): شتەکە لە فیسار لێنزیکبووەو توانای بەسەردا بوو.

٣-(اَلقِنئِل): ١-ملی فیل ٢-ژنی کورتەبنە.

قنب: ١-(قَنَبَ- في الشيءِ. قُنوباً): چووە شتەکەوە.

(-تِ الشَّمسُ): خۆرەکە ئاوابوو.
(-الـزَّرعُ): گـەڵای گوڵی کشـتەکە دەرهات/ دەرکەوت.
(-الزَهـرُ): گوڵەکە لـە قاوغەکەی دەرهات/ کرایەوە.
(-الأسَـدُ بِمَخلَبِهِ): شـێرەکە چنگی بەناودا بردو شاردیەوە.
(أقنَـبَ): خـۆی لـە ناحەزەکـەی یـان دەسەڵاتدارەکە شاردەوە.
(تَقَنَّبَ- الرَجُلُ فِي بَيتِهِ): چووە خانووەکەیەوە.
(ألقُنْب): ١-چارۆکەی گەورەی پاپۆڕ ٢-چنگی شێر.
(-مِن كَفِّ الأسَدِ): جێی چنگی شێر لە بەری لە پێدا کە تیایدا دەشارڕێتەوە.
(قُنْبُ الزَهرِ (ج) قُنُوب): بەرگی گوڵ.
(ألقِناب): چنگی شێر.
(ألقِنـاب والقُنـاب الواحِدَة قِنابَـة وقُنابَة وقُنَّابَة): ئـەو کۆمەڵە گـەڵاو بەرگانەن کە بەر دەگرنـە خونچـەو گـوڵ، دەیپێچنەوە پێـش دەرهاتنـی وەك گوڵەگەنـمو گوڵەجۆ یان پووڵەکەی زیندەوەر کە لەشـی زیندەوەر دەشارنەوە.
(ألقُناب والقَنَّابَة): ئەو کۆمەڵە گەڵایانەن کە گوڵە گەنمەکە یان جۆکەیان پێچاوەتەوە.
(ألقِنَّـب والقُنَّـب) (ن) (یونانیة): ڕووەکی گـوش. ڕووەکێکـە سـاڵانەیە لـە هنـدەوە هاتووە زۆر لەمێـژە دەچێنرێت ڕیشـاڵێکی لێدەردەهێنرێـت قایمــە گوریـسو داوی لێ دروسدەکرێت. لە وڵاتە فێنكو ساردەکانیشدا زۆر دەچێنرێت.
(ألقَنيب): هەوری چڕ.
(ألمِقْنَـب): ١-دەفرێکی ڕاوە چـی ڕاودەکرێت تێیدەخەن ٢ لەپی شێر.
(ألمِقْنَب والمِقناب): چنگی شێر.
٢-(قَنَبَ- الكَرْمَ. قُنُوباً): مێوەکەی قونارکرد/ پەلە ڕزیوو وشكو خراپەکانی لێکردەوە.
(قَنَّبَ- الكَرْمَ): مێوەکەی هەڵپاچی.
٣-(قَنَـبَ وتَقَنَّـبَ واقْتَنَـبَ-تِ الخَيـلُ): ئەسپسوارەکان ئامادەی هێرشبوون.
(«قَنَّبوا وتَقَنَّبوا نَحـوَ العَدُو): کۆبوونەوە/ گردبوونــەوە/ ئامــادەی هێرشــی ســەر دوژمنبوون.
(أقْنَبَ): هەنگاوی گەورەینا.
(ألقانِـب= القَيـج): پۆسـتەبەری گـورجو چالاك.
(وادِ قانِـب): دۆڵێکە لە دوورەوە لێشـاوەکە ڕووی تێدەکات/ بۆی دێت.
(ألقَنيب): کۆمەڵە خەڵکێك.
(ألقَيْنـاب= القَيج): پۆسـتەبەری چابوكو گورج.
(ألمِقْنَـب (ج) مَقانِب): کۆمەڵە سـوارەیەك کۆبوونەوەو ئامادەی هێرشبردنن.

٤-(أَلقانِب): گورگی بەلووره.
(أَلقِناب): ژێی کەوان.
٥-(أَلقُنبُرَة): پەرکلاوی سەر.
(أَلقُنْبُـرَةُ والقُنبَـرَةُ (ج) قَنابِـر) (ح): کلاوکوره.
(دجاجَةٌ قُنبَرانِيَّة) (ح): مریشکی کلاودار.
٦-(القُنبُض (م) قُنبُضَة): ١-مار ٢-کورت.
٧-(أَلقُنَّبِيـط (ن) القَرنِبيـط): قرنابیت/ برنجـی حاجـی لەقلـەق ڕوومکێکـە لـە پێش ئـەوەدا گوڵەکـەی بکاتـەوە گۆڵەکەی لێدەکرێتەوە. سپییەو گۆشتنەو لێدەنرێت.
٨-(قَنْبَـعَ- في بَيتِـهِ): خۆی لـە ماڵەکەیدا شاردەوە.
(-تِ الشَجَرَةُ): گوڵەکەی یان بەرمکەی بەرگی پەیداکرد.
(أَلقُنبُـع): ١-بەرگی گوڵـی درەخت ٢-بەرگی دەنکە گەنمەکەی ناو گوڵە گەنمەکە.
(أَلقُنبُعَةُ= القُنْبُـع): ١-بەرگی گوڵی درەخت ٢-بەرگی دەنکە گەنمەکەی ناو گوڵە گەنمەکە.
(أَلقُنبُعَـةُ= القُنْبُـع): ١-بەرگـی گوڵی درەخت بەرگی دەنکـە گەنمی ناو گوڵەکـە ٢-بەرگێکە وەك ڕۆبو کلاوی هەیە دەکرێتە بەری منداڵ.
٩-(قَنبَعَ- الرَجُلُ): لە ڕقاندا دڵی (کەفیکرد/ هەلاوسا/ گیفبووەوە).
١٠-(أَلقُنْبُـع): پیـاوی کورتەبنـەی بێرێزو لەچەر/ سووك.

(أَلقُنبُعَةُ= القُنبُع): ١ پیاوی کورتەبنەی بیرێز ٢ ئافرەتی کورتەبنە.
(قُنبُعَةُ الخَنزِير): بووزی بەراز/ کونەلووتی بەراز.
١١-(قَنبَلَ- العَـدُوَّ) (ا ع): دوژمنی دایە بەر گوللە تۆپ یان بۆمبا یان نارنجۆك.
(أَلقَنبَـلُ والقَنبَلَـةُ (ج) قَنابِـل): دەسـتە خەڵكێك یان ڕەوە ئەسپێك.
(القُنبُـل والقُنابِـل): پیاوی ڕقئەسـتووری توندو تیژ.
(أَلقُنبُلَـةُ (ج) قَنابِـل): گوللـە تۆپێکە پڕە لـەو مادانەی کـە دەتەقنەوەو سـووتێنەرن بە تـۆپ دەگیرێتـە دوژمن لەوانـە بۆمبای سووتێنەر(الحارقة) و بۆمبای میکرۆببەخش. (الجرثومية) بۆمبای ئۆتۆمی.
(القُنْبُلَة الذَرِيَّة. القُنْبُلَة السـامَّة): بۆمبای ژەهرپرژێن.
قنـت: ١-(قَنَـتَ. قُنُوتـاً): ١-ملکەچبـوو ٢-سەرشۆڕو گوێڕایەڵی فەرمانی خودابوو.
(«قَنَـتَ اللهَ وقَنَتَ لله»): ملکەچی خودابوو. ملکەچییو سەرشۆڕیی بۆ خودانواند.
(-لَهُ): سەرشۆڕیبوو کەساسیی بەردەستیبوو.
(أَقنَتَ): خۆی ملکەچی خودا کرد.
(إقْتَنَتَ): خۆی بەدەستەوەدا.
(أَلقانت (فا) (ج) قُنَّتٌ): هەمیشـە ملکەچو بەرفەرمان.

(إمْــرَأةٌ قَنُــوتٌ): ئافرەتــی گوێڕایەڵــی مێردەکەی/ شووەکەی.

٢-(قَنَــتَ. قُنُوتــاً):لــە نوێژدا ١-ڕاوەســـتاو دەســـتی بە نوێژ کرد ٢-لە قسەکردن وەستا/ بێدەنگبوو.

(أقْنَتَ):١-درێژەی بە وەســتان لەنوێژەکەدا ٢-درێـــژەی بــە حەجەکــەدا ٢-درێـــژەی بە داگیرکردندا.

(ألقانِت (ج) قُنَّت):نوێژکەر.

(سَــقاءُ قِنيِّت):کوندەیەکی تۆکمە/ ساغ کە ئاو دانەدات.

٣-(قَنَتَ. قَناتَةً):کەمخۆر بوو.

(ألقَنيــت):(بــۆ نێــرو مــێ): کەمخۆراك/ کەمخۆر.

٤-(أقْنَتَ):دۆعای لە ناحەزو دوژمنەکەی کرد.

قنث: (قَنْثَلَ- الرَجُلُ):لە ڕۆیشــتندا بەپێ تۆزی هەستاند/ ورووژاند.

قنج: (ألقُمجُل):کۆیلە/ بەندە.

قنــح: ١-(قَنَــحَ- العــودَ قَنْحــاً):ســەری چێوەکەی/ چیلکەکەی/ توڵەکەی نوشتاندەوە تاوەك گۆچانی لێبێت.

(قَنَحَ وأقْنَحَ- البــابَ):دەرگاکەی بە دارێك بەرزکردەوە کە سەرەکەی چەمابووەوە.

(قَنَّحَ- البــابَ):کلیلە کەچەکەی بۆ دەرگاکە سازکرد.

(ألقُناح):تەختەی پشتگیری دەرگا.

(ألقُناحَــة):١-کلیلێکی خــواری کەچی درێژ ٢ هەموو تەختەیــەك بیخەیتە ژێر یەکێکی ترەوەو بیبزوێنێت.

٢-(قَنَحَ- الشــارِبُ. قَنْحاً):١-ئاو خۆرەوەکە کــە تێرئــاو بــوو ســەری بەرزکــردەوە ٢-پــاش تێرخواردنەوەو خــواردن حەزی لە ئاوخواردنەوە نەکرد.

(تَقَنَّــح):پــاش تێرئــاو بــوون حــەزی لە ئاوخواردنەوە نەکرد.

(قَنَخ): (ألقُناخِر (ج) قَناخِر):لەشــکەتە/ زەبەلاح/ چەتەوڵ.

(أنْفٌ قُناخِر):لووتێکی قەبە/ زل.

(ألقِنَّخْر):١-لەشــکەتە/ زەبەلاح ٢-لووتفش و دەمگەورەو دەنگ قەبە/ زل.

(ألقِنَّخرَةُ والقُنْخُورُ والقُنْخُورَةُ والقِنْخيرَةُ): گاتاوێر/ تاوێرێکی زۆر گەورە.

قنــد: ١-(ألقَنْــد (ج) قُنُــود):(لــە کند)ی فارسیەوە وەرگیراوە) شــیلەی قامیشی شەکر کە ڕەق بێت.

(ألقِنْديــد (ج) قَناديــد):١-شــەکری کەللە ٢-کافور ٣ خواردنێکی خــۆش کە زەعفەرانی تێدەکرێت ٤ مەی کە بۆن بندرێت و سافبێت.

(ألقَنْديَّة) (ن):دەوەنێکی بچووکی کەپروکە دار یان هەڵزنە، لە جۆرەکانی ســوورە دەوەنە کە دە مەتر بەرزدەبێتــەوە گەڵا گەورەیە لە زستاندا دەردەکەوێت بۆ جوانیی دەروێنرێت.

(سُـوَيق مُقَنَّد): حەڵوای شـەکریی/ حەڵوا بەشەکرکراو.
(كَلامٌ مُقَنَّد): قسەی شیرینو خۆش.
(سُوَيقٌ مَقْنود): حەڵوای بە شەکرکراو.
(رَجُلٌ مَقنودُ الكلام): پیاوێکی زمانشیرینو قسەخۆش.
٢-(اَلقُنْدُر والقُنْـدُس) (ح) (لە (كُنْدُس)ی فارسیەوەوەرگیراوە): سـەگلاو زیندەوەرێکی ئاویـی شـیردەرە لـە قرتێنەکانـە کلکێکی چەماوەی بەهێــزو ڕەنگسـوری تێری هەیە پێستەکەی بە نرخەو بۆ فەروو بەکاردێت.
٣-(قَندَسَ): پاش گوناهباریی تۆبەیکرد.
(قَندَسَ- في الأَرضِ): سەری خۆی هەڵگرتو ڕۆیشت.
(اَلقُنْدُس) (ح) = القُنْدُر) (فارسية): سەگلاو.
٤-(اَلقِنْدَعْل): گەوج.
٥-(قَنْدَلَ): سەری (گەورە بوو/ زلبوو).
(قُنادِل وقَندَويل): سەرزل.
(رَأْسٌ قُنادِلٌ): سەری زلی ڕەق.
(اَلقُنْدُول الواحِدَة قُندولَة) (ن): دەومنێکی درکاوییە لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەراستدا دەروێــت گوڵێکی زەردی هەیە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆرە.
(اَلقِنديل (ج) قَناديــل) (لاتينية): لەمپا/ چرایدەستی.
٦-(اَلقَنْدَلَفت) (يونانية): مجێوری کلێسە.

قنز: ١-(أَقْنَزَ): بە کووپەڵۆکە ئاوی خواردەوە.
(اَلقِنْز والإِقْنيز): کووپەڵۆکە.
(اَلقَنَز): ڕاوکردن.
(اَلقانِز والقَنّاز): ڕاوچی/ ڕاوکەر/ نێچیرەوان.
٢-(القُنْزُع والقُنْزُعَة والقَنْزَعَة والقِنْزَعَة): ١-تۆپەڵە قژێکە بە تەوقیسەرەوە دەهێڵرێتەوە/ دوگلە ٢-قژی هەر چوارلای سـەر ٣-پاشماوەی پەڕ ٤-پەڕی ملی کەڵەشێرو پۆپنەی کەڵەشێر.
(اَلقُنْزُعَة= القُنْـزُع. القُنزُعَةُ (ج) قُنْزُعات وقَنازِع): ژنی بستەباڵا.
(اَلقَنازِع): ١-خەڵکە بچووکەکان، بستەباڵاکان ٢-قسـەی ناشـیرین ٣-لێقەومانە گەورەکان/ چورتوم.
قنس: ١-(أَقْنَـسَ- الرَجُلُ): خـۆی بردەوە سەر ڕەسـەنێکی باڵاو خۆیشی نارەسەن بوو/ ناجسنبوو.
(اَلقَنْس): نەژاد/ رە سەن/ جسن.
(اَلقِنْس): نەژاد/ ڕەسەن.
(اَلقِنـس (ج) قُنُوس والقَونَس (ج) قَوانِس والقَونـوس): ١-تەوقەسـەر ٢-تەوقەسـەری کلاوئاسـن کـە شـەڕکەر دەیکاتـە سـەری ٣-ناوەڕاستی ڕێگا ٤-نێسکێکە لە نێوان هەردوو گوێی چارەویدا.
(اَلقَبْنَس (ج) قَبانِس) (ح): گا.
٢-(قَنْسَرَتْهُ الشَدائِدُ أَو السِنُّ):تەنگانەی سەختو نەهامەتیی زۆر یان تەمەن سەری سپیکرد.

(تَقَنْسَــرَ): پیر بوو و لەشــی چــووە یەك و بچووكبووەوە.

(اَلقَنْسَــر والقَنْسَــرِي والقِنَّسْــر): پــیری تەمەنزۆر/ بەساڵداچوو.

(اَلقُناسِر): توند.

قنش: (قَنَّشَ-هُ). تَقنيشــاً: كەمیكرد/ لێی كەمكرد.

(قُنِّشَ- في الشيءِ):لە شتەكەدا كەموكوورییكرا/ چرووكیی تێدا كرا.

قنص: ١-(قَنَصَ- الطَيرَ. قَنْصاً): باڵندەكەی ڕاوكرد.

(تَقَنَّص واقتَنَصَ- الطَيرَ أو الظَبيَ):باڵندەكە یان ئاسكەكەی ڕاوكرد/ شكاركرد.

(اَلقانِصَةُ): ڕاوكەرەكان.

(-لِلطَّير (ج) قَوانِص) (ع ١): ســیقەتۆرەی باڵندە كە بەشێكە لە كۆهەرسی باڵندە.

(اَلقُنَّاص): ڕاوكەرەكان/ شكاركەرەكان.

(اَلقَنيص (م) قَنيْصَة):١-ڕاوچی/ شــكاركەر ٢-ڕاوكراو.

(اَلقِنْص): نەژاد/ ڕەسەن.

٣-(القُنصُل (ج) قَناصِل):١-كورت/ كورتەبنە.

٢-(القُنصُل) (لاتينية): كونســوڵ. جێبرەوای دەوڵەتێك لە شارێكی دەوڵەتێكیتردا.

(اَلقُنصُلِيَّة):١-كۆنســوڵخانەو پایەی كۆنسوڵ ٢-پلانی كۆنسوڵ.

قنــط: ١-(قَنَــطَ. قُنوطــاً): نائومێد بوو/ هیوابڕاو بوو/ بێهیوا بوو.

(قَنِط وقانِط وقَنُــوط): نائومێد/ بێهیوا/ هیوابڕاو.

(-هُ): ڕێلێگرت/ نەیهێشت.

قَنِــطَ وقَنُطَ قَنَطــاً وقَناطَــةً: هیوابڕی/ نائومێد بوو/ بێهیوا بوو.

(قَنَّطَ وأقْنَطَ-هُ): نائومێدیكرد/ بێهیوایكرد.

٢-(قَنْطَرَ- الرَجُلُ. قَنْطَرَةً): بوو بە خاوەن سامانو داراییەكی زۆر.

(اَلقِنطار (ج) قَناطير):١-كێشــێكە سەنگێكە لەگەڵ ڕۆژگاردا بڕەكەی گۆڕراوە، هەر جارەی بە ئەندازەیەك دادەنرێت ٢-تەغار/ كینتار كە (٤٤,٩٣ كگم)ە ٣-دارای زۆر/ سامانی زۆر.

(قَناطِيرُ مُقَنطَــرَةٌ): دارای تــەواو زۆر (بۆ زیادرەوی وا دەوترێت).

٣-(قَنْطَرَ- الشيءَ. قَنطَرَةً):شتەكەی گرێداو قایمیكردو دایمەزراند.

(-الفارِسُ)ســوارەكە بەســەردا گلاو كەوتە بەرپێی چارەوێكە.

(اَلقَنطَرَة (مص) (ج) قَناطِر):پردی سەرئاو ٢-باڵەخانە/ تەلار.

٤-(قَنطَرَ قَنطَــرَةً): وازی لە ژیانی خێڵەكی هێناو شارنشینبوو.

(-عَلَينــا): لە لامان بنجــی داكوتاو مایەوە/ نەڕۆیشت.

٥-(اَلقِنْطِر) (ح): باڵندەیەكە.

(ألقِنطِر والقَنْطير): زۆرزان.

ألقَنْطُريون والقَنطُوريُون (ن): گوڵ گوچیله. جۆره گوڵێکه زۆر جۆرو ڕەنگی هەیه بەشی زۆری دڕکاوییه. له پزیشکیی میللیدا بۆ تا خاوکردنەوه بەکاردێت.

(ألقَنطَريون الصغير) (ن): ڕووەکێکه، گیایەو ساڵانەیه تاڵه، گوڵەکەی ئاڵه بە دەگمەن زەرد دەبێت له پزیشکیدا دژی تا و کرمی ناوسك بەکار دێت هەروەها بۆ هەندێك خواردنەوه بەکاریدەهێنن.

قنع: (قَنَعَ. قُنوعاً): سواڵیکرد دەرۆزەیکردو سەریشۆڕکردو داماویی نواند.

(قَنِعَ. قَنَعاً وقَناعَةً وقُنْعاناً): بەو بەشەی بۆی دانرا قایلبوو/ داکەوت.

(قَنَّعَ-هُ): قایلیکرد.

(أقْنَعَ بَيَدَيهِ في الصَّلاةِ): له نوێژدا دەستی درێژکردو له خودا پارایەوه.

(-الإناءَ): قاپەکەی دایه بەر ئاوه ڕۆیشتووەکه تا پڕبێت.

(«أقْنَعَ الإناءَ في النَهْرِ»): قاپەکەی له ڕووبارەکه هەڵکێشا تا پڕیکات.

(تَقَنَّعَ): خۆی به قایلو داکەوتوو پیشاندا.

(إقْتَنَعَ- بالشيءِ): ١-بە شتەکه (قایلبوو/ داکەوت) ٢-شتەکەی سەلماند.

القانِع (فا) (ج) قانِعون وقُنَّع: قایل/ داکەوتوو/ ساز/ ڕازی.

(ألقَنيع): قایلبوو.

(ألقانِع): ١ سواڵکەری/ دەرۆزەکەری خۆداماو کردوو/ کەساسکردوو (لەوانەیه بۆیه وا ناونراوه، چونکه به کەمو زۆر دادەکەوێتو وا قایلدەبێت ٢-نۆکەریی خوێشگەلو بە کرێگیراویان.

(ألقَنيع): قایل بەو بەشەی پێیدراوه/ بۆیدانراوه.

(ألقُنعَةُ): سواڵ/ دەرۆزەکردن.

(رجلٌ قَنْعان): پیاوێکی بەرچاوتێر/ بێتەماعو بەکەمیش قایل.

(شاهِدٌ قُنعان): شایەتێکه/ گەواهێکه بڕوای پێدەکرێتو شایەتیەکەی لێوەردەگیرێت (بۆ تاكو کۆو نێرو مێ دەبێ).

(رَجُلٌ قُنْعانيّ): پیاوێکه ڕاکەی پەسەند دەکرێتو پێی قایلدەبن.

(القُنُوع) (مص): ١-قایلبوونی مرۆڤ بەو بەشەی بەریدەکەوێت ٢-چاوچنۆکیی ٣-سواڵکردن/ دەرۆزەکردنو ڕسواییو خۆکەساسکردن ٤-خوازلۆکییو خۆ له خەڵك هەڵسوونو سەرشۆڕیی.

(ألقَنُوع (ج) قُنُع والقَنيع (ج) قُنْعاء= القَنِع): به بەشی خۆ (داکەوتوو/ قایلبوو).

(ألمُقْنِع) (فا): کەسێکه داماوانەو کەساسانه سەرهەڵبڕێتو تەماشابکات.

(شاهِدٌ مَقْنَعٌ (ج) مَقانِع): شایەتێك جێی

بڕوایەو بڕوا بە شایەتیەکەی دەکرێت.
(«فُلانٌ لَنا مَقْنَعٌ»): فیسار کەسێکە جێی بڕوای ئێمەیەو پێی قایلیین.
٢-(قَنَعَ-تِ الشاةُ. قَنْعاً): مەڕەکە گوانەکەی سەرکەوت یان گوانەکە دانەکەوتبوو شۆڕ نەبوو.
(-الجَبَلَ قُنُوعاً): سەرکەوتە سەر شاخەکە.
(قَنِعَ-تِ الشاةُ): مەڕەکە گوانی سەرکەوت یان هەر شۆڕ نەبووەوە.
(أَقْنَعَ- رأسَهُ أَو صَوتَهُ): سەری یان دەنگی بەرزکردەوە.
(-الإناءَ): قاپەکەی لارکردەوە بۆ ئەوەی کە تیایدا بوو بیڕێژێت.
(أَقْنَعَ واسْتَنْقَعَ-تِ الشاةُ): مەڕەکە گوانی سەرکەوت.
(اَلقِنْع (ج) قِنْعَة وأَقْناع): لی کەڵەکەبوو.
(اَلقُنْعَةُ): درز/ کەلەبەر لە دیواردا.
(اَلقَنَعَةُ): هەڵتۆقینی سەری مرۆڤ.
(-مِنَ الجَبَلِ والسَنام): تەوقەسەری شاخ یان هی کۆپارە.
(اَلمُقْنَع) (مفع): کەسێکە کە بە زکماکی سەری بڵند وەستاوبێت و ڕاستبێت.
٣-(قَنَعَ وقَنِعَ-تِ الإبلُ): حوشترەکان ڕوویانکردە شوێن مانەوەیان و خاوەنەکانیان.
(قَنَّعَ- الديكُ): کەڵەشێرەکە پەڕی ملی بەرووی سەریدا فشکردەوەو هەستاند.
(أَقْنَعَ-الإبِلَ): ڕووی حوشترەکانی کردە لەوەڕگاو گێڕانیەوە بۆ لای خاوەنەکانی.
(إقْتَنَعَ-تِ الإبِلُ): حوشترەکان بەرەو کۆزەکانیان ڕۆیشتن.
(-الرَجُلُ الإبلَ أَوِ الغَنَمَ لِمَأواها): پیاوەکە حوشترەکان یان مەڕەکانی بەرەو گەوڕو کۆزەکان برد.
(فَمٌ مُقْنَعٌ): دەمێک کە دانەکانی بەرەو ناوەوە خواربوو بێتەوە.
٤-(قَنَّعَ- المَرأَةَ): چارشێوەی بەژنەکە پۆشی.
(-رَأسَهُ بالعَصا أَو السيفِ): بەدار یان شمشێر کێشای بەسەریدا.
(-هُ خزيَةً و عاراً): ئابڕوویبردو ڕسوایکرد بە پەندی پساریکرد.
(«قَنَّعَهُ الشَّيبُ خِمارَهُ»): پیرێتی پەردەی خۆی بەسەریدا دا/ سەری سپیکرد.
(تَقَنَّعَ): خۆی بە بەرگەکەی داپۆشی/ دەمامکی پۆشی.
(-بالسلاح): خۆی چەکپۆشکرد.
(-تِ المَرأَةُ بالقِناع): ژنەکە سەرپۆشی بەسەر خۆیدادا/ پەچەیگرتەوە.
(اَلقِنْع (ج) أَقْناع): چەك.
(اَلقِنْعَةُ (ج) قِنْعٌ و (حجج) قِنْعان): شوێنی تەختی نێوان دوو گرد.
(اَلقِناع (ج) أَقْناع وأَقْنِعَة): سەرپۆشی ژن/ پەچە.

(اَلقِنــاع (ج) قُنُع): ١-چەك/ دەمامكی زرێی، دەمامك ٢-(ع ا) پەردەی دڵ.
(«كَشَفَ القِناعَ عَن الشيءِ»): پەردەی لەسەر شتەكە لادا دەریخستو خستیەروو.
(اَلمِقْنَع والمِقْنَعَة): سەرپۆشی ئافرەت.
(اَلمُقَنَّــع) (مفــع): ١-دەماخكــراو یان ســەر یــان رووپۆشــراو ٢-ئەوەی كلاوی ئاســنینی لەسەركردووە ٣-خۆبە بەرگ داپۆشیو.
٥-(اَلقانِع (ج) القانِعون وقُنَّع): كەســێكە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكیتر بچێت.
(اَلقِنْــع (ج) قِنعَة وأقناع): گۆلی ئاوی نزیك شاخ.
(اَلقِنْع والقُنْع (ج) قِنعَة وأقْناع): قاپولكەی توولی دارخورما كە خواردنی تێدەكرێت.
(اَلقِناع (ج) أقْناع وأقْنِعَة): قاپێك كە لە توولی دارخورما دەكرێتو خواردنی تێدەكرێت.
(اَلقَنَعَةُ): چینە لمێكی تەنك.
٦-(القِنْعاث): كەســێك كە سەرو دەمووچاوی تووكنبێت. قژو تووكی زۆر بێت.
قنــف: ١-(قَنِــفَ- المَكانَ): قوری شــوێنەكە قڵیشا/ شەقار شەقار بوو.
(قَنَّفَ-هُ بالسَّیفِ): بە شیر پارچە پارچەیكرد/ لەتلەتیكرد.
(إسْتَقْنَفَ- المَجلِسُ): ئەنجومەنەكە كوریبەست.
(اَلقَنَف) (مص): بچووكیی گوێو بە سەرەوە نووسانی.

(اَلقَنَّف): لیتەی شەقارشەقار بوو.
(اَلأقْنَف (م) قَنْفاء (ج) قُنْف): كەسێكە گوێی بچووكو ئەستوور بێت.
(اَلقَنْفاء): ١-گوێی بێقەراغ ٢-گوێی ئەستووری بزن كە وەك سۆل وەهابێت.
(اَلقَنیف (ج) قُنُف): كۆمەڵانی خەڵك.
٢-(قَنِفَ- الفَرَسُ قَنَفاً): پشتملی چارەوێكە سپیبوو.
(اَلقَنَــف مِنَ الخَیــل (م) قَنْفاء (ج) قُنْف): چارەوێی پشتمل سپی.
٣-(أقْنَــفَ): گوێــی (شــۆڕكرد/ شــلكرد/ داخست).
٤-(أقْنَفَ): سوپایەكی زۆری پێكەوەنا.
(اَلقَنیــف (ج) قُنُــف): هــەوری پــڕ ئــاوو باراناوی.
٥-(أقْنَفَ واسْــتَقْنَفَ): راكــەیو كارەكەی بۆ خۆشبوونی گوزارانەكەی یەكیانگرت.
٦-(اَلقَنِف): قژ كەمیقژ بلاوی سەر.
(اَلقِناف والقُناف): لووتزل.
(اَلقَنیف (ج) قُنُف): پیاوی كەمخۆر.
٧-(اَلقُنفُــذ (ج)قَنافِذ والأُنثــی «قُنْفُذَة») (ح): ژیشك. زیندەوەرێكە پشتی بە دركی تیژ داپۆشراوەو خۆی پێ دەپارێزێت لە تەنگانەو مەترســیدا خــۆی گرمۆڵــە دەكاتو ســەری بەنــاودا دەبات بە ڕۆژ خۆی دەشــارێتەوە بە شەو دێتو دەچێت گەلێك جۆری هەیە.

٨-(القُنفُــذ): ١-درەختێك لە ناوەراســتی لمدا بێت ٢-لی گردەوەبووی بڵند ٣-(ح) مشك.
(اَلقُنْفُذ والقُنْفَذ (ج) قَنافِذ والأَنثى قُنْفُذَة)
(ح): ژیشك.
(«هــو قُنفُذُ لَيــل»): پشــێوین/ زمانبەد/ ناشووبگێر/ قسەهێن‌و قسەبەر.
(اَلقَنافِذ): گەلێك شاخی كورت كورت.
٩-(قَنفَشَ- هُ قَنفَشَــةً): گورج بەیەكیدا داو گردیكردەوە/ كۆیكردەوە.
(تَقَنفَشَ): چووە یەك/ كرژ بوو.
(اَلقُنافِش): لووتكرێشاوی‌و ریشزبر.
(اَلمُقَنفِش (فــا)- في اللِّباس): مرۆڤی پنتی‌و قەلافەت ناشیرین.
١٠-(تَقَنفَعَ-تِ القُنفُذَةُ): ژیشــكە مێچكە كە خۆی گرمۆڵە كرد.
(اَلقُنفُع): كورتەبنەی لەچەر/ هیچ‌و پووچ/ رسوا.
(اَلقُنفُع والقِنفِع) (ح): مشك.
(اَلقُنفُعَةُ) (ح): ١-ژیشــكە مــێ ٢-بن/ قنگ/ قوون.
قنق: (اَلقِناق): ١-كاروانســەرا ٢-قۆناغ ٣ خان كە لە قۆناغێكدا كاروان تیادا پشوودەدات ئەو ماوەیەیە كە گوزاركار/ سەفەركار لە رۆژێكدا دەیبرێت. وشەكە (توركییە).
٢-(اَلقَنغَــر) (ح): كەنگەر/ كنگر. زیندەوەرێكە لە كۆمەڵــەی لاقدرێژەكانە لــە زیندەوەرەكانی ئوسترالیایە. مێیەكەی توورەكەیەكی بەورگەوەیە لە كاتی مەترسیدا بەچكەكەی تێدا دەشارێتەوە. گرنگترین جۆریــان كنگــرە زەبەلاحەكەیە، كە كلكی زۆر گەورەیەو ناناساییە.
٣-(اَلقِنقِن): ١ رابەر/ رێنوما ٢ رێپیشاندەری رێی راست.
قِنقِنَــة (ح): ١-جــۆرە جرجێكە ٢-ســەدەفی دەریایی.
(اَلقُناقِــن (ج) قَناقِــن): (عەرەبــی نییــە) ئەندازیارێكە دەزانێت كە ئاو لەژێر زەوییەكدا هەیە.
قنــم: ١-(قَنِــمَ- الجَــوزُ قَنَمــاً): گوێزەكە خراپبوو.
(قانِم): گوێزی گەنبوو.
(-الفَــرَسُ ونَحْــوُهُ): چارەوێكــە یــان هیتر ئاورنگی بەركەوت‌و تۆز لێیداو پیسبوو.
(-الطَعــامُ واللَّحْــمُ والسَّــقاءُ و غَيرُهُــا): چێشــتەكەو گۆشــتەكەو جەوەندەكــە بۆگەنیكردو بۆنی ناخۆشبوو.
(قَنِم وأَقْنَم): بۆنكردوو/ بۆگەن.
(«يَدي قَنِمَــةٌ مِن الزَيتِ»): دەســتم بۆنی رونشلەی خراپی گرتوە. بۆنی ناخۆشبووە.
(اَلقَنَمَةُ): بۆنناخۆشــیی شلەرۆن‌و شتی لەو بابەتە.
٢-(اَلأُقْنُــوم (ج) أَقانيم): ١-كــەس ٢-نەژاد/ بنەچە (سریانیە).

قنــو: ١-(قَنا- المــالَ. قَنْواً وقُنْــواً وقُنُوّاً): دارای بــۆ خۆی کۆکردەوەو پەیداکرد نەك بۆ بازرگانی.
(قَنی. يَقْني وقَنِيَ. يَقْنى وقَنَّى واسْتَقنى- الحيــاءَ. قَنْواً): شــەرمنبوو/ بەشــەرمبوو/ شەرمگرتی.
(أَقْنــى-ەُ اللهُ): خودا دارایکردو یاریدەیدا کە ببیێت.
(-الحياءَ): شەرمو شکۆیگرت.
(تَقَنَّــى): بــە بژێویەکــەی داکــەوتو دەستیگرتەوەو پاشەکەوتیکرد.
(إقْتَنــى- المــالَ): داراو سـامانی بــۆ خۆی کۆکردەوە.
(-الحَياءَ): شەرمو شکۆ گرتیو لێینەبووە.
(أَلقُنْــوَة والقِنْــوَة): ئــەو داراو ماڵــەی کە پەیداکراوەو دەستگیربووە.
(«لــه غَنَمٌ قُنْوَةٌ وقِنــوَةٌ»): مەری هەیە بە تایبەتی هی خۆیەتیو خۆی پەیدایکردووە.
(أَلقِناوَة): پاداشت.
(أَلقِنيَ والقَنِيَّة): ئەو مەرو مێحوشترانەی کە خۆی پێکیەوە ناوەو دەستگیربووە.
٢-(قَنا- اللهُ الشــيءَ قَنْواً): خودا شــتەکەی بەدیهێنا/ دروستیکرد.
(أَلقَنا): بەدیهاتوو/ دروستبوو.
٣-(قَنا لَونُ الشــيءِ. قَنواً): رەنگی شــتەکە سووری (تۆخبوو/ تێربوو).
(أَحْمَرُ قانٍ): سووری تۆخ/ تێر/ زۆر سوور.
(أَلقَنــا) (ن): رەگــەزە، گوڵێکــە تاکلەتکەیە (تاکلەپــە) جێگــەی بنەڕەتــی ئاســیاو ئەمەریکایە. قەدەکەی ئەســتوورە گەڵاکانی گەورەو هێلکەیــین گوڵی رەنگاورەنگی هەیە. ئەمەریکاییــە باشــوریەکانو هیندیــەکان رەنگێکی ســووری لێدەگرن. لە باخەکاندا بۆ جوانیی دەیرووێنن.
٤-(قَنِــيَ. يَقنى- الأَنفُ قَناً): لووت قوڵونگی بوو/ ناوەراستی لووتی بەرزو کونەلووتەکانی تەسکبوو.
(أَقْنى): لووتقوڵنگی.
(قَنَّــى- القَنــاةَ): نۆکەندەکــەی هەڵکەند/ جۆگەکەل هەڵکەند.
أَلقَنــا (ج) قِناء: (وەك جبــل (ج) جبال): نێزە/ رم.
(أَلقَنــى والقُنْــو والقِنْو (ج) أَقْنــاء وقُنيان وقِنْيان وقُنْوان وقِنْوان): هێشووە خورما.
(أَلقَناة (ج) قِنــى وقِناء وقَنَوات):١-چاڵێکە دارخورمای تێــدا دەروێنرێت ٢-جۆگەی ئاو/ نۆکەند/ ئاوەرۆ بۆ ئاوراکێشان ٣-داردەست.
(أَلقَنــاة (ج) قَناً وقُنيّ وقَنَــوات وقَنَيات): نێزە. یان داری نێزە.
(«فــلان صُلْــبُ القَنــاةِ»): بــاڵای پتەوە/ لەشقایمە.
(أَلقَنّاء): جۆگەبر/ جۆگە هەڵکەن.

(أَلقَنّاء والمُقْنِيّ): خاوەن نێزە/ نێزەدار.

(ألأَقْنــى- مِنَ الأُنُــوف (م) قَنْــواء): لووت قوڵنگیی.

(«هو أَقنى الأنف»): ئەو لووتی قوڵنگییە.

٥-(أَقنى-تِ السَّماءُ): ئاسمان بارانی بڕی.

٦-(القَنــاة (ج) قِنىً وقِنــاء وقَنَوات) (ح): گاکێوی.

(أَلقَنــاء والأَقْنــاءَة- مِــنَ الحائــطِ): دیوی سێبەری دیوارەکە.

(أَلقُنُوُّ): ڕەشیی.

(أَلقَنوان): زەبەلاح/ کەتە/ زلە.

(أَلمَقْناة والمَقْنُوَّة): شــوێنی نســێ کە هەتاوی لێنادات.

قنــي: ١-(قَنى. يَقني- المالَ. قَنْيــاً وقِنْياناً وقُنيانــاً): دارای (دەســتگیر بــوو بــۆ خۆی پێکەوەنا).

(- ألحياءَ): بە شەرمو شکۆ بوو.

(قَنَّى- اللهُ فُلاناً): خودا فیساری قایلکرد.

(قانى- الشيءُ مُقاناةً): شتەکە بەردەوام بوو.

(«قانى لي في الصَّيفِ ظِلٌّ بارِدٌ»): لە هاویندا سێبەرێکی فێنکم هەبوو.

(-الشــيءُ فُلانــاً): شــتەکە بۆ فیســار لواو گونجا.

(«مايقانيني هذا الشــيءُ»): ئەم شــتەم بۆ نالوێتو ناگونجێت.

(أَقْنــى- اللهُ فُلانــاً إِقْنــاءً): خودا فیســاری قایلکردو دەوڵەمەندیکرد.

(-الصَّيدُ فلاناً ولِفُلانٍ): نێچیرەکە لە فیسار نزیکبووەوەو خۆی خستە قەمچییەی.

(أَلقُنْيَــة والقِنيَة (ج) قِنىً): داراو ســامانی دەستگیر بوو/ پەیداکراو.

(أَرضٌ مَقْنــاةٌ): خاکێك بۆ هەموو کەســێك دەگونجێت.

٢-(قانى- الشيءَ مُقاناةً): شتەکەی تێکەڵکرد.

قــهّ: (قَهْقَهة. قَهقَهَةً): دایە قاقای پێکەنین/ بە قاقا پێکەنی.

قهب: ١-(قَهِبَ. قَهَباً): ڕەنگەکەی سپاتبوو.

(قَهْب وأَقْهَب): ڕەنگسپات.

(أَلقُهْبَة): ڕەنگسپیەکی لێڵ/ ڕەنگی سپات.

(أَلقُهاب والقُهابِي): ڕەنگی سپی.

٢-(أَقْهَبَ- عَنِ الطَّعام): چێشتەکەی نەخواردو دڵی نەچووە سەری/ حەزیلێنەکرد.

٣-(أَلقَهْب) (ح): حوشتری لەشگەورە.

(أَلأَقْهَبان): فیلو گامێش.

قهد: (قَهَدَ- في مَشــيِهِ): هەنگــاوی کورتو وردینا.

(أَلقَهْــد (ج) قِهــاد): ١-ســپیەکی زۆر لێــڵ ٢-ڕەنگپــاك (ح) ٣-جۆرە مەرێکە ٤-گوێرەکەی مانگای کێویی ٥-مانگای بچووکی جوانکیلە ٦-(ن) نێرگزی دەمنەکراوە.

قهــر: ١-(قَهَرَ-هُ: قَهْراً): بەســەریدا زاڵبوو/ بەزاندی/ شکاندی/ بۆری پێدا.

(قَهِرَ- اللَّحْمُ):ئاگرەکە گۆشتەکەی گەرمکردو خوێناوەکەی هاتە دەرێ.

(قاهَرَ-هُ):بەزاندی/ بەسەریدا زاڵبوو.

(أقْهَرَ- هُ):بە بەزیویی دی.

(-الرَجُـلُ): ١-باریکـەوتو زەبوونبـوو/ شکسـتیهانیو سەرشـۆڕ بـوو ٢-هاوڕێکانـی بەزینرابوون/ شکستیان هێنابوو.

(ألقاهِـرَة):مێـی وشـەی (القاهِـر):زاڵ/ سەرکەوتوو/ بەزێن.

(ألقُهْرَةُ):ناچاریی/ بێدەسەڵاتیی.

(«هـو قُهْرَةٌ للناس»):ئـەو بەزیوو ناچاری دەستی هەموو کەسێکە.

(ألقَهّـار):١-زۆر بەزێـن ٢-یەکێکـە لە ناوە پیرۆزەکانی خودای مەزن.

٢-(ألقاهِـر (ج) قَواهِر):١-بڵند پایە/ بەرز/ باڵا ٢-زاڵ/ بەدەسەڵات/ بەزێن.

(«جَبَلٌ قاهر»):چیایەکی زۆر (بڵند/ بەرز/ لووت لە ئاسمان.

(«جِبـالٌ قواهـر»):کێوانی قـووچ/ بەرزو لووت لە ئاسمان.

(ألقاهِرَة):٢-سەرەوەی سنگو تەختی سەنگ/ شـوێنی گەردانەی سەروو سـنگ ٢-سەرەتاو دەستپێکردنی هەموو شتێك.

(ألقُهْرَةُ (ج) قُهَرات- مِنَ النِّسـاء):ئافرەتی شرو درو بێحەیا.

٣-(ألقَهْرَم):پیاوی کورتە باڵا.

(ألقَهْرَمان (ج) قَهارِمَة):بریکار یان نوێنەری داهاتو باجو خەرجکردن.

(ألقَهْرَمَـةُ): کاری نوێنــەری داهــاتو خەرجکردن.

٤-(قَهْقَر وتَقَهقَر. قَهْقَرَةً):پاشەکشـەیکرد/ هاتەدواوە/ گەڕایەدواوە.

(«هـو يُقَهْقِـر في مَشـيَتِهِ»): ئـەو لـە ڕۆیشتنەکەیدا پاشەوپاش دەگەڕێتەوە.

(ألقَهْقَـرِي): پاشەکشـێکردن/ بـۆ دواوە گەڕانەوە.

(ألقُهْقُـور):خانۆچکەی منـداڵان کە لەبەرد دروستیدەکەن لە شێوەی قوچەکدا دەبێت.

(ألقَعْقُور) (عامية) = القُهْقُور.

قهز: (قَهَزَ. قَهْزاً):بازدیدا.

(ألقَهيز= القَزّ):ئاوریشم.

قهـل: ١-(قَهِـلَ- جِلْـدُهُ قَهْـلاً وقُهُـولاً): پێستەکەی (وشکهەڵاتو وشکبووەوە).

(قَهِلَ- جِلْدُهُ):پێستەکەی وشکبووەوە.

(-الرَجُـلُ):لەشـی خـۆیّ پۆخـڵ ڕاگرتو نەیشت.

(أقْهَلَ-الرَجُلُ):خۆی پۆخڵ ڕاگرتو پیسکرد.

(تَقَهَّلَ):فەلاقەت پنتیو شرو پۆخڵبوو.

(-جِلْدَةُ):پێستی وشکبووەوە.

(-الرَجُلُ):بەتەنگ پاکیی لەشیەوە نەهاتو خۆی پیس ڕاگرت.

٢-(قَهَلَ- الرَجُلُ. قَهْلاً):١-سپڵەبوو بە چاکە

پیاوەتیی نەزانی ٢-کفرانی نیعمەتیکرد/ لەباتیی پاداشتی چاکە خراپەی نواند.
(- فُلاناً): ناشیرین بە فیساریدا هەڵدا.
٣-(أقْهَلَ- الرَجُلُ): خۆی بە کارێکەوە ئاڵاندو خۆی تێهەڵقورتاند کە هی ئەو نەبوو.
٤-(تَقَهَّلَ):١-بیتابوشتانە/ لاوازانە ڕۆیشتو هەنگاوینا ٢-هاواری بۆ پێداویستیی خۆیکرد.
(-صَوتُهُ): دەنگی کزو لاواز بوو.
(إنقَهَلَ): لاوازو بێهێز بوو.
٥-(ألقَيْهَل والقَيْهَلَة): چارەو ڕوو/ دەموچاو.
(«حَيَّا اللهُ هذه القَيهَلَة»): خودا ئەم چارەو ڕووە بهێڵێتەوەو تەمەن درێژیکات.
قهم: ١-(قَهِمَ- الرَجُلُ. قَهَماً): دڵی گیراو خواردنی پێنەخورا.
(قَهِم): دڵگیراو.
(أقْهَمَ- عَنِ الطَّعام): خواردنی پێنەخورا/ دڵی نەچووە سەر خواردنەکە.
(-إليهِ) (ضد):١-حەزی لە خواردنەکە کرد ٢-دڵی نەچوە سەر/ خواردنەکە.
(-عَنِ الشيءِ): ڕقی لە شتەکە بووەوە.
(-عَنِ الشَّرابِ والماءِ): حەزی لە شەربەتو ئاو نەکردو وازی لێهێنا.
(-تِ الإبلُ عَنِ الماءِ): حوشترەکان نەچوونە سەر ئاوەکەو نەیانخواردەوە.
٢-(أقْهَمَ-تِ السَّماءُ): ساماڵیکرد/ هەروی ئاسمان ڕەوییەوە.

٣-(قَهْمَز. قَهْمَزَةً): هەڵبەزییەوە/ بازدیدا.
(ألقَهْمَزَى): ئامادەییو خێراییو چالاکیی.
(ألقَهْمَز): کورت.
(ألقَهْمَزَةُ (مص) مِنَ النِّساءِ): ئافرەتی بستەبالاّ/ زۆر کورت.
قهو: ١-(أقْهَى): هەر خەریکی قاوەخواردنەوە بوو.
(ألقَهْوَةُ):١-مەی (دەڵێن بۆیە وا ناونراوە چونکەئەوەی بیخواتەوە حەزی خواردنی کەمدەبێتەوە) ٢-شیری ڕووت کە ئاوی تێنەکرابێت ٣-دڵگیرانو دڵتێربوون ٤-بۆن.
(«إنَّ فُلاناً طَيِّبُ قَهْوَةِ الفَمِ»): بۆنی دەمی خۆشە ٥-قاوەی گیراوە ڕەنگە بە (بُن)بڵێن قاوە.
(ألقَهوَة (ج) قَهَوات): قاوەخانە.
(ألمَقهى (ج) مَقاةِ): قاوەخانە.
٢-(ألقَهْوانُ) (ح): ساپڕێنی پیری شاخ گەورە.
٣-(قَهْوَسَ): پەلەیکرد.
(-الرَجُلُ): تۆقییو ڕایکرد/ لە ترسا ڕایکرد.
(تَقَهْوَسَ):١-خێرایکرد/ پەلەیکرد ٢-بەکۆمەکۆمو شپرزە ڕۆیشت ٣-قەموور بوو.
قهی: (قَهِيَ- عَنِ الطَّعامِ قَهىً): دڵی گیراو حەزی خواردنی کەمبوو.
(-عَنِ الشَّراب): خواردنەوەی وازی لێهێنا.
(أقْهى- عَنِ الطَّعامِ. إقْهاءً): دڵی لە خواردنەکە هەڵکەنرا.

(أَلقَاهي): ١-دلْقايميى دەسەڵاتدار/ بە زەبروزەنگ.

(عَيشٌ قاهٍ): ژيانێكى تێرو تەسەل‌و بێگێروگرفت.

قوب: ١-(قابَ- الأَرضَ قَوباً): زەويەكە بە نيمچە خرِيى هەڵكەند.

(قَوَّبَ- الأَرضَ): ١-زەويەكەى نيمچە خرِيى چاڵكردو هەڵكەند ٢-بە پێ چاڵيكرد.

(إنْقابَ-تِ الأَرضُ): زەويەكە هەڵكەنرا/ هەڵكۆڵرا.

٢-(قابَ- الرَجلُ. قَوباً): نزيكبووەوە.

(أَلقاب): ١-بر/ هێندە.

(«هوَ على قابَ قَوسَين»): (ئيديۆمە) زۆر نزيكبۆتەوە. ئێمەيش دەڵێين: پێچى مێزەرێكە/ يان دوو هەنگاوە ٢-نێوان نيوەى ژێى كەوانەكەو سەرى كەوانەكە.

(أَلقيب): بر/ هێندە.

(«بَينَهُما قيب قَوسٍ»): نێوانيان هێندەى كەوانێكە.

٣-(قابَ- الطائِرُ. قَوباً): باڵندەكە درزى كردە هێلكەكەيەوە.

(-الرَجُلُ): هەڵات (بە جووچكى ناو هێلكە چوێنراوە كە لەناو هێلكەكە هەڵديێت؟

(تَقَوَّبَ وانقابَ-ت البَيضَةُ): هێلكەكە قڵيشا/ شەقيبرد/ترووكا.

(أَلقابَةُ والقائِبَةُ) (ح): ١-جووچك ٢-هێلكە.

(تَخَلَّصَت قائِبَةُ أَو قابَةٌ مِن قوبٍ»): جووچكەكە لە هێلكەكە رزگارى بوو. واتا لە هاورێكەى جيابووەوە.

(أَلقَوْب (ج) أَقْواب) (ح): جووچك.

(أَلقُوَب): توێكڵە هێلكە.

(أَلقُوبيُّ): جووچكخۆر/ حەزى لە خواردنى جووچكە.

٤-(قَوَّبَ- الشيءَ): شتەكەى هەڵكەند.

(تَقَوَّبَ): لە رەگو ريشە (هاتە دەرێ/ هەڵكەنرا.

(تَقَوَّبَ وانقابَ- المَكانُ): شوێنەكە هەندێكى لە دارو گيا رووتكرايەوە.

(«تَقَوَّب مِن رأسِهِ مواضِعُ»): هەندێك شوێنى سەرى كرێشى هەڵدا.

(أُمُّ قُوْب): وەى/ چورتوم/ ئاپۆرە.

(أَلقُوباء والقُوْباء (ج) قُوَب والقُوْبَة والقُوَبَة) (طب): دەردە پێستە/ پێست توێژ هەڵدەداتو رەشە خەڵكەكە پێيدەڵێن: (أَلحَزاز) =(أَلقُوبَة).

(أَلمُتَقَوِّب): ١-پێستى وشكەوەبووى توێژ هەڵدەر ٢-كەسێكە كە گەرِيى تووشدەبێت‌و تووكى لەشى هەڵدەوەرێت.

(أَلمُتَقَوِّب- مِنَ الحَيّات): مارێكە كاژى فرێدابێت.

٥-(إقْتابَ- الشيءَ): شتەكەى هەڵبژارد.

٦-(أَلقُوَبَةُ): دانيشتوويەكى سەرومر لە

خانەیەكدا/ بەردەوام.
(«فُلان مليءُ قُوَبَةٌ»): فیسار خۆی خزانۆتە خانووەكەیەوە/ ماڵەوە دەرناچێت.
قوت: ١-(قاتَ. يَقُوتُ- الرجُلُ قَوْتاً وقياتَةً): خـــواردنو پێبـــژی ڕۆژانەیدایـــە پیاوەكـــەو خێزانەكەی بەخێوكرد.
(أَقاتَ- فُلاناً و على فُلانٍ إقاتَةً): ١-پێبژێی بـــە فیســـاردا ٢-دەســـەڵاتی بەســـەر داشـــكا. ٣-پاراستی.
(تَقَوَّتَ- بالشيءِ): شتەكەیخوارد.
(إقتاتَ- بالشيءِ. إقتِياتاً): شتەكەی خوارد.
(-الشيءَ): شتەكەی كردە خۆراكی خۆی.
(«فُـــلان يقتـــاتُ الكلامَ»): كەمـــدووە/ كەم دەدوێت.
(إسْتَقاتَ فُلاناً. إسْتِقاتَةً): داوای خواردنی لە فیسار كرد.
(ألقائِـــت= القـــوت): خـــواردن/ خۆرشـــت/ خۆراك/ ڕۆژیی.
(ألقائِت-مِن العَيـــشِ): خواردنێك ڕۆژییەك بەسبێت.
(«هو في قائِتٍ مِنَ العَيش»): ئەو ڕۆژییەكی تەواوی هەیـــەو ژیانێكی مســـۆگەری تەواوی هەیە.
(ألقُوْت (ج) أقْوات): خۆراك/ بژێویی.
(ألقُوات والقيْت والقيتَة): خۆراك/ خواردن/ ئەوەی مرۆڤ دەیخواتو پێیدەژی.

(أَلمُقيـــت)( فـــا): ١-بەتواناو دەســـەڵات وەك ئەوەی بژێویی خۆی بدات بە هەموو پیاوێك ٢-پارێزەری شـــتو ئاگادارو چاودێریكەری لە وشەی (ألقوت)ەوە وەرگیراوە.
٢-(ألقات) (ن): چای عـــەرەب درەختێكە لە یەمـــەن دەروێنرێـــت گەڵاكـــەی دەجوون كە بێهۆشكەرە.
قـــوح: ١-(قـــاحَ وتَقَـــوَّحَ- الجـــرحُ. قَوحاً): برینەكە هەڵاوسا/ هەویكرد.
٢-(قـــاحَ وقَـــوَّحَ- البَيتَ قَوْحـــاً): ماڵەكەی ماڵی/ گەسكدا.
(ألقاحَـــةُ (ج) قـــوح): مەیـــدان/ گۆڕەپان/ حەوشە.
(«دَخَلْتُ قاحَةَ الدارِ»): چوومە حەوشـــەی خانووەكەوە.
٣-(أقاحَ- الرَجُلُ. إقاحَةً): سوور بوو بڕیاریدا كە هیچ نەدات بە سواڵكەر.
قـــوخ: (قاخَ. يَقُوخُ- جَوْفُهُ. قَوْخاً): بە هۆی دەردێكەوە هەناوی تێكچوو.
(لَيلَةٌ قاخٍ): شـــەوێكی تاریكو ئەموستەچاو/ شەوێكی ڕەش.
قود: ١-(قـــادَ. يَقُودُ- الدابَّةَ. قَـــوْداً وقيادَةً وقيـــاداً ومَقـــادَةً وقَيـــدودَةً): وڵاخەكـــەی (بەدوای خۆیدا بەكێشكرد/ جڵەوكێشیكرد).
(-قيـــادَةَ الجَيـــشَ): فەرماندەی لەشـــكر بوو/ سووپاسالار بوو/ فەرماندەیی لەشكەرەكەی كرد.

(-القاتِلَ إلى مَوضِعِ القَتلِ): بكوژەکەی بۆ شوێنی کوشتنەکە جڵەوکێشکرد/ برد.

(قَوَّدَ- الدابَّةَ تَقويداً وتَقْواداً): وڵاخەکەی بەدوای خۆیدا بەکێشکرد.

(-قاوَدَ-هُ مُقاوَدَةً): لە بەڕێوەبرندا شانازیان بەسەریەکدا کرد.

(أقادَ): پێشکەوت/ بەرکەوت.

(-الغَيثُ): بارانەکە بەربڵاو بوو و هەموو لایەکی گرتەوە.

(-هُ خيلاً): ئەسپێکیدادایە بەدوای خۆیدا رایبکێشێت.

(-القاتِلَ بالقَتيلِ): بکوژەکەی لە بری کوژراوەکە کوشتەوە.

(تَقاوَدَ- الرجلان): دوو پیاوەکە خێرا ڕۆیشتن وەك یەکتری بەکێش بکەن.

(-المَكانُ): شوێنەکە تەختو ڕێکبوو.

(إنْقادَ. إنْقياداً): ملیدا/ گوێڕایەڵییکرد/ خۆی بەدەستەوە دا/ جڵەوکێشبوو.

(-لِفُلان): ملی بۆ فیسار دانەواندو/ ملشۆڕیبوو/ زەبوونبوو/ گوێڕایەڵییکرد.

(-الطريقُ إلى كذا): بۆ ئەوە ڕێگەکە دیاربوو.

(إقتادَ. إقتِياداً): بەڕێوەبرا/ ئاراستەکرا/ ڕابەرییکرا.

(-الدابَّةَ): وڵاخەکەی بەکێشکرد.

(«إقتادَ الدابَّةَ فاقتادَت»): وڵاخەکەی ڕاکێشا/ بەکێشکرد/ وڵاخەکە بەکێشکرا/ ڕاکێشرا/ جڵەوکێشکرا.

(إسْتَقادَ): سەرشۆڕو ملدەر بوو.

(-لَهُ): ملی بۆ داو خۆی دایە دەستی.

(-الأميرَ): داوای لە میر کرد کە بکوژەکە لە بری کوژراوەکە بکوژرێتەوە.

(«إسْتَقادَ الأميرَ مِن القاتِلِ فأقادَهُ مِنهُ»): لە میریخواست کە بکوژەکە لە جێی کوژراوەکە بکوژێتەوە، میریش بە گوێیکرد..

(ألقائِد (فا) (ج) قُوّاد وقُوَّد وقادَة و (حجج) قادات) (ا ع): سەرلەشکر/ سوپاسالار/ سەرکردەیی سوپا. ئەفسەرێکە کە فەوجێك یان بەشێکی سوپا یان دەستەیەکی بەڕێوەدەبات.

(قائد المَوقِع) (ا ع): سەرکردەی سوپای نیشتەجێی شارێك یان جێگەیەك.

(ألقائِدة): مێی وشەی (القائِد).

(ألقَوْد) (مص): وڵاخ کە جڵەوی ڕابکێشرێتو سواری نەبن.

(ألقَوَد): تۆڵە، سزا/ کوشتنەوەی کوژەر لە بری کوژراو.

(ألقَوّاد): ١-زۆر شارەزا لە بەکێشکردندا ٢-دەوپت/ گەواد.

فَرَسٌ قَوُودٌ وقَوُودٌ وقَيدٌ وقَيِّدٌ: چارمووێیەکی ڕامو ملدەرە/ دەستەمۆ/ هۆگر.

(ألقِياد): جڵەو/ هەوساری وڵاخ/ ڕەشمە. ئەوەی وڵاخی پێڕادەکێشرێت.

(«فُلان سَلِسُ القياد»): فیسار گوێڕایەڵەو ئاسان بەڕێوەدەبرێت/ بە قسە دەکات.

(«أعطى فُلانٌ القياد»): ملی بۆ فیساری شۆڕکردو جڵەوی خۆی دایەدەستی سا بە خۆشی یان بە زۆر بێت.

(اَلقِيادَة): ١-سەرکردەیی/ ڕابەریی/ بەڕێوەبردن ٢-سەرکردەگا.

(اَلقيادَة العامَّة): سەرکردەگای گشتی.

اَلأَقْوَد: چارەوێی زۆر نەرمو ملدەرو هۆگر/ دەستەمۆ/ ڕام.

اَلأَقْوَد: ١-کەسێکە کە ملی بۆ شتێك نا لێیلانەداو بەرینەدا ٢-ملتوند (بۆیە وای پێدەڵێن چونکە کەم ئاوڕ بەملاولادا دەداتەوە) ٣-ڕژد/ چرووك (چونکە لەسەر نانخواردنبوو ئاوڕ ناداتەوە نەوەك مرۆڤێك ببینێت ناچاربێت بانگیبکات).

(«أعطاهُ مَقادَتَهُ»): جڵەوی خۆی دایە دەست ئەو/ ملیبۆدا.

(اَلمِقْوَد (ج) مَقاوِد): هەر شتێك کە وڵاخی پێ ڕابکێشرێت.

اَلمَقُود (مفع)= مَقْوُود: جڵەوکێشراو، ڕاکێشراو.

(طَريقٌ مُنقاد): ڕێگەی ڕاست/ ڕێگەی گیراوو درووست.

٢-(قَوِدَ. يَقوَدُ- الفَرَسُ وغَيرُهُ. قَوَداً): چارەوێکە پشتو ملی درێژ بوو.

(أَقْوَد (م) قَوداء (ج) قُوْد): چارەوێی ملیو پشتدرێژ.

(اَلقائِد (ج) قُوَّاد وقُوَّد وقادَة و (حجج) قادات): ١-هەموو زەوییەکی لاکێشەیی درێژ یان کێوێکی لاکێشەیی ٢-لووتە شاخ.

(القائِدَة): گردێکی درێژەوەبوو.

(القَوَد): درێژبوونەوەی کەمەرو ملی چوارپێ.

(اَلأَقْوَد والمُقَوَّد): چیای/ شاخی درێژ.

٣-(قِيدَ- الدَقيقُ): ئاردەکە چنگی دایە یەكو یەکیگرتو لێنرا.

٤-(اَلقاد والقيد): ماوە/ میانەو ئەندازە/ هێندە.

(بَينَهُما قادُ قَوسٍ أو قَيدُ قَوسٍ= قَدَرُ قَوسٍ): هێندەی کەوانەیەك لە یەك دوورن نێوانیان بە ئەندازەی کەوانەیەکە/ ماوەیان هێندەی کەوانەیەکە.

قور: ١-(قارَ. يَقورُ. قَوراً): لەسەر نووکیی پێی ڕۆیشت بۆ ئەوەی گوێیان لە خشپەی پێی نەبێت.

(-الصَيدَ): نێچیرەکەی خلافاندو فێڵی لێکرد.

(إقتارَ- حَديثَهُم. إقتِياراً): بەدوای ئاخاوتنەکەیاندا گەڕا.

٢-(قارَ. يَقورُ- فُلاناً. قَوراً): چاوی (هەڵکۆڵی/ دەرهێنا).

(قـارَ وقَوَّرَ واقتـارَ واقْتَوَرَ- الشـيءَ. قَوراً وتَقويـراً واقْتيـاراً واقْتِواراً): شـتەكەی لە ناوەڕاستداو خڕ هەڵكۆڵی.

(قَورَ يَقْوَرُ- الرَجُل. قَوَراً): كوێر بوو.

(تَقَوَّرَ- السَّحابُ): هەورەكـە بوو بە پارچە پارچەی خڕخڕو بڵاو.

(-اللَّيلُ): بەشـی هەرە زۆری شـەو ڕۆیشتو تاریكییەكەی كز بوو.

(إنقارَ. إنْقياراً): كەوت/ ڕما.

(-تِ البئرُ): چاڵاوەكە تەپی.

(-بِهِ): بەلادا خواربووەوە/ لایدا.

(إقْوَرَّ- تِ الأرضُ. إقوِراراً): زەویەكە ڕووەكی پێوە نەماو ڕووتبوو.

(ألقار): گەلە حوشترێكی گەورە.

(ألقـارَةُ (ج) قـار وقارات وقُـوْر وقيران): گردەكێوێكی لە كێوان پچڕاو.

(ألقُـوارَة): ١-پارچـەی خڕخـڕ كـە لە جل كرابێتـەوە ٢-ئـەوەی كـە لەملاولای شـت بڕابێـتو كرابێتەوە ئـەوەی پارچەی خڕی لێبڕابێت/ لێكرابێتەوە.

(ألأقْوَر (م) قَوراء): فراوان.

(ألأقْوَرِيّات والأقْـوَرون): نەهامەتییو وەیی (سەخت/ گرانو گەورە).

٣-(تَقَوَّرَ-تِ الحَيَّة): مارەكە لوولیخوارد.

(إقْوَرَّ- الجِلْدُ. إقْوِراراً): ١-پێستەكە لە لاوازیدا كرژ بوو/ چرِبوو/ چووميەك ٢-شلو خاو بووەوە.

(-الفَرَسُ): چارەوێكە تێقوپاو چرووسا.

(-فُلانٌ) (ضد): ١-قەڵەو بوو ٢-لەڕ بوو.

(ألْمُقَوَّر): ئەسپی تێقوپاوو چرووساو.

٤-(إقتارَ- الرَجُـلُ. إقتِياراً): پیاوەكە نەبوو بوو/ دەستكورتبوو.

٥-(ألقـار= الزفـت): قیر كـە پاپـۆڕی پێ قیردەكەن.

(ألقـار الواحِـدَةُ قـارَة) (ن): درەختێكـە بەرتاڵ.

(ألقارَة) (ج) قار وقارات وقُوْر وقيران) (ح): ورچەمێ.

(ألقَـوْر): ١-لۆكەی تـازە ٢-(پەت/ گوريس)ی لۆكە.

(ألْمُقَوَّر): قیركراو/ بەقیرسواغدراو.

الملحق:

قـور: (ألمِقْـوَر (ج) مَقـاوِر): هەڵكۆڵ/ ئەو ئامێـرەی باینجانو شـتی لـەو بابەتەی پێ هەڵدەكۆڵن.

قوز: (قَوَّزَ- النَبتُ. تَقويزاً): گیاكە زۆر بوو.

تَقَوَّزَ- البَيتُ): خانووەكە هەڵوەشاو ڕووخا.

(-الوَعْلُ): كەڵەكێوییەكە ڕایكرد.

(إقتازَ-هُ النَمرُ): پڵنگەكە خواردی.

قـوس: ١-(قاسَ يَقُوسُ- الشـيءَ على غَيرِهِ وبِهِ): شـتەكەی بـە هێتر (پێـوا/ ئەندازە) گرت/ كە وەك خۆیبوو.

(-القَومَ): پێش خوێشگەل كەوت.

(قاوَسَني فَقُسْتُهُ): پێشبڕکێی ئەندازەگرتنی شتی لێکردم من لەو باشتر ئەندازەمگرت.

(إقتاسَ- الشيءَ): شتەکەی پێوا.

(- بفُـلان): چـاوی لە فیسـار کـرد/ وەك ئەویکرد.

(ألقَـوْس): بـاڵ/ باسـك (چونکە شـتی پێ دەپێورێت).

(ألقَيَّـاس والمُقـاوَس): کەسـێکە کە سـوار بنێرێت.

(ألمَقْـوَس (ج) مَقـاوس): ١-مەیـدان/ گۆڕ/ گۆڕەپان ٢-پەتێکە لە پێشـبڕکێدا ئەسپەکانی پێ ڕیز دەکرێت ٣-ئەو شوێنەی کە ئەسپەکان لێوەی دەست بە غارو پێشبڕکێدەکەن.

٢-(قَوِسَ واسْـتَقْوَسَ- الرَّجُلُ قَوَساً): پشتی کۆمایەوە.

(-تِ السـحابَةُ): هەورەکە نـەوی‌و دایکردە باران.

(-الباروِدَةَ ونَحْوَها) (عامية): بارووتەکەیان لەو بابەتەی تەقاند.

(-ةَ بالبـارودَةِ) (عاميـة): تفەنگەکـەی باروتەکەی پێدا تەقاندەوە.

(تَقَوَّسَ): چەمییەوە وەك کەوانی لێهات.

(-قَوَسَهُ): بەرگەیگرت.

(القَوس (ج) قِسِيّ وقُسِـيّ وأقْواس وقياس وأَقْـوُس وأقيـاس): ١-کـەوان کـە تـیری پێدەهاون.

(قُوَيْس وقُوَيْسَة): کەوانۆك/ کەوانی بچکۆلە (وشەکە مێیەو بە نێریشدەکرێت)/ ئامێرێکی نیوەبازنەییە تیری پێدەهاون.

قُسَوِيّ: کەوانەیـی. وشەی «قَوس»دەخرێتە پاڵ هاوپەیوەستەکەی‌و دەڵێن: (قَوس نَدْفٍ): کەوانـی هەلاجیـی‌و (قَوس نَبْـلٍ)کەوانی تیرئەندازیـی ٢-هەرچی لە شـێوەی کەوانەدا بێـت وەك کەوانـەی پرد/ تاقـی پردو تاقی سـەرکەوتن‌و کەوانەی شـەبەنگە بە ڕۆژ ٣-(فك) کەلووی کەوان بورجێکە لە ئاسماندا.

٤-(قَوسُ الرَّجُل): چەماوەیی پشـتی مرۆڤ ٥-کەوانەی هێڵێکی چەمـاوە وەك بازنە (هـ) کە بەشێکە لەو هێڵە چەماوەیە.

٦-(سَهْم قَوْسِ الدائِرَة) (هـ): تیرەی بازنە کە هێڵێکی ڕاستە هەردوو نیوە کەوانەی بازنەکە بە یەك دەگەیەنێت.

(ألقُـوس): خانەی ڕاوکـەر/ قوڵغی ڕاوکەر/ پەرێز.

(ألقَـوَّاس (ج) قَوَّاسَـة): ١- کەوانـەوان ٢-کەوانساز ٣-یەکێکە بە کەوان تیر بهاوێژێت/ تیرهاوێـژ ٤-ڕاوکەرێك بـە تفەنگ‌و باروت ڕاوبکات ٥-کارگوزاری قەشەو قۆنسوڵ‌و ئەوانە کە بەرگێکی تایبەتیی خۆیان هەیە.

(ألقُوَيـس والقُوَيْسَـة): کەوانـۆك/ کەوانی بچووك.

(ألقَيَّاس): کەسێکە کە کەوان دەتاشێت.

(اَلأَقْوَس): پشتكۆماوە/ پشتچەماوە.

(اَلِقْـوَس (ج) مَقـاوِس): دەفرێكە كەوانی تێدەخەن/ كەوانە دان.

٣-(تَقَوَّسَ-هُ الشَـيبُ): قژی سەری سپێتیی تێكەوتو ماشوبرنجبوو و پشتی كۆمايەوە.

٤-(اَلقُوس): خەڵوەتگای پارسا.

(اَلقَوْس والقَوْسـي- مِـنَ الأَيـام): ڕۆژانی سەختو درێژ.

(اَلأَقْـوَس): گـردە لمێكی بەرز كە بەسـەردا بڕوانێت.

(-مِن الأَيام): ڕۆژانی سەختو درێژ.

(لَيـلٌ أَقْـوَس): شـەوەزەنگ/ شـەوێكی زۆر تاريكو نووتەك.

(بَلَدٌ أَقْوَس): شارێكی دوور.

(اَلقُوَيْسَة= الناعِمَة) سالفيا (ن): ڕووەكێكە بۆنخۆش لاسك سـپییە لە درزی تاوێرەكاندا دەڕوێـت گوڵەكەی سـوورەو هەندێك كەڵكی پزیشكیی هەیە.

قوص (تَقَوْصَرَ): بەیەكداچوو.

(اَلقَوصَرَة): دەفرێكە لە قاميش دروستدەكرێت خورماو لەو بابەتەی تێدەكرێت.

قـوض: (قاضَ. يَقُـوضُ- البِنـاءَ. قَوْضاً): خانەكەی ڕووخاند.

(قَوَّضَ- البِناءَ): خانەكەی/ بيناكەی ڕووخاند.

(-الصُفوفَ والمَجالِسَ): ڕيزەكان و ئەنجومەنەكانی بڵاوەپێكرد/ پەرش و بڵاویكردنەوە.

(«بنی فُلانٌ ثُمَّ قَوَّض»): چاكەيكردو پاشان تێكيدا، كەوتە خراپەكردن.

(تَقَوَّضَ): هەر لە هاتن و چووندا بوو ئارامی لەبەر برا.

(-تِ الحَلَـقُ أَو الصُفوفُ): خەڵكەكە پەرش و بـڵاو بوونەوەو لەيەكپچـڕان/ ئەڵقەو ڕيزی خەڵك لەيەكپچڕا.

(تَقَوَّضَ وانقاضَ- البِناءُ): خانەكە (ڕووخا/ كاولبوو/ ڕما).

قوط: (اَلقَوْط (ج) أَقْواط): ڕانەمەڕ.

(اَلقَوْطَة): قوڵینەی قیركراوی گەورە.

(اَلقَوْطَة): خورما.

(اَلقَوَّاط): شوانی ڕانەمەڕ.

قـوع: (قـاعَ. يَقُـوع. قَوْعـاً): دواكەوتو پاشەكشەيكرد.

(قـاعَ وتَقَـوَّعَ): لـە ڕۆيشـتندا بەملاولادا لاردەبـووەوە وەك بـە شـوێنێكی دڕكاويـدا بڕوات.

(اَلقـاع (ج) أَقْـواع وأَقْـوُع وقيـع وقيعان وقيْعَة): تەختاييەكی نزمتر لە گردو شـاخ و دەوروپشتی.

(اَلقاعَـة (ج) قاعـات): ١ حەوشـەی خانوو ٢ ژووری ميوان و پێشوازيی.

(ج) (أَقْواع): شـوێنی هەڵخسـتنی گەنم يان خورما.

(اَلقُواع والأُنثی قُواعَة) (ح): كەروێشك.

(أَلقَوَّاع) (ح): گورگی بەلووره/ لوورەكەر.
قوف: ١-(قافَ. يَقوفُ واقتافَ أثَرَ فُلان قَوفاً): شوێنپێی فیساری هەڵگرتو دوایكەوت.
(تَقَـوَّفَ- أثَـرَ فُلان): شـوێنپێی فیساری هەڵگرتو پێ بە پێی ئەو ڕۆیشت/ دوایكەوت.
(-هُ في المَجالِـسِ): لـە كـۆڕدا ڕەخنـەی لە قسەكانیگرتو پێی وت: وا بڵێو وابڵێ.
(« هوَ يَتَقَوَّف عَلَيَّ مالي»): دەسـت بەسەر ماڵەكەمـدا دەگرێـتو بـەری بەكارهێنانیم لێدەگرێت.
(أَلقائِف (فا) (ج) قافَة): ١-پاشماوەی دێریننناس و ئەوەی بە دوای پاشماوە دێرینەكاندا دەگەڕێت ٢-ئـەوەی ڕەچەڵەكناسـەو بە تەماشـاكردنی ئەندامانی ساوا دەزانێت لە چ ڕەچەڵەكێكە.
(أَلقَواف والقَوَّاف): شـوێنكەوتووی پاشماوە دێرینەكانو پاشماوەی دێرنناس.
(ألأَقْوَف): زۆر شارەزای پاشماوەی دێرین.
(«هو أَقْوَفُ النـاس للأثَر»): ئەو لە هەموو كەس باشـتر پاشـماوە دێرینەكان دەناسێتو بەدوایاندا دەگەڕێت.
٢-(أَلقاف- مِن الرَّقَبَة): مووی درێژەوەبووی سەر پشتیمل/ ناوچاڵی مل.
(أَلقُوف): سەرووی گوێچكە.
(أَلقُوفَـة- مِـنَ الرَقَبَة= القـاف) («أَخَذَتُهُ بقُـوف رقبَتِـهِ»): هەموو پشـتیملی گرت/ هەموو مليم گرت.

(أَلقَوفي): هەموو بوغوردێكی بۆنخۆش.
قوق: ١-(قاقَ -تِ تقـوق الدجاجَةُ. قَوقاً): مریشكەكە گارەگاریكرد/ گاراندی.
(أَلقاق): ١-گەوجی هەڵەشە/ هەرزەگێل.
أَلقاق: ماسـيگرە/ كەرەسـەرە. لـە كۆمەڵەی قەلەڕەشكەیە. سەرو باڵو كلكی ڕەشەو ئەویتری لەشی خۆڵەمێشییە – (لای ڕەشە خەڵكەكە).
(ج) قيقان) (ح): قەلەڕەشكەكە هەڵگێراوەی وشەی (الغاق)ە.
(أَلقاق والقُوق) (ح): مەلێكی ئاویی ملدرێژە.
(أَلقُـوق والقيق- مِنَ الرجـال): پیاوی زۆر (قووچ/ درێژ).
(أَلقُوْقَةُ) (ح): بایەپوش.
(أَلقاووق (ج) قَواويق) (فارسية): كڵاو قووچ كە لە ئێراندا زۆر لەسەردەكرێت.
٢-(قَوْقَـأَ-تِ الدجاجَةُ قَوقَأَةً): مریشـكەكە قرتەقرتیكرد.
٣-(قَوقَلَ- الرَجُلُ في الجَبَل قَوقَلَةً): پیاوەكە سەركەوتە كێوەكە/ شاخەكە.
٤-(قَوقى. قَوقاةً وقيقاءً): دەنگەدەنگیكرد/ هاواریكرد/ قیژاندی.
قول: ١-(قالَ. يَقُولُ قَوْلاً وقالاً وقيلاً وقَولَةً ومَقالاً ومَقالَةً): ١-وتی ٢-قسەیكرد/ دووا.
(-بكَـذا): ١-بڕیارو دەنگی لەسـەر ئەوە دا/ بڕیاریداو بڕوای پێبوو ٢-زاڵبوو/ سەركەوت.
(-بِهِ): حەزی لێكردو بۆ خۆی تەرخانكرد.

(-لَه): پێیوت/ قسەی لەگەڵدا کرد/ دوواندی.

(-عَنهُ): لەوەوە گێڕایەوە.

(-عَلَیهِ): بوختانی بـۆ کردو گومانباریکرد/ درۆو بوختانی بۆ هەڵبەست.

(-برَأسِهِ): بەسەر ئاماژەیکرد.

(-بیَدِهِ): دەستی درێژکردو بردی.

(-برجلِهِ): ڕۆیشت.

(-بثَوبِهِ): جلەکەی بەرزکردەوە/ هەڵبڕی.

(-فیه وعَنهُ): کۆششی تێدا کردو لێکرد.

(قـالَ ظَـنَّ): وایزانـی/ وایبۆچـوو، بـەم مەرجانە بە واتای (وایزانی) دێت، ١-بە وشەی داهاتوو «مضارع» بێت ٢-پرسیار «استفهام» لە پێشـەوە بێـت ٣-بێجگە لـە «ڤرف» هیچ نەکەوێتە نێوان «فعله»کەو «استفهام»ەکەوە وەك: «أتَقولُ زَیداً مُنطَلِقاً»: ئایا وا دەزانیت یان وای بۆ دەچیت کە زەید دەرچووە؟ هەندێ لە عەرەبیـش «قال» وەهـا بەکاردەهێنێت، وەك: قُلتُ زَیداً مُنطَلِقاً: وایبۆچووم کە زەید دەرچووە.

(قـالَ= مـالَ وأقْبَـلَ): بـۆ ئامادەبـوونو خۆخرهەڵدان بۆ کارێك.

قالَ فأكَلَ): خۆی ئامادەکردو خواردی.

(قالَ فضَرَبَ): خۆی ئامادەکردو لێیدا.

(قَـوَّلَ-هُ): فێریکـرد یـان فەرمانیدایە کە بڵێتو قسە بکات.

(قَـوَّلَ وأقالَ وأقْوَلَ فُلاناً مالـم یَقُل. إقالَةً وإقْـوالاً): قسـەیەکی دایـە پاڵ فیسـار کە نەیکردبوو.

(قاوَلَ-هُ في الأمر- مُقاوَلَةً): پێکەوەبەڵگەبازییو لێکۆڵینەوەیان لەسەر کارەکە کرد.

(تَقَوَّلَ- علیه القَولَ): بە زمانی ئەوەوە شتی هەڵبەست.

(تَقاوَلُـوا- في الأمـرِ): بـۆ کارەکـە قسـەو دانوسانیانکرد.

(إقتالَ- الشيءَ): شتەکەی هەڵبژارد.

(-عَلَیهِـم): داوای ئـەوەی لێکـردن کە ڕای خۆیانی تێدا دەرببڕن.

(-بالثَّـوبِ ثَوبـاً): بەرگێکی بـە بەرگێکیتر گۆڕییەوە.

(ألقائل (ج) قُوَّل وقُیَّل وقالَة وقُؤول) (فا): گوتوو/ بێژەر/ قسەکەر/ وتەبێژ.

(ألقال): سەرەتا یان پرسیار.

(«رَجُلٌ قـالٌ أي قائـل»): پیاوێکی بێژەر/ قسەکەر/ گوتوو.

(ألقال والقیل): قسەی (دەماودەم/ ئەمو ئەو) واتەواتی خەڵکی: وتەوتی خەڵکی.

(«كَثُرَ قالِ الناس وقیلُهُم»): وتەوتەی (ئەمو ئەو/ خەڵك) زۆر بوو.

(ألقالَةُ والقَولَة= القَـول): وتەوتەی باش یا خراپی ناو خەڵك.

(ألقَـول (ج) أقوال و(جج) أقاویل): قسـە/ ئاخاوتن یان هەر وتەیەك ٢-ڕاو بیروبڕوا.

(«هذا قَـوْلُ فُلان»): ئەمــە ڕاو بیروبڕوای فیسارە.

(ألقيل): وەڵام.

(ألقَيْل (ج) أَقْوال وأَقْيال وقُيُول): ١-سەرۆك ٢-شـایەك لە شـاكانی «حیمیـەر» (بۆیە وا ناونـراوە چونكە هـەر قسـەیەكی بكردایە قسەكەی دەبردە سەر.

(ألقُولَة والقَوَّالَة والقَوُول والقَؤُول (ج) قُوُل وقُـوْل والتِقْوَلـة والتِقْوالة):١-قسـەجوان. زمانشیرینو ناسك ٢-قسە زۆر/ فرە قسە.

(ألقَوَّال (ج) قَوَّالون): گۆرانیبێژ.

(-في إصطِلاح الرَّجالين):شایەر كە سەۆپێیی گۆرانی دەڵێن.

(ألمَقال) (مص): ئاخاوتن/ قسە.

(ألمَقالـة= القَوْل):١-قسـە/ ئاخاوتن/ پارچە وتارێك/ نووسینێك/ بەشێك لە كتێبێك.

(ألمُقاوَلَة): بەڵێن/ بەڵێنبەسـتنو ڕێككەوتن لەسەر كارێك خانەسازیی بێت یان بازرگانیی بێـت یان هـەر كارێكیتر بێـت دوان بن یان زۆرتـر بۆ ئەوە (بۆیـە وای پێوتراوە چونكە گفتوگۆو دانوسانی تێدا دەكرێت).

(ألمِقْوَل (ج) مَقاوِل ومَقاوِلَة):زمان.

(ألمِقْـوَل والمِقْـوال (ج) مَقـاوِل ومَقاوِلَة): قسەخۆشو زمانشیرینو دەمپاراو.

(إمْرَأةٌ مِقْوَلٌ ومِقْوالَة):ئافرەتێكی بەزمانو قسەزانو زمانشیرین.

(ألمَقُول والمَقْوُول) (مفع): ئاخاوتنی وتراو.

(مَقُولُ القَول عند النحاة):لای ڕێزماننناسەكان كاری ئاخاوتنەكە/ وتراوەكە.

(كَلِمَةٌ مُقَوَّلَة): وشەیەكە یان وتەیەكە چەند جار وترابێتەوەو چەندبارە بووبێت.

٢-(قال. قَوْلاً. وقـالاً وقيلاً. وقَوْلَةً. ومَقالاً ومَقالَةً): مرد.

(-القَومُ بفُلانٍ): خوێنشگەل فیساریان كوشت.

(-الحائِطُ): دیوارەكە كەوت/ ڕما/ ڕووخا.

٣-(قـالَ. قَوْلاً وقـالاً وقيلاً وقَولَـةً ومَقالاً ومَقالَةً): حەسایەوە/ حەوایەوە.

(ألقالَة): نیوەڕۆخەو/ نوستن لە نیوەڕۆدا.

الملحق:

قول: (قاوَلَ- فُلاناً على العَمل):كارەكەی بە بەڵێن دایە كە بیكات.

(ألمُقـاوِل): بەڵێنـدەر كەسـێكە كـە كار بگرێتە دەسـتو بیكات بە پێـی ڕێككەوتنو گرێبەستێكو ڕێككەوتننامەیەك.

---

قوم: ١-(قـامَ. يَقومُ. قَومـاً وقَومَةً وقياماً وقامَةً):هەستا/ وەستا/ ڕاوەستا/ ڕاستبووەوە.

(تَقـولُ للماشـي «قُم لي»):بۆم بووەسـتە. ئەمە بە یەكێك دەڵێت كە لە ڕۆیشتندا بێت.

(قام- الأمرُ):كارەكە ڕاستبووەوە/ ڕێكبووەوە.

(قَوَّم- دَرأَهُ):خوارو خێچی لابرد/ ڕاستیكردەوە.

(قاوَمَ- دُ قِواماً ومُقاوَمةً):١-لەگەڵیدا هەستا ٢-لەگەڵیدا بەرەنگاریبوو/ دژی یەك وەستان.

(أَقامَ-هُ إقامَةً وقامَةً): هەڵیسـانده سەرپێ/ قنجیکردەوە/ ڕاستیکردەوە.

(-المائِـلَ أَو المُعْوَجَّ): لارەکـە یان خوارەکەی (ڕاستکردەوە/ ڕێککردەوە).

(«ماأَقْوَمَـهُ»): ئـای کە ڕێکو ڕاسـتە/ کە ڕاستو دروستە (بۆ سەرلێسوڕمانە).

(تَقَوَّمَ): ڕێکو ڕاستبووەوە.

(تقاوَمُوا- فِي الحَرب): لە شـەڕدا بۆ یەکتری هەستان.

(إِسْتَقامَ): ڕێکو ڕاست بووەوە.

(«إِسْـتَقامَ له الأَمرُ»): کارەکەی بۆ ڕاسـتو ڕێکبووەوە.

(-لَهُ الشِعرُ): کێشی هەڵبەستەکەی بۆ ڕاستو دروستبوو/ ڕاست بۆیهات.

(أَلقائِـم (ج) قُوَّم وقُيَّم وقِوام وقِيَم وقِيَّام) (فا): ١-وەستاو/ قنج ٢-ڕاست/ دروستو ڕێك ٣-ڕاستەوەبوو.

(قائِـمُ- الماءِ): عەمـاری ئاو کـە لێوەی ئاو دابەشدەبێت/ سەرچاوەی چاو.

(أَلقائِـم مَقـام (ج) قُوَّام المَقامـات و قائِم مَقامـون (عنـد أَربـاب السياسـة): لای ڕامیـارەکان ناوچەدار/ فەرماندار/ ئەوەی لە خوار پارێزەرەوەیە.

(أَلقائِمَة (ج) قائِمات وقَوائِم):مێی وشـەی (أَلقائِم).

(قائِمَةُ الدابَّة):دەسـتی یـان پێی چوارپێ/ پەلی چوارپێ.

(قائِمَـةُ الخَـوان أَو السَـرير):قاچی مێزی نانخـواردن یان هـی تەختـی/ قەرەوێڵەی/ کورسیی نوستن.

(أَلقامَـةُ- مِنَ الإِنسـان (ج) قامات وقِيَم): بەژنو باڵای مرۆڤ/ قەدی مرۆڤ.

(- (ج) قِيَم):بەکرەو ئامرازەکانی.

(أَلقوم (ج) قِيمان):دوژمنەکان.

(أَلقَومَـةُ) (مـص):جارێك ڕاسـتبوونەوە/ هەسـتانەوەیەك ٢-هەسـتانەوەی نێوان دوو ڕکاعەتی نوێژ ٣-بەژنی/ باڵای مرۆڤ.

(أَلقُـوَام): دەردێکـە دەداتـە چوارپەلـی چوارپێ.

(أَلقَـوام):١-دادو ڕاسـتبوون ٢-مامناوەندیی ٣-ڕاستی/ ڕێکیی.

(قَوامُ الإِنسان):(بەژن/ باڵا)ی مرۆڤو قنجو قیتی.

(أَلقَوام):ڕاستو ڕێك.

(«رمحٌ قِوام»):نێزەیەگی ڕاست/ ڕێك.

(أَلقَـوَّام (ج) قَوَّامـون):قـەدو بەژنڕێكو جوان/ باڵاشۆخ.

(قَومِيَّةُ الإِنسانِ وقُومِيَّتُهُ):قەدوباڵای مرۆڤ.

(أَلقَويـم (ج) قِيام):١-باڵاشـۆخ/ باڵاڕێكو جوان ٢-مامناوەندی.

(أَلقيامَـة):زیندووبوونـەوەی مرۆڤ ڕۆژی حەشر/ قیامەت.

(يَـومُ القيامَـةِ): ڕۆژی زیندووبوونـەوە/ لێپرسینەوە/ ڕۆژی حەشر.
(ألقيمَـة (ج) قِيَـم): ١-جـۆرو شـێوەی ڕاستبوونەوەو هەستان.
(قيمَةُ الإنسان): (بەژنی/ باڵای) مرۆڤ.
(أمرٌ قَيِّمٌ): کارێکی ڕاستو دروست.
(ألدِّيانة القَيِّمَة): ئاینی دروستو ڕاستی.
(«ذلـك دينُ القَيِّمَة»): ئەوە ئاینی ڕاسـتو پاكو دروستی میللەتەکەیە.
(ألأقْوَم): ڕاستتر/ دروستتر.
(«فُلان أقْوَمُ كَلاماً مِن فُلان»): قسەی فیسار ڕاستو دروستترە لە هی فیسار کەس.
(ألمَقام (ج) مَقامات): ١-شوێنێ ٢-پلەوپایە.
(ألمِقْوَم): دەسـتەدووی ئامێری جووتکردن/ ئـەوەی جوتیارەکە لـە کاتـی جووتکردندا دەستی پێوەدەگرێت.
(ألمُقيم) (فا): نیشتەنی/ دانیشتوو/ جێگیر.
(«هـذا أمرٌ مُقيـمٌ مُقعِدٌ»): ئەمـە کارێکە داتدەنێو هەڵتدەستێنێ/ شپرزەتدەکات.
(مُسـتقيمان): دوو هێڵـی ڕاسـت (ص صَ) تەریبنو ئاراستەیان پێچەوانەی دوو هێڵێترە (س، سَ) دوو گۆشەی (١، ٢) پێکدەهێنن لەگەڵ (ص صَ) کە یەکسـانن یان چوارگۆشـەیەك دروسـتدەکەن بازنەیکی لەسـەر دەکێشرێت دوو هێڵی تەریب (هـ) (مستقيمان متوازيان) (هــ): دوو هێڵـی تەریـب واتـە: لەسـەر

ئاستێکدانو یەکتری نابڕن/ بەیەکناگەن.
٢-(قامَ. يَقـومُ- بالأمرِ قَوْماً وقَوْمَةً وقياماً وقامَةً): کارەکەی گرتە ئەستۆ.
(«قام بِـيَ وقَعَدَ»): هەڵیگرتـمو دایگرتم/ شتی خراپی دەرباره وتمو بڵاوکردەوە.
(قامَ- أهْلَـهُ): بەتەنگ خێزانەکەیەوە هاتو کاروباری بەڕێکردن/ بەخێویکردن.
(-الحَقُّ): ڕاسـتو ماف دەرکەوتو ئاشـکراو جێگیر بوو.
(-علـى الأمـرِ): ١-چاودێریـی کارەکەیکرد ٢-لەسەر کارەکە مایەوەو تیایدا سەرومڕ بوو/ بەردەوامبوو.
(-تِ الصلاةُ): دەست بە نوێژ کرا.
(«قام بِفِعْلِ كذا»): دەسـتی بەو کارە کرد/ دەستی دایە ئەو کارەو کردی.
(قَـوَّمَ- الشَـيءَ): شـتەکەی ڕاسـتکردەوە ڕێکخست ٢-نرخاندی.
(«تَقويم البلدان»): ڕێکخستنەوەی کاروباری وڵات ٢-درێژیو پانیـی وڵاتەکە دەربخرێتو بـاجو خەراجـی زەویـوزارو بەرهەمـی دیاریبکرێت.
(أقامَ- الشـيءَ. إقامَةً وقامَـةً): درێژەی بە باری شتەکە داو وەك خۆی هێشتیەوە.
(-بالمَكان): لە شوێنەکە نیشتەجێبوو و کردی بە نیشتمانی خۆی.
(-الحَقَّ): ڕاستیو مافی دەرخست/ ئاشکرایکرد.

(-للصَّلاةِ): بانگی نوێژیدا.

(-الصَّلاةَ): نوێژەکەی تەواو کرد.

(تَقَوَّمَ- الشيءُ): شـــتەکە ڕێكو ڕاستبووەوە کەچیی نەما.

(«قَوَّمْتُهُ فَتَقَوَّمَ»): ڕاستمکردەوەو ڕاستبووەوە.

(قائِمُ السَّيفِ): مشتوی شمشێرەکە.

(ألقائِمَةُ): لیستەی نوسراوێك.

(قائِمَةُ السَّـيفِ): دەسکی شمشـێر: مشتوی شمشێر.

(ألعَـــيْنُ القائِمة): چاوێکی نابینای بە دیمەن ساغ.

(ألقامَةُ (مص) (ج) قامات وقِيَمٌ): گرووپی خەڵك/ کۆمەڵی خەڵك.

(ألقَـــوْم): ١-نیشـــتەجێبوون/ دامـــرکان لـــە شوێنەکەدا ٢-نیاز.

(ألقَوم): لە شوێنەکەدا جێگیربوون.

(- (ج) أقْـــوام وأقـــاوِم وأقائِـــم و أقاوِيم): کۆمەڵێك خەڵك.

(قَـــوْمُ الرَجُلِ): ١-کەســـوکاری/ خوێشـــانی/ خزمانـــی پیاوەکـــە کـــە لەبەرەبابێکـــن ٢-نەتەوە.

(ألقَومِيّ): نەتەوەخواز/ نەتەویی.

(ألقَومِيَّة) نەتەوەو نەتەوایەتی بیروبڕوایەکی ڕامیاریـــیو کۆمەڵایەتییـــە هەڵگـــری ئـــەو بیروبڕوایە هەموو شـــتێك کە پەیوەندیی بە نەتەوەکەیـــەوە بێت لەلای لەپێشـــترە لە هی هەموو لایەکیتر.

(ألقَومِيَّة): بیرێکە کە نەتەوەیەك یەکدەخات کە مێژوویان یەك بێـــتو ئاواتو ئامانجیان یەکبێت.

(قَومِيَّةُ الأمرِ): سیســـتمی ئەو کارەو ئەوەی پێیهەڵدەستێتو دەیهێنێتە دی.

(ألقَوام): خواردنێك کە بۆ مرۆڤ بەسبێت.

(ألقِوام): ئەو خواردنەی بۆ مرۆڤ بەسبێت.

(قِـــوامُ الأمرِ وقِيامُهُ): شـــیرازەو ڕاگری کارو ئەوەی پێیهەڵدەسێتو ئەنجامی دەهێنێت.

(هـــو قِـــوامُ أهلِـــهِ وقِيامُهُـــم): ئـــەو ڕاگرو جێبەجێکەری کاروباری خێزانەکەیەتی.

(ألقَوَّام (ج) ألقَوَّامون): ڕاگرو دەســـتەبەری کار ٢-بەدەسەڵاتو تواناو لە کردنی کارەکەدا ٣-میر.

(ألقَيُّوم والقَيّام): هەر بـــووەو هەر دەبێتو کۆتایـــی نییە. ئەمانـــە لە نـــاوە پیرۆزەکانی خودای مەزنن..

(ألقَيِّم- على الأمرِ (م) قَيِّمَة) سەرپەرشتیارو ڕاگیرکار وەك سەرپەرشتیاری وەقف.

(قَيِّمُ المَرْأة): مێردی ژن.

(ألإقامَـــة. (ج) إقامـــات): چاوگـــی وشـــەی (أقامَ)ە: نیشتەنی/ مانەوە.

(«طَوى بِســـاطَ الإقامَة»): گاڵی گوێزایەوە/ کۆچیکرد.

(إقامَةُ الجُندي): کاری سەربازەکە.

(اَلتَقْويــم) (مــص): ســاڵنامە. کۆمەڵــە دەســتورێکە بــۆ رێکخســتنی نێــوان ســاڵی شارســتانیو ساڵی هێڵی کەمەری گۆی زەویو بەشبەشکردنی چاخو سەردەمەکە.

(اَلتَقويــم الرومِــيّ أو اليوليوســي): ئــەو ســاڵنامەیەیە کە یولیۆس قەیســەر فەرمانی پەیڕەوکردنــی دا. لــە ســاڵی (٤٦)ی پێــش زایینبی تیایدا هەر ســاڵێك ڕۆژەکانی بەسەر چواردا دابەشــبکرێتو هیچــی نەمێنێتەوە ئەوە ساڵێکی پڕە.

اَلتَقيوم الهِيجري: ســەرەتا لە (١٦)ی تەموزی (٦٢٢) زاینــداو ســاڵی (١٧)ی کۆچیدا خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب داینا. ســاڵی هیجری/ کۆچیــی (١٢) مانگی عەرەبییــە/ (هەیڤییە) واتا (٣٥٤) ڕۆژەو ســاڵی پڕیشــی (٣٥٥) ڕۆژە. ســاڵنامەی گریگۆریــی. پاپــا گریگۆریوســی ســیازدەهەم داینا ســەرەتا لــە (١٥)ی مانگی ســەرماوەزی ســاڵی (١٥٨٢)ی زاینــی بڕیاری پەیڕەوکردنیدا تیایدا ساڵانی (سەدەیی) وەکو ١٦٠٠ و ١٧٠٠ بــە ســاڵی پــڕ دانانرێت ئەگەر بەسەر (٤٠٠)دا دابەشنەکرێت.

(تَقويــم البُلــدان): پانــیو درێژیــیو باجو خەراجی زەویەکانی وڵاتانی تێدا دەردەخرێت.

(اَلمَقام (ج) مَقامات): پلەوپایە.

(اَلمَقام و المُقام): جێنشینبوونو شوێنەکەیو کاتەکەی/ سەردەمەکەی.

(اَلمُقامَة): ١-نیشتەنیی ٢-شوێنی نیشتەنیبوون/ جێنیشتەنی ٢-کۆمەڵە خەڵکێك.

(اَلمَقامَة (ج) مَقامات): ١-سەروەریی ٢-ئەنجومەن ٣-کۆمەڵە خەڵکێك ٤-وتار یان ئامۆژگارییە بە گوێی کۆمەڵە خەڵکێکــدا بدرێت یان قەوماوو سەرگوروشــتەیەك کە لــە کۆمەڵێکدا بوترێت لەوانە (مەقاماتی حەریری).

٣-(قــامَ. يَقــومُ- الماءُ قَوْمــاً وقَومَةً وقياماً وقامَةً): ١-ئاوەکە پەنگیخواردەوەو دەرمیەکی نەبوو لێوەی دەرچێت ٢-بەستی/ مەیی.

(-ت بِهِ دابَّتُهُ): چوارپێکە مانیگرتو نەرۆیشت.

(-ميزانُ االنَّهارِ): ڕۆژ بوو بە نیوەڕۆ.

٤-(قامَ يَقومُ-تِ السُّوقُ قَوماً وقَومَةً وقياماً وقامَةً): بازار هەستایەوەو فروختی باشبوو.

(-المَتاعُ بِكَذا): نرخی کاڵاکە بەوە هەستایەوە.

(قوَّمَ- المَتاعَ): نرخی دیاری بۆ کاڵاکە دانا.

(قــاوَمَ- الشــيءَ قِوامــاً ومُقاوَمَــةً): جێی شتەکەیگرتەوە/ لەبری شتەکە وەستا.

(«قاوَمَ الثَّمَنَ المَتاعَ): نرخەکە گەیشتە ڕادەی چاکیی کاڵاکە.

(أقامَ السُــوقَ. إقامَــةً وقامَــةً): بازارەکەی گەرمکردو برەوی بە بازارەکە دا.

(تَقاوَمَ القَومُ الشَــيءَ بَينَهُم): لەناو خۆیاندا نرخیان بۆ شتەکە دانا.

(إسْتَقامَ المَتاعَ. إسْتِقامَةً): نرخی بۆ (کاڵاکە/ کەلوپەلەکە) دانا.

(أَلقائِمَة) (ت): لیستەی نرخی شتەكان‌و كۆی نرخیان/ ژمێرەی شتەكان.
(أَلقيمَة (ج) قِيَم): نرخی كاڵاكە.
(أَلقيميّ): نرخیتی.
(أَلقيّم): گرانبەها/ هەموو شتێكی بەنرخ.
(«كِتابٌ قَيِّم»): كتێبێكی بەنرخ‌و بەها.
(مَقــامُ أَو مَخــرَجُ الكَسْــر) (ع ح): ژێرەی كەرتی ئاسایی ژێرەی كەرتی (٣\٤) = ٤
٥-(قامَ يَقومُ - به ظَهرُه قوماً وقَومَةَ وقياماً وقامةً): پشتی بەوە هاتە ژان.
(- على غريمه): داوای وامەكەی/ قەرزەكەی لە وامەرگرتووەكە كردەوە.
(إقتامَ إقتياماً أنفَهُ): لووتی بری.
٦-(القُوماندُس) (لاتينية): كوماندۆ: كۆمەڵە ســەربازێكن راهێنراون كە لە تاریكەشــەودا، لە پاپۆرەكانیانەوە دزە بكەن بۆ ســەر خاكی دوژمــن‌و شــوێنە گرنگەكانــی هەڵتەكێنن‌و وێران بكەن، ســەنگەری دوژمن هەڵتەكێنن‌و كاولكاریی لە خاكی دوژمندا بكەن.
الملحق:
قَوم: أَلقائِمقامِيَّة: ١-ناوچەیی/ كەرتكردنی‌وڵات‌و پارێزگایەك بە گەلێك ناوچەوە هەر ناوچەیەك/ كەرتێــك/ ناوچەوداریــك/ فەرمانداریــك/ قایمقامێك سەرپەرشــتیی كاروبــاری دەكات‌و بەرێوەیدەبــات ٢-پلــەی قایمقــام/ ناوچــەدار ٣-بنكەی ناوچەدارو شوێنی كاركردنی.

(أَلمُقاوَمَــة): بەرەنگاریی هێز بــە هێز/ بەرگری راوەستان بەرامبەر هێرشی دوژمن.
(«أَبــدى الجنــودُ مقاوَمــةً بُطولِيَّــة»): ســەربازەكان قارەمانانــە بەرامبەر هێرشــی دوژمن وەستان‌و بەرگرییانكرد.
(المُقاوَمَة): بەرهەڵستكردنی خواستی كەسێك‌و خۆبەدەستەوەنەدانی/ بەجێنەهێنانی نامانجەكانی.
(مُقاوَمَةَ الرَئيس): بەرهەڵستكردنی سەرۆك نارەزایــی دەربریــن بە نادادیی لەشــتدا كە پێچەوانەی ئارەزووەكان بێت لەســەر ئەوەی ئازادیی بەربەست بكات‌و هەرەشەی لێبكات.
(«مُقاوَمَة تدابــير حكومية مُتَعَسِّــفَة»): بەرهەڵستكردنی كارە نادادیەكانی میری.
(قُوَةُ الإحتمال): هێزو توانای ئارامگرتن.
(مقاومة التَعَب): بەرگەگرتنی ماندوێتی.
(أَلقُــدرَة على إبطــال أَو تخفيــف مَفعول قُــوة): توانای پووچەڵكردن یان ســوككردنی كاریگەری هێزێك.
(مُقاوَمَــة الإنضغــاط): بەرهەڵســتكردن‌و بەرگەلێگرتنی فشارێكی سەر.
(مُقاوَمَــة الجَــرّ): بەرهەڵســتی راكێشــان/ بەكێشكردن.
(«عدم الإنقياد لِلإغراء»): مل شۆرنەكردن‌و خونەدانە دەست لاسدانی شتێك كە مەترسیی هەبێت یان لە رووی رەوشــتەوە خراپ بێت‌و تەفرەت نەدات.

(«مُقاومـــة التَجرُبَـــة»): بەرگریکـــردن تاقیکردنـــەوەو بەرهەڵســـتکردن بریتیە لە: (لُجـوء جماعات مِــن المُواطِنين المُسَــلَّحين إلى محاربة العَدُو المُحْتَل بوَســائِل مُتَنَوِّعَة كشــن هجمات مُتَفَرِّقَة أو إحداثُ تَخريباتٍ في مُنْشَــآتِهِ وقواعِــدِهِ): پەنابردنی کۆمەڵە چەکدارێــك بــۆ رێگەی هەمەجــۆری بەگژ دوژمندا چوون وەك لەملاولاوە پەلاماربدەن یان لە دامــەزراوو بنکەکانیانــدا، کاولکاریی بکەن.

(«إتَّســعَ نِطاقُ المُقاومَــة»): کوڕی بەرگریی پەرەی سەندو فراوانبوو.

(اَلقائِمــون بالحركــة أنْفُسِــهِم): بزوتنەوە گێرەکان خۆیانن.

(يَنتَمي الى المُقاومَة): سەر بە هێزی بەرگرییە.

(اَلمُقاومــة الكهربائية): بەرگریی ١-ئەو رێگریو بەرهەڵســتیەیە کە بە هۆی گەیەنەرێك پەیدای دەکات کاتی تێپەڕبوونی تەزوو پیایدا. ٢-پلێتێکی گانزاییــان تەلێك کە وزەی کارەبــا بۆ گەرمایی دەگۆڕێت.

قــون: (تَــقَــوَّنَ- الــرَجُــلُ): بــە زمــان دوژمنکارییکرد.

(اَلقان) (ن): درەختێکە کەوانی لێدروستدەکرێت.

(اَلقاوون) (ن): ١-جۆرە ئارووییەکە/ خەیارێکە.

(اَلقُونَة (ج) قُوَن): پارچە ئاســن یان مسێکە قاپی پێ پینەدەکرێت.

القُونَة (عامية- سريانية)= أيقُونَة: ئەو وەڵییە پاکەیە کە بە پاکی دەچێتەوە لای خودا.

قُوه: ١-(قَوَّه- الرَجُــلُ تَقْويهاً): هاواریکرد/ قیژاندی.

(تَقــاوَهَ- الرَجُــلانِ): هاواریــان لەیەککرد/ دەنگیان لە یەککردو یەکتریان ناسی.

٢-(قَــوَّهَ- الصَيدَ. تَقْويهــاً): نێچیرەکەی بە دەنگ ترنجاندە شوێنێکەوە.

إسْــتَقْوَهَ-هُ): داوایلێکرد بە دەنگ نێچیرەکە بترنجێنێتە شوێنێکەوە.

٣-(أَيْــقَــهَ): ١-ملکەچبوو/ گوێــرایەڵبــوو ٢-تێگەیشت.

(«أَيْقِهْ لِهذا»): لە مەتێبگە.

(أَيْقَهَ واستَيقَهَ): گوێرایەڵییکرد (هەڵگێراوەی وشەی (أوقَهَ) و (اسْتَوْقَهَ) ن.

(اَلقاهُ): ملکەچیی/ فەرمانیی/ گوێڕایەڵیی.

(«مالَكَ عَلَيَّ قاهٌ»): دەســەڵاتت بەســەرمدا نییە.

٤-(اَلقــاهُ): ١-ســامان/ دەوڵەمەندیی ٢-ژیانی بەرزو خۆشیی.

(اَلقاهي): ساماندار/ دارا/ خاوەنی گوزەرانی بەرزو خۆش.

(اَلقُوهَة): شیرێك گۆڕابێتو کەمێك شیرینی بدات.

قوي: ١-(قَوِيَ. يَقْوى قُوَّةً): بەهێز بوو.

(-على الأَمرِ): توانای بەسەر کارەکەدا شکا.

(قَــوَّى- الرَجُــلَ أَو الشَــيءَ): پیاوەکە یــان شتەکەی بەهێز کرد.
(قاوى- الرَجُلَ. مُقــاواةً): لەگەڵ پیاوەکەدا هێــزی یەکتریان تاقیکــردەوەو لەو بەهێزتر بوو.
(«قاوانی فَقَوَیْتُهُ»): شەرە هێزمانکردو من بەزاندم.
(أَقْوَى. إقْواءً): چوارپێیەکی بەهێزی هەبوو.
(-الحَبْلَ): بەشــێکی گوریســەکەی لەویتری ئەستوورترکرد.
(-الشِعْرَ): سەرواکانی هەڵبەستەکەی جیاجیا کرد یەکێك بۆردارو یەکێك سەردار کرد.
(تَقَوَّى): توندیینواندو خۆی بەهێز بوو.
(تَقاوى- القَومُ المَتاعَ بَینَهُم. تَقاوِیاً): نرخی کاڵاکەیان لەســەریەك زۆرکــرد/ زیادکرد تا گەیشتە ئەوپەری نرخی.
(إقْتَوى- الرَجُلُ. إقْتِواءً): توند بوو/ توندیی نواندو بەتوانا بوو.
(-المَتــاعَ): کەلوپەلەکــەی/ کاڵاکــەی کــڕی پــاش ئەوەی نرخی بە مــەزات بەرزکرایەوە (دەڵێــن لە بەهێزەوە هاتووە گوایا نرخەکەی گەیشتۆتە ئەوپەری هێزو بەرزی).
(-الشــيءَ): شــتەکەی بۆ خۆی تەرخانکرد/ تایبەتکرد.
(إسْتَقْوى إسْــتِقواءً): بەهێــز بوو/ قایمبوو/ بەتوانا بوو.

(أَلقُوَّة (ج) قُوّات وقُوىً وقِوَىً): هێز/ توانا/ دەسەڵات.
(- (ج) قُــوىً): ١-تاڵێك لە تاڵەکانی پەتەکە/ گوریسەکە.
(أَلقُوَّة- في الفَلْسَــفَة): ٢-شــتێك ئامادە بێت ببێت، بەڵام ئێستە نەبێت.
(قُوَّةُ عَدَدٍ ما) (ع ح): ئەوە ئەنجامی لێکدانی چەند جارێك ژمارەکەیە لە خۆیو پێیدەڵێن: توان ئەگەر ٧ × ٧ = ٤٩. ئەمە وا دەنوسرێت ٧[٢] دەڵێن حەوت توان دوو. یان ٢ × ٢ ×٢ × ٢ =٢ ×١٦ئەمە وا دەنوسرێت: ٢[٤]. دەڵێن دوو توان چوار کەواتە: قُوةُ عددٍ ما = توانی ژمارەیەك.
(أَلقُوى): ئاوەز/ ئەقڵ.
(أَلقَــوِيّ (ج) أَقْوِیــاء): خاوەنهێــز/ بەهێز/ بەتوانا/ بەدەسەڵات.
(أَلمُقْوِيّ) (فا): بەهێز/ بەکێش/ بەتوانا.
(أَلفَرَسُ المُقْوِي – القَوِيّ): چارەوێی بەهێز/ بەکێش.
(أَلمُقَوّى= الكارتون): مقەبا/ کارتۆن.
٢-(قَــوِيَ. يَقْــوى-تِ الــدارُ قِيّــاً وقَواية): خانووەکە چۆڵبوو.
(-قَوىً): زۆر برسیبوو.
(-المَطَرُ): باران نەباری.
(أَقْوى. إقْواءً): لە بیابانێکی وشــكو برنگدا دابەزی.
أَقْوى: (ضــد): ١-هەژار کــەوت ٢-دەوڵەمەند

بوو/ دارا بوو.
-تِ الـدارُ: دانيشـتووەكانى تێـدا نەمـاو چۆڵبوو.
(-القومُ فنى زادهم): خوێشـگەل توێشوو و خواردنيان نەما.
(-الرَجُل): پياوەكە هاتو هيچى پێنەبوو.
(-البُقْعَةَ): پارچە زەويەكەى چۆڵكرد.
(تَقاوى. تَقاوِياً): بە برسێتيى مايەوە.
(-القَـومُ الدَلـوَ): دەميان بـە دۆلكەكەوە نا هەريەكە چەندى بۆ خورايەوە خواردييەوە.
(بَلَدٌ قاو): شارێكى چۆڵ كەسى تێد نەبوو.
(القاوِيَةُ): ١-مێى وشەى (ألقاوي). ٢-هێلكەكە بۆشبوو (چونكە جووچكەكەى لێدەرهاتووە)
٣-ساڵێكى كەمباران.
(إبلٌ قاوياتٌ): حوشترانێكى برسى.
(ألقَـواءَ (ج) أقْـواء): ١-چۆڵيـىو وشـكيى/ بێناويى زەوى ٢-زەوييەك بارانى لێنەبارىبێت
٣-برسێتى.
(«باتَ القواءَ»): بە برسـێتيى شەوى بەسەر بردوو مايەوە.
(مَنزِلٌ قَواء): ماڵێكى بێهاودەم.
(ألقِواء (ج) أقواء): وشـكو بێناويىو چۆڵيى زەوى.
(ألقَوى): ١-وشـكو بێناويـىو چۆڵيى زەوى ٢-برسێتيى.
(«بـاتَ القَـوى»): بـە برسـێتيى شـەوى بەسەربرد مايەوە.
(ألقَوايه): زەوييەك بارانى لێنەبارىبێت.
(ألقَوايَة والقـيّ): بێناويى وشـكيى زەوىو چۆڵيى.
(ألقَـوَيّ): بچووككـراوەى (قـاوٍ): جووچك (چونكـە هێلكەكـەى لێبۆتـەوەمو هێلكەكـە چۆڵبووە).
(ألتَقاوي) (مص): كەمبوون.
(تَقاوي ألأمطار): بارانكەميى/ كەمبارانى.
(بَلَدٌ مُقْو): ولاَتێكى بێباران.
٣-(قاوى-ەُ مُقاواةً): دايە/ پێبەخشى.
(إقْتَوى- شَـيئاً بَشَـيءٍ إقْتِواءً): شـتێكى بە شتێكيتر گۆڕييەوە.
(ألقاويّ): وەرگر.
٤-(إقْتَـوى- علـى فُلان إقْتِـواءً): گلەيى لە فيسار كرد.
قيأ: (قاءَ. يَقـيءُ ما أكَلَـهُ. قَيْئاً): هەرچى خواردبوو (ڕشانديەوە/ هێنايەوە).
(قائِيءٌ): كەسێكى ڕشاوە.
(-تِ الطَعْنَـةُ الـدَّمَ): تيغلێدانەكـە خوێنى دەرپەڕاند.
(قـاءَتِ الأرضُ الكَمْـأةَ): زەويەكە دومەلاّنى دەرپەڕاند/ دەركرد.
(«قاءَ الرَجُلُ نَفْسَهُ»): گيانى بەدەستەوە داو مرد.
(قَيَّأَ وأقاءَ- فُلاناً ما أكَلَهُ. تَقْيِئَةً وإقاءَةً): فيسارى ڕشاندەوەو چى خواردبوو پێيهێنايەوە.

(تَقَيَّأَ واسْـتَقاءَ. تَقَيُّؤاً واسْتِقاءَةً): هێڵنجیدا ویستی برشێتەوە.

(ألقَیـاء): رشـانەوە/ لـە دەمـەوە خواردن هێنانەوە.

(القیّو وألقَیُوء): کەسێکە زۆر برشێتەوە.

(ألمُقَیِّیء): دەرمانی پێرشانەوە.

قیت: (ألقیتار والقیتارَة (ج) قَیاتِر والقیثار و القیثـارَة (ج) قَیاثـیر) (مـو) یونانیة): گیتار/ تار. ئامێرێکی مۆسیقایە.

قیح: (قاحَ یَقیحُ وقَیَّحَ وأقاحَ وتَقَیَّحَ الجرحُ. قَیْحـاً (طب): برینەکـە کێمیکرد یان کێمو زووخی (لێهاتەدەری/ لەبەر رۆیشت).

(ألقَیح): کێمو زووخ بێخوێن.

قیـد: ١-( قَیْـدَ- الرَجُلُ= قُیِّـدَ): کۆتکرا/ پێوەندکرا/ قاچی بەسترایەوە.

(قَیَّدَ-هُ. تَقییْداً): ١-کۆتـی کردە پێی ٢-رێی لێبەستەوە.

(-هُ بالإحسـانِ): بـە چاکـەو پیاوەتی دڵی لێسەند/ دڵی بە خۆیەوە بەند کرد.

(-الکِتابَ): سـەرو بـۆری بـۆ کتێبەکە یان نووسینەکە کرد.

(-الخَطَّ): نووسینەکەی خاڵبەند کردو سەرو بۆری بۆ کردو ڕێکیخست.

(-الحسابَ): ژمێرەکەی نووسیو تۆماریکرد.

(-الکاتِبُ والمُتَکَلِّمُ): نووسەرەکەو قسەکەرەکە: ئامانـجو نیازیـان بـە روونیـی دەربـڕیو دیاریکـرد پێچەوانەی ئـەوەی بە جۆرێکی رەهایی و گشتیی دەریببڕن.

(تَقَیَّـدَ): ١-کۆتکرا/ پێی بەسـترایەوە ٢-ڕێی لێگیرا ٢-تۆمار کرا ٣-خاڵبەند کرا.

(ألقَیْـد (ج) قُیُود وأقیاد): کۆت یان پەت کە دەکرێتە پێی یان دەسـتی چوارپێ/ پێوەند/ کەلەبچە (بە خـوازە دەوترێت):(فَرَسٌ قَیْدُ الأوابِدِ): ئەسـپێکە بـە خێراییەکەی ڕێ لە دڕندەو شـتی وا دەگرێت/ بەری لێدەگرێتو ناهێڵێت لە دەست سوارەکەی دەرچێت.

(قَیْدُ الأسنان): پووکی دان/ ئەو گۆشتەی بە دەوری داندایە.

(ألقِیاد): هەوسـار/ رەشـمە/ پەتێکە ولاخی پێرادەکێشرێت.

(ألقَیِّد- مِنَ الخیلِ والإبلِ): ئەسپو حوشتری رامکراوو ملدەر.

(ألمُقَیَّـد (مفـع) (ج) مَقاییْد): ١-حوشـترو ولاخی کۆتکراو/بەسـتراوە ٢-شوێنی پاوانەی قاچـی ئافـرەت ٣-شـوێنی پێوەنـدی ولاخو چـارەوێ ٤-شـوێنی پێوەندکردنی حوشـترو بەرەڵاکردنی.

(-مِـنَ الشِّـعرِ): هەڵبەسـتی سـەروادار پێچەوانەی هەڵبەستی ئازاد.

(کِتابٌ مُقَیَّد): نووسنێکی سەروبۆر بۆکراوو خاڵبەندکراو.

٢-(ألقَیْـد والقید والقاد): ١-هێندە/ ئەندازە

٢-ماوە/ ئەوەندە.
**(«بَينَهُما قَيدُ رِمحٍ أو قادُ رِمحٍ»)**: نێوانیان هێندەی درێژیی رمێکە/ نێزەیەکە.
قـیر: **(قَيَّـرَ- الشَّـيءَ)**: قـیری لە شـتەکە تێهەڵسوو.
**(ألقار والقير= زفت)**: قیر/ مادەیەکی رەشـە لە پاپۆرو حوشتری هەڵدەسوون.
**(ألقَيَّار)**: خاوەنقیر/ قیردار.
٢-**(إقتَـارَ- الحَديثَ)**: بۆ فەرمایشـتەکە بۆ ئاخاوتنەکە گەڕاو سۆراغیکردو کۆڵییەوە.
٣-**(القَيُّور)**: رەسەن ناتەواو.
**(«هذا لَقَيَرُ مِن ذلك»)**: ئەمە لەوە تاڵترە.
٤-**(ألقيراط)**: بیسـتو چوار یەکی شـتێك= ١\٢٤.
٥-**(ألقَيرَوان (ج) قَيرَوانات)**: ١-رەوە ئەسـپ ٢-زۆربەی دەستە سەربازێك ٣- کاروان **(مُعَرَّبَة عَن كاروان الفارسـية)** لە کاروانی فارسیەوە وەرگیراوە.
٦-**(القَيرَيُـوس (ن)**: رووەکێکـە لە کۆمەڵەی سـوێرە بنچینـە ئەمەریکاییـە پەلەکانـی لوولەکییە راست خۆی وەك مۆم هەڵدەستێت.
قیس: ١-**(قـاسَ يَقيسُ. قَيْسـاً. قِياسـاً)**: بــە خۆبادانــەوە رۆیشــتو گەنجەفەیەکــی زۆریکرد.
٢-**(قاسَ. يَقيسُ. قَيْساً قِياساً)**: برسیبوو.
٣-**(قـاسَ يَقيسُ- الطَبيبُ قَعْـرَ الجراحَة. قِيْساً)**: پزیشکەکە قووڵیی برینەکەی (پێوا/ گرت).
**(قائِس)**: پێوەر.
**(-الشـيءَ بِغَيرِه أو على غَيرِه)**: شتەکەی بە شتێکیتر پێواو ئەندازە گرت.
**(-هُ. قَيْساً وقِياساً)**: پێشیکەوت.
**(قايَسَ- بَينَ الأمرَين قِياسـاً ومُقايَسَـةً)**: میانەی دوو کاری خەمڵاندو بەراوردیکرد.
**(-الشـيءَ بِكَـذا وإلى كَذا)**: شــتەکەی بەوە ئەندازە کرد.
**(-الرَجُـلَ)**: لە ئەندازەگرتــنو خەمڵاندندا وەك ئەویکرد.
**(-هُ في كَذا)**: لەوەدا بۆریدا.
**(أقاسَ- الشيءَ بِغَيرِه وعَلَيه وإليهِ)**: شتەکەی بەهیــتر پێوا/ لەســەر ئــەو ئەندازەیگرتو بەویپێوا.
**(تَقَيَّسَ)**: ١-وەك خێڵی قەیسی عەیلانیکرد ٢-خۆیکرد بە یەکێکی خێڵی قەیس یان خۆیکرد بە یەکێکی ســەر بەوان بــە (هۆی پەیمانەوە یان هاوسێیەتیەوە یان لایەنگیرییەوە).
**(إنقاسَ)**: پێورا/ ئەندازەیگیرا.
**(إقتاسَ- الشيءَ)**: شتەکەی پێوا.
**(«هوَ يَقتاسُ بِأبيهِ»)**: ئەو پەیڕەویی باوکی دەکات/ لەسەر رێو شوێنی باوکی دەڕوات.
**(ألقــاس والقيــس)**: ١-ئەوەنــدە/ هێنــدە/ ئەندازە ٢-ماوە.

(بَينَهُمــا قاسُ رُمْــحٍ أَو قيْسُ رُمْحٍ): ماوەی نێوانیان هێندەی درێژیی نێزەیەکە.

(أَلقياس) (مص): پێوانە/ ئەندازەگرتن.

(-فِي المَنطِق قولٌ مُرَكَّبٌ من قَضايا إِذا سُــلِّمَ بهــا لَزِمَ عَنها لِذاتِها قَــولٌ آخَر): لە گفتەدا ئەوەیــە. ئاخاوتنێکی یەکگرتــووە لە گەلێك کێشەدا خۆی دەنوێنێت ئەگەر بڕوای پێکراو بــە پێوەر دانراو ســەلێنرا ئەوە وتەو شــتی تــری لێ پەیدادەبێــت وەك(أَلعالَــمُ مُتَغَيِّرٌ وكُلُّ مُتَغَيِّرٍ حــادِثٌ فالعالَم حادِثٌ): جیهان دەگۆڕێتو هەمــوو گۆڕراوێك تازەیە، کەواتە جیهان تازەیە.

(هذا قيــاس ذاك): (ئەمە لە وێنەی ئەوەیە واتا لێکچواندنیان هەیە).

(أَلقَياسِيّ): بە پێی پێوەر/ بە پێی دەستوور/ پێوەرانە.

(أَلقَيَّاس): زۆر پێو/ پێوانەکار.

(أَلمِقيــاس (ج) مَقاييس): ١-بــڕ/ چەندانە ٢-پێوەر/ ئەندازەپێو/ ئامێری پێوان.

٤-(القَيسَرِيّ (ج) قَياسِر وقَياسِرَة): گەورە.

(-مِنَ الإِبل): حوشتری زۆر گەورە.

(قيســارِيَّة): تێکشــکانو گۆڕینــی وشــەی (أَلقَيصَرِيَّة) یە.

(قَيصَــر (ج) قَياصِــرَة): نازنــاوی هەموو شــاکانی ڕۆمــانو بیزەنتیــەکانو ئەڵمــانو ڕوسەکان بوە.

قيص: ١-(قاصَ. يَقيــصُ- البَطنُ. قَيْصاً): سکەکە جوولا.

٢-(قاصَ-تِ السِــنُّ. يَقيصُ. قَيْصاً): دانەکە لە بنەوە هەڵکەنراو کەوت.

(تَقَيَــصَ- الضِرسُ): خرێکــە کەوت یان بە درێژیی لەتبوو.

(-الحائِطُ): دیوارەکە بەلادا هاتو ڕووخا.

(-تِ البئرُ): چاڵاوەکە تەپی.

(إِنقــاصَ- الضِرسُ): خرێکــە کەوت یان بە درێژیی شەقیبرد.

(-الحائِطُ): خواربووەوەو ڕووخا.

(-تِ البئــرُ): چاڵاوەکــە ئــاوی وا زۆر بــوو خەریکبوو بیتەپێنێت.

الملحق:

قَيصَــر: (قَيْصَــر (ج) قَياصِــرَة): نازناوی شــاکانی ڕۆمانو بیزەنتیەکانو ڕوسو ئەڵمان بووە.

(أَلقَيْصَرِيَّة): نەشتەرگەرییەکە کە کۆرپەلەی لە ســکی دایکیــدا پێدەردەهێنرێــت کاتێك منداڵبوونەکە زۆر گراندەبێت.

قيض: ١-(قــاضَ- الشــيءَ يَقيــضُ. قَيْضاً): شتەکەی (قڵیشاند/ هەڵهێنایەوە/ هەڵقڵیشاند).

(-الشيءُ): شتەکە هەڵقڵیشا.

(-تِ السِنُّ): دانەکە جوولا/ لەقبوو.

(-البئرَ): بە بیرەکەدا گەڕا.

(قَيْضَ-تِ البئْرُ): چاڵاوەکە ناوی زۆر بوو.

(تَقَيَّضَ-تِ البَيضَةُ):هێلکەکە شکا.
(-الحائِطُ):دیوارەکە ڕووخاو کەوت.
(-الرُكْبَة أَو السِـنُّ):ئەژنۆکە یان دانەکە بە درێژیی قڵیشیبرد.
(إقتاضَ- الشيءَ):شتەکەی لەبندەرهێنا.
(أَلقَيْض) (مص):توێکڵی وشکی هێلکە.
(أَلقَيضَـــة (ج) قَيْـــض):تەڵەزمێکی بچوکی ئێسقان/ پارچەیەکی بچووکی ئێسقان.
(أَلمَقيض):شوێنی قڵیشان.
(بَيضَةٌ مَقيضَة):هێلکەیەکی درزتێبوو.
(بئـــرٌ مَقيضَـــة):چاڵاوێکـــی فرەئـــاو لـــە سروشتەوە ئاوەکەی زۆر بوو.
٢-(قاضَ. يَقيضُ- الشيءَ بِالشَّيءِ):شتەکەی وەك شتەکەیتر لێکرد.
(-الشيءَ مِنَ الشيءِ):شتەکەی بە شتەکەیتر گۆڕییەوە.
(قايَضَ فُلاناً بِكَذا. قَياضاً ومُقايَضَةً):شـــت بە شتی لەگەڵ فیساردا کردو گۆڕییەوە.
(«بَيع المُقايَضَة»):فرۆشـــتن بە گۆڕینەوەی شت، شت وەرگرتن لە بری شتیتر.
(تَقَيَّضَ- أَباهُ):لە باوکیچوو.
(تَقايَضَ- الرجُـــلانِ. تَقايُضاً):دوو پیاوەکە شـــتیان لەگەڵ یەك گۆڕییـــەوە/ لە بری پارە شتیان بەیەکدا/ شتبەشتیان کرد.
(أَلقَيْـــض والقِيـــاض):هێنـــدەی یەك/ وەك یەك/ وەکو یەك/ هاوتا/ هاوشان/ هاوشێوە.

(«هــذا قَيضُ أَو قِياضُ لِكَــذا»):ئەمە بەو یەکسانەو هێندەی ئەوە/ هاوشێوەیەتی/ وەك ئەوە.
(«هُمــا قَيْضــانٌ»):هەردووکیــان هێندەی یەکین/ یەکسانن/ چونیەکن.
(بَيعُ المقايَضَة):فرۆشتن بە گۆڕینەوە/ شت بە شت کە هاونرخبن.
٣-(قَيَّضَ- اللهُ لَهُ كَذا):خودا ئەوەی بۆ ڕەخساند.
(-اللهُ فُلاناً لِفُلانٍ):خودا فیســـاری بۆ فیسار کەس ڕەخساندو ناردی.
(تَقَيَّضَ- لَهُ كَذا):ئـــەوەی بۆ پەیداو ئامادە بوو بە هۆی ئەوەوە.
٤-(أَلقَيْض والقَيْضَة):نەردێکەگەرمەدەکرێتو دەردی سم یان ئەژنۆی مەڕو بزنو گاو مانگای پێداخدەکرێتو چاردەکرێت.
(نُقـــرَةُ الغَنَـــم):دەردێکـــە دەداتـــە ســـمو ئەژنـــۆی مـــەڕو مانگاو بـــزن وەك لوویەكو هەڵاوساوییەك وەهایە.
قيـــط:» (أَلقيطـــان أَلواحِـــدةُ قيطانَة (ج) قَياطـــين) (عاميـــة):قەیتـــان پەتێکـــە لە ئاوریشـــمو شـــتی وەها تاڵەکانی بەسەریەکدا بادەدرێت.
قيظ: (قاظَ. يَقيظُ- اليَـــومُ قَيْظاً):ئەمڕۆ گەرما تاویسەند.
(قـــاظَ وتَقَيَّظَ واقْتـــاظَ- القَـــومُ بِالمَكانِ): خوێشـــگەل لـــە شـــوێنەکەدا دەمی ســـەختی

گەرماکەیان بەسەربرد.

(قَيَّظَ- القَومُ بالمكان): خوێشگەل لە شوێنەکەدا دەمی سەختی گەرماکەیان بەسەربرد.

(-هُ الشيءُ): شتەکە بەشی قرچەی گەرماکەیکرد.

(قَيَّظوا): بارانی دەمی سەختی گەرما لێیدان.

(قايَظَ-هُ قِياظاً ومُقايَظَةً): ١-پێکە لە شوێنێکدا قرچەی گەرما زۆرەکەیان بەسەربرد ٢-لە قرچەی گەرمادا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد.

(القائظ والقَيْظ): زۆر گەرم/ قرچەی گەرما.

(يَومٌ قائِظ): ڕۆژێکی زۆر گەرم.

(قَيظٌ قائظ): قرچەی گەرمای سەخت و برژین.

(القَيْظ (ج) أقْياظ وقُيُوظ): ١-تیژیی و سەختیی گەرما ٢-قرچەی چلەی هاوین.

(القَيظي): ئەوەی لە گەرمادا بەرهەم هێنرابێت.

(المَقاظ والمَقيظ والمَقيَظ): ئەو شوێنەی کە لە قرچەی گەرمادا تیایدا بمێنیتەوە.

(المَقْيَظة) (ن): گیایەك تا چلەی هاوین بە سەوزی بمێنێتەوە.

قيع: (قاعَ. يَقيعُ الخنزيرُ قَيْعاً): بەرازەکە بۆڕەیهات.

قيف: (قَيَّفَ وتَقَيَّفَ- أثَرَهُ): شوێنپێی هەڵگرت/ دوایکەوت.

(القِيافَة): شوێنپێ هەڵگرتن.

قيق: ١-(قاقَ. يَقيقُ-تِ الدَجاجَةُ. قَيقاً): مریشکەکە گارەگاریکرد.

(القيق (ح) = أبو زُرَيْف): قەلەباچکە: باڵندەیەکە هێندەی کۆترێك دەبێت لە کۆمەڵچەی قەلەڕەشەیە باڵی ڕەش و سپییە کلکی ڕەشە. دەنگەورەیە/ زۆر دەقیڕێنێت.

٢-(ألقيْق): گەوجی هەڵەشە.

(القيقاة والقيقاءَة (ج) قَواق وقَياق وقِيَق): زەوی ڕەقەن.

(قيقِيَةُ البَيْضَةِ): پەردەی ژێر توێکڵە ڕەقەکەی هێلکە.

٣-(ألقَيْقَب): ١-قایشێکە بە دەوری هەردوو قەڵپوزی زینەکەدا دەبەسترێت ٢-ئەو ئاسنەی لە دەمی وڵاخەکەدا دەبێت کە بە لغاوەکەیەوەیە

٣-(ن) نارەوەن/ کەووت درەختێکە زۆر جۆری هەیە گەڵاکەی وەك لەپیدەستە هەندێك جۆری بۆ جوانیی و ڕازاندنەوە لە باخچەکاندا دەروێنرێت بە تایبەتی لە شوێنە گشتیەکاندا لە کەنەدا جۆرێکی هەیە جۆرە شەکرێك دەردەکات کە گرنگیەکی لەو وڵاتەدا هەیە.

(ألقَيْقَب والقَيقَبان): ١-زین ٢-دارێکە زینی لێدروستدەکرێت.

قيل: ١-(قالَ. يَقيلُ. قَيْلاً وقائِلَةً وقَيْلولَةً ومَقالاً ومَقيلاً): لە نیوەڕۆدا نوست/ نیوەڕۆ خەویکرد.

(-قَيْلاً): شيری دۆشیو له نیوەڕۆدا خواردیەوە.

(قَيَّلَ-هُ): له قرچەی گەرمادا ئاو یان شەربەتیدایە.

(«قَيَّلَ فلانٌ») (عامية): له گەرمەی نیوەڕۆدا حەوایەوەو پشوویدا.

(ألقَيُّولَة): گەرمەی نیوەڕۆ.

(أقالَ- الإبِلَ إقالَةً): له نیوەڕۆدا حوشترەکانی ئاودا.

(تَقَيَّلَ): خەوی نیوەڕۆیکرد.

(تَقَيَّلَ-تِ الإبِلُ): حوشترەکان له قرچەی نیوەڕۆدا ئاویانخواردەوە.

(ألقائِل (ج) قَيْل وقُيَّل وقُيَّال): خەوکردووی قرچەی نیوەڕۆ.

(ألقائِلَةُ): ١-مێی وشەی (القائِل) ٢-نیوەڕۆ.

(ألقائِلَةُ و القَيلولَةُ): ١-نوستنی قرچەی نیوەڕۆ ٢-حەسانەوە له نیوەڕۆدا ئەگەرچی خەویشی لەگەڵدا نەبێت.

(ألقَيْل): مێحوشترێك كه له ناوەڕاستی ڕۆژدا/ له نیوەڕۆدا بدۆشرێت.

(ألقَيْل والقَيُول): شیر كه له نیوەڕۆدا بخورێتەوە.

(ألقَيلَةُ والقَيولَة): مێحوشترێك كه له گەرمەی نیوەڕۆدا بدۆشرێت.

(رَجُلٌ قَيَّال): خاوەنی مێحوشترێك كه له نیوەڕۆدا دەدۆشرێت.

(دوحَةٌ مِقْيالٌ): درەختێكی زۆر گەورە كه زۆر له ژێریدا له قرچەی نیوەڕۆدا دەنوون.

ألمَقيل (مص) ١-جێخەوی قرچەی نیوەڕۆ ٢-خەوتن/ نوستن یان حەوانەوە له نیوەڕۆدا.

ألمَقْيَل: جامێكی گەورەی شیردۆشین له نیوەڕۆدا.

٢-(قايَلَ-هُ): لەگەڵیدا گۆڕییەوەو شت بەشتیکرد.

(إقْتالَ- شَيْئاً بِشَيءٍ): شتێكی به شتێكیتر گۆڕییەوە.

٣-(أقالَ- اللهُ عَثْرَتَكَ إقالَةً): ١-خودا هەڵتسێنێتەوەو سەرتخاتەوە/ له تەنگانەكەت ڕزگارتبكات ٢-لێتخۆشبێت.

(الإقالَة في البَيع): هەڵوەشاندنەوەی فرۆشتنەكە.

(أقالَ- البَيعَ): فرۆشتنەكەی هەڵوەشاندەوە.

(-هُ مِن مَنْصَبِهِ) له پلەكەی و كۆمەكەی لایبرد/ دەریكرد/ دەستی له كارەكە كێشایەوە.

(تَقايَلَ- الرجلان البَيعَ): دوو پیاوەكە ڕێككەوتنی فرۆشتنەكەیان هەڵوەشاندنەوە.

(إسْتَقالَ-هُ عَثْرَتَهُ إسْتِقالَةً): داوای لێكرد كه له كەوتنەكەی هەڵیسێنێتەوە.

(-هُ البَيعَ): داوایلێكرد كه سەواو ڕێككەوتنی فرۆشتنەكەیان هەڵوەشێنێتەوە.

(-مِن مَنْصَبِهِ): داوایكرد له كارەكەی بخەن و دەستی له كارەكە بكێشنەوەو وازی لێبهێنێت.

(الإقالَة) (مص): ١-هەڵوەشانەوەی ڕێکەوتن/ پەشیمانبوونەوەی کڕینو فرۆخت ٢ لابردنی خاوەن پایەیـــەك وازپێلێهێنانی خاوەن پایەو پلەیەك.

٤-(تَقَيَّلَ- أباهُ): لە باوکیچوو.

(ألقَيْل): ١-شـــایەکە لە شاکانی حیمیەر کەلە شاکانی پێش خۆی چووە ٢-سەرۆك.

٥-(تَقَيَّلَ- الماءُ): ئاوەکە کۆبووەوە/ مۆڵبوو/ پەنگی خواردەوە.

قين: ١-(قانَ. يَقينُ الحَديدَ قَيْناً): ئاسنەکەی ڕێکوپێککـــرد، گـــەڕانو ســـازیکردو ســـافو ڕاستیکردەوە.

(-الإناءَ): قاپەکەی چاکسازکرد/ چاککردەوە.

(-الشيءَ): شتەکەی گردکردەوە/ کۆکردەوە.

(-تِ المَــرأةُ المَــرأةَ): ژنەکــە ئارایشــتی ژنەکەیتریکردو ڕازاندیەوە.

(-اللهُ فُلانــاً علــى كــذا): خـــودا ئـــەوی وا بەدیهێنا/ لەسەر ئەو شێوەیە دروستیکرد.

(-قَيْنا وقيانَةً): بوو بە ئاسنگەر.

(قَيَّنَ-هُ): ڕازاندیەوەو جوانیکرد.

(-ألقِيانَ): کەنیزەکەکانـــی پەروەردە کرد و بەخێویکردن.

(مُقَيِّن): پەروەردەکارو بەخێوکەر.

(تَقَيَّـــنَ): خـــۆی ئارایشـــتکرد/ جوانکـــردو ڕازاندەوە.

(-النَبتُ): ڕووەکەکە شکۆفەیکرد.

(إقْتــانَ- النَبــتُ إقْتِيانــاً): ڕووەکەکــە شکۆفەیکردو جوانبوو.

(-الرَجُلُ): خۆی تاسولووسداو خۆی ڕازاندەوە.

(-تِ الرَوضَةُ): باخچەکە بەجۆرەهای ڕووەك ڕازایەوەو نەخشا/ باخچەکە خۆی نەخشاند.

(ألقَيْــن (ج) قُيُــون وأقيــان): ١-ئاســنگەر ٢-پیشەساز.

(ألقَيْن (ج) قِيان): کۆیلە.

(ألقَيْنَــةُ (ج) قيــان): ئافرەتــی کۆیلــە/ کەنیزەکی کۆیلە ٢-ژنی گۆرانیبێژ ٣-ئافرەتی ئارایشتکار.

(ألمُقَيِّنَــة):١-مێــی وشــەی (ألمُقَيِّــن)٢-ژنی ئارایشتکار.

٢-(ألقــانُ الواحِدَةُ قانَة) (ن): درەختێکە لە دارەکەی کەوان دروستدەکرێت.

(ألقَينَةُ (ج) قيان): دواترین گرێی بڕبڕاگەی پشت.

# ك

(ك) پیتی بیست‌و دووهه‌مینی ئه‌لفوبێی عه‌ره‌بییه‌و له پیته شارراوه‌كانه. كاف له ژمێره‌ی كۆی پیته‌كاندا (٢٠) بیسته: ل-له دوای كرداره‌وه بێت‌و پێوه‌ی بنووسێت بۆ گوێگره‌و راناوه وه‌ك: (ضَرَبَكَ): لێیدایت (بۆ تاكی نێر).

ضَرَبَكِ) (تاكی مێ): لێیدایت.

(ضَرَبَكُما): له‌ هه‌ردووكتانیدا.

(ضَرَبَكُم): له‌ ئێوه‌یدا (كۆی نێر).

(ضَرَبَكُنَّ): له‌ ئێوه‌یدا (كۆی مێ).

(كِتابُكَ): كتێبی تۆ (تاكی گوێگری نێر).

(كِتابُكِ): كتێبی تۆ (تاكی گوێگری مێ).

(كتابُكما): كتێبی هه‌ردووكتان (بۆ نێرو مێ).

(كِتابُكُم): كتێبی ئێوه (كۆی نێری گوێگر).

(كِتابُكُنَ): كتێبی ئێوه (كۆی مێی گوێگر).

٢-بۆ لێچواندنه (لِلتَشبیه) وه‌ك زیدٌ كالأَسَدِ: زه‌ید وه‌ك شێره.

٣-(للتعلیل): لێكدانه‌وه‌ی هۆ وه‌ك: (اُذكُروا اللهَ كَما هداكُم): خوداتان بێته‌وه یادو ناوی بهێنن چونكه خستوونیه‌ته سه‌ر رێی راست.

٤-(توكید) بۆ جه‌ختكردن لێره‌دا زیاده‌یه وه‌ك: (لَیسَ كَمِثلِهِ شيءٌ= لَیسَ مِثلِهِ شيءٌ*): هیچ شتێك وه‌ك ئه‌و نییه.

٥-ده‌بێته پاشگری ناوی ئاماژ بۆ قسه‌له‌گه‌ڵكردن/ دواندن وه‌ك: (ذلِكَ وتِلكَ): ئه‌وه (بۆ نێربو مێ).

٦-ده‌بێته پاشگری راناوی جیا وه‌ك: (إِیاكَ وإِیاكُما).

٧-ده‌بێته پاشگری ناوی هه‌ندێك ناوی (چاوگ) وه‌ك: (رُوَیدَك): له‌سه‌رخۆبه.

كاَب: ١-(كَئِبَ. كَأْباً وكَأْبَةً وكَآبَةً): دڵته‌نگبوو/ دڵگیر بوو خه‌فه‌تبار بوو/ دڵشكستبوو/ ماته‌مینی دایگرت/ په‌ستبوو.

(كَئِــب وكَئيــب): دڵتەنــگ/ خەفەتبــار/ دڵشکست/ خەمبار/ مەلوول.

(«أرضٌ كئيبَـــةُ الوَجــه»): زەوییەکــی ڕەشــداگەڕاو (ئەمــە بە خــوازە وا دەوترێت وەك ڕووی خەفەتبار چۆن ڕەشــهەڵدەگەڕێت خاکێکی خەفەتهێن.

(أَكْأَبَ- الرَجُــلُ): پیاوەکە پــەژارە دایگرت/ خەفەتیخوارد.

(-الرَجُــلَ): پیاوەکــەی خەفەتبارکــرد/ داخیدایە/ جەخاری کردە دڵیەوە.

(إكتَأَبَ= كَئِبَ): خەفەت دایگرت/ داخیخوارد/ ماتو مەلوولبوو/ پەستو دڵتەنگبوو.

(الكَأباء): پەژارەیگران/ ســوێی سەختی دڵ/ خەفەتی قورس.

(إمْــرَأَةٌ كَأْبــاء): ئافرەتێکــی (ســوێ لەدڵ/ خەفەتبارو دڵشکست).

(«ماأَكْأَبَهُ»): ئای کە دڵتەنگو خەفەتبارە.

(أَلمُكْتَئِــب): ١-خەفەتهێــن ٢ پەژارەداگرتوو/ خەمناك/ خەمۆك.

(«رمــادٌ مُكتَئِب اللــون»): خۆڵەمێشــێکی ڕەشداگەڕاو.

٢-(أكأَبَ- الرَجُــلُ): پیاوەکــە خەفــەت (دایرزانــد/ پەرێشــانیکرد) پەژارەداربــوو/ کەوتە شکستەوە.

كأج: (كَأَجَ- الرَجُــلُ كَأْجــاً): پیاوەکە تەواو گەوجبوو.

(أَلكِئاج): گەوجیی‌و قسەبۆنەهاتن.

كأد: (كَأَدَ. كَأْداً): دڵتەنگبــوو/ پــەژارە دایگرت.

(تَكَأَّدَ وتَكاءَدَ الأَمرُ فُلاناً): کارەکە/ لە فیسار چووە بەست، بۆ یگرانبوو.

(-الأَمْــرَ): ســەختیی‌و گرانیــی کارەکــەی چەشتو خۆی لەبەردا گرت.

(إكْوَأَدَّ- الشَيْخُ): پیرەکە لە پیریدا لەرزی.

(أَلكَأْداء): ١-خەفەتو پەرێشانی‌و نارەحەتیی ٢-پەســتیی/ ماتەمینی/ پەژارە ٣-سڵکردنەوە ٤-شەوی زۆر تاریكو تنۆك.

(عَقَبَــةٌ كَأْداء وكَــؤُود): کۆســپێکی گەورەو گــران/ قۆرتێکــی ســەخت کە ســەرکەوتن بەسەریدا پشووبڕ بێت.

(أَلكَــؤْداء= الصُعَداء): هەناسەهەڵکێشــانێکی توندو درێژی پەژارە یان ماندوێتی.

كأس: (أَلــكَأْس (ج) كُــؤوس وأَكــؤُس وكَأْســات وكِئاس): ١-جام/ کاسە (مێیە). کە پێیدەخۆنەوە ٢-مەی.

(كاس وكَأْسُ الزَهرَة) (ز): کاســەی گوڵ. لە بەشی دەرەوەی گوڵەکەیە، بەرگی گوڵەکەیە. لە چەند پارچەیەکی لێکجیا یان پێکەوەنووساو پەیدادەبێت بە زۆریش ڕەنگسەوزە.

(أَلكَأْسَةُ): کاسە/ جام بۆ پێخواردنەوە.

(أَلكَأْسِيَّة): بەشێکی کاسەی گوڵە.

(كَأْســيَّةُ النَور) (ن): دەومنێکە بۆنی خۆشە

شـوێنە بنەڕەتەکەی ئەمەریکای باکوور بووە بۆ ڕازاندنەوەو جوانکردن دەروێنرێت.

(کاسـیات النـور) (ن): کۆمەڵـە ڕووەکێکن کە دوو لەپـن کۆمەڵە دەومنێکی بۆنخۆشـی بۆنعەترین.

کاص: (کَأَصَ-هُ کَأْصاً): سەرشۆڕیکردو بەزاندی.

(-الشـيءَ): شـتەکەی زۆر خوارد یـان زۆر خواردەوە.

(«کَأْصنا عِندَهُ مِنَ الطعام ماشِـئْنا»): هەتا توانیمان لەلای خواردنمانخوارد.

کَأك: (کَأْکَأَ. کَأْکَأَةً): بێتوانایی‌و ترسـنۆکیی نواندو پاشگەزبووەوە.

(تَـکَـأْکَـأَ): زیـرمیـکـردو پاشەکشەیکردو پەشیمانبووەوە.

(-فِي کَلامِهِ): لە قسەدا دەمی تێکەڵوپێکەڵ بوو.

(اَلـکَأْکَاء): ١-ترسـنۆکییەکی زۆر تۆقیوانــە ٢ ڕاکردنی دز کاتی هەڵاتنی.

٢-(تَکَأْکَأَ- القَومُ): خوێشگەل خڕبوونەوە.

٣-(اَلْمُتَکَأْکِيءُ): مرۆڤی کورتەبنە/ خڕەکە.

کأل: (کَأَلَ. کَأْلاً وکَأْلَـةً وکُـؤُولاً): وامێکـی خۆی لای کەسێك بە وامی ئەم لای کەسێکیتر گۆڕییەوە (لە فرۆشتن یان کڕیندا).

کأن: (کَأَنَ- الرَجُلُ کَأْناً): کابرا توند بوو.

(کَأَنَّ): بــە چەند واتایەك دێت١-التَشـبیه: وەکو/ هەروەکــو/ بۆلێچواندنەو بە زۆری بۆ ئەوە دێت.

(کَأَنَّ زَیْداً أَسَـدٌ»): هەروەکو زەید شێر بێت وەهایە ٢-اَلشك والظن: بۆ گومانو بۆچوون.

(کَأَنَّ زَیــداً قائِمٌ): لاموایــە/ وا دەزانم زەید هەستاوە/ هەروەکو زەید هەستابێت.

٣-اَلتَقریب: بۆ نزیککردنەوە.

(کَأَنَّــكَ بالشِّـتاء مُقبِــلٌ): وەکـو زسـتان نزیکبووبێتەوە وایە.

(کَأَنِّي بِكَ تَنحَطُّ): وەك بڵێیت تۆ پەکتکەوتوە تۆ وەهایت(کاف) و(باء) لە ڕستەی یەکەمداو (باء ویاء) لە ڕستەی دووەمدا زیادن.

کأی: کَأَی. یَــکْأَی- الرَجُــلُ کَأْیاً): بە قسـە (ئازاریدا/ ژانی بردە دڵیەوە).

(أَکْأَی عَنهُ): ڕقی لێبووەوە.

(کَأَیِّنْ أَو کَأَيٍّ): (وشەیەکی لێکدراوە لە(ك)ی لێچوانــدنو(أيّ) کە بۆ واتای زۆرکردن وەکو (کَکَمْ): )کَأَيٍّ رَجُلاً رأیتُ): ئای کە پیاوم دی واتا: پیاوێکی زۆرمەی یان(بۆ پرسیــار دێت کە ئەمەیان دەگمەنە) وەکو (کَأَيٍّ تَقْرَأُ سورة الأَحــزاب): چەنــد جار ســوورەتی ئەحزاب دەخوێنیتــەوە؟ وەڵامیدایەوە: ســیو حەوت جار.

کبّ: ١-(کَبَّ الإِناءَ کَبّاً): قاپەکەی (سەرەوژێر کرد/ قلپیکردەوە/ هەڵگێڕایەوە).

(-الرَجُلَ علی وَجهِهِ ولِوَجهِهِ): پیاوەکەی بە زەویدا داو بەدەمدا خستی.

(-الشيءُ): شتەکە قورسبوو.

(كَبَّ): كەبابیکرد/ کەبابی لێدا.
(أَكَبَّ- فُلاناً): فیساری دا بەزەویدا.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە بە زەویدا کەوت.
(تَكَبَّـبَ-تِ الإِبِـلُ): حوشـترەکان بـە هۆی نەخۆشییەوە یان شتێترەوە بەزەویدا کەوتن.
(أَلكُبَّةُ (ج) كُبَب): قورسایی.
(«أَلقـى علیـه كُبَّتَـهُ»): قورسـایی خۆی بەسەردا دا.
(أَلكَباب) (ط): کەباب.
(أَلمِكَبّ والمِكْباب): کەسێکە زۆر سەر بۆ زەوی شۆربکاتەوەو تەماشای زەوی بکات.
٢-(كَـبَّ- الغَزلَ كَبّـاً): ریسـەکەی کرد بە گوڵۆڵە.
(أَلكُبَبْ): گوڵۆڵەی موو و خوریو شتیتر.
(أَكَبَّ- على العِلم وغيرِه): روویکردە زانستو شـتیترو بەدڵ (پێـوەی خەریکبوو/ خۆی بۆ تەرخانکرد).
(-عَلَيهِ): رووپتێکردو کەوتە پاراستنی.
(تَكَبَّـبَ): خـۆی لەبەرگەکەیـەوە (ئاڵاند/ پێچایەوە).
(-الرَملُ أَوِ الشَـجَرُ): لمەکـە یان درەختەکە (بەیەکداچوو/ لوولیخوارد/ گرمۆڵەبوو).
(تَكَّابَ- القَومُ على الشيءِ): خوێشگەل لەسەر شتەکە کۆمەڵەیانبەست.
(إِنْكَـبَّ- علـى أَمـر): خـۆی بەکارێکـەوە بەستەوە.

(أَلكُبَّـةُ (ج) كُبَـب): ١-حوشـتری کەتـە/ زل ٢-رەوە ئەسـپ ٣-دژواریـیو نارەحەتـی ٤-بەیەکدادانی دوو ئەسـپ ٥-پەلامارو هێرش لە جەنگدا.
(«كانَت لَهُم كُبَّةٌ في الحَربِ»): لە جەنگەکەدا (قریومیانبووو پەلامالاریاندەدا/ نەعرەتەیان لێدەدا ٦- (ط) کوبەو کفتەی ساوەر لە گۆشتو سـاوەر تێکەڵدەکرێـنو پێکـەوە دەکوترێن سووردەکرێتەوەو دەکوڵێنرێت (عامیە).
(كُبَّةُ الغَزلِ أَو الخُيوطِ): گوڵۆڵە بەنو خوری رێسراو یان کلافە دەزووی لوولکراو.
(كُبَّـةُ الحِيلَة) (ط) (عامية): کوبەو کفتەی ساوەر بە بێگۆشت.
(أَلكَبَّـةُ):١-دەسـتە خەڵکێـك ٢ نارەحەتییو دژواریی ٣-بەیەکدادانی دوو ئەسپ ٤-پەلاماردان لە شەردا/ لە جەنگدا.
(كانَـت لَهُم كَبَّةٌ): لە جەنگـدا نەعرەتەو قریومیـان بەرز بـوو. نەعرەتـەو قریومیان بەرز بوو.
(كَبَّةُ الشِّتاءِ): سەختیو تەنگیی زستان.
(كَبَّةُ النَّارِ): گرو نێڵەی ئاگر/ زووربەی.
(أَلكُباب): ١-قـوری یەکگرتووی رەقبوو ٢-لی کۆمەڵەبـووی بەیەکداچوو ٣-رانە مەرو رەوە حوشتر.
أَلمِكَبّ (ج) مِكَبَّات ومَكَابّ): خلخۆکە/ بەکرە کە دەزوو و رێسراوی لەسەر هەڵدەکەن.

٣-(اَلكُبُّ) (ن): ترشۆكە جۆرە گیایەكی ترشە.

٤-(كَبْكَبَ- الشيءَ. كَبْكَبَةً وكِبْكِبَةً): شتەكەی (هەڵگێـرو داگێر كـردو دایبەسـەریەكدا)و كوتای بە زەویدا ٢-بە حەوادا هەڵیدا.

(-المَواشيَ الشـارِدَةَ): ئاژەڵە (پەرەوازەكانی/ بڵاوەكانی) كۆكردەوە.

(تَكَبْكَبَ- القَومُ): خوێشـگەل خربوونەوە/ گردبوونەوە/ كۆبوونەوە.

(-في ثِيابِـهِ): خـۆی لـە بەرگەكەیـەوە (پێچایەوە/ ئاڵاند).

(اَلكُباكِب (ج) كَباكِب. والكُبْكُب): كۆمەڵگای خەڵكی.

(اَلكَبكَب والكَبْكِب): جۆرە یارییەكە.

(اَلكَبْكَبَـةُ والكُبْكُبَـةُ والكِبْكِبَـةُ والكَبْكوب والكَبْكوبَة): كۆمەڵە خەڵكێك شانیان دابێتە شانی یەك و یەكیانگرتبێت یان ڕەوە ئەسپێكی تێكرژاو.

(اَلكَبْكُوب (ج) كَباكِيـب) (عامية): گوڵۆڵە بەن یـان گوڵۆڵە دەزوو كـە تۆپەڵە كرابێت وەك تۆپێكی لێكرابێت.

كبـت: ١-(كَبَـتَ-هُ. كَبْتـاً): ١-دایبەزەویدا/ خستی.

(«كَبَتَـهُ لِوَجهِهِ»): ١-بە دەمـدا بە زەویدادا ٢-فەوتاندی/ مراندی ٣-ڕسوایكرد/ ئابڕوویبرد ٤-دەستی پێوەنا ٥-شكاندی ٦-سەری پێشۆڕكردو زەبوونیكرد.

(«كَبَـتَ اللهُ العَدوَّ»): خودا دوژمنی ڕسـواو سەرشـۆڕو زەبوونكرد ٦-بە داخـی خۆیەوە تلاندیەوە.

(«كَبَـتَ فُـلانٌ غَيْظَهُ في جَوفِهِ»): فیسـار ڕقەكەی خۆی خـواردەوە/ ڕقەكەی پەچنیە دڵیەوە.

(اِنْكَبَـتَ): ١-بـە زەویـدا درا ٢-شكسـتیهێنا ٣-سەرشۆڕبوو.

(اَلمُكْتَبِت): دڵپڕ لە (داخ/ جەخار).

٢-(اَلكَبُّوت (فرنسـية) = مِعْطَف): قاپووت/ پاڵتۆ/ ساقۆ.

كبـث: (كَبِـثَ- اللَّحْـمُ. كَبْثاً): گۆشـتەكە بۆگەنبوو.

(كَبيث ومَكْبُوث):گۆشتی بۆگەنبوو.

(كَبَّثَ- السَفينَةَ): ١-پاپۆڕەكەی بەلای زەویدا لاركردەوە ٢-بـاری پاپۆڕەكەی بۆ پاپۆڕێكیتر گواستەوە.

كبـح: (١-كَبَـحَ- الدابَّـةَ باللِّجـامِ. كَبْحاً): وڵاخەكـەی (جڵەوگـیر كـرد، دایمركانـد/ ڕایگرت).

(-هُ عَـنِ الحاجَةِ): بـەری پێویسـتیەكەی لێگرت و بۆی جێبەجێنەكرد.

(-هُ بالسَّيفِ): بە شمشێر لێیدا.

(-الحـائِطَ السَّـهمَ): تیرەكە بـە دیوارەكەدا نەچـو و بەربـووەوە/ دیوارەكـە تیرەكـەی گێڕایەوە.

(أَكْبَـــحَ- الدابَّـــةَ باللِّجـــام): ولاخەكـــەی بە جڵەوەكـــەی (جڵەوگـــیر كـــردو وەســـتاندی/ دامركاند).

٢-(كابَحَ-ەُ. مُكابَحَةً): شەڕە جنێوی لەگەڵدا كردو یەكتریان ناشیرینكرد.

٣-(أُكْبِـــحَ- المَـــكانُ): شـــوێنەكە بـــەرزو فووچبوو.

(مُكْبَح ومُكَبَّح): شوێنی بڵندو فووچ.

٤-(أَلكابِـــح (ج) كَوابِح): ئەوەی بەرەو رووت دێتو لێی دەسڵەمیتەوەو خۆتی لێلادەدەیت وەكو سابرێنو لەو بابەتە.

(بَعيرٌ أَكبَح): حوشـــترێكی چەمووش/ توند/ سەركەش.

الملحق:

كبـــح: (الكابِحَـــة): راگـــری ئوتومبیـــل یان شـــەمەنەفەر/ نیســـتۆپ. ئامێرێكـــە لـــە ئوتومبیلو شەمەنەفەردایەو هێواشیدەكاتەوە یان رایدەگرێت.

---

كبد: ١-(كَبَدَ-ەُ. كَبْداً): كێشای بە جگەریدا.

(-الأَمْرَ): نیازی ئەنجامدانی كارەكەیكرد.

(كَبِـــدَ وكُبِـــدَ. كَبَـــداً): هـــاواری ئـــازاری جگەریكرد.

(مَكْبُـــود): دەردە جگەریبـــوو/ دەردە جگەر گرتوو.

(كَبَّـــدَ-تِ الشَّـــمسُ السَّـــماءَ): خـــۆر هاتـــە ناوەڕاســـتی ئاســـمان/ لە ناوەڕاستی ئاسماندا بوو/ هاتە جەرگەی ئاسمان.

(تَكَبَّدَ- اللَّبَنُ): شیرەكە وا مەیی وەك جەرگی لێهات.

(-الأَمرَ): نیازی ئەنجامدانی كارەكەیكرد.

(-الفَلاةَ): نیازی بیابانو ناوەڕاســـتو بەشی زۆریكـــرد/ ڕوویكردە جەرگەو بەشـــی زۆری بیابانەكە.

(-المَكانَ): لە ناوەڕاستی شوێنەكەدا بوو.

(-تِ الشَمسُ السَّماءَ): خۆر ڕۆیشتە ناوەڕاستی ئاسمان/ لە ناوەڕاستی ئاسماندا بوو.

(سودُ الأكباد): دوژمنانی دڵڕەش.

(الكَبْـــد (ج) أكباد وكُبُود مِـــن الآمعاء) (ع ا): جگـــەر ئەندامێكـــی لەشـــە ئەكەوێتـــە لای چەپـــەوە، زراو دەڕژێنێتـــە ســـەر خـــواردن (دەكرێتە نێرو مێ).

(الكِبِدُ- مِنَ السماءِ): ناوەڕاستی ئاسمان.

(الكَبِـــد (ج) أكبـــاد وكُبُود):١-لا/ تەنیشـــت ٢-هەموو هەنـــاو. ٣-(ناوەڕاســـتی/ ناوەندی) خەرگەی شت. ٤-بەشـــی زۆری شت/ زوربەی شت.

(-من الأمعـــاء) (ع أ): جگەر (دەكرێتە مێو نێر).

(كَبِـــدُ لررض): ناوســـكی زەوی كە كانەكانی تێدایە وەك زێرو زیوو هیتر.

(أكبـــاد وكُبُـــود مِن الأمعـــاء) (ع أ): جگەر: ئەندامێكە لەلای چەپدایـــەو زراوی پێوەیە،

كە مادەی زراو دەرژێنێتە سـەر خواردن (بە مێو نێر) دەكرێت.
(كَبِدُ القَوسِ): ناوەڕاستی كەوان.
(ألكَبَــد): ١ـبەشــی هــەرە زۆری هەنــاو ٢ـ ناوەڕاستی لم.
(-مِنَ السَّماءِ): ناوەڕاستی ئاسمان.
(ألكَبْدَةُ): جارێك دەردە جگەر گرتن.
(ألكُباد): (ئازاری/ ژانی) جگەر.
(ألأكْبَــد (م) كَبــداء (ج) كُبْد): ١ـكەســێكە جگەری گەورە بێت ٢ كەســێكە جێ جگەری بەرز بێت ٣ـناوەڕاست ئەستوور ٤ـسستەپێ ٥ـ (ح) باڵندەیەكە.
(ألكَبْداء): ١ـكۆمەڵە لمێكی ناوەڕاست ئەستوور ٢ـكەوانێك كە دەسكەكەی پڕ بە مشتبێت.
(ألكَبْداء والكُبَيداء والكُبيْداة- مِنَ السَّــماء): ناوەندی/ ناوەڕاستی ئاسمان.
(ألكَبَدِيَّــة ) (ن): قەوزە جــەرگ. ڕووەكێكە گوڵشــاردراوەیە لە قەوزە دەچێت لە شوێنی شــێداردا دەڕێ بە شــێوەی پەڵەپەڵەی سەوز خۆی دەنوێنێت گوڵ سەریدەكەوێت كە وەك قارچكە كە خۆریشــی لێیدەدات ڕەنگجەرگیی دەنوێنێت.
٢-(كَبَدَ- البَردُ- القَومَ. كَبْداً): سەرما زۆری بۆ خوێشگەل هێناو تەنگی پێهەڵچنین.
(كابَدَ- الأمــرَ كِباداً ومُكابَــدَةً): بۆ كارەكە تووشــی ماندوێتییەكــی زۆر بــوو ڕەنجێكی زۆریداو لەگەڵیدا بەكێشبوو.
(-المُســافِرُ اللَّيلَةَ): گوزاركارەكە ســەختییو نارەحەتیی شەوی چەشتو بەرگەیگرت.
(ألكابِد) (فا): ڕەنجدەرو خۆراگری سەختیی.
المكابَــدَة: گیرۆدەیی چەشــتنی نارەحەتییو سەختیی.
(ألكَبَد): ١ـدەردیســەریی/ نارەحەتیی ڕەنجو ماندووبوون/ چەشتنی (سەختییو دژواریی) تەنگانە/ گیرۆدەیی.
(ألكَبْداء): دەستار (لەبەر گرانیی كارپێكردنی).
٣-(ألكَبَد): هەوا/ با.
(ألكَبْدَةُ): مووڕووی خۆشەویستیی.
(ألكَبَّــاد) (ن): ترنــج. (الأتــرج) (عامية): ترنج.
كبر: ١-(كَبَرَ- فُلاناً بِالسِــنِّ. كَبْراً): لە فیسار بە تەمەنتربوو.
(كَبِرَ- فِي السِــنِّ. كِبَراً ومَكبِــراً): پیر بوو/ بەساڵدا چوو.
(كَبُرَ- فِي القَدْرِ. كِبَراً و كُبْراً وكُبارَةً): ١ـپایەو ڕێز بڵند بوو ٢-(كەتە/ زلە/ لەشگەورە) بوو.
(كَبير وكُبَّار وكُبار): ١ـگەورە، كەتە، زلە ٢ـمەزن/ شكۆمەند/ بەڕێز، پایەدار.
(كَبُرَ-عليــه الأمــرُ): كارەكەی بــۆ دژوار/ سەخت/ نارەحەتبوو/ بە گیروگرفتبوو.
(كَبَّرَ. تَكبــيراً وكُبَّاراً): وتی «ألله اكبر» واتە خودا گەورەیە/ الله اكبری كرد.

(-الشَيءَ): شتەکەی (زلکرد/ گەورەکرد).

(کابَـرَ-هُ): ١-کەللەرەقیـی لەگەڵـدا کـرد، بەربەرەکانێیکرد/ ململانێی لەگەڵدا کرد.

(-هُ علـی حَقِّـهِ): پێـی لـە (هەقەکـەی/ مافەکەی) نە ناو نکوڵیی لێکرد.

(کُوبِرَ- الرَجُلُ فِي مالِهِ): بە زۆر ماڵی پیاوەکە (داگیرکرا/ و زەوتکرا).

(مُکابَرٌ عَلَيهِ): ماڵ لێداگیرکراو/ تالآنکراو.

(أکْبَـرَ- الأَمرَ): کارەکەی (بـە گەورە گرت/ مەزن هاتە بەرچاو).

(أکبَرَ-الرَجُلَ):١-پیاوەکەی بە گەورەو بەرێز دانا ٢-مەزنیکرد.

(تَکَبَّـرَ): فیزی نواند/ خۆی بە خاوەن پایەو رێز دانا یان بە تەمەنگەورە دانا.

(إِسْـتَکبَرَ): بەفیزو دەعیە بـوو/ لووتبەرز بوو.

(-الأَمْـرَ): کارەکەی بە گـەورە هاتە بەرچاو یان بە گەورەی دانا.

(ألکابِر):١-مەزن/ گەورە ٢-باپیرە هەرە گەورە ٣-پایە بڵندو شکۆدار ٤-سەردار.

(ألکُبْـرِ):١- (زۆربـەی/ زۆرینەی) شـتەکە ٢-سەروەریی‌و پایەداری.

(«هوَ کُبْرُهُــم وکُبَّرُهُــم وکُبُرَتُهُم»): ئەو سـەروەری هەموانـەو لـە رەچەڵەکـەدا لە هەمووان لە پێشـترو نزیکـترە (لێرەدا تاك‌و کۆو نێرو مێ وەك یەکە).

(ألکِبْـرِ): ١-زۆربـەی شـت ٢-سـەروەری‌و پایەداریی ٣ سـتەمکردن ٤-گوناهی گەورە ٥-کفرکردن‌و هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن.

(ألکِبَـر والکَبْرَة): تەمەنزۆریـی/ گەورەیی تەمەن.

(«عَلاهُ الکِبَـرُ أو عَلَتْهُ کَبْرَةٌ»): تەمەنی زۆر بوو/ پیر بوو.

(ألکِبْـرَةُ = الکِبَـر): ١-تەمەنزۆریـی/ تەمەنگەورەیی ٢-گوناهی گەورە.

(«هُوَ کِبَرتُهُم»): ئەو سـەری گەورەیانەو بە رەچەڵەك لە هەموان لە پێشترو نزیکترە.

(«فـلان کِـبرَةُ وَلَدِ أَبیـهِ»): فیسـار کوڕە بچکۆڵەی باوکیەتی/ پاشە بەرەیەو لە هەموان زۆرتر لەبەر دڵدایە.

**(لێرەدا نێرومێ‌تاك‌کۆیەکیەکە).**

(أَلکُبـار والکُبّـار): گـەورە/ مـەزن/ ئاغا/ سەروەر.

(ألکَبیر): لـە ناوە پیرۆزەکانی خودایە (-(ج) کِبار وکُبَراء):١-گەورە (پێچەوانەی بچووك) ٢-مامۆستا، وەستا، سەرۆك.

(ألکَبیرَةُ (ج) کَبیرات وکَبائِر):١-مێی وشەی (الکَبیر)٢-گوناهی گەورە.

(ألأَکْبَر (ج) أکابِـر وأکْبَرون): گەورەترین/ مەزنترین/ پایەدارترین.

(«ألأَکْبَر والأَصغَر»): گەورەترین‌و بچووکترین.

(«أَتانـي فُلان أکبَرَ النَّهارِ»): فیسـار کاتێك

هاتە لام کە خۆر بەرز بووبووەوە.
(أَكابِرُ- القَومِ): پیاوە (ماقوڵانی، سەردارانی، مەزنانی) خوێشگەل.
(أَلكُبْــرى (ج) كُبَر وكُبْرِيات): مێی وشــەی (الأكبر).
(«هذه الجارِيَةُ مِن كُبْرى بناتِ فُلان»): ئەم كچە لە كچە گەورەكانی فیسار كەسە.
(أَلكِبرِياء): مەزنییو لووتبەرزییو ستەمكاریی.
(أَلمَكْبِر والمَكْبَرَةُ والمَكْبُرَةُ): بە ســاڵداچوون/ تەمەنگەورەیی.
(أَلمُكَبِّرَة) (ف): زەرەبین/ گەورەكەر/ گەردبین.
(أَلمَكْبُــوراء): ١-گەورە ٢-مامۆســتا، وەســتا/ پیاوماقوڵان.
٢-(أَلكَبَــر (ج) كِبــار وأَكبار) (فارســية): تەپڵ.
(أَلكَبَر أَو الأَصَف) (ن): (یونانیە) (ن) شیفە لەتــە دەوەنێكی دڕكاوییــە گوڵەكانی جوانو سپین. لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. لەوە هەیە گوڵو بەرەكەی دەكرێتە ترشیات وەك شتێكی بەهاراتییو بۆ هەرســیش باشــەو بەكاردێت خەڵكــە رەشــۆكەكە پێیدەڵێــن (أَلكُبّــار) (یونانیة).
(أَلكُبران (ج) كَبارين) (عامیة): بەرگێكە تا ناوقەد لەسەر بەر كۆشەوە لەبەر دەكرێت.
(أَلإِكْبِر والأَكْبَر): شتێكە وەك خورماو ڕۆنی وشــكەوەبوو. نە مێــوە نــە هەنگوینە. زۆر شــیرینیش نییە هەنگ دروستی دەكات وەك چۆن مێو درووست دەكات.
٣-(كَبْــرَتَ- الشــيءَ): بە گۆگرد ســواغیدا/ گۆگردی تێهەڵسوو.
(أَلكِبْرِيــت) (ك): گۆگرد مادەیەكی كانزاییە رەنــگ زەردە. زوو گڕدەگرێــت ٢-مرواریــی سوور ٣-زێڕی سوور.
(«ذَهَبٌ كِبريت أَو فِضَّةُ كِبْرِيت»): گۆگردێكی پوختە.
الملحق:
كبر: (أَلتَّكبير): ١-گەورەكردن یان فراوانكردن.
(«تَكْبِيرُ البَيت») گەورەكردن یان فراوانكردنی خانــوو ٢-بەهێزكــردنو تۆكمەكردنی شــت ٣-زلو قەبەكردنی شت.
(«تكبيرُ الصَوت»): گەورەكردنی دەنگ.
(أَلتَكبير): ئەڵلاهو ئەكبەر كردن.
(أَلتَكبير): كار گەورەو زلكــردنو زیادەڕەویی كردن تیایدا.
(«تَكبيــرُ المُصيبَــة»): گەورەكردنــی وەیو جوورتوم.
(أَلتكبيــر) (ف): زۆر گەورەكردنــی شــت/ قەبارەپێدانی.
(«التَكبير بواســطه المِجْهَــر»): بە زەرەبین شت زۆر گەورەكردن/ قەبارەپێدانی.

---

كبس: ١-(كَبَسَ- البِئرَ كَبْسا): چاڵاوەكەی بە گڵ پڕكردەوە.

(-رَأْسَـهُ في الثَّوب): سـەری بە کراسەکەیدا کرد.
(-القَومُ دارَهُ): خوێشگەل لە ناکاودا هێرشیان بردە سەر خانووەکەی.
(-الناصيَـةُ جَبْهَتَـهُ): قـژی/ ناوچەوانی/ رووی داگرت.
(-اللفتَ ونَحْوَهُ في الخَلِّ): شـێلمو شـتیتری کردە سرکەکەوە تا ترشبێت.
(كَبيس ومَكْبوس (ج) مكابيس) (عامية): شتی ناو سـرکە. خەیار یان هەر شتێکیتر کە دەخرێتە سرکەو ترشیاتەوە.
(كَبَّسَ- على الشيءِ): شتەکەی پەستاوت.
(تَكَبَّسَ- الرَجُلُ): سـەری بە کراسـەکەیدا کرد.
(-على الشيءِ): شتەکەی پەستاوت.
(تَكَبَّسَ وانكَبَسَ- النَهْرُ أو البئرُ): رووبارەکە یان چاڵاوەکە بە خۆڵو لیتەو قوڕ پڕبووەوە.
(ألكابِسَةُ): مێی وشەی(الكابِس).
(ناصِيَـةٌ كابِسَـةٌ): پەرچەمی شـۆڕەوەبوو بەسەر ناوچەواندا.
(أرْنَبَةٌ كابِسَةٌ): پەڕەکەیلووتی شۆڕەوەبوو بۆ لچ.
(ألكِبْـس): ١-خۆڵ کە بیری پـێ پڕبکرێتەوە ٢-خانووی بە قوڕو گڵ دروسـتکراو/ خانووی قوڕ/ گڵین ٣-ئەشکەوتی دامێنی چیا.
(ألكَبْسَـةُ): پەلاماردانی ناکاو/ بەسەردادان/ شەبەیخوونکردن.
(ألكَبّاس): کەسـێك سـەر بە پۆشـاکەکەیدا بکاتو بخەوێت.
(ألكَبيس): لوولەی خشڵ کە ناوەکەی لە بۆنی خۆش دەئاخنرێتو چەسپدەکرێت.
(ألكَابيس): ١-کەسـانێکن کە لە ناکاو بەسەر ماڵاندا دەدەنو بە گیریاندەهێنن ٢-کەسانێکن کە خانوو سواغدەدەن.
(ألمُكَبِّس) (فا): ١-گوشەر ٢-پەستێو ٣-کەسێکە کـە هەڵبکوتێتـە سـەر خەڵـكو بـە گیری بهێنێت.
٢-(كَبَسَ- على الشـيءِ. كَبْساً) (سريانية): شتەکەی پەستاوت/ فشاری خستەسەر دەستی پێدانا.
(كَبَّسَ- الجَسَـدَ): لەشەکەیشێلاو نەرمکرد/ دەستی پێداهێنا.
(-المُهْرَ) (عامية): جوانووەکەی ڕامکرد.
(-الثَورَ): گاکەی ڕامکردو فێری جووتکردنیکرد.
(الكابـوس): مێردەزمـە/ مۆتەکـە، کە لە خەودا سـواری مرۆڤدەبێت وەك بیخنکێنێت هەناسەی ئەو کەسە توند دەبێت.
(ألمِكْبَـس (ج) مكابِـس والمكبـاس (ج) مكابيس): مەنگەنە/ ئامێرێکە بۆ پەستاوتنی خوریو کاغەزو شتیتر ٢-ئامێرێکە بۆ گوشینی زەیتوونو ڕۆن لێدەرهێنانی.
(ألمُكَبَّس) (فا): پەستێن.

٣-(كَبَسَ-السَنَة بِيَوم. كَبْساً): ڕۆژێکی خستە سەر ڕۆژانی ساڵو ساڵەکە پڕ بوو.

(ألسَنة الكَبيسَة مِنَ السنين الشَمسِيَّة): ساڵی پڕ لە ساڵەکانی خۆرییە کە مانگی ڕەشەمێ تیایدا (٢٩) ڕۆژە کە هەر بە چوار ساڵ جارێك وا دەبێت واتە ساڵ ٣٦٦ ڕۆژە.

٤-(كَبِسَ. كَبَساً): سەری زلبوو.

(أكْبَس (م) كَبْساء (ج) كُبْس): سەرزل.

(ألكِبْس): سەری زل.

(ألكُباس): ١-مەزنسەر ٢-گوشتنو تێکسمراو.

(هامَةٌ كُباس): سەری خرو زل.

٥-(ألكِبس): ڕیشە/ ڕەچەڵەك/ بنەڕەت.

(جِبالٌ كُبْسٌ وكُبَّسٌ): شاخی سەختی قایم.

(ألكِباسَة (ج) كَبائِس): هێشووی خورما وەك هێشووی ترێ.

(ألكِبيس): جۆرە خورمایەکە.

٦-(ألكَبْسُول ألواحِدَةُ كَبْسُولَة): تەرمەقە کە دەخرێتە سەر بنی فیشەك. مادەیەکی تێدایە کە زۆری چووە سەر گردەگرێتو فیشەکەکە دەردەکاتو دەتەقێت. ڕەشە خەڵکەکە پێیدەڵێن (كَبْسون) یەکێکی (كبسونه) (لاتينية وعامية).

الملحق:

كبس: (ألكَبَّاس): مەنگەنە کە لۆکەو کاغەزو شتیتری پێدەپەستێورێت.

(ألكَبّاس): پەستێوی پاڵپێوەنەر لوولەکێکە لە بۆرییەکدا دەجووڵێت بۆ پەیداکردنی فشار یان گوێزانەوەی بزوە/ جووڵە.

(ألكَبّاس كَبّاسُ مِضخَة: پەستێنەری پاڵپێوەنەر، خەڵکە ڕەشۆکەکە بە هەموو بەشێکی ئامێر یان ئامراز دەڵێت کە بە پەستاوتن کارەکەی بەجێدەهێنێت.

---

كبش: (كَبَشَ-الشيءَ كَبْشاً): مشتی بە شتەکەدا کردو مشتێکی لێبرد.

(ألكَبْش): ١-سەرداری نەتەوە ٢-بەردێکی گەورەیە بە ڕووی دیوارەوە دەنرێت ٣-بەردهاوێژ: ئامێرێکی جەنگە. کۆن لە ئابلووقەدانی قەڵاو شاری دوژمندا بەکار دەهێنراو بەردی بۆ دیواری قەڵاکانی دوژمن پێدەهاوێژرا/ پێدادەکێشرا.

(ألكَبْش (ج) كِباش وأكباش وأكْبُش وكُبُوشَة) (ح): بەران، بەرخەنێرەی دووساڵە، وتویشیانە چوار ساڵە.

(ألكِباش): قارەمانان/ پاڵەوانان.

(كَبْشُ التُوتِ وكَبْشُ القَرَنْفُلِ (ج) كُبُوش): بەری توو و بەری مێخەك (عامیتان).

(ألكَبْشَةُ عند الخَيّاطين (ج) كُبَش): نێرو مێیەکە لە سمە جێی کونو قۆپچە دەگرنەوە. پێشیدەوترێت: جووتە چنگاڵ.

(ألكَبّاش): خاوەن بەران.

كبع: ١-(كَبَعَ-الشيءَ. كَبْعاً): شتەکەی بڕیو لەتکرد.

(-هُ عَن كذا): رێگەی ئەوەی لێگرت/ ئەوەی لێ قەدەغەکرد.

(كَبَّعَ- الشيءَ): شتەکەی لەتکرد، بڕی.

٢-(كَبَعَ. كُبوعاً): سەری شۆڕکرد/ چۆکی داداو زەبوونبوو.

٣-(كَبَعَ- الدَراهِمَ. كَبْعـاً): پارەکەی ژماردو کێشای.

٤-(أَلكُبَـع (ح)= جَمَلُ البَحر: حوت البَحر): نەهەنگ یان حوشتری دەریا.

كبل: (كَبَلَ-هُ. كَبْلاً): ١-بەستیەوە/ کۆتیکرد ٢-بەندیکرد.

(-هُ الدَيْـنَ): دانەوەی وامەکەی دواخسـتو دەستیدەستیی بە خاوەن وامەکە کرد.

(كَبَّلَ-هُ): ١-بەستیەوە/کۆتیکرد/پێوەندیکرد، لە کەمەندیدا ٢-بەندیکرد.

(كابَلَ-ه الدَينَ) (كَبَلَ-هُ الدَينَ): وامەرگرەکە وامەکەی نەدایەوە بە خاوەنەکەی دوای خست.

(-الـدَّارَ): کرینـی خانووەکەی دواخسـت تا خەڵکیتر بیکرێتو ئەم بە ماڧ دراوسـێیەتی هەڵیبگرێتەوە.

(تَكَبَّلَ): بەسترایەوە/ کۆتکرا.

(إكتَبَلَ- الأَسيرَ): دیلەکەی بەستەوە.

(-الكيسَ): توورەکەکەی بەست.

(-خَيْرَهُ): بەخشـینەکەی وەستاندو دەستی گرتەوە/ خێری بە کەس نەکرد.

(الكابُول): تۆڕی ڕاوکەر.

(أَلكَبْـل (ج) كُبُول وأَكْبُـل): کۆتو زنجیری قایـم/ پێوەند ٢-لێوی دۆلکـە یان ئەوەی کە دەنوشـتێنرێتەوەو ئەو چەرمـەی لە لێواری دۆلکەکەوەیە.

(أَلكِبْل (ج) كُبُول وأَكْبُل): کۆت یان بەهێزو قایمترین کوت.

٢-(أَلكَبل): فەروی خوریی چڕ.

(أَلكَبَل والكابِلِيّ): بەرگی کورت: جلی کورت.

(«فَروٌ كَبَلٌ أو كابِلِيّ»): فەرویەکی (تیسـك تووك) کورت.

كبن: ١-(كَبَــنَ- الثَوبَ. كَبْنــاً): بەرگەکەی تیـكو بنتیکرد/ بۆ نـاوەوە نوشـتانیەوەو درووی.

(-الشيءَ): شتەکەی ونکردو شاردیەوە.

(-الرَجُــلُ كَبْنــاً وكُبُوناً): دانی سـەرەوەو خـوارەوەی پێشـەوەی کابـرا بـۆ ناودەمی خواربۆتەوە.

(-الظَبيُ): ئاسکەکە بە زەویەکەوە نووسا.

(إكبَأَنَّ إكبِئناناً): کرژ بوو/ چووەیەك.

(-الظَبـيُ): ئاسـکەکە خۆی بـە زەویەکەوە نووساند.

(-الرَجُلُ): شکستیهێنا.

(أَلكَبْن) (مـص): لێوی دۆلکە. یان پێسـتی لێوی دۆلکەیەك نوشتابێتەوەو دروابێت.

(أَلكُبُـنّ): ١-نـان چونکـە نان کـرژ دەبێتو دەنوشتێتەوە ٢-بەدی ڕژد.

(رَجُـلٌ لَبيـبٌ (ج) أَلِبَّـاء (م) لَبيبَـة (ج) لَبيبَـات ولَبائِب): بە كارەوە بەندو لەسـەر كارو ئەنجامدانی هەتەر.
(«لَبَّيكَ= إلْباباً بـكَ بَعد إلْباب وإقامَةً على طاعتك بَعد إقامَـة و إجابَةً بَعد إجابَة»): (دووبـارە كردنـەوە بـۆ جەختكردنـە) بە دەنگتەوەم/ هەمیشە ملكەچی فەرمانەكانتم، هەمیشـە بـە دەنگتـەوە دێـم/ پەیرەویی فەرمانەكانتم، ئامادەمو سەرم لە ڕێیە.
٢-(لَـبَّ- اللَـوزَةَ. لَبّاً): بادامەكەی شـكاندو ناوكەكەی دەرهێنا.
(-الرَجُلَ): كێشای بەسەر سنگی پیاوەكەدا.
(-الدابَّة): قایشی بۆ بەرسنگی وڵاخەكە كرد تا زینەكەی نەكەوێت.
(لَبَّ- لَبّاً ولَبابَةً): ژیرو زرنگبوو ٢-ناسـكو لە دڵەوە نزیكبوو.
(لَبِبَ. لَبَباً ولَبّاً ولُبّاً ولَبابَةً): (ناوك. كاكڵە. ناو)ی پەیداكرد.
(لَبُبَ يَلْبُبُ وهونادر في المضاعَف): ئەمە بە دەگمەن وا دەوترێت.
(لَبَّبَ- الحَبُّ. تَلْبيباً): دانەكە شـیلەی تێزا/ ناوی پەیداكرد.
(-فُلاناً): یەخەی فیساریگرتو ڕایكێشا.
(أَلَبَّ- الدابَّة): قایشی بەر سنگی بۆ وڵاخەكە كرد تا زینەكەی نەكەوێت.
(-السَرجَ): قایشی (بەرسنگی وڵاخەیكرد/ بۆ زینەكە كرد).
(تَلَبَّبَ- القتالَ): بۆ جەنگ (خۆی خرهەڵدا/ ئامادە كردو پشتێنی بەست).
(-الرَجُلانِ): دوو پیاوەكە یەخەی/ بەرۆكی یەكتریانگرتو یەكتریان بەگیرهێنا، یەكتریان (ڕاكێشا/ هێناو برد).
(إسْـتَلَبَّ- زَيـداً): زرنگیـیو ژیریی زەیدی تاقیكردەوە.
(أَلْلُـبّ (ج) أَلْباب وأَلُـبّ وأَلْبُب): ١-كوڕۆكو گەوهـەری یان پوختـەی هەموو شـتێك ٢- ناوەزی تـەواوی بێكەموكووریی یان زرنگیی، بە مێشـكو ناوەزی ناتـەواو ناوترێت ٣ (دڵ (دەڵێـن لە (لِبُـو)ی سـریانییەوە وەرگیراوە یان لِب (بە عیبری) دڵە بۆیە وایشـیپێوتراوە چونكـە چەوریی/ بـەز دایپۆشـیوە ٤-ژەهر ٥-توێكڵێكـی تەنكـەو نەرمە بڕێك شـیلەی تێدایە كە بەشـی هەرە زۆری بەرگی میوەكە پێكدەهێنێت.
(أَللُبُّ-مِنَ الجَـوز واللَّوز ونحو ذلك): كاكڵی گوێزو ناوكی بادامو هیتری لەو بابەتە.
(أَللَبَّـة): ١-جارێك یەخەگرتـن/ بەرۆكگرتن ٢-شـوێنی گەردانەی سەرسنگ (كەلەپوختەو هەڵبژاردەی شتەوە وەرگیراوە.
أَللَبَب (مص) (ج) أَلْباب: ١-شوێنی گەردانەی سەرسنگ ٢-شوێنی چەقۆپێداهێنانوسەربڕین ٣-قایشـی بەرسـنگی وڵاخ كـە زینەكەیـان

کورتانی ولاخەکەی پێ قایمدەکرێت ٤-تەنکە لی درێژەوەبوو.

(أَللُبـاب): ١-ناوێـزەو هەڵبـژاردەو پوختەی هەموو شتێك.

(«فُـلان لُباب قَومِهِ وهُمْ لُباب قَومِهِم وهي لُبـابُ قَومِها»): ئـەو زرنـگو هەڵبژاردەی خوێشـگەلیەتی ئەوان. زرنـگو هەڵبژاردەی خوێشـگەلیانن ئـەو ژنـە زرنـگو ژیـرو هەڵبژاردەی خوێشگەلیەتی.

(«حَسبٌ لُبابٌ وعَيشٌ لُباب»): باووباپیرێکی پـاك و پوخـت و بەرێزو ژیانێکـی پوخت ٢- توێکڵێکـی نەرمـەو بریك شـیلەی تێدایەو بەشی هەرە زۆری توێکڵی بەرەکەیە.

(لُبـابُ الجَـوزِ ونَحْـوَهُ): کاکڵـی گوێـزو ناوکەبادامو ناوکی شتیتر.

(أَللَبابَة): جلێکە بەسـەر هەموو جلەکانداو لـە کاتـی خـۆ ئامادەکردنـدا بـۆ جەنـگ لەبەردەکرێت.

(أَللَّبيـب (ج) أَلِبّاء (م) لَبيبَـة (ج) لَبيبات ولَبائِب): ژیر/ بەناوەزو تێگەیشتوو/ زرنگ.

(بَناتُ أَلبُب) (ج): کۆمەڵە دەمارێکی دڵە دەڵێن گوایا ئەوە ناخی دڵە/ جەرگەی ناسکیی دڵە.

(«أَنا أُحِبُّك مِن بَناتِ أَلبُبی»): من لە ناخی دڵمەوە تۆم خۆشدەوێت.

(جمع أَلبُب ألابب): ناخەکانی دڵ.

أَلِيبب: دەمارۆکەی دڵ کە ناسکیی و سۆزی پێوەیە.

(أَلأُلبوب): (ناوی/ تۆوی) بەرە مووروتك.

(أَلتَلْبيـب): خۆ بە ژیرو زرنگ پیشـاندان/ نواندن بەبێ ئەوەی زرنگیی و ژیریی سروشتی هەبێت.

(أَلتَلْبيب (ج) تَلابيب): (یەخەی/ بەرۆکی) کراس.

ويُعرَف بالطَوق): بەرۆك/ یەخە.

(«أَخَـذَ بِتَلابيبِهِ»): دەسـتی دایە یەخەی و بەگیری هێنا.

(أَلمُتَلَبَّب): شوێنی گەردانەی سەر سنگ.

(أَلمَلْبوب): بە ژیرو زرنگو ناسك ناسراو.

٣-(لَبَّـبَ- في الأَمـرِ تَلْبيبـاً): لـە کارەکەدا دوودڵییکرد/ ڕاڕا بوو.

٤-(أَللَبَب): ١-بیر ٢-دڵ، مێشك، هۆش.

(«هُوَ رَخِيُّ اللَبَب»): ئەو سنگ فراوانە.

«فلان في لَبَبٍ رَخيٍّ»: فیسـار لە بارێکی/ لە گوزەرانێکی خۆشدایە/ دارایە.

(أَللَباب): گیای کەم.

٥-(لَبلَبَ-تِ المَرأَةُ بِوَلَدِها): ژنەکە بە سۆزەوە منداڵەکەی خۆی لاواندو سۆزیدایە.

(-تِ الشـاةُ بِوَلَدِها بَعدَ الوضـعِ): مەرەکە سۆزی بۆ بەرخۆلەکەی جووڵا پاش زانیی و بە لێوی کەوتە لستنەوەی.

(أَللَبْلَـب و اللُبلُب): سـۆزدار لەگەڵ خێزان و کەسوکارداو چاکەکار لەگەڵ هاوسێکانیدا.

٦-(لَبْلَبَ- القَومُ): خوێشگەل بلاوبوونەوە.

(أَللَبْلَبَــةُ) (عنــد العامة): قســەی تێکەڵو پێکەڵ.

(لَبالِــبُ الغَنَــمِ): بارەبــارو بەیەکــدادانو ترپەترپی پێی مەڕەکان.

٧-(أَلْلَبْــلاب) (ن): لاولاو ڕوومەکێکــە خــۆی بە درەختــدا هەڵدەواســێت گوڵەکەی زەردە گەڵاکەی لە هی (لۆبیا/ ماشەســپی) دەچێت کولومەکانی پانن دەنکێکیان تێدایە دەخورێت. لــە خۆرهەڵاتــی ناوەڕاســتدا دەچێنرێــت هەندێك جۆری هەر لە زۆر کۆنەوە/ لە سەدە کۆنەکانەوە ناسراوە.

(لَبلاب الحُقول= العَصَب): مالەوێچە. گیایەکە پەلدەهاوێت‌و بڵاودەبێتەوە لەناو کشتەکاندا دەرویێت‌و زیان بە کشت دەگەیەنێت.

لبــأ: (لَبَأَ- الشــاةَ. لَبْــأً): ژەکــی مەڕەکەی دۆشی.

(-تِ الأُمُّ وَلَدهــا): دایکەکــە ژەکــی بــە ساواکەیدا.

(-الزَرعَ): یەکەم ئاوی کشتەکەیدا.

(-القَومَ): شیری ژەکی دەرخواردی خوێشگەلدا.

(-أَلْلِبَأَ): ژەکەکەی پوختکردو لێینا.

لَبَّــأَ-تِ الشــاةُ. تَلْبِئَــةً): شــیری ژەك لــە گوانی مەڕەکــەدا کۆبــووەوە: مەڕەکە ژەکی پەیداکرد.

(شــاةٌ مُلَبِّيءٌ): مەڕێك شیری ژەکی (هەبێت/ پەیداکردبێت).

(أَلبَأَ- القَــومَ اللِبأَ): شــیری ژەکی دەرخوارد خوێشگەلدا.

(-أَللِبَأَ): شیرە ژەکەکەی پوختکردو لێینا.

(-تِ الشاةُ): مەڕەکە شیرە ژەکەکەی دادا.

(-الجــدْيُ): کارۆژڵەکــە خــۆی گوانی دایکی مژی.

(-القَومُ): خوێشگەل شیری ژەکی زۆریان بۆ بوو.

(-الفَصيــلَ): بەچکە حوشــترەکە یان گۆلکە ســاواکەیان بەرخۆلەو کارژۆلەکەی بە گوانی دایکیەوە نووساند تا شیرە ژەکەکەی بمژێت.

(إلْتَبَأَ- اللِبأَ): شیرە ژەکەکەی خواردەوە.

(-الشاةَ): شیرە ژەکی مەڕەکەی دۆشی.

(إلْتَبَأَ واسْتَلْبَأَ- الجديُ الشاةَ): ژەکی مەڕەکەی مژی.

(أَللِبَأ): شیری ژەك.

(أَللَبْــأَةُ واللَبــاءَةُ واللَبوءَةُ واللَبْــوَةُ واللَبوُةُ واللَبْوَةُ واللَبَــةُ واللَباةُ واللَبُ (ج) لَبآت ولَبأ ولَبو ولَبُوات) (ح): مێشێر.

٢-(لَبَّــأَ- بالحَــجِّ- تَلْبِئَــةً): لەحەجدا وتی: (لَبَّيْكَ أَللّهُمَ لَبَيْكَ): خودا ملکەچم بە دەنگ‌و بانگەوازتەوە هاتم.

لبت: (لَبَتَ- يَدَهُ. لَبْتاً) دەستی ئەوی بادا.

(-فُلانــاً): بــە دار دارکاریکردو کێشــای بە سنگ‌و سك‌و ئەملاو لای کەمەریدا.

لبث: (لَبِثَ- بالمَكان. لَبْثاً ولُبْثاً ولَبَثاً ولَباثاً ولُباثاً ولَباثَةً ولَبَثاناً ولَبيثَةً): لە شوێنەکەدا

مایەوە/ ستارمیگرت،/ گلیخواردەوە.
(«مالَبِثَ أن فَعَلَ كذا»): زۆری پێنەچوو/ نەخایاند/ نەبرد کە ئەو کارمیکرد یان زۆر دوانەکەوت.
(لَبَّثَ وأَلْبَثَ- فُلاناً في المَكانِ): فیساری لە شوێنەکەدا هێشتەوە/ جێگیریکرد.
(تَلَبَّثَ- في المَكانِ): لە شوێنەکەدا هەڵوێستەیکرد/ وەستاو مایەوە.
(إِسْتَلْبَثَ- هُ): خاوەخاوی پێکرد/ هێواشی کردەوەو دوایخست.
(أللابِث واللَّبِث- بالمَكان): گلخواردوی شوێنەکە/ کەسێکە لە شوێنێکدا بمێنێتەوەو جێگیر بێت.
أللُبثَةُ: پشوو/ تاوێك وەستان/ هەڵوێستەیەك.
(أللَبِيْثَةُ (مص) (ج) لَبائِث): کۆمەڵە خەڵکێکی لە هەمەتیرەو خێڵ.
لبج: (لَبَجَ- بِهِ الأرضَ لَبْجاً): کوتای بە زەویداو پشتی لە زەویدا.
(لُبِجَ بالرَجُلِ أو البَعيرِ): پیاوەکە یان حوشترەکە بە زەویدا درا، خۆی بە زەویدا دا لەبەر نەخۆشی یان لە شەکەتیدا.
(لَبيج): لە تاو نەخۆشی یان لە شەکەتیدا بە زەویدا کەوتوو.
(لَبَجَ-هُ بالعَصا): دارکارییکرد/ بە دار لێیدا.
(أللُبْجَةُ واللُبَجَةُ (ج) لَبَج ولُبَج): ئاسنێکە قژقژە گورگی پێدەگیرێت.
(أللِباج): گەوجی کەم ئاوەز.
لبح: (لَبِحَ ولَبَّحَ وأَلْبَحَ- الرَجُلُ. لَبَحاً): پیاوەکە تەواو پیر بوو.
(أللَبَح): ١-پیری بەساڵداچوو ٢-ئازایەتیی/ دلێریی/ نەبەردیی.
لبخ: ١-(لَبَخَ- فُلاناً. لَبْخاً): ١-لە فیساریدا ٢-جنێوی پێدا ٣-کوشتی.
(لَبَّخَ وتَلَبَّخَ- جِسْمُهُ مِنَ الضَرب) (عامية): لەشی شین بووەو/ شوێنی لێدانەکەی پێوە دیاربوو.
(لابَخَ-هُ لِباخاً ومُلابَخَةً): ئەو دووانە یەکتریان بەر زللەداو لە یەکتریاندا.
٢-(لَبَخَ- الرَجُلُ. لَبْخاً): پیاوەکە بۆ بردنی شتەکە فێڵیکرد.
(-الشيءَ): شتەکەیبرد.
٣-(لَبَخَ- جَسَدُهُ لُبُوخاً): ئەو لەشی گۆشتی زۆر گرت/ گۆشتنبوو/ قەڵەو بوو.
(لَبيخ): گۆشتن/ قەڵەو.
(لَبَّخَ- لَهُ) (عامية): نیوەنمەکی تێگرت.
(تَلَبَّخَ): بە نیوەنمەك چارەسەری ئازارەکەیکرد.
(أللَبخَة (ج) لَبَخات (طب): مڵەما/ نیوەنمەك پەرۆیەك تۆوی کەتانی خووساو یان کەپەكو شتی لەو بابەتانەی تێدەخرێتە سەرو پاش تەرکردنی بە ئاو یان بە سرکە گەرمیدەکەنو

دەخرێتە سـەر ناوچەوان بۆ سووككردنی تا یان دەیخەنە سەر شوێنی ئازار (عامیە).
(أَلْلَبیخ= أَلْلَحیم): (گۆشتن/ قەڵەو.
(أَلْلَبیخَة): شووشەی بۆن.
٤-(أَلْلَبَخ الواحِدَةُ لَبَخَة) (ن): دار ئاوریشم/ دار نۆینمـەك. درەختێكی گەورەی دڕكاوییە گەڵاكەی وەك گـەڵای گوێزە گوڵەكەی زەردی مەیلـەو سـەوزە بۆنێكی خۆشـی لێدێت بە زۆریی لە میسر دەروێنرێت.
لبد: (لَبَـدَ- بِالمَكانِ لُبُوداً): لە شـوێنەكەدا نیشتەنیبوو.
-القَومُ بِالرَّجُلِ: خوێشگەل پیاوەكەیانگرتو چواردەوریاندا.
-بِالشَّیءِ: بە شتەكەوە نووسا/ لكا.
(-الشَیءُ بالشَیءِ): شتەكە (بـە شتەكەیترەوە نووسـا/ چـوە سـەر شـتەكەیتر/ پێـوەی چەسپبوو).
(-الثَوبَ): جلەكەی پینەكرد.
(-الصَــوفَ. َلبْداً): خوریەكەی شـیكردەوەو تەڕیكردو سوویەوە تا یەك بگرێتو ببێت بە لباد.
(لَبِدَ- بالمَكانِ. لَبَداً): لە شـوێنەكەدا جێگیر بوو.
(لَبَّـدَ- الصوفَ): خوریەكەی كـرد بە لباد/ خوریەكـەی شـیكردەوەو سـوویەوە تا یەك بگرێتو ببێتە لباد.

(-الشَــيءَ): شـتەكە یەكیگرتو وەك لبادی لێهات.
(-المَطَــرُ الأَرضَ): بارانەكـە ڕشـێنەیكردو زەوییەكەی گرت.
(-شَــعْرَهُ): قژەكـەی بە شـتێكی لینج یان بۆیەیــەك بە یەكیەوە نووسـاند وەك لبادی لێكرد.
(-الكِســاءَ وغَیــرَهُ): بەرگەكە یان شـتیتری پینەكرد.
(أَلْبَدَ-بالأَرضِ): بە زەویەكەوە نووسا.
(_بالمَكانِ): لە شوێنەكەدا نیشتەجێبوو.
(-السَرجَ): لبادی بۆ زینەكە كرد.
(-الفَــرَسَ): لبـادی خسـتە سـەر پشـتی چارەوێكەو پێوەیبەست.
(-الشيءَ بالشَّيءِ): شتەكەی بە شتەكەیترەوە نووساند/ لكاند.
(-الرجُلُ رَأسَــهُ): پیاوەكە چـووە ژوورەوە سەری لە خاستی دەرگاكەدا دانەواند.
(-الخَرقَ): دراوەكەی پینەكرد.
(-بَصَرُ المُصَلّــي): نوێژكەرەكە چاوی بڕییە شوێنی سوجدەكە.
(تَلَبَّدَ- الصوفُ ونَحْوَهُ): خورییەكە یان شتی وەهـا چنگی دایە یەكو بە یەكەوە نووسـاو بوو بە لباد.
(-الطائِرُ بِالأَرضِ): باڵندەكە لەسەر زەویەكە هەڵنیشت.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە روانیی‌و سەرنجیدا.
(-تِ الأَرضُ بِالمَطَـرِ): زەویەکە بە بارانەکە چنگی دایە یەك‌و بە یەکەوە نووسا.
(إِلْتَبَـد- الوَرَقُ ونَحوُهُ): گەڵاکە یان شـتیتر بەیەکەوە (نووسا/ لکا) و یەکیگرت.
(-تِ الشَجَرَةُ): درەختەکە گەڵای زۆر بوو.
(أَللِبْـد (ج) لُبُود وأَلْباد): ١-لباد کە لە خوری دروسـتدەکریت ٢-ئەو لبادەی دەخریتە سەر پشتی چارەوێ‌و ژێر زین ٣-هەموو قژێك یان خورییەك کە چنگ بداتە یەك‌و ببێتە لباد.
(«فُـلان لايَجِـف لِبْـدُهُ»): فیسـار لبـادی سەرپشتی ولاخەکەی وشکنابێتەوە/ واتا هەر لە گەراندایە.
(أَللَبَد) (مص): خوریی بە لباد بوو.
(«مالُهُ سَـبَدٌ ولا لَبَد»): نە قژی هەیەو نە لباد: واتا نە زۆرو نە کەمی هەیە.
(أَللَبِـد): ١-قـژی یان شـتیتری بـە لباد بوو ٢-کەسـێکە کـە گـوزار نـەکات‌و مـاڵ بـە جێنەهێڵێت.
(«مـالُ لُبَدٌ»): دارایەکـی زۆری کەڵەکە بوو وەك لباد چنگی داوەتە یەك.
(«صارَ الناسُ عَلَيه لُبَداً»): خەڵکی لەسەری کەڵەکەبوون‌و گەمارۆیاندا.
(أَبو لُبَد) (ح): شێر.
(أَللِبْدَة): ١-پینەیەك سـنگی کراسی پێ پینە دەکرێـت ٢-قژ یان خوری کـە چنگی دابێتە یـەك وەك لبادی لێهاتبێـت ٣-دیوی ناوەوەی ران ٤-(ح) کوللە.
(-(ج) لِبَد ولُبَد وأَلْباد ولُبُود): تووکی کەڵەکەبووی نێوان هەردوو شانی شێر/ یالی شێر.
(أَللُبْدَةُ (ج) لِبَد ولُبَد وأَلْباد ولُبُود): تووکی کەڵەکەبووی نێوان هەردو شـانی شێر/ یالی شێر.
(أَللابِد (فا) (ج) لُبَّد) (ح): شێر.
(«مالٌ لابِدٌ»): ماڵێکی (کەڵەکەبوو/ زۆر).
(أَللَبَّاد): کارگەچی/ لبادکەر.
أَللُبّاد= أَلقَباء مِنَ اللِبَد: شەپقەو کلاوی لباد، تەپلەی لباد.
(أَللُبَّـدى): ١-خەڵکی گردەوەبـوو/ کۆمبوو ٢-(ح)شوانخەڵەتێنە (مەلێکە خۆی بە زەوییەوە مەلاسدەکات تا نەچێتە سەری هەڵنافرێت).
(أَللَبود) (ح): گەنە.
(أَللَبيد): ١-جەواڵ ٢-توورەکەی ئالیکی ولاخ.
(أَللَبيد واللُبادى واللُبَّادى) (ح): شوانخەڵەتێنە.
(أَلمُلْبِـد) (فـا): بـە زەویـەوە (چەسـپاو/ خۆمتکردوو/ نووساو).
(«فُلانٌ مُلْبِدٌ»): ١-فیسـار زۆر هەژاری دارزاوە بە زەوییەوە لکاوە/ کەوتۆتە سەر زەوی ٢-شێر.
(أَلمُلْبَد والمُلَبَّد): ١-پینەکراو ٢-پەستێوراو.
(أَلمَلْبود): پەستێوراو.
(تيـس مَلْبـود): سـابرێنێکی خـرت/ زۆر قەڵەو/ گۆشت توندوتۆڵ.

لبـز: (لَبَـزَ- هُ. لَبْزاً): (تونـد/ تيژ) ليّيدا/ زۆری کوتا.

(-الشيءَ): ١-شتەکەی بە شپرزەییو بە هەڵپە خوارد ٢-شتەکەی شکاند.

(-فُلاناً): ١-ناوو ناتۆرەی خراپی لە فیسار داهێنا ٢-دەستی بە پشتیدا کێشا/ لێیدا.

لبـس: (لَبَسَ-عَلَيه الأَمْرَ لَبْسـاً): کارەکەی (لێ چەواشـە کـرد/ لێئاڵۆزکرد) تا سـەری لێدەرنەچێت.

(-هُ): وایلێکرد سەری لە کارەکەی دەرنەچێت/ لێیتێکداو ونکرد/ چەواشەیکرد.

(«لَبَسَـني»): وایلێکردم لە کارەکەی نەگەم/ چەواشەیکردمو لێیونکردم.

(لَبِسَ- الثَوبَ. لُبْسـاً): بەرگەکەی پۆشـی/ خۆی بە بەرگەکە داپۆشی.

(-فُلاناً): ماوەیەك لەگەڵ فیسـاردا هاودەمو هاورێیبوونو لەیەك ئالآن.

(-فُلانـاً علی مافیـه): بە هەموو شـتێکی فیسارەوە لەگەڵیدا هەڵیکرد.

(«لَبِسْتُ علی ذلك أُذُني»): خۆم لەوە کەرکرد/ نقەمنەکرد/ قسەمنەکرد/ خۆم لێ بێئاگا کرد.

(«لَبِستُ لِفُلان أُذُني»): گوێم نەدایە فیسار.

(لَبَّسَ- عَلَيهِ الأَمرَ): کارەکەی لێچەواشە کرد تا سەری لێدەرنەچێت.

(-الشـيءَ): کەموکووریی شتەکەیشـاردەوە/ ساختەیکرد.

(لاَبَـسَ-هُ): تێکەڵیبـوو/ هاودەمیکـردو لە دەروونی گەیشت.

(-الأَمرَ): بە کارەکەوە خەریکبوو/ کارەکەیکرد.

(أَلْبَسَ-هُ): داپۆشیو شاردیەوە.

(-هُ الثَوبَ): بەرگەکەی پێ لەبەرکرد.

(تَلَبَّسَ- عَلَيَّ الأَمرُ): کارەکەم لێچەواشە بوو ناروون/ ئاڵۆز بوو/ سەرم لێدەرنەکرد.

(-بِالأَمرِ وبالثَّوبِ): بە کارەکەوە (پێچرایەوە خەریکبوو/ ئاڵرا) بە بەرگەوە پێچرایەوە.

(«تَلَبَّـسَ حُبُّـهُ بِدَمـي»): حەزەکـەی،/ خۆشەویسـتیەکەی لە خوێنمدایـە/ تێکەڵی خوێنم بوو.

(-الطَعامُ بالیَد): چێشتەکە بە دەستەوە لکا.

(-بِـيَ الأَمـرُ): کارەکەم تێوەئـالآ/ دوچاری کارەکـەم، بە کارەکـەوە (گرفتـارمو لکاوم/ تێوەگلاوم).

(«تَلَبَّسَ لِباسـاً حَسَـناً»): بەرگێکی جوانی (لەبەرکرد/ پۆشی).

(إلْتَبَسَ- بِعَمَلِ كذا): بەو کارەوە (ئاڵا/ گلا/ خەریکبوو).

(-عَلَـيَّ الأَمـرُ): کارەکەم لێچەواشـە بووەو سـەری لێدەرناکـەم/ بۆی ناچـم/ ناروونە، ئاڵۆزە.

(أَللُبس): ١-لێگۆڕان/ چەواشـەبوون/ نادیار/ نـاروون/ چەواشـە/ سـەرلێدەرنەکردن ٢-تاریکیو نووتەکیی ٣-جۆرە پۆشاکێکە.

(أَلَّلَبَس): لێگـۆڕان/ چەواشـە/ نـاڕوون/ نادیار/ سەرلێدەرنەکردن/ گومان ٢-تاریکیو نووتەکیی زۆر.

(أَلَّلِبـس (ج) لُبُـوس): پۆشـاك/ جلوبەرگ ٢-پێستێکی ناسـكو تەنکە لە نێوان گۆشتو پێستی دەرەوەدایە.

(لِبْـسُ الهَـودَجِ ونَحْوَهُ): پـەردەی کەژاوەو شتیتر کە پێی دادەپۆشرێت.

(أَلَّلُبْسَة والإلْتِباس واللبوسَة واللُّبُوسَة) ئاڵۆزییو رووننەبوون، گومانو سەرلێدەرنەکردن.

(أَلَّلِبْسَـةُ): ١-جـۆرە لەبەرکردنێـك ٢-جۆرە بەرگێکە، پۆشاکێکە.

(أَلَّلِبَـاس): ١-بەیەکداچـوون، تێکەڵبـوون ٢-کۆمەڵبەسـتن/ کۆبوونـەوە ٣-ژنو مێرد/ هاوسەر.

(أَلَّلِباس (ج) لُبْس وأَلْبِسَة): پۆشاك/ جلوبەرگ.

(لِباسُ الزَهر): کاسەی گوڵ.

(لِبـاسُ التَقـوى): بەرگی خوداپەرسـتیو خۆپارێزیی کە شەرمو شکۆو شتیتریشە.

(أَلَّلَبَّاس): کەسـێکە کارو شـت بئاڵۆزێنێتو کەمووکووڕیی شـت (بشـارێتەوە/ ونبکات) ٢-خاوەن پۆشاکی زۆر.

(أَلَّلَبُوس): ١-پۆشاك/ ئەوەی کە لەبەر دەکرێت ٢-زرێ ٣-پۆشاکزۆر.

(أَلَّلَبِيس): ١-چون/ وەکو/ هاووێنە/ هاوشێوە ٢-بەرگ/ پۆشاك.

(قَميصٌ لَبِيس): کراسـێکی زۆر لەبەرکراوی کۆنو دڕاو.

(أَلتَلْبِيـس) (مـص): بەرگتێهەڵکێشـان/ بەرگتێگرتن ٢-شـاردنەوەی ڕاستیی شتەکەو دەرخستنی پێچەوانەی ڕاستییەکەی.

أَلمِلْبَس: شەو.

(أَلمِلْبَـس والمَلْبَـس (ج) مَلابِس): پۆشـاك/ جلوبەرگ.

(أَلمُلَبَّس) (مفع): ١-پۆشراو/ داپۆشراو/ بادام یـان گوێز کە شـەکرو شـتیتری تێدەگیرێت دەکرێتە بەرگی/ بەرگتێگیراو.

٢-(إلْتَبَـسَ-ت بِـهِ الخَيـلُ): ئەسـپەکەی گەیشتێ.

لبش: (لَبَّش) (عامية): کەلوپەلو شتەکانی بەسەریەکداداو کۆیکردنەوە (بۆ ڕۆیشتن یان گوزار/ سەفەر).

لبط: ١-(لَبَطَ- بِفُلانٍ الأَرضَ لَبْطاً): فیساری بە زەویدا کێشاو پشتی لە زەویدا.

(-البَعِـيرُ أَو البَغَـلُ. لَبْطـاً): ١-حوشـترەکە یان ئێسترەکە سـمکۆڵیکرد/ پەلی بە زەویدا کوتا ٢-غاریکردو سـمی بەزەویـدا (دا/ کوتا) (سریانیه).

(لُبِطَ-بِـهِ): ١-بـە زەویدا درا بـە پێوە بوو ڕەهێڵبـوو ٢-خـۆی بە زەویـدا کوتا بە هۆی نەخۆشییەکەوەیان کارێك و نارەحەتییەکەوەو لە پڕ ئاگای لێبرا.

(لَبَّطَ- العَجِينُ ونَحْوَهُ») (عامية): هەویرەکەو شتی وەك ئەوە خاوو شلبووەوەو ئاویدایەوە/ لەکەڵککەوت.

(تَلَبَّطَ والتَبَطَ- البَعيرُ): ١-حوشترەکە چوارپەلی بە زەویدا کوتا/ سمکوڵیکرد ٢- کەوتە غارو سمی بە زەویدادا (سریانیە).

(-الرَجُلُ): ١-راکشاو تەپاوتلیکرد ٢-شپرزەو سەرگەردانو سەرسامبوو.

(-في الأَمر): لە کارەکەدا کۆششیکردو خۆی رەتاندو فێڵی تێداکرد.

(أَلْلَبْطَةُ): ١ جارێك بەزەویدا کەوتنو رەهێڵبوون، جارێك سمکوتانی وڵاخو حوشتر.

(أَلْلَبَطَةُ): ١-پێبەزەویدادان ٢-تلاوتلکردن خۆگەوزان ٣-راکردنی هەنگڵەشەلێیانە.

(أَلْمَلْبُوط) (مفع): حەپەساو.

(رَجُلٌ مَلْبُوط): پیاوێکی (حەپەساو/ سەرسام) لە کارەکەیدا ٢-بەزەویدا دراوو گەوزێنراو.

٢-(لُبِطَ-بِه): تووشی هەڵامەتبوو.

(أَلْلَبْطَةُ): هەڵامەت.

٣-(أَلْألْباط): پێستەکان.

(لَبْطَة): پێستەیەك/ چەرمێك.

لَبَعَ: (لَبَعَ) (عامية): چلێسانە خواردنەکەی خواردو زۆریخوارد.

لبق: ١-(لَبَقَ- الشَيءَ لَبْقاً): شتەکەی نەرمکرد.

(لَبِقَ ولَبُقَ. لَبَقاً ولَباقَةً): ١-کارامە بوو ٢-ناسكو زمان نەرمو رووخۆشبوو، زمانزانو رەفتار جوانبوو.

(-الثَوبُ و نَحْوَهُ بِفُلانٍ): جلەکە یان شتەکە بۆی شیبیا/ لێیکەوت/ بۆیدەبێت.

(لَبَّقَ- الشيءَ): شتەکەی نەرمکرد.

(-لَهُ الثَوبَ ونَحْوَهُ): جلەکەی لەبەرکرد بزانێت بۆی دەبێتو لێیدەکەوێت.

(«لَبَّقَ لَهُ إسماً») (عامية): نازناوێکی لێنا.

(أَللَبِق (م) لَبِقَة واللَبيق (م) لَبيقَة): زمان (پاراو، شیرین) رەفتار ناسكو نەرمو قسەزان/ بە رەوشت.

لبك: (لَبَكَ ولَبَّكَ- الأَمرَ أو الشيءَ. لَبْكاً): کارەکە یان شتەکەی تێکەڵوپێکەڵکردو بەسەریەکیداداو چەواشەیکرد.

(-الثَريدَ): تریتەکەی تێکەڵکرد بیخوات.

(-القَومُ بَيْنَ الشعر): خوێشگەل تێکەڵی مەرەکانبوون.

(«لَبَّكَه بِه») (عامية): کارەکەی لێگرانکردو چەواشەیکرد سەری لێتێکدا.

(لَبِكَ وتَلَبَّكَ والتَبَكَ- الأَمرُ. لَبَكاً): کارەکە ئاڵۆزو چەواشە بوو/ شێوا/ بەیەکداچوو.

(أَلْلَبَكُ): ١-قسەی پیسو ناشیرینو بێئابڕووانەی بە دەمدا هات ٢-قسەکەی هەڵەتو پەڵەتو نادروستبوو.

(أَلْلَبْكُ واللَبْكَة): شتی تێکەڵو پێکەڵ/

شێواو/ بەسەریەکدا دراو/ ئاڵۆز.

(«وَقَعَ فِي لَبْكَةٍ»):کەوتە گێژاوەوە.

أَمــرٌ لَبكٌ ولَبيــكٌ:کارێکی (شــێواو/ ئاڵۆز/ تێکەڵو پێکەڵ).

(أَللَبكَةُ):پارووە تریتێك یان قاپە تریت.

(أَللُباكَة واللَبيكَة):کۆمەڵ.

(«وَقَعَ فِي لَبيكَة»):کەوت گێژاوەوە/ کەوتە کارێکــی ئاڵــۆزو تێکەڵو پێکەڵەوە/ ســەری لێشێوا.

الملحق:

لبك: (أَلتَّلَبُّك):تێکەڵو پێکەڵبوون/ شێوان/ ئاڵۆزبوون/ بەیەکداچوون.

(أَلتَلَبُّــكُ المِعَــوِيّ): گــەدە تێکچــوونو هەرستێکچوون.

لَبَنَ:١-(لَبَنَ- فُلاناً بِالعَصا لَبْناً)بە دار فیساری شلکوتکرد هێندەی لێدا/ دارکارییکرد.

(لَبــَنَ- الرَجُــلَ. لَبْنــاً):شــیری دەرخوارد پیاوەکەدا.

(لَبِنَ-تِ الشــاةُ. لَبَناً):مەڕەکە زۆر بە شــیر بوو/ شیری زۆر بوو.

(أَلْبَنَ- القَومُ):خوێشگەل شیریان زۆر بوو.

(لابِنُون ومُلْبِنون): خوێشــگەل شــیردارن/ شیرزۆرن.

(-الرَجُــلُ):پیاوەکــە خواردنێکی لە شــیرو هەنگوینو کەپەکی ئارد دروستکرد.

(-تِ الناقَةُ):مێحوشترەکە شیرزایە گوانی.

(إلْتَبَــنَ):شــیری خــواردەوە یان شــیرەکەی مژی.

(إسْتَلْبَنَ):داوای شیریکرد.

(أَللابِن (فا) (م) لابِنَة (ج) لابِنات ولَوابِن): ١-زۆر بەشــیر، فرە شــیر، خاوەن شیرێکی زۆر ٢-شیرپەز.

(أَللَوابِن):گواندارەکان/ شیردەرەکان.

(أَللَبَن) (مص) (ج) أَلْبان):شیر.

(لَبَنَة):جۆرە شیر.

(لَبَنُ الشَجَرَةِ):شیلەی درەخت.

(لَبَــنَ الطَيرِ) (ن):شــیری باڵندە = گێلاخە= سرێشــگولاخ- روکاکوزی رووەکێکی سەلکدارە لە کۆمەڵەی شــلێر. ســرێش لە ســەلکەکەی دەردەهێنرێت.

(أَللَبِن):١-کەسێکە زۆر حەز لە شیر خواردنەوە بکات ٢ شیرخۆرەوە.

(أَللَبِنَةُ واللَبينَةُ):بەشیر، شیردار.

(أَللَبَنِيَّة):شیربرنج کە گۆشتیتێبکرێت.

(أَللُبان):١-(ن)دارکاژ/ سنەوبەر ٢ (ن) کوندور (یونانیە) داری بوغورد درەختێکی درکاوییە لــە کۆمەڵــەی قــەزوان جــۆرە جەوییەکی لێدەردەهێنرێــت پێیدەڵێــن بوغــورد کــە دەسوتێنرێت بۆنێکی خۆشدەدات.

(أَللَبان):ســنگ یان نێوان هەردوو مەمك. بە زۆری بۆ ســنگی ولاخی سمدار دەوترێت وەك چارەوێ.

(أَلِّبان): شیریی.
(«هو أَخُوهُ بِلَبانِ أُمِّهِ»): ئەو برای شیرییەتی، ناوتریّت: (بِلَبَنِ أُمِّهِ).
(أَلْلَبَّان) (عند العامة): شیرفرۆش.
(أَللَّبون= أَللَبِن): شیردەر/ شیردار.
(أَللَّبون واللَبونَة (ج) لِبان ولَبِن ولُبْن ولُبُن ولَبائِن): شیردەر.
(كَم لَـبُنْ غَنَمِـكَ): چەنـد سـەر مەڕت شیردەرە.
(أَللَبـين (م) لَبينَـة): ١-شـیرەخۆرە ٢-زۆر بەشیر.
(أَللُبنـى) (ن): درەختێکە شـیلەیەکی وەك هەنگوین هەیە ڕەنگە بسوتێنرێت و بۆنەکەی بەخودا بکرێت وەك بوغورد.
(عَسَلُ اللبنى): شیلەی ئەو درەختەیە.
(أَلتَلْبـين والتَلبينَـة): شـۆربایەکە یـان خواردنێکـە لـە هەنگویـن و شـیرو کەپەك دروستدەکرێت.
(أَلمَلْبَن) (ط): جۆرە شیرینییەکە لە نیشاستەو شەکرو گوڵاو دەکرێت.
(أَلمِلْبَـن): ١-شـیر پاڵێوك ٢-(دەفـری، جامی) شیردۆشین.
(أَلمَلْبَنَة): کەوچکی ماستاوو شیر/ کەوچك.
(عُشبُ مَلْبَنَةٌ): گیاو پووشی بەشیر کە ئاژەڵ بیخوات شیری زۆر دەبێت.
(أَلمُلَبِّن) (عند العامة): شیرئامادەکار.
(أَلمَلْبون): ١-شـیرەخۆرە ٢-کەسێکە کە بە شیر مەستدەبێت.
٣-(لَبِنَ- الرَجُلِ. لَبْناً): پیاوەکە زۆریخواردەوە.
٤-(لَبِـنَ- الرَجُـلُ. لَبَنـاً): پیاوەکە ملی بە سەرینەکەی هاتە ژان.
(لِبنٌ- القَميصُ): پەخەی کراسەکە.
(أَللَبين): پەخەی کراسەکە.
٥-(لَبَّنَ): چووە ئەنجومەنێك کە پێداویستی مرۆڤی تێدا پەیدادەکرێت.
(مَجْلِـسُ لَبِنٌ): ئەنجومەنێکە پێداویسـتیی مرۆڤی تێدا پەیداو جێبەجێ بکرێت.
(أَللُبانَـة (ج) لُبان ولُبانات): پێداویسـتیی لە هەژارییەوە نەبێت بەڵکو لە پێویسـتیی و کەمبوونی شتێکەوە بێت.
(قَضَيـتُ لُبانتـي): پێداویسـتیەکەم جێبەجێکرد/ ئەو شـتەی کە پێویسـتمبوو پەیدامکرد.
٦-(لَبَّنَ): خشـتی کاڵی بڕیو دروستکرد (بۆ دوستکردنی خانوو).
(-الشيءَ): شتەکەی وەك خشتیکاڵ چوارگۆشە کرد.
(أَللَبِن واللبن واللِبْن): خشتیکاڵی چوارگۆشە.
(لَبِنَةُ): خشتێکی کاڵی چوارگۆشە.
(أَللَبَّان والمُلَبِّن): خشتبڕ.
(أَلمِلْبَـن): ١-قاڵبی خشـتیکاڵ ٢-قورکێش کە قوری تێدا بۆ خشتبڕین دەکێشرێت.

٧-(تَلَبَّـنَ- الرَجُلُ): خـۆی خایاندو درەنگی بەخۆیکرد/ خۆی هێشتەوە.

الملحق:

لبن: (لَبْنَنَ- هُ أو الشـيءَ): کردی بە لوبنانی یان شـتەکەیکرد بـە هی لوبنانو نیشـانەو سیفەتی لوبنانیی پێدا.

---

لبو: (أللَبْوة واللَبُوَة) (ح): مێشێر.

(لَبُؤة ولَباءَة ولَبْأة): مێشیر.

لبي: (لَبِيَ يَلْبى-مِنَ الطَعام لَبْياً): چێشـتی زۆر خورد/ زۆری لە خواردنەکە خوارد.

(لَبَّـى- الرَجُـلَ. تَلْبيَـةً): وەڵامـی پیاوەکەیدایەوەو وتی: وا بە دەنگتەوە هاتم.

(«بَينَهُم المُلْتَبيَة»): دانوسـان لە نێوانیاندا هەیەو هیچ لە یەکتری ناشارنەوە.

لتَ: ١-(لَتَّ- الشـيءَ. لَتّاً): ١ شـتەکەی کوتاو وردوخاشکردو هاری ٢-بەستیو شەتەکیدا.

(-السَّـويقَ): ئاردەکەی کەمێـك تەرکرد یان تێکەڵی رۆنیکرد.

(-المـاءُ الثِيابَ وغَيرَهـا): ئاوەکە جلەکە یان شتیتری تەرکرد.

(لـتّ) (عاميـة): هەڵەوەریـی زۆریکـرد/ درێژەی بە قسە هیچو پووچەکانیدا.

(لُتَّ- فُلانٌ بِفُلانٍ): فیسار بە فیسارەوە لکاو بوو بە هاودەمی.

(أللاَّتّ): ١-هارەرو وردوخاشکەر ٢-زۆربڵێ.

(ألــلاّت واللاتُ): بتێکە لە پێش ئیسـلامدا هەبو (مێیە).

(إل): خودا بە ئاشووری. واتاکەی لاتی خودا.

(أَلَّتُّ) (مص): ١-کوتانو هارین ٢-تەشوێ ٣-تەوری گەورە (فارسیە).

(أَلُتات): ١-ئەوەی پێی تەردەکەن ئاو یان رۆن ٢-وەریوی توێکڵی درەخت.

(«ماأبقـى مِنّي المَـرَضُ إلا لُتاتـاً»):دەرد/ نەخۆشی هەر پێستە وشکەکەی هێشتووەمەتەوە وەك توێکڵی دار.

٢-(ألَــتَّ- الطائِرُ): باڵندەکە سـەری بەژێر باڵیدا کردو شاردیەوە.

٣-(أَلَتْلَتَة): سوێندی درۆ.

- (عنـد العامــة): ١-قسـەی زۆری بێکەڵك ٢-خۆبەکاری هیچەوە خەریککردن.

(لَتلَــتَ): خۆی بــە کاری هیــچو پووچەوە خەریککرد. یان سوێندی درۆیخوارد.

(لَتلات (م) لَتلاتَة): کەسـێکە خۆی بەکاری بێبایەخەوە خەریك بکات یان سـوێندی درۆ بخوات.

لتـأ: (لَتَأَ- فُلاناً في صَدرِهِ. لَتأً): دەسـتی بە سنگی فیسارەوە ناو پاڵی پێوەنا.

(«لَتَأت بِهِ أُمُّهُ»): دایکی ئەویبوو.

(-هُ بِحَجَرٍ): بەردێکی تێگرت.

(-إلَيــهِ بِعَينِهِ): چاوی (لــێ دەرپەڕاند/ لێ بزکردەوە).

(-الشيءَ): شتەکەی کەمکرد/ لە شتکەی لادا.

(أَلَتــيءُ): کەســێکە خــۆی لــە جێگەکەیدا بهێڵێتەوەو نەبزوێت.

لتب: (لَتَبَ-بِهِ. لَتْباً ولُتُوباً): پێوەی نووسا/ لکا.

(-فيهِ): تیایدا (چەسپبوو/ جێگیر بوو).

(-فِي مَنْحَــرِ الناقَــةِ): کــردی بــە شــوێنی سەربڕینی مێحوشترەکەدا.

(لَتَبَ ولَتَّبَ- السَرجَ على الفَرَسِ): زینەکەی بە پشتی چارەوێکەوە توند کرد/ چەسپاند.

(«لَتَّبَ عَلَيهِ ثَوبَهُ»): بەرگەکەی بە لەشیەوە چەسپکرد وەك نەیەوێت دایبکەنێت.

(أَلْتَبَ- عليه الأمرَ): کارەکەی خستە ئەستۆی ئەو، کردی بە (پێویست/ ئەرك) بە سەریەوە.

(تَلاتَــبَ- القَــومُ): خوێشــگەل بەیەکــەوە نووسان.

(-القَــومُ بِالرِمــاحِ): بــە نێــزە بەربوونــە یەکتری.

(إِلْتَتَبَ الثَوبَ): جلەکەی لەبەرکرد.

(أَللاتِــب) (فــا): ١-پێوەنووســاو ٢-نەگــۆڕ/ بنجبەست.

(أَلِمْلْتَــب): کەســێکە ماڵــەوە بگرێــتو هەر نەیەتە دەرێ.

(أَمَلاتِب): جلی کۆنەو دڕاو.

لتــح: (لَتَحَ-هُ. لَتْحاً): چەوی بە دەموچاویدا یان بە لەشــیدا کێشــاو کاری تێکردو پێوەی دیاربوو.

(-هُ بِبَصَرِهِ): چاوی تیژ تێگرت/ تیژ چاوی تێبری.

(-فُلانــاً): فیســاری ڕووتکــردەوەو هیچــی پێنەهێشت/ هەرچی هەبوو بردی.

(لَتِحَ. لَتَحاً): برسیبوو.

(لَتْحان (م) لَتحى): برسی.

(رَجُــلٌ لَتِحٌ ولاتِحٌ ولَتاحٌ ولُتْحَةٌ (ج) لِتاح): زۆرزانێکی بە فروفێڵی ژیر.

(«هو أَلْتَحُ شِعْراً مِنهُ»): ئەو هەلبەستەکەی لە هی ئەویتر کارتێکەرترەو بەواتاترە.

(لتــخ: (لَتَــخَ- هُ لَتْخاً): پیســیکرد/ پەڵەی پیسی لێدا/ لەکەداریکرد.

(-الشيءَ): شتەکەی قڵەشت.

(تَلَتَّخَ-بالشيء): بە شتەکە لەکەدارو پیسبوو.

لتد: (لَتَدَ- فُلاناً بِيَدِهِ لَتْداً): سیخورمەی لە فیساردا/ بە دەستی تێوەیژەند.

لــتر: (أَلْلِّتْر واللِّيتر) (يونانية): لیتر پێوەری شتی شلەیە.

لتز: (لَتَزَ- هُ. لَتْزاً): ســیخورمەی لێداو پاڵی پێوەنا.

لتــم: (لَتَمَ-هُ. لَتْمــاً): ١-لێیدا/ پیایداکێشــا ٢-تیغەکەی بە لووتیدا کرد.

(-السَهْمَ): تیەرکەی وەشاند.

(-هُ بِسَهْمٍ): تیرەکەی تێگرت.

(-فُــلانٌ بِشَــفْرَتِهِ فِي لَبَّــةِ بَعيرِهِ): فیســار قەمەکەی کرد بە بەرسنگی حوشترەکەیدا.

(-تِ الحِجارَةُ رِجلَ- الماشــي): بەردەکە پێی پیادەکەی بریندار کرد.

(أَللَتَم): نۆشداریی.

لتــن: (اللاتينِــيّ (ج) لاتينيون ولاتين (م) لاتينيَّــة (ج) لاتينيَّــات): لاتینــی/ خەڵکی لاتینیوم کە یەکێکە لە هەرێمەکانی ئیتالیا.

(شَعبٌ لاتيني): میللەتی لاتینیوم.

(لُغَةٌ لاتينية): زمانی لاتینی.

لتی: (أَلَّتِي وأَلّتِ وأَللَــتْ (ج) أَللاَّتی واللاَّتِ واللَّــواتِ واللَّواتــي واللَّــوا (يحــذف التاء) واللاءی والــلاء واللاءات وفي التَثنيَة. أَللَتان واللَتا بدون (نون رفعاً) والَتي نَصباً وجَرّاً): ئەوەی/ ئــەوە (بۆ مێیــە) (ج) ئەوانەی (بۆ مــێ) (أَللَتــان) (بــۆ جووتە مــێ). ئەوانەی (أَللَتَيّا واللُتَيّا): بچووککراوەی (التی).

(أَللَتَيَّان واللُتَيان): جووتی بچووککراوەکان.

(ج) )أَللَتَيَّــات اللُتَيَّــات): ئەوانەی (بۆ کۆی مێی) بچووککراوەکان. دەوترێت.

(«وَقَعَ في اللَتيا والَّتي»): تووشــی چورتومو وەیی گرانی هەمەرەنگب فورسوو.

(«بَعدَ اللَّتَيَّا والَّتي»): پاش قســەیەکی زۆرو چەلەحانێیەكو شەرە قسە.

لث: ١-(لَثّ وأَلَثّ- بالمَكان لَثّا): لە شوێنەکەدا نیشتەجێبوو/ دانیشتو تێدامایەوە.

(-عَلَيهِ): پێی لێداگرت/ زۆری لێکرد.

(-المَطَرُ): باران چەند ڕۆژ سەرومر بوو.

(لَثَّ الشجرُ): شەونم لە درەختەکەیدا.

(أَللَثّ) (مص): شەونم/ ئاونگ.

٢-(لَثلَثَ-المَطَرُ): باران چەند ڕۆژێك درێژەی کێشاو باری.

(-بالمَكان): لە شوێنەکەدا مایەوەو نیشتەنیبوو.

(-على فلان): پێی لە فیســار کردە کەوش/ زۆری لێکرد/ پێی داگرت.

(-الرَجُلُ): لاواز بوو/ بێتینبوو.

(-البَعيرَ): حوشترەکەی شەکەتکرد.

(-هُ في التُــراب): لــە خۆڵەکەیــەوەدا/ خۆلاوییکرد.

(-هُ عَن كذا): ڕێی ئەوەیلێگرتو بەندیکرد.

(-كَلامَهُ): قسەکەی جووەوەو دەرینەخست.

(-في الأَمــر): ڕاڕایــی یــان خاوەخــاوی لــە کارەکەدا کرد.

(«لَثلِثــوا بِنــا»): کەمەکێــك ڕایانگرتین‌و خایاندینیان.

(تَلَثلَــثَ بالمَــكانِ): لە شــوێنەکەدا مایەوەو جێگیر بوو.

(-في الأَمر): لە کارەکەدا ڕاڕابوو و خاوەخاوی تێدا کرد.

(-في التُراب): لە خۆڵەوە چوو، لە خۆڵەکەدا گەوزا.

(-الغَيــمُ والسَّــحابُ): هەورەکە خاو یەك لە دوای یەك هات تۆ وا دەزانیت براوە.

(أَللَثْلَث واللَثْلاث و اللَثْلاثَة واللُثَلث): خاوو

خلیچـك‌و ته‌مه‌ڵ لـه هه‌موو شـتێكدا تۆ وا ده‌زانیت به‌ ده‌نگته‌وه‌ هاتووه‌ كه‌چی ئه‌و هه‌ر له‌ جێی خۆیه‌تی‌و ئه‌و نه‌جووڵاوه‌.

لثـأ: (لَثَأَ- الكَلْـبُ. لَثْأ): سـه‌گه‌كه‌ به‌ زمان ئاویخوارده‌وه‌.

(أَللَثَأُ): دۆشاوی دره‌خت یان جه‌وی كه‌ ده‌ریده‌دات/ ئه‌و شیله‌یه‌ی كه‌ دره‌خت ده‌ریده‌كات.

لثد: (لَثَـدَ- المَتَـاعَ. لَثْـداً): كه‌لوپه‌له‌كه‌ی له‌سه‌ریه‌ك هه‌ڵچنی‌و رێكخست.

(أَللَثْـدَة): كۆمه‌ڵـه‌ خه‌ڵكێك نیشـته‌نیبن‌و كۆچنه‌كه‌ن.

لثط: (لَثَـطَ- فُلاناً. لَثْطاً): سـووك پیایدا كێشا/ لێیدا.

(-هُ): سووك هه‌ڵیدا.

لثـع: (أَللَثْعَة): ئه‌و بن دانانه‌ی كه‌ به‌ لێوه‌وه‌ نووساوه‌،/ حاستی لێوه‌.

(أَلأَلْثَع (م) لَثْعاء (ج) لُثع): كه‌سێكه‌ كه‌ (ث)و (ع) له‌ قسه‌دا زۆر به‌سه‌ر زمانیدا دێت/ زمانپسه‌.

لثغ: (لَثِغَ وتَلاثَغَ. لَثَغاً): زمانی پسبوو.

(أَلْثَغ (م) لَثْغاء (ج) لُثغ): زمانپس.

(أَللُثغَةُ): ١-زمانپسی. ئه‌وه‌یه‌ (س) به‌ (پ) (ر) بـه‌ (غ) یان وه‌ك (ل) یان بـه‌ (ی) ده‌رببرێت ٢-زمانقورسیی له‌ قسه‌كردندا.

(أَللَثْغَة) (ع ا): ده‌م.

لثق: (لَثِقَ- اليَومُ لَثَقاً): ئه‌مرۆ بانیشت‌و شێ زۆر بوو.

(-المُسافِرُ): گوزاركه‌ره‌كه‌ كه‌وته‌ قوڕاوه‌وه‌.

(تْ ثِيابُهُ): جله‌كانی ته‌ڕ بوو.

(-الطائِرُ): باڵنده‌كه‌ په‌ڕه‌كه‌ی ته‌ڕ بوو.

(لَثِق): په‌له‌وه‌ری په‌ڕته‌ڕ.

(لَثَّقَ- الشيءَ): شته‌كه‌ی گه‌نكرد/ خراپكرد.

(أَلْثَقَ-الشيءَ): شته‌كه‌ی ته‌ڕكردو ئاویكرد.

(تَلَثَّقَ والتَثَقَ): ته‌ڕ بوو.

أَللَثَق: ١-ته‌ڕیی ٢-قوڕاو/ لیتاو.

(«مَشَينا في لَثَقٍ»): به‌ لێتاودا رۆیشتین.

(أَللَثِق): قوڕی مڵو شتی لینج.

(يَومٌ لَثِقٌ): رۆژێكی بێبای شێدار.

لثـم: ١-(لَثَمَ ولَثِمَ- الفَـمَ أَو الوَجْهَ. لَثْماً): ده‌می یان رووومه‌تی ماچكرد.

(لاثَمَ-هُ): ماچیكرد.

(تَلاثَما): ماچی یه‌كتریانكرد.

(أَللاثِم (ج) لثم) (فا): ماچكه‌ر.

(أَللَثْمَة): ١-ماچێك، جارێك ماچكردن ٢-ماچ.

٢-(لَثَمَ- أَنْفَـهُ. لَثْماً): مشـته‌كۆڵه‌یه‌كی به‌ لووتیدادا.

(-تِ الحِجـارَةُ خُفَّ البَعِـيرِ): به‌رده‌كه‌ به‌ر سمی حوشتره‌كه‌ كه‌وت‌و خوێنی لێهێنا.

(-البَعِيرُ الحجارَةَ بِخفِّهِ): حوشتره‌كه‌ به‌ سمی به‌رده‌كه‌ی شكاند.

(لَثَـمَ ولَثِمَ وتَلَثَّمَ والتَثَـمَ- الرَجُلُ. لَثْماً): پیاوه‌كه‌ ده‌مامكه‌كه‌ی له‌سه‌ر لووتی یان ده‌می توندكرد/ ده‌ماخیكرد.

(ألَلْثْم) (مص): لووتو دەوروپشتی.
(ألَلِثْمَة): شـێوەو چونیەتیـی دەماخکردن/ دەمامکبەستن.
(ألِلثـام (ج) لُثُم): دەمامـك/ ئەوەی (دەمو لووتی پێهەڵدبەمستن/ دەماخی پێدەکەن).
الملحق:
لثم: (ألمُلَثَّمون) = الطَّوارِق: دەماخکردووەکان لە خێڵەکانی بەربەرن کە لە خۆراوای باکوری ئەفەریقـان پیاوەکانیـان دەمامکدەکـەن/ دەماخـی خۆیاندەکـەن ژنەکانیشـیان ڕوو بەرەڵان.

---

لثـي: (لَثِـيَ. يَلْثى لَثـىً): چۆرێـك ئاوی خواردەوە/ دەمی تەرکرد.
(-القِدْرَ): مەنجەڵەکەی تەواو لستەوە.
(-شَـجَرُ السَـمُرِ): درەختی زەمقی عەرەبی شیلەی دەردا کە دەبێتە زەمق.
(-تِ اليَـدُ مِـن طـينٍ ونَحْوِهِ): ١-دەسـتی قوراویبوو یان شـتێتری پێوە لکا ٢-دەستی بە ڕۆن چەورو لینجبوو.
(-الثـوبُ): بـە ئـەرەق/ خوەی تـەڕ بووو پیسبوو.
(ألَثـى- شَـجَرُ السَـمُرِ): درەختـی زەمقە عەرەبییەکە شیلەی دەرداو تەڕ بوو.
(-تِ الشَـجَرَةُ ماحَولَهـا): درەختەکـە دەوروپشتی خۆی بە شیلەکەی تەرکرد.
(تَلَثّى): شیلەی درەختەکەیگرت کە دەبێتە زەمق.
(-الشَجَرُ): درەختەکە شیلەی دەردا.
(إلْتَثى): زەمقی درەختەکەی گرت.
(ألَلَثـى): ١- شـیلەیەکە لـە درەختی زەمقی عەرەبی دەردەچێتو دەبێتە زەمق.
٢-(شیری لینج ٣-ئاورنگ یان شتی وەك ئەو.
(لَثى الثَوب): پیسیی/ چڵکی بەرگ/ جل.
(ألَلثي): ئاورنگ.
(ثَوبٌ لَـثٍ): جلێکی ئارەقاویـی یان چڵکنو پیسبوو.
(ألِلثَة (ج) لِثىً ولِثاتٌ ولُثِيٌ): پووك کە دانی تێدایە.
(نبرَةُ الأَسنان) (عامية): پووك.
(ألَلثـاة = ألَلهـاة): ١-زمانـە بچکۆلـە ٢-(ن) درەختێکە.
(ألَلَثِيُّ): کەسێکە حەز لە خواردنەوەی شیری لینجو خەستبکات.
(ألحُروف ألِلثَوِيَّة): پیتی (ث) و (ذ) و (ظ) چونکە سەرەتایان لە پووکەوە دێتو بەسەرێ زمانە.
لـج: ١-(لَـجَّ. لَجَجـاً ولَجاجـاً ولَجاجَـةً): ١-لـە نەیـاریو ناکۆکیـدا (سەرسـەختیی/ بەقیناچوونی) نواند/ لاسـاربوو/ قیرسچمە بـوو/ ڕقاویبـوو ٢-بە ڕقدا کـەوتو کرداری ناشیرینی لێوەشایەوە.
(-في الأَمرِ): لەسـەر کارەکە سـوور بوو/ بە کارەکەوە لکاو بەرینەدا.

(-بِهِ الهَمُّ ونَحْوَهُ): داخ و مەراق و شتی وەها گرتی و بەرینەدا.
(-علی فُلان في المَسْأَلَةِ): لە پرسە بابەتەکەدا پێی لە فیسار داگرت کە پەلە لە جێبەجێکردنی بکات.
(لَجَّجَ- القَومُ): خوێشگەل چوونە نێرینەی دەریاکەوە.
(-تِ السَفینَةُ): پاپۆڕەکە خۆی بە نێرینەی دەریاکەدا دا.
(لاجَ- خَصْمَهُ): لەگەڵ ناحەزەکەیدا کەوتە رقەبەرایەتیەکی زۆرەوەو درێژەی دایە.
(أَلَجَّ- القَومُ): چوونە نێرینەی دەریاکەوە.
(-تِ الإبلُ): حوشترەکە کردی بە بۆرە بۆڕو کەفچەندن.
(تَلَجَّجَ- مَتاعَ فُلان): کەلوپەلی فیساری (کرد بە هی خۆی/ بە هی خۆی دانا).
(اِلْتَجَّ- البَحْرُ): دەریاکە هەستاو کەوتە شەپۆلدان و داپۆشینی دەوروپشتی.
(-تِ اللأرضُ): رووەکی زەویەکە بالاّیکردو بەگژیەکدا چوو/ زۆر بوو.
(تِ الأرضُ بالسَّراب): زەوییەکە بە تراویلکە داپۆشراو شەپۆلی بەسەردادا.
(-الأمرُ أو المَوجُ): کارەکە گرنگبوو زۆر بوو نیشتە سەریەك یان شەپۆلەکان هەستان و بەیەکیانداا.
(-الظَلامُ): تاریکیی بوو بە شەوەزەنگ/ بوو بە نەموستەچاو/ هیچ دیارنەما.
(-تِ الأَصواتُ): دەنگەکان بەیەکداچوون/ بوو بە ژاوەژاو/ تێکەڵی یەکبوون.
(إسْتَلَجَّ- مَتاعَ فُلان): کەلوپەلی فیساری بە هی خۆی دانا.
(-بيَمينِهِ): سوێندی گرانی خواردو لەسەری سوور بوو کەفارەتەکەی نەداو وای دەوت کە راستدەکات.
(أَلْلاجّ): ویرەویرکەرو رکەبەر/ هەتەر لەسەر قسەی خۆی.
(أَللُّجُّ): ١-(نێرینەی ئاو بەشی زۆری ئاوەکە ٢-خەڵکێکی زۆر/ کۆمەڵێکی زۆر ٣-تەنشتی دۆڵەکە ٤-شمشێر (بە شەپۆلی ئاو چوێنراوە).
(«فَرَسٌ أَدهَمُ لُجٌّ»): چارەوێیەکی رەشی تۆخ. رەشیەکەی شەپۆلدەدات.
(أَللُّجَّةُ (ج) لُجٌ ولُجَجٌ ولِجاجٌ): ١-زۆرینەی ئاوەکە ٢-کۆمەڵێکی زۆر.
(«فُلانٌ لُجَّةٌ واسِعَةٌ»): فیسار وەك دەریایەکی بەرفراوانە (لە داراییدا/ لە ساماندا).
(أَللَجَّةُ): ١-جارێك سەرسەختیکردن و بەقینداچوون/ لاساریکردن ٢-هەتەربوون و سووربوون لەسەر کار ٣-پێداگرتن و ورکگرتن ٤-ژاوەژاوو دەنگە دەنگێکی زۆر.
(«بَحرٌ لُجاجٌ»): دەریایەکی فراوان و بە هاژەو شەپۆل.

(«فُلانٌ فِي فُؤادِهِ لَجاجَةٌ»): فیسار له برساندا دڵی کوتەکوتیەتی.
(اَللُّجـوج واللَجوجَـة واللُجَجَـة والمِلْجـاج: اَللاّج): ١-هەتـەرو پێداگر ٢-له دوژمنایەتیدا سەرسەختو قینلەدڵو لاسـار ٣-گیرەگیرکەر ٤-له برساندا دڵەکوت.
(اَللُجِيُّ): نێرینەی ئاو/ بەشی زۆریی ئاوەکە.
(بَحـرٌ لُجَـيٌّ): دەریایەکـی فراوانـی شەپۆلفراوان.
(اَلمُلْتَجَّـة): ١-زەوییەکی زۆر سـەوزو پڕ گیا ٢-چاوێکی بەڵەك/ زۆر ڕەش.
٢-(اَللُجّ): شوێنی سەختی شاخ.
(اَللُّجَّة (ج) لُجٌّ ولُجَجٌ ولِجاج): زیو.
٣-(لَجْلَجَ. لَجْلَجَةً): له قسـەدا زمانی تێکەڵو پێکەڵبوو زمانی گرتی.
-فِي صَدْرِهِ شيءٌ: شتێك له دڵیدا گینگڵیدا.
(-اللُقْمَـةَ فِي فيهِ): پاروومکـەی بێجوون له دەمیدا هێنای‌و بردی.
(تَلَجلَج): زمانی تەتەڵەیکردو قسەی تێکەڵو پێکەڵبوو/ زمانی گرتی.
(-فِي صَـدرِهِ شَـيءُ): شـتێك لـه دڵیـدا گینگڵیخوارد.
(-بالشَيءِ): دەستی به شتەکه کرد.
(«تَلَجْلَجَ دارَهُ مِنْهُ»): خانووەکەی لێسـەند/ لێومرگرت.
(اَللَجـلاج): لاڵەپەتـە/ کەسـێکە (زمانـی قورسـبێت/ زمانی بیگرێت‌و تێکەڵو پێکەڵ قسه بکات).
لجـأ: ١-(لَجَأَ ولَجِيءَ والتَجَـأَ- الی الحُصن أو غَـيرِهِ. لَجْأً ولُجُـوءَ ولَجَأً): خـۆی دایه پەنا قەڵاکه/ پەنایبردە بەر شـتیتر/ خۆی کوتایه پاڵ شتیتر/ خۆی کوتایه قەڵاکه.
(لَجَّأَ- فُلاناً. تَلْجِئَةً): فیساری ناچارکردو ملی پێ شۆرکرد.
(أَلجأَ- فُلاناً): فیساری ناچاری پەنابردنکرد.
(-هُ): پەناو دالدەی ئەویدا.
(-أَمْـرَهُ إلى اللهِ): پەنایبردە بەر خودا/ خۆی دایـه پاڵ خودا/ هانای بۆ خودا برد/ پاڵی به خوداوه دا.
(تَلَجَّأَ-إلَيهِ): پاڵـی بەوەوە دا/ پەنای بۆ ئەو برد.
(-مِـنَ القَومِ) له خوێشـگەل تەریکبووەوەو پەنای بـۆ لایەکیتر برد وەك خۆی بداتە بەر قەڵایەك.
(اَللاّجِـيء (ج) لاجِئـون): پەنابەر/ ئاوارە. ئـەو کەسـەیە لـە وڵاتەکەی به هـۆی باری ڕامیارییەوە یـان هۆیترەوە هەڵبێت‌و پەنا بۆ وڵاتێکیتر بەرێت.
(اَلْلَجَأ) (مص): ژنی پیاو.
(- (ج) ألجاء): قەڵاو پەناگا.
(اَلتَلْجِئَة) (مـص) (عند الفقَهاء): له ڕووی دینییەوە ئەوەیـە مرۆڤێك ناچارتبکات پەنا

بەریتە بەر کردارو گوفتارێك کە پێچەوانەی راستییەکەبێت.
(أَلْمَلْجَأ (ج) ملاجِيء): ١-قەلا/ پەناگا/ شوێنی خۆشاردنەوە/ مەلاسگە ٢-پەنابردن ٣-ژێرزەمین کە لە کاتی بوردوماندا لە شاراندا خەلك پەنا دەبەنە بەری خۆیانی تێدا دەشارنەوە.
٢-(لَجَأَ- فُلانٌ مالَهُ تَلْجِئَةً): فیسار سامانەکەی بە هەندێك میراتگر داو هەندێکی لێبێبەشکرد.
(أَلْلَجَأ): میراتگر.
٣-(أَلْلَجَأُ والواحِدَةُ. لَجَأَةٌ) (ح): جۆرە کیسەلێکە لە ئاوو وشکانیدا دەژی.
لجب: ١-(لَجِبَ- البَحرُ لَجَباً): دەریاکە هەستاو رووژا.
(-القَومُ): خوێشگەل کەوتنە هاتو هاوارو رووژان.
(أَلْلَجَب) (مص): ١-حیلەی ئەسپ ٢-نەعرەتەی زۆری پالەوانانو قارەمانان.
(«بَحرٌ ذو لَجَب»): دەریایەکی رووژاوو/ هەستاوو شەپۆل بە شلپەو بە هاژەوە بەیەکدا کەوتوو.
(أَلْلَجِب): ١-بە هاتو هاوار/ بە دەنگە دەنگو ژاوەژاوو٢-ژاوەژاو/ قرەقر/ غەلبەغەلبی زۆر.
(جَيشٌ لَجِبٌ): سوپایەکی بێشوماری بە غەلبەو دەنگو ترپەترپ.

٢-(لَجُبَ-تِ الشاةُ لُجُوبَةً) (ضد): ١-مەرەکە شیری کەمبوو ٢-شیری زۆر بوو.
(لَجَّبَ-تِ الشاةُ) (ضد): ١-مەرەکە شیری کەمبوو ٢-شیری زۆر بوو.
(-هُ بالسَّيفِ): بە شمشێر لەتیکرد/ بری.
أَلْلَجْبَةُ واللِجْبَةُ واللُجْبَةُ واللَجَبَةُ واللَجبَةُ واللِجَبَةُ (ج) لِجاب ولَجَبات) (ضد): ١-مەری کەمشیر ٢-مەری فرە شیر/ زۆر بەشیر.
٣-(أَلْمِلْجاب): تیرێك پەری پێوەکراوەو نووکی پێوە نەکراوە.
لجذ: ١-(لَجَذَ ولَجِذَ – الرَجُلُ. لَجْذاً): پیاوەکە خواردنی خوارد.
(-الحِمارُ): کەرەکە لەوەری سەرەتای خوارد.
(-تِ الماشِيَةُ الكَلأَ): ئاژەلەکە سەرقرتی گیاکەیکرد/ بە زمان گیاکەی گرتو خواردی.
(-مِنَ الشيءِ): کەمەکێکی لە شتەکە برد.
(-الكَلْبُ الإناءَ. لَجْذاً ولَجَذاً): سەگەکە ناوی قاپەکەی لستەوە.
٢-(لَجَذَ ولَجِذَ- الرَجُلُ لَجْذاً): پیاوە دەرۆزەکەرەکە جارێك شتێکیاندایە کەچی هەر داوایدەکرد.
(-فُلاناً): تێزە تێزەی فیساریدا/ هانیدا.
(«لَجَذَني على كذا»): هانی ئەوەیدام/ بۆ ئەوە تێزەتێزەیدام.
لجف: ١-(لَجَفَ-هُ. لَجْفاً): تێرو توند لێیدا.
٢-(لَجِفَ-تِ البِئْرُ. لَجَفاً): ئەملاولای

چاڵاوەکە داکەوتو خورا/ داروخا.
(لَجْفاء): بیری ئەملاولا (داکەوتوو/ داروخاو).
(لَجَّـفَ- البئــرَ): ئەمــلاولای چاڵاوەکــەی هەڵکەند/ دایخوراند/ دایروخاند.
(-الشَيءَ): شتەکەی لەملاولایەوە فراوانکرد.
(تَلَجَّـفَ- البِئْــرَ): تەنشــتەکانی بیرەکــەی هەڵکەند.
(تِ البئْــرُ): ١-چاڵاوەکە ئەملاولای هەڵکەنرا ٢-ئەمــلاولای چاڵاوەکــە داخــوراو داکەوت/ داروخا.
(-الوَحشُ الكناسَ): درندەکە تەنشــتەکانی لانەکەی/ کونەکەی هەڵدری/ هەڵکەند.
(إلْتَجَـفَ-تِ البئــرُ): ئەمــلاولای چاڵاوەکە داخورا/ داروخا.
(ألْلَجَف (مص) (ج) ألْجاف): ١-دادرانی قەراغی چــاڵاو یان ئەوەی کە ئــاو خواردوویەتیەوەو داخوراوە ٢-بەربەســتی لافاو ٣-ناوەندو ناوی دۆڵ.
(ألِلجاف (ج) ألْجِفَة ولُجُف: ١-لووتی شــاخ کە بەسەر ئەشــکەوتدا بروانێتو شــۆڕبێتەوە ٢-داری گرێژەنەی دەرگا.
(ألْلَجيفَة): باهووی دەرگا/ لاشیپانی دەرگا.
(بئرٌ مُلتَجِفَةٌ): چاڵاوێکی/ بیرێکی داروخاو.
لجم: ١-(لَجَمَ- الثَوبَ لَجْماً): جلەکەیدروو.
(لَجَّمَ- الماءُ فُلاناً): ئاوەکە گەیشــتە حاســتی دەمی فیسار.

(ألْجَمَ- الدابَّةَ): ولاخەکەی لغاو کرد.
(-الناقَةَ): بە لغاو داخی مێحوشــترەکەیکردو نیشانەیکرد.
(-القِدرَ): دارێکی خستە دەسکی مەنجەڵەکەوە پێیهەڵگرت.
(-هُ عَن حاجَتِهِ): نەیهێشت پێداویستیەکەی بەدەست بهێنێت.
(«تَكَلَّمَ فَأَلْجَمْتُهُ وأَلْقَمْتُه الحَجَر»): قسەیکرد نەمهێشتو قورم بە دەمیدادا.
(لَجَمَ- الماءُ فُلاناً): ئاو گەشتە دەمی فیسار.
(إلْتَجَمَ-تِ الدابَّةُ): ولاخەکە لغاوکرا.
(إسْــتَلْجَمَ- فُلاناً الفَرَسَ): داوای لە فیســار کرد چارەوێکە لغاوبکات.
(ألْلَجْمَة): شوێنی لغاوکردنی چارەوێ/ یان بە سەروکەڵلەوە کردنی رشمە.
(ألِلجام): نیشانەیەکی حوشترە.
اللِجام (ج) لُجْم ولُجُم وألْجِمَة: لغاو: ئاســنی ناودەمو ئەمســەرو ئەوسەری ئاسنی ناودەمو، ئــەو قایشــەی ئاســنەکەی پێوەیــەو بەلای کاکیلەی ئەســپەکەدا بە پقایش بەستراوە بە لغاوەکەوە.
(«جاءَ فُلانٌ وقد لَفَظَ لِجامَهُ»): فیسار هات لە شەکەتیدا وازی لە پێداویستیەکەی هێنا.
(ألْلَجّام): لغاو دروستکەر.
(ألْمُلَجَّــم): شــوێنی لغاوکردنی چــارەوێ لە سەروکەڵلەی یان دەمیدا.

٢-(أَلْلُجم) (ح): ١-شـەوگەرد ٢-(ح)بۆقەكان.
٣-(ح)ولاخێك كە بە بەدووم دابنرێت ٤-هەوا.
(أَلْلَجَم (ج) أَلْجـام): زەوییەك تەختبێت نە بەرزو نە چاڵبێت.
(أَلْلَجَم واللُجَم) (ح): ١-شـەوگەرد ٢-بۆقەكان ٣-ولاخێك كە بە بەدووم دابنرێت.
(أَلْلُجام): ئەوەی بە بەدووم دابنرێت و سـڵی لێبكرێتەوە.
(أَلْلُجمَة):١-شاخی تەخت ٢-ناوێكە لە ناوەكانی زەوی.
(لَجْمَةُ الوادي): كەناری دۆڵ یان دەمی دۆڵ.
(أَللَّجمَة) (ح): ١-سیسـەمارێك/ شەوگەردێك ٢-ناوێ/ لە ناوەكانی زەوی.
(لَجَمَةُ الوادي): كەناری یان دەمی دۆڵەكە.
(أَلمِكيالُ المُلْجَم): دوو صاعو نیوە/ پێوەرە.
لجن: (لَجَنَ ولَجَّنَ- وِرَقَ الشَجَرِ ونَحْوَهُ لَجْناً): گەڵای دارو شـتی وەهای تێكەڵی ئارد كرد یان جۆ كرد كردی بە ئاڵفی حوشتر تا قەڵەو بن.
(لَجِنَ-بِهِ لَجَناً): پێوەی لكا. هەڵواسرا.
(تَلَجَّنَ- الشيءُ): شتەكە لینجبوو.
(-القَومُ): خوێشگەل گەڵاو كاو شتی وەهایان لە كەپەكو جۆوەدا بۆ چوارپێكانو حوشترەكان.
(-رأسُهُ): سەری چڵكنبوو.
(أَللَجِن): چڵكن.
(أَللَجـين): ئاڵفی تێكەڵ لە گـەڵاو كاو جۆو كەپەكو پێكهێنراو بۆ ولاخو بۆ حوشتر.

٢-(لَجَنَ- في المَشي لُجُوناً ولِجاناً): لە ڕۆیشتندا پێگرانبوو.
(-البَعيرُ): حوشترەكە مانیگرت.
(أَللَجـون مِـنَ الجمـال والنُوق): حوشـترو مێحوشتری سستەپێ.
٣-(أَللَجْنَـةُ): لیژنە/ كۆمەڵێـك كۆدەبنەوە بـۆ تەماشـكردنی كارێـكو پوختەكردنـی (یان یۆنانیە لە (لیجـون)ەوە وەرگیراوە یان (لاتینیة) لە (لیجیو)وە وەرگیراوە.
(أَللُجَين): زیو (بچووككراوەیەتی).
(أَلُجَينِية): دراو/ پارە، لە (اللَجيف)ەوەیە.
لَجـيَ: (إلتَجی- الی غیرِ قَومِهِ): خۆی بە هی خوێشگەلو نەتەوەیەكیتر دانا.
(أَللَجاةُ) (ن): ڕووەكێكی شاخاوییە گوڵەكەی زێرینییە.
لحّ: ١-(لَـحَّ-تِ العَینُ لَحّاً ولَحَحـاً): پێڵووی چاوەكە بە ڕیپۆق پێكەوە نووسا.
(أَلَـحَّ-في السـؤالِ): لـە پرسـیاركردندا یان سـواڵكردندا وازی نەهێناو پێیداگرت/ سوور بوو لە سەری.
(-الجَمَلُ): مانیگرت.
(-تِ أَلمَطِـيُّ): ماكەرەكـە پەكیكەوت ماندوو بوو سستەپێبوو.
(-السَحابُ بالمَطَرِ): بارانەكەی سەرومڕ بوو/ درێژەیكێشا/ بەردەوامبوو.
(-القتبُ على ظَهرِ الدابَّةِ): كورتانەكە پشتی

ولاخەکەی بریندار کرد/ ناوکەڕێژیکرد.
(تَلَحَّـحَ- علیه): زۆری لێکـرد/ پێی لێکردە کەوش/ پێی لێداگرت.
(ألَلاَّحُ) (فا): لەسەر شت ڕۆیشتوو/ پێلێداگر/ هەتەر.
(مَـکانٌ لاحٌ ولَحِـحٌ): شـوێنێکی (تەسـك/ تەنگەبەر)/ بە ڕاستی.
(ألَلَحّ) (مص): بەڕاست/ پێوەنووساو.
(«هو ابن عَمِّي لَحّاً»): ئەو ئامۆزای ڕاستیمە/ ئامـۆزای باوکبرایـن (ئەمە بۆ مـێو دوانو کۆیش هەروەهایە).
(أَلمِلْحـاح): ١-زۆر (پێداگـر/ لەسەرشـت ڕۆیشـتوو) هەتەر ٢-کورتانێك کە پشتی ولاخ ناوکەڕێژ بکات بریندار بکات.
(سَـحابٌ مِلْحاح): هەورێکی (هەمیشە باران/ بە بارانێکی زۆر).
٢-(لَحْلَحَ- القَومُ) (ضد): ١-خوێشگەل شوێنەکەیان (بەرنەدا/ جێنەهێشت) ٢ دوورکەوتنەوە.
(«لَحْلَحَ علیه» (عامیة): ١-زوو زوو سـەری لێداو لێینەگەڕا ٢-سەری کردە سەری.
(تَلَحْلَحَ- القَومُ) (ضد): ١-خوێشگەل شوێنەکەیان (جێنەهێشـت/ بەرنـەدا) ٢-شـوێنەکەیان جێهێشتو دوورکەوتنەوە.
(ألَلَحْلَح): شوێنی (تەسك/ تەنگ)/ تەنگەبەر.
(أَلُلَحْلَـح): ١-سـەرداری نەتەوەو خوێشـان ٢-گەورە/ ئاغا.

لحب: (لَحَبَ- الطَریقَ لَحْباً): ١-ملی ڕێگەکەی گرتو ڕۆیشت ٢-دەریخست/ ڕوونیکردەوە.
(-الشيءَ): کاری لە شتەکە کرد.
(-بِفُلانٍ الأَرضَ): فیساری بە زەویدا دا.
(-اللَّحْمَ): گۆشتەکەی ڕاستەبڕکرد.
(-اللَحْـمَ عَـنِ العَظْـمِ): گۆشـتەکەی لـە ئێسـقانەکە کردەوە/ ئێسـقانەکەی (داماڵی/ ڕووتکرد).
(- الرَجُلُ): ڕاست ڕۆیشت یان خێرا ڕۆیشت.
(- الطَریقُ. لُحُوباً): ڕێگەکە دیاربوو.
(- ظَهرُ الفَرَسِ): پشـتی ئەسـپەکە لووسو خزو لێژ بوو.
(لَحِبَ- الرَجُلُ. لَحَباً): پیاوەکە پیریی گۆشتی شلکرد گۆشتەکەی داکەوت.
(- لَحْمُ زَیدٍ): گۆشتی لەشی زەید لەڕ بوو.
(لَحَّبَ-الشـيءَ): ١-کاری لـە شـتەکە کـرد ٢-شتەکەی پارچەپارچەکرد.
(-فُلاناً): فیسـاری (سەرشـۆڕ کرد/ زەبوون کرد).
(-هُ بِالسَّـیفِ): بە شمشـێر لێیدا/ دایە بەر شمشێر.
(اِلْتَحَبَ-الطریقَ): ڕێگەکەیگرت/ بە ڕێگەکەدا ڕۆیشت.
(أَللاّحِب): ڕێگەی دیارو ئاشکرا.
(«طریقٌ لاحِب»): ڕێگەیەکی دیارو ئاشـکرا وەکو خۆڵی لەسەر لابرابێت.

(- (ف): ڕێڕەو.
(أَلَّلَحْب) (مص): ڕێگەی ڕوونو دیار/ ئاشکرا.
(أَلَّلَحِيب) (ح): مێحوشترێك گۆشتی پشتی کەمبێت.
(أَلِملْحَب): ١-جنێوفرۆش، زمانپیس ٢-هەرچی شتی پێ لەتبکرێت یان توێژگرە ٣-زمانی پاراوو ڕەوان.
(أَلَّلحوب) (مفع): گۆشتداماڵراو.
(رَجُلٌ مَلحوب): پیاوێکی گۆشتداماڵراو/ لەر.
(طريقٌ مَلْحوب): ڕێگەیەکی دیار/ بەرچاو.
(طَريقٌ مُلَحَّبٌ): ڕێگەیەکی دیارو ئاشکرا.
لحت: (لَحَتَ-العَصا. لَحْتاً): داردەستەکەی ڕووتکردت توێکڵی داردەستەکەی گرت.
(-فُلاناً بالعَصا): بە داردەست لە فیساریدا.
(-الرَجُلَ): پیاوەکەی ڕووتکردەوە هەرچی هەبوو لێیسەندو بردی.
(«لَحَتُوكُم كما يُلْحَتُ القَضيبُ»): وەك چێو ڕووتیانکردنەوەو هیچیان پێنەهێشتن.
(أَلَّلَحْت) (مص): پوختو ڕاستو ساغ.
(أَلَّلحاتَة): توێکڵی گیراوی شت.
لحج: ١-(لَحَجَ-إلَيـهِ. لَحْجاً): هانای بۆ برد/ پەنای بۆ برد/ دالدەی بدات.
(لَحِجَ- الشـيءُ. لَحَجاً): شتەکە هاتەوەیەك/ تەسکبووەوە.

(-السَّـيفُ ونَحْوُهُ): شمشێرەکە یان شتی وەها لە کێلانەکەیداو لە شوێنەکەیدا گیربوو دەرنەهات.
(-بالمَكانِ): لە شوێنەکەدا مایەوەو گیربوو.
(-اللحيُ): چەناگەی، کاکیلەی خواربوو.
(أَلْحَج): (کاکیلە/ چەناگە) خوار.
(لَحَّـجَ- عَلَيـهِ الخَبَـر): هەواڵەکەی لێ هەڵگێڕایەوەو ئەوەی پێنەوت کە دەیزانیو لە دڵیدا بوو.
(لَحْـوَجَ- عَلَيـهِ الأَمرَ): کارەکەی تێکەڵو پێکەڵکردو ئەوەی کە دەیزانی پێینەوت.
(أَلْحَجَ-هُ إلَيهِ): ناچاریکرد پەنای بۆ بەرێت.
(تَلَحَّجَ الأَمرَ على فُلانٍ): کارەکەی لە فیسار هەڵگێڕایەوەو ڕاستیەکەی پێنەوت.
(إلْتَحَجَ- إلَيهِ): بەلای ئەودا لایدا/ ڕوویکردە ئەو.
(-فُلاناً إلَيهِ): ئەو فیساری بەلای ئەودا لاداو پەنای بۆ ئەو پێبرد.
(إسْـتَلْحَجَ- البـابُ): دەرگاکە گیربوو نەکرایەوە.
(أَلَّلُحْج (ج) أَلحاج): بارگەو بنە.
(مَكانٌ لَحِجٌ): شوێنێکی تەسك/ تەنگ.
(أَلَلاجِج): دەربەندەکان.
(أَلَلاحيج): ڕێگە تەسکەکانی ناوشاخ.
أَلمُلْحَج: پەناگا. کەورگی شاخ.
(«إنَّ في الناسِ لَمُلْحَجاً»): لەناو خەڵکدا هەیە

پەنادەرە (دالّدەی/ پەنای) خەلّکدەدات.

(قفـلٌ مُلْحَــجٌ): کولّۆمێکــی/ قفلێکی گیرو فتیمبوو کە نەکرێتەوە.

(أَلْمُلْتَحَج): پەناگا/ کەورگی ناوشاخ.

٢-(لَحَجَ-هُ لَحْجاً): لێیدا.

(-هُ بعَینِهِ): بە چاویەوە کرد.

(لَحجَ-ت عَینُهُ): چاوی ڕیپۆقی کرد.

(أَللَحْج) (ع ا): شــوێن ئێســکی بــرۆ، کە بە سەرچاوەوەیە.

(أَللُحْج (ج) أَلحاج): ١-شــوێنی برۆی سەرچاو ٢-گۆشەی خانوو ٣-هەموو لووتو دەرچوویەکی شـاخ کە بەســەر شــوێنێکی نەویوەوە بێت ٤-کەنارو تەنشتی دۆلّ.

(أَلْلَحَج): ڕیپۆقی چاو.

لحد: (لَحَدَ-المَیتَ لَحْداً): مردووەکەی ناشت.

(-اللَحْدَ): گۆڕەکەی هەلّکەند.

(-لِلْمَیتِ): گۆڕێکی بۆ مردووەکە هەلّکەند.

(-السَــهْمُ عَنِ الهَدَفِ): تیرەکە نیاشــنەکەی نەپێکاو لایدا.

(-الی فُلانٍ): بەلای فیساردا لایدا.

(-فِي الدینِ): لە دین لایداو کافر بوو.

(-عَلَيَّ فِي شَــهاداتِهِ): لە شایەتیەکەدا لایداو گوناهی بەرامبەرمکردو ڕاستی نەوت.

(لاحَدَ-صاحِبَــهُ مُلاحَــدَةً): هەریەکەیــان بەرامبەر دۆستەکەی ڕاستی نەکرد/ بەرامبەر یەك خوار بوون.

(أَلْحَدَ المَیْتَ وإلحاداً): مردووەکەی ناشت.

(- واللَّحــدَ لِلمَیِّــت): گۆڕی بــۆ مردووەکە هەلّکەند.

(-عَــنِ الدینِ): ١-لــە ئاین لایــداو کافر بوو گومانی لە بوونی خــودا دەربڕی/ گومڕا بوو ٢-ســەرپێچی لە فەرمانو ڕێی ڕاســتی خودا کردو ســتەمیکردو گومانی لــە بوونی خودا کرد/ گومڕا بوو.

(أَلحَدَ-فِي الحَرَم): (ئەوەی کە لای موسولّمانان پــیرۆزە/ حەرەمی مالّی خــودا)ی ئەتککردو بێحورمەتکرد/ سووکیکردو شکاندی.

(-السَــهْمُ الهَــدَفَ): تیرەکــە لــە لایەکــی نیشانەکەوە کەوت.

(-بِهِ): بێڕێزیکردو شتی ناڕەوای دایە پالّی.

(إِلْتَحَدَ- عَــنِ الدینِ): لە ئایــن لایداو کافر بوو/ گومڕا بوو.

(-إلى کذا): بەلای ئەوەدا لایدا.

(-إلى فُلان): پەنایبردە بەر فیسار.

(أَللاحِد) (فا): کەندڕکردی گۆڕ.

(«قَــبْرٌ لاحِد»): گۆڕێــك کەنــدڕ کرابێت/ گۆڕێکی گەندردار.

(أَللَحْــد واللُحْد (ج) أَلْحاد ولُحُــود): ١-کەندڕێکی تەنشــتی گۆڕەکــە (بۆیــە وا ناونــراوە چونکە لە ناوەڕاســتی گۆڕەکەداو لە تەنشــتەوە ئەو کەندرە دەکــەن) ٢-گۆڕ. لــە منجەکەدا ئاوایــە (چونکە لە ناوەڕاستی گۆڕەکە بە هەردوو تەنیشتدا لای داوە).

(الإلحـــاد: ١-لادان ٢-كفركـــردنو بێبڕوایی بە بوونی خودا.

(اَلُّحُود): کەچ/ خوار/ لادەر/ خێچ.

(اَلْمُلْحِد (فا) (ج) مَلاحِدَة ومُلْحِدون): بێبڕوا بە بوونی خودا/ کافر.

(اَلْمَلاحِـــدَة): دەســـتە بێبڕوایەکــن بە بوونی خوداو بڕوایان بە بوونی خودا نییە.

(اَلدَهْرِيُون والدُهرِيَّة): دەستە بێبڕوایەکن کە پێیاندەوترێت (ڕۆژگاریەکان، ڕۆژگەریەکان) بڕوایان بە ئەوە دنیا نییە.

(اَلْمَلْحود): گۆڕ. گۆڕی کەندرکراو.

(«قَبرٌ مَلْحود»): گۆڕێکی کەندردار.

(اَلْمُلحادَة): کەسێکە زۆر دژی دینەو بە خراپ لێیدەدوێت/ گومرا بووە.

(اَلْمُلْتَحَـــد): پەناگـــا/ دالدەگـــا. چونکە ئاوارە پەنای بۆ دەبات.

لحز: ١-(لَحَزَ-هُ لَحْزاً): پێی لێداگرت/ زۆری لێکرد.

(لَحِزَ. لَحَزاً): چرووکییکرد/ ڕژد بوو.

(لِحْز ولَحِز): چرووك/ پیسکە/ ڕژد.

(تَلَحَّزَ): چرووکییکرد/ ڕژد بوو.

(تَلاحَزَ- القَومُ): خوێشگەل شەڕە قسەیانکردو بە گژ یەکدا چوون.

(-الصبيانُ): منداڵەکان شەڕە شیعریانکرد.

(اَلْمَلْحَــز (ج) مَلاحِز): ١-دەربەند ٢-تەنگانە/ تەنگیی ئیش و کار.

(«وقَعوا في الملاحِز»): کەوتنە تەنگانەوە.

(اَلْمُتَلاحِز مِنَ الشَّجَر): درەختی بەیەکداچووی چڕ.

٢-(تَلَحَّزَ): بە خواردنی هەنار یان هەڵووژەو لــەو بابەتـــە دەمی پڕ بـــوو لە ئـــاو/ دەمی ئاویکرد/ ئاوی تێزا).

٣-(تَلَحَّزَ): بۆ شەڕ یان گوزار چاکی بەلادا کرد/ خۆی (خڕهەڵدا/ ئامادە کرد/ کۆکردەوە).

٤-(تَلَحَّزَ- عَنهُ): لێی دواکەوت.

لحس: ١-(لَحِـــسَ- الدودُ الصُوفَ. لَحْســـاً): مۆریانەکە خوریەکەیخوارد.

(-الجَرادُ الخَضِرَ): کوللە سەوزاییەکەیخوارد.

(-القَصْعَةَ. لَحْســـاً ولَحْسَةً ولُحْسَةً ومَلْحَساً): لەگەنەکەی بە پەنجە یان بە زمان لستەوە.

(لَحَّسَ- هُ الشيءَ): شتەکەی پێلستەوە.

(أَلْحَـــسَ-تِ الأَرْضُ): زەویەکـــە ســـەری ڕووەکەکەی دەرکرد.

(ـــتِ الماشِـــيَةَ): ئاژەڵەکـــەی لـــە گیـــا تـــازە دەرچووەکەدا لەوەڕاند.

(اِلْتَحَـــسَ- مِنـــهُ حَقَّـــهُ): مافەکـــەی خۆی لێسەندەوە.

(سَنَةٌ لاحِسَة): ساڵێکی سەختو تەنگانە.

(أَخَذَتْهُـــم لواحِسُ»): ســـاڵانێکی ســـەخت دایگرتن سەوزایی لێبڕین.

(لاحِسَةُ السُكَّر) (ح): شەکرلیس/ موریانێکە لـــە کۆمەڵـــەی کلکدارەکانـــەو ڕەنگزیوییـــە.

ئازا بــه دیواری خانوانــدا هەڵدەزنێت کتێب دەقرتێنێــتو دەخــوات بــه شــەکرەمەنیو نیشاستە دەژی لەبەرئەوە زیان بە ئازووخەی ماڵان دەگەیەنێت.

(أَللاحوس): ١-بەدوومێك كەسـێكی شــووم کە ســەری خوێشــگەلەکەی بخوات ٢-بەرچاو تەنگێك كە هەرچی بەرچنك بکەوێت دەستی بەسەردا بگرێت/ بیماشێتەوە.

(أَلَلْحَس) (مص): سەری گیای تازە دەرهاتوو کە ماڵیات دەیبینێت سەرقرتیدەکاتو زمانی پێدا دەهێنێت.

(«مالَك عِندي لُحْسَــةٌ»): هیچ شــتێکت لای من نییە.

(أَللَحّاس): فرەلێس/ خۆشلێس.

(أَلْلَحّاسَة): ١-مێی وشەی (أَللَحّاس) ٢-مێشێر/ ماشێر.

(أَلَلَحُــوس): ئەوەی دوای شــیرینی دەکەوێت وەك مێش حەز لە شیرینی دەکات.

(أَلَلحْوُس والمُلْحِس): چاوبرســی کە هەرچی بەرچنگ بکەوێت بیبات.

أَلمُلْحَس: ١-چاوبرسیو بەهەڵپە ٢-ئازاو بەهەڵپە.

٢-(أَلُلْحُسُــم (ج) لَحاسِم): شیوی تەسکی ناو دۆڵ.

لحــص: ١-(لَحَــصَ- خَبَــرَ فُــلان. لَحْصاً): زۆر ســۆراغی هەواڵی فیســاریکرد وردە وردە دەریخستو بۆی دەرکەوت.

(لَحَّصَ- خَبَرَهُ): زۆر بە دوای هەواڵیدا گەڕاو بۆی دەرکەوت و دەریخست.

(إِلْتَحَــصَ- البَيضَــةَ ونَحْوَهــا): هێلکە یان شتەکەی کەم کەم خوارد.

٢-(لَحَــصَ-فِي الأَمرِ- لَحْصاً): لــە کارەکەوە گلاو تێوەیچوو.

(لَحَّصَ-فِي كذا): لەوەدا گیربوو و خۆی ماندوو کردو سۆراغیکرد.

(-هُ عَن كذا): ڕێی ئەوەی لێگرتو نەیهێشتو بەندیکردو ساردیکردەوە.

(-الكِتابَ): کتێبەکــەی تۆکمەکرد یان چاك فێریبوو.

(إِلْتَحَصَ-الأَمرُ): کارەکە سەختو گرانبوو.

(-هُ عَن كذا): ڕێی ئەوەی لێگرتو نەیهێشت. ساردیکردەوەو بەندیکرد.

(-هُ إِلى كذا): ناچاری ئەوەیکرد بۆ ئەوە پاڵی پێوەنا پەنای ئەوەی پێبرد.

(-هُ الشــيءُ): گرفتــاری شــتەکەی کــرد/ تێوەیگلاند/ خەریکیکرد.

(-تِ الإبرَةُ): کونی دەرزییەکە گیرا.

(-ت عَينُــهُ): چــاوی بە ڕیپــۆق بەیەکەوە نووسا.

(أَللَحَص): چرچیو کرژیی پێڵووی سەرەوەی چاو.

لَحاص: ســەختییو وەیو نەهامەتیی گرانو وشکەساڵییو تووش.

(أَلْلَحيص): تەسك/ تەنگ.

(أَلْلَحَص): پەناگا/ دالْدەگا.

٣-(أَلْلَحْصان): ڕاكردنو خێرایی.

لحـط: (لَحَطَ-ه. لَحْطـاً): ١-ئاورشـێنیكرد ٢-ڕازاندیەوە.

(إِلْتَحَطَ- الرَجُلُ): پیاوەكە تووڕە بوو.

لحـظ: ١-(لَحَظَ الفُلانَ وإِلى فُـلانٍ بالعَين. لَحظاً ولَحَظاناً): ١-بە تیلەی چاو بە ڕاسـتو چەپدا تەماشایكرد ٢-چاودێرییكرد.

(لَحَـظَ ولَحَّـظَ- البَعـيرَ لَحْظـاً وتَلْحيظاً): نیشانەیەكی بۆ حوشترەكە لەژێر چاویدا كرد.

(لاحَظَ-هُ. لِحاظاً وملاحَظَةً):١-چاودێرییكرد ٢-هەریەكەیان چاودێریی ئەویتریانیكرد.

تَلَحَّظَ الشيءُ: شتەكە تەسكبوو/ هاتەوەیەك.

(أَللاحِظَـةُ (ج) لَواحِـظ): ١-مێـی وشـەی (اللاحِظ) ٢-چاو.

أَلْلَحْـظ (مص) (ج) لِحـاظ وأَلْحاظ): ناوی چاو.

(أَلْلَحْظَـة (ج) لَحَظـات): كاتێكی زۆر كورت هێنـدەی تیلەتێگرتنێكـی چـاوی خێـرا/ چاوترووكانێك.

(«جَلَستُ عِندَهُ لَحْظَةً»): چاوترووكانێك لە لای دانیشتم.

(أَلْلَحاظ واللِحـاظ (ج) لُحُظ)١-تیلەی چاو/ گۆشـەی چاو لای لاجانگەوە ٢-نیشـانەیەكی ژێرچاو.

(أَلْلَحَّاظ): زۆر بە دیقەت.

(أَلْلَحُوظ): تەسك/ تەنگ.

(أَلتَلْحيظ) (مص): نیشانەكردن لەژێر چاودا یان نیشانەیەك لەژێر چاودا.

(أَلْمَلْحَـظ (ج) مَلاحِـظ): ١-بـە تیلەی چاو تەماشاكردن ٢-ئەو شـوێنەی بە تیلە تەماشا دەكرێت.

٢-(تَلاحَظَ-تِ الأَشياءُ): شتەكان لە یەكچوون.

(أَحوالُهم مُتَشـاكِلَة مُتَلاحِظَة): گوزەرانو بارییان وەك یەكەو لە یەك دەچێت.

(أَلَلَحيظ): چونیەك/ هاوشـێوە/ هاوڕەنگ/ هاووێنە/ لەیەكچوو.

٣-(أَللِحاظ): ١-حەوشەی خانوو.

(لِحاظُ السَهْم): ئەو بەشە تیرەی كە لە سەروو پەڕەكەوەیە.

(لِحاظُ الريشة): بەشی خوارووی پەڕەكە كە سپییە.

الملحق:

لحظ: (أَلملاحَظَة): چاودێریی شتێك یان بارو ڕەوشێك بۆ ئامانجێكو نیازێك/ تێبینی.

(«مراقبة شَخص»): چاودێریكردنی كەسێك.

(ملاحظة سـير الكواكِب): چاودێری بزوەو ڕۆیشتنی هەسارەكان.

(الملاحَظة): تێڕوانین/ دەربڕینی ڕادەربارەی كارێك یان تێهەڵكێشكردنی قسەیەك قسەكەو ڕاكە وەربگیرێت یان وەرنەگیرێت.

٢-(لَـطَّ- الرَجُلَ. حَقَّهُ وعَـن حَقِّهِ. لَطّاً): چاوپۆشـی له ماڤ پیاوەکه کرد/ حاشـای له مافەکەیکرد.

(-هُ بالعَصا. لَطّاً): بەدار لێیدا.

(أَلَطَّ- الغَريمُ): ناحەزەکه یان وامومرگرەکه حاشـای له مافەکه کرد/ نکوولیی له مافەکه کرد/ لەو وامەی وەریگرتبوو کرد.

(أَلَطَّ و تَلَطَّطَ- حَقَّ فلان): حاشـای له ماڤ فیسار کرد.

(تَلَطَّى- حَقَّهُ): حاشای له مافەکەیکرد (بۆیە وا دەوترێت چونکه سـێ(ط) بەیەکەوە بێت ناخۆشە.

(أَلَّلَطَط): حاشـاکردنی له مـاڤ وامومرگر/ نوکولیی لێکردن.

٣-(أَلَـطَّ- فُلانـاً): کۆمەکـی فیسـاریکرد/ باربوویکرد.

٤-(أَلـلاطّ والمِلَـط): ١-پیـس/ گـەن، ناپاك ٢-دەستپیس/ ناپاکیکرد.

لطأ: (لَطَـأَ- بالأَرضِ. لُطُوءً): به زەویەکەوە نووسا.

(-هُ بالعَصا): بەدار به پشتیدا کێشا.

(لَطِيَءَ- بالأَرضِ. لَطْأً): به زەویەکه نووسا.

(أَللاطِئَـةُ): ١-باجێـك کـه هـەر لـه کۆڵ نەبێتەوەو تەواو نەبێت ٢-شـکاندنێکی سەر که بگاتە مێشك ٣-کڵاوێکی بچووك به سەرەوە بنووسێت.

أَلمَلْطَأ والمِلْطَـأَةُ): توێژاڵێکی تەنکه له نێوان ئێسقانی سەرو گۆشتەکەی.

لطث: ١-(لَطَثَ- هُ. لَطْثاً): ١-به شـتێکی پان لێیدا ٢-توند لێیدا ٣-پاڵی پێوەنا.

(-هُ بحَجَر): بەردێکی تێگرت/ بەردێکی پێدا کێشا.

(-هُ الأَمرُ): کارەکەی بۆ گرانبوو یان لێیچووە بەست.

(تَلاطَثَ- المَوجُ): شەپۆڵەکان دایانبەیەکدا.

(-القَومُ): خوێشگەل به دەست کەوتنه لێدانی یەکتری.

(أَلَلاطِـث): شـوێنی نازاری لـەش به هۆی لێدانەوە یان کۆڵهەڵگرتنەوە.

٢-(لَطَثَ- الشـيءُ. لَطْثاً): شتەکه (گەنبوو/ خراپبوو/ تێکچوو).

٣-(لَطَثَ- الشيءَ. لَطْثاً): شتەکەی کۆکردەوە.

لطح: (لَطَحَ-هُ لَطْحاً): دایه بەر شـەپازللە/ به بەریدەست پیایدا کێشا.

(-بِهِ): کێشای به زەویدا.

لطـخ: (لَطَخَ ولَطَّخَ- الشـيءَ بالمِدادِ ونَحْوَهُ لَطْخاً): به مەرەکەب و شـتی وەها شـتەکەی پیسکرد پەڵاوییکرد.

(-هُ بشَرٍّ): گرفتاری خراپەو نارەحەتییکرد.

(تَلَطَّخَ): پیسـبوو/ لەکاویبـوو/ پەڵاویبوو لەکەدار بوو.

(-بأَمرٍ قَبيحٍ): به کارێکی زشت و بەد لەکەدار

بوو ناوی زڕا/ ئابڕووبچوو.

(-بشَــرٍّ): بە کارێکی بەد کــە کردی لەکەدار بوو.

(أَلْلَطخ) (مص): ١: لەکەداربوون ٢-کەمەکێکی هەموو شتێك.

(«سَــمِعتُ لَطْخــاً مِــن خَبَــرٍ»): کەمەکە هەواڵێکم بیست.

(«فِي السماءِ لَطْخٌ مِن السَّحاب»): چەند پەڵە یان کەمەهەورێك بە ئاسمانەوەیە.

(أَلْلَطِخ): ١-گەندەخۆر/ کەسێکە کە خواردنیو پیسو هەمــوو خواردنێك بخــوات ٢-هەموو شــتێك بــە رەنگێکــی جیای خــۆی پیسو پەڵاویبێت.

(أَلْلَطــوخ): ئەوەی کە پێــی پیسو پەڵاویی بکرێت.

(أَلْلُطَخَةُ (ج) لُطَخات واللِطِّيخ): گەوج.

لطس: (لَطَسَ- هُ. لَطْساً): ١-زللەی لێدا ٢-بە شتێکی پان لێیدا/ شتێکی پانی پێداکێشا.

(-الشَــيءَ): ١-شــتەکەی چاك وردکرد ٢ توند پێی پێدانا.

(-هُ بِحَجَرٍ): بەردێکی تێگرت.

(-الحَجَرَ بِالحَجَرِ): بەردەکەی بە بەردەکەی تردا کێشا.

(لاطَسَ-هُ مُلاطَسَــةً): پێــی پیسو لەکەدار بوو.

(تَلاطَسَ- المَوجُ): شەپۆلەکان بەیەکیاندادا.

(أَلْمِلْطَــس (ج) مَلاطِــس والمِلطــاس (ج) مَلاطيــس): ١-بەردێکــە ناوکــی شــتی پێ دەشکێنرێت ٢-پیك کە بەردی پێدەشکێنرێت ٣-چەکوشی بەرد داتاشــینو رێکخستن ٤-پێی حوشتر/ سمی حوشتر.

لطش: (لَطَشَ-هُ) (عامية): بەدەست پیایدا کێشا.

(لَطَّــشَ- ثيابَــهُ) (عاميــة ســريانية): بەرگەکــەی/ جلەکەی پەڵەپەڵە کرد/ پیسو پەڵاویکرد.

لطــع: (لَطَــعَ- الكَلْــبُ أَو الذِئــبُ المــاءَ لَطعــاً): ســەگەکە یــان گورگەکە بــە زمان ئاویخواردەوە.

(-الشَيءَ بِلِسانِهِ): بە زمان شتەکەیلستەوە.

(-تِ البِئــرُ): بیرەکــە/ چاڵاوەکــە ئاوەکەی وشکیکردو نەما.

(-هُ بالنارِ) (عامية): بە ئاگرەکە سووتاندی (وەك ئاگرەکە بە زمان لستبێتیەوە.

(-إِســمَهُ) (ضد): ١-ناوی لە دیواندا سڕییەوە ٢-ناوی خستە دیوانەوە.

(«لَطعَ إِصْبَعَهُ»): مرد.

(لَطِعَ لَطعاً): دانەکانی هەڵوەریو نەما تەنها بنەکانی ما.

(أَلْطَع): کەسێکە دانکەوتووی بندان ماو.

(-الشَــيءَ بِلِسانِهِ لَطعاً): شــتەکەی بە زمان لستەوە.

(تَلَطَّعَ-ت الإبِلُ): حوشترەكە لە پیریدا دانی لە دەمدا نەما.

(اِلْتَطَعَ): هەموو ئاوی قاپەكە یان حەوزەكەی خواردەوە.

(-الشيءَ): شتەكەی لستەوە.

(اَللَطع) (مص): سپیبوونەوەی ناوەوەی لێو.

(اَللَطْعَـةُ): پارچە لبادێك یان مشـەمایەكە دەخرێتـە ژێـر سـاواكەوە تا دۆشـەكەكەی میزاویو پیس نەكات.

(اَللَطـاع): ئـەوەی پەنجـەی دەمژێـتو دەیلێسێتەوە پاش خواردن.

(اَللَطْعاء (ج) لُطْع): ١-مێی وشـەی (اَلأَلْطع) ٢-ژن یان كچ یان مێینەی ئاژەڵی لاواز.

٢-(لَطَـعَ- الغَـرَضَ. لَطْعـاً): بـە ئامانـج گەیشت.

(-عَينَهُ): كێشای بە چاویدا.

(-فُلاناً بالعَصا): بەدار لە فیساریدا.

(لَطَعَ ولَطِعَ- فُلاناً لَطْعاً): لە پشـتەوە دایە بەر شەق/ شەقی تێهەڵدا.

٣-(اَللَطع (ج) اَلْطاع): كاكیلە.

(رَجُلٌ لُطَعٌ): پیاوێكی بەدزمان/ بەدخواز.

لطف: ١-(لَطَـفَ- بِفُلان ولِفُـلان. لُطفاً): بەزەیی پێداهاتەوە/ لەگەڵیدا میهرەبانبوو.

(لَطَفَ- اللهُ بالعَبدِ ولَهُ): ١- خودا بەندەكەی سەرخسـتو میهرەبانانە ئەوەی خوازیار بوو دایە ٢-پاراستی.

(لَطُـفَ. لُطْفـاً ولَطافَةً): بچووكو ناسـكو وردبوو (پێچەوانەی قەبەو ئەستوور).

(لَطيف): ١-میهرەبان ٢-بەبەزەیی ٣-وردیلەو ناسك.

(«لَطُفَ- عَنهُ»): لەو بچووكترو ناسكتر بوو.

(-كَلامُـهُ): قسـەكەی ناسـكو نـەرمو شیرینبوو.

(«لَطِفَ بِهِ»): میهرەبانییـان لەگەڵدا كردو لەگەڵیدا ناسكبوون.

(مَلطوف): كەسێكە لەگەڵیدا میهرەبانبوون.

لَطَّفَ- الشيءَ: شتەكەی جوانو ناسككرد.

(لاطَفَ- هُ مُلاطَفَةً): ١-دلۆفانییو ناسـكیی لەگەڵدا كرد/ لەگەڵیدا میهرەبانو قسە نەرمو خۆشبوو ٢-چاكەی لەگەڵدا كرد.

(اَلْطَفَ- السُـؤالَ): پرسـیارەكەی ئاسـانكردو چاككرد/ بە نەرمییو ناسكیی پرسیارەكەیكرد.

(-هُ بِكَذا): شتێكی بە دیاریی دایەو لەگەڵیدا بە سۆز بوو.

(تَلَطَّـفَ- الأَمـرَ وفي الأَمـرِ): ١-لـە كردنی كارەكـەدا نەرمو شـێنەییو بـە بەزەییبوو ٢-بچووكیی نواند.

(تَلاطَـفَ- القَومُ): ١-خوێشـگەل كۆكبوونو تەبا/ پێكهاتوو ٢-لـە كردنی كارەكەدا لەگەڵ یەك میهرەبانبوون.

(اِسْتَلْطَفَ-هُ): بە ناسـك هاتە بەرچاوی یان بە ناسكو بە سۆزی دانا.

(أَلْلُطْــف) (مص) (ج) أَلطاف مِن قبل الله): میهرەبانیــیو سەرخســتنو پارێزگاریــی لە لایەن خوداوە.

(أَلْلَطَــف (ج) أَلطــاف): ١-خواردنێکــی کــەم ٢-چاکەو پیاوەتیکردنو بەخشیشدان ٣ خەڵات.

(«هــؤُلاء أَلْطافُ فُــلان»): ئەوان دۆســتو کەسوکاری فیسارن.

(أَلْلَطَفَةُ): دیاری، خەڵات.

(أَلْلَطْفــان= المُلاطِف): میهرەبان/. بە ســۆز، ناسكو قسەخۆش.

(أَلْلَطّاف): زۆر میهرەبانو نەرمو ناسك.

(أَلْلَطيــف (ج) لِطاف ولُطَفــاء): ١-میهرەبان ٢-نەرمو ناسك لە قسەو کرداردا ٣-بەبەزەییو دڵنــەرم ٤-یەکێکە لە نــاوە پیرۆزەکانی خودا واتاکەی: بــە بەزەیی بــە بەندەکانی خۆی/ چاکەکار پێیان هەروەها ئاگاداری هەموو کارە نهێنیەکانە بە وردو درشتیەوە.

(أَلْلَطيف- مِــن الكَلام): قســەی نادیارو بە پێچو پەنا/ شاردراوە.

(-مِــنَ الإجــرام): تەنــی ناســكو جــوانو رێکوپێك.

(أَلْلَطيفَــة (ج) لَطائِــف): ١-مێــی وشــەی (اللطيف)٢-قسەی خۆشو ناسكو پێکەنیناوی کە دڵی پێبکرێتەوە.

(أَلتَلطيف(مص)عِندالقُرّاء):قورئانخوێنەکان لە خوێندنەوەدا (الف) بەلای (یاء) داو سەر بە لای ژێردا بکشێنن ٢-جوانکردن ٣-میهرەبانییو نەرمییو دڵخۆشکردن.

(أَلْلُطُــف) (طــب): دەرمانی خاوکــەرەوەو نەرمکــەرەوە هەروەهــا دامرکێنــی ئــازارو هێمنکردنەوەی.

٢-(لَطَفَ- الشيءُ لُطفاً): شتەکە نزیکبووەوە.

(الطَفَ- الشيءَ بِجَنبِهِ):شتەکەی نابەخۆیەوە/ بە خۆیەوە نوساند.

(-بــِهِ): خــۆی خســتە پاڵــی بــە فێــڵ تا نهێنییەکانی بزانێت.

(إسْــتَلْطَفَ- الشــيءَ بِجَنبِهِ): شتەکەی دایە پاڵیو پێوەی نووساند.

(أَلْلَواطِــف- مِنَ الأَضلاع): دانە پەراســووە نزیکەکانی سنگ.

لطم: (لَطَمَ-هُ. لَطْماً): بە بەریدەست کێشای بــە ڕوومەتیدا یان بە لای لەشــیدا یان بەناو لەپی دەستی پیایدا کێشا.

(-هُ بِكَذا): بەوەوە لکاندی/ نووساندی.

(-هِ الغرَّةُ الفرسَ): پەڵەی سپی لایەکی ڕووی چارەوێکەی داپۆشی.

(لُطِمَ- الفَــرَسُ): لایەکــی ڕووی چارەوێکە سپیبوو.

(لَطيــم (ج) لُطُــم) (بــۆ نێــرو مــێ) ئەو چارەوێیەی پەڵەی سپی بەلایەکیەوەیە.

(لَطِمَ- الرَجُلُ): ستەمیان لە پیاوەکە کرد.

(لَطَّمَ-هُ): دایە بەر زللەی زۆر.

(-الكِتــابَ): پەرتووكەكــەی/ كتێبەكەی یان نامەكەی مۆركرد.

(لاطَمَ-هُ. لِطاماً وملاطمة): ١-دایە بەر زللە ٢-هەردووكیان یەكتریان دایە بەر زللە.

(تَلَطَّمَ- وَجْهُهُ): ڕووی ڕەش هەڵگەڕا.

(تَلاطَــمَ والتَطَمَ-ت الأمواجُ): شــەپۆلەكان بەیەكیانددادا.

(-القَومُ): یەكتریان دایە بەر زللە.

(أَللَطمَة (ج) لَطَمات): زللەیەك/ پێداكێشانی زللە.

(أَللَطیــم= الَملطــوم): ١-زللە لێــدراو ٢-بۆنی خــۆش/ بۆنــی مســك ٣-نۆهەمــین ئەســپی پێشــبڕكێ كە لە دواوە دەبێتو دەكێشرێت بە ڕوویدا ناچێتە كەپرەكەیــەوە ٤-چارەوێیەك كە لایەكــی ڕووی ســپییە وەك بەو ســپییە زللەی پێدادرابێت ٥-بەچكە حوشــترێك كە لە شیر دەبڕێتەوەو كاتێك كە ئەستێرەی گەلاوێژ هەڵدێت خاوەنەكەی گوێــی دەگرێتو بەلای ڕوویدا دەكێشــێت لە داكیی دوور دەخرێتەوە ٦-نێرە حوشتر ٧-كوڕی بێدایكو باوك/ هەتیو.

(أَللَطیمَــة (ج) لَطائِــم): ١-بۆنــی مســك ٢-شووشەی بۆنی مسك ٣-بازاڕی عەتارەكان.

(أَلمَلْطَم): ڕوومەت.

(أَلمَلْطِم): شوێنی شكانی شەپۆلەكانی دەریا.

(أَلمِلْطَم): كەوڵ كە دادەخرێت.

(أَلمُلَطَّم): بەدزمان/ بەدخواز.

لطه: (لَطَهَ-هُ. لَطْهاً): بە لەپیدەست لێیدا.

لطــو: (لَطا. یَلطو. لَطْــواً): لەتاو باران یان هەر شــتێكیتر خۆی كوتایە بــن بەردێك یان كەوركێك یان ئەشكەوتێك.

(«لَطــی یَلطي») (عامیة): خۆخســتنە بن تاوێــرو ئەشــكەوتو شــتیتر (لەتــاو بارانو شتیتر).

لطي: ١-(لَطی. یَلْطي- الرَجُلُ. لَطْیاً): خۆی بە زەوییەوە نووساند/ لكاند.

(لَطِــيَ- الرَجُــلَ لَطــیً): بــاری پیاوەكەی گرانكرد.

(تَلَطَّی- علــی العَــدُوِّ. تَلَطِّیــاً): چاوەڕێی بێئاگایی دوژمنیكرد تا بەسەریاندا بدات.

(أَللُطاة): دزی لێتەوە نزیك.

(أَللَطــاط): زەوی/ خــاك ٢-شــوێن/ جــێ ٣-ناوچەوان/ تەوێڵ یان ناوەڕاستی تەوێڵ.

(لَطْأَةُ الرَجُلِ): كەلوپەلــی پیاوەكە یان ئەو شتانەی كە پێیەتی.

(«أَلقی بلَطاتِهِ»): باریخست.

(أَلمِلْطی والملطاة): پێســتە تەنكەكەی نێوان ئێسقانی سەرو گۆشتەكەی.

٢-(لَطِــيَ- فُلانــاً بذلــك لَطــیً): وایزانی ئەوەیهەیە.

لظ: ١-(لَظَّ- هُ لَظّاً ولَظیظاً): ١-پێوەی بەند بوو لەگەڵیدا بوو ٢-لەسەری ڕۆیشتو هەتەر بوو.

(-بالشَّيءِ): بە شتەکەوە بەند بوو و بەرینەدا.

(-هُ لَظّاً): دەریکرد.

(لاظَّ- في الحَرب. لِظاظاً ومُلاظَّةً): پێی لەسەر شەڕکردن داگرتو لەسەری سوور بوو.

(ألظَّ): پێی لەسەر داگرتو لەسەری هەتەر بوو.

(-المَطرُ): بارانەکە سەرومڕ بوو.

(-بالمَكان): لە شوێنەکەدا نیشتەنیبوو.

(-بالشَّيءِ): بە شتەکەوە بەند بوو بەجێینەهێشت.

(تَلاظَّ- القَومُ في الحَربِ): لە جەنگدا کەوتنە راونانی یەکتری.

(أَلَلَظُّ) (مص): پیاوێکی گیری توندو سەرسەخت.

(«رَجُلٌ لَظٌّ كَظٌّ»): پیاوێکی گیری سەرسەختی پەککەوتەو ماندوو.

(أَلِلَظُّ والمِلظاظ): پێداگرێکی سوورو هەتەر لەسەر شت.

٢-(تَلَظَّظَ-تِ الحَيَّةُ. تَلَظُّظاً): مارەکە توورە بوو لە ڕقاندا کەوتە سەر جوولاندن.

٣-(لَظلَظَ-تِ الحَيَّةُ رَأْسَها لَظلَظَةً): مارەکە لە تووڕەییدا کەوتە سەر هێنانو بردن.

(تَلَظلَظَ-تِ الحَيَّةُ): مارەکە لە تووڕەییدا کەوتە جوولەو بزوە.

(أَلَلظلاظ- مِنَ الرجال): ١-پیاوی گیرو توندو سەرسەخت ٢-زمانپاراو.

(يَومٌ لَظلاظٌ): ڕۆژێکی گەرم.

لظأ: (أَللَظَأُ): شتێکی کەم.

لظي: (لَظِيَ. يَلْظى-تِ النارُ لَظىً): ئاگرەکە کڵپەیسەند/ گڕی بەرزبووەوە.

(لَظَّى- النارَ. تَلظِيَةً): گڕی بە ئاگرەکە (گرت/ سەند) کڵپەی پێسەند.

(تَلَظَّى-تِ النارُ): ئاگرەکە خۆشبوو/ گڕی بەرزبووەوە/ کڵپەیسەند.

(-فُلانٌ): فیسار گڕیگرتو تووڕە بوو.

(-تِ المَفازَةُ): بیابانەکە لە گەرماندا داخبوو.

(-تِ الحَيَّةُ مِنَ السَمِّ): مارەکە لەبەر ژەهری زۆری کەوتە تەکاندانو بزوە.

(إلْتَظى-تِ النّارُ): ئاگرەکە بڵێسەیسەند.

(-فُلانٌ): فیسار لە ڕقاندا/ لە تووڕەییدا گڕیگرت.

(أَللَظى) (مص): ئاگر یان گڕی ئاگر.

(لَظى معرفةً): جەهەننەم/ دۆزەخ.

لعَ: ١-(ألَعَّ- المَكانُ): شوێنەکە کاسنی لێڕوا.

(تَلَعَّى): کاسنیخوارد (بنچینەکەی (تَلَعَّعَ)یە.

(-اللُعاعَ): کاسنیخوارد.

(ألُعاع الواحِدَةُ (لُعاعَةَ): کاسن: ڕووەکێکە کە دەردێت نەرمە لیقەیە.

(«إنَّما الدنيا لُعاعَةٌ»): جیهان/ دنیا وەك کاسنی (گیای سەوز) وایە زوو تەواو دەبێتو دەڕوات.

(«مابَقِيَ إلاّ لُعاعَةٌ»): کەمەکێکی ماوە.

(أَلْلُعاعَة (ج) لُعاع) (ن): ١-كاسـنيى ٢-پيتو فەر ٣-جيهان/ دنيا.

٢-(أَلْلَعَّــة- مِــنَ النسـاءِ): ئافرەتــى جوانى داوێنپاكو ئابڕوودار.

(أَلْلُعاعَــة (ج) لُعــاع): قومە (شــەربەتێك، خواردنەوەيەك).

(لُعاعَةُ الإناءِ): پوختەى ناو قاپەكە.

(أَلْلَعَّاعَة): كەســێكە كە لــە ئاوازەكاندا هەڵە دەكات.

(مُطْرِبٌ لَعَّاعَة): گۆرانيبێژێكى ئاواز نەزانە كە هەڵەى تێدا دەكات.

(عَسَلٌ مُتَلَعٌّ): هەنگوينێكى جيرە ئەگەر لێى بەرز بكەيتــەوە دەزوولەكەى لە بەر لينجى زۆرى ناپچرێت.

٣-(لَعْلَعَ- العَظمَ ونَحوَهُ):ئێسقانەكەى شكاند يان شتيترى شكاند.

(تَلَعْلَعَ): شكا/ لەتوپەتبوو.

٤-(لَعْلَعَ- الرَعْدُ): هەورە گرمەكە ناڵەيكرد/ هەورەكە گرماندى.

(لَعْلَــعَ بالعاشــرِ):نــزاى بــۆ باركەوتووەكە كــرد پێيوت («لَــعْ أو لَعْلَعْ أو لَعــاً»):واتا:/ هەڵسيتەوەو خودا دەست بە باڵتەوە بگرێت/ بژيەيتەوە.

(أَلْلَعْلَع) (ح): گورگ.

٥-(لَعْلَــعَ- السَــرابُ): تراويلكەكە بريســكە بريسكبوو/ بريسكايەوە.

(-مِــنَ الجُوعِ): لە برســاندا ژان چووە دڵى/ داخ دڵيگرت.

(-مِنَ الشيءِ): لە شتەكە (بێزار بوو، وەڕسبوو/ هەراسانبوو).

(تَلَعْلَعَ- السرابُ): تراويلكەكە بريسكايەوە.

(-مِنَ الجوعِ): لە برساندا تەپاوتليبوو هاوارى كرد/ گينگڵيدا.

(-الرَجُلُ): پياوەكە بێهێز بوو لەتاو هيلاكىو نەخۆشى تينى نەبوو.

(-الكلْــبُ): ســەگەكە لــە تينوانــدا زمانى دەركێشا.

(أَلْلَعْلَع): تراويلكە.

(أَللَعْلاع): زۆر ترسنۆك/، زيرەكردوو.

٦-(أَلْلَعْلَع) (ن): درەختێكى حيجازە.

(عَسَلٌ مُتَلَعْلِعٌ): هەنگوينێكى جيرِ كە ئەگەر هەڵيبريت دەزووڵە دەكات.

لعب: ١-(لَعَبَ ولَعِبَ- الصَبيُّ. لَعْباً): كۆرپەكە/ منداڵەكە ليك بە دەميدا هاتە خوارێ.

(أَلْعَــبَ- الصَبيُّ): منداڵەكە/ ســاواكە ليكى پەيدا كردو بە دەميدا هاتە خوارێ.

(أَلْلُعاب): ليكى دەم.

(لُعابُ النَحْلِ): هەنگوين.

(لُعابُ الحَيَّةِ ونَحْوها): ژەهرى مارو شتى وەها.

(لُعاب الشَمسِ): دەزوولەى تيشكى خۆر كە لە نيوەڕۆدا وەك شارە جاڵجاڵۆكە دەنوێنێتو وەك لە ئاســمانەوە بەربێتەوە وايە پێيشدەوترێت

(مُخاطُ الشَيطان): تەناف شەیتان.

(لُعابُ السَغَرْجَل ونَحْوَهُ): دەرمانێکە لە تۆوی بەهێ دروستدەکرێت یان تۆوی هیتر.

(أَللُعابيّ): لیکن.

أَللُعابِيَّة): شەربەتی میوە.

(ثَغْرٌ مَلْعوبٌ): دەمێکی لیکن.

٢-(لَعِبَ: لَعْباً ولِعْباً ولَعِباً وتَلْعاباً): ١-گەمەی کرد یارییکرد/ وازییکرد ٢-شۆخییکرد/ گاڵتەیکرد ٣-کارێکیکرد بۆ خۆشیی دڵو ئارەزووی خۆی یان گەشتو گوزار ٤-کارێکیکرد بێکەڵك کە کەڵکی لێنابینێت.

(-بِكذا): ئەوەی کرد بە یاری.

(-فِي الأَمـر): کارەکەی بە گەمە گرتو بە تەنگیەوە نەهات/ سووك هاتە بەرچاوی.

(-على القانون وغيرِهِ مِن آلات الطَرَب): لە قانوونەکەیدا یان ئامێرە مۆسیقاییەکانی ژەند بە هەڵە دەڵێن: («لَعِبَ دَوراً»): راستیەکەی دەبێت بڵێن: («مَثَّلَ دَوراً»): رۆڵێکی بینی.

(- تِ الرياح بالديار): باکە گاڵەی بە وڵاتکرد سەراپا وڵاتیگرتەوە.

(لَعَّبَ= لَعِبَ): یاریکرد.

(لاعَبَ مُلاعَبَةً): یاریی لەگەڵدا کرد.

(أَلْعَبَ= لَعِبَ): یاریکرد.

(-ەُ): وایکرد/ وایلێکرد یاریی بکات یان شتێکی بۆ هێنا یاریی پێبکات.

(تَلَعَّبَ وتَلاعَبَ= لَعِبَ): یاریکرد.

(«لَعِبَت بهِمُ الهُمومُ وتَلَعَّبَت بِهِم»): مەراقو پەژارە یاریی پێکردنو هێنانو بردنی/ گاڵەی پێکردن.

(أَللَعِب (مص): ١-یاریکردن ٢-رابواردن ٣-یاریکەر.

(أَللُعْب= اللاعِب): یاریکەر/ یاریزان.

(أَللُعْبَة (ج) لُعَب): ١-یاریی/ بازیی/ گەمە ٢-یارییەك/ سەرەی یاری («أُقعُد حتى أَفْرَغَ مِن هذهِ اللُعْبَة»): دانیشە تا لەم یارییە دەبمەوە ٣-ئەوەی کە یاریی پێدەکرێت وەك شەترەنج ٤-پەیکەر ٥-گەوجێك کە گاڵتەی پێبکەن.

(«رَجُلٌ لُعْبَةٌ»): پیاوێکە گەمەو گاڵتەی پێدەکەن/ گاڵتەجاری ئەمو ئەو.

أَللَعْبَةُ: جارێك یاری/ یارییەك.

أَللِعْبَةُ: جۆرە یارییەك.

(أَللُعَبَة): کەسێکە یاریی زۆر بکات یان زۆر سوعبەتو گەمە بکات، قۆشمە بێتو حەز لە دەستبازیی بکات.

(أَللَعّاب): ١-یاریکەر/ یاریزان کە پیشەی یاریکردنبێت ٢-کەسێکە زۆر یاریی بکات/ یان زۆر سوعبەتو گەمە بکاتو حەز لە گاڵتەو گەپ بکات.

(أَللَعُوب (ج) لَواعِب ولَعائِب): شۆخو بەناز.

(«جارِيَةٌ لَعُوب»): کەنیزەکێکی شۆخی بە عیشوەو ناز/ بە لەنجەولارو.

(أَللِعِّيب والتَلْعاب والتِلْعاب والتَلْعابَة التِلْعابَة

و التِلعَّابَــة والتِلعَّــاب والتِلعِيبَة والأُلْعُبان): كەسـێكە گەمە بازو سـوعبەتچیو دەسبازو فۆشـمە بێت زۆر حەز لـە یاریکردن بکاتو یاری بکات.

(أَلْعَيبَة): پەیکەرو بووك كە یاری پێدەکەن/ بووکەشووشـە/ بووکـە سـەماکەرە/ کە هی منداڵانە.

(ألأَلْعُوبَة (ج) أَلاعِيب): یاری، بازی.

(أَلْمَلْعَب): ١-یاریگە ٢-شوێنی گەمەو رابواردن.

(مَلاعِــبُ الريــاح): شـوێنی بالێوەهاتــنو لێوەدەرچوون/ هەڵگەو دەرچەی با.

(«تركتــه في ملاعِب الجنّ»): لە شـوێنێکدا جێمهێشت کە خۆیشی نازانێت لە کوێیە.

(أَلْلعَبَةُ والمُلْعِبَةُ): بەرگێکی بێقۆڵ کە لەبەر منداڵ دەکرێت.

(أَلْلاعِب) (فا): بازیکەر، هاورێی یاریکردن.

(مُلاعِبُ ظِلِّه) (ح): شاماسیگرە، باڵندەیەکە باڵدرێژو ملکورت.

٣-(إِسْــتَلْعَبَ-تِ النَخْلَــةُ): دارخورماکــە بەرێکیــتری دەرکردو کە هێشــتا پاشــماوەی بەرەکەی پێشووی پێوە مابوو.

لعــث: ١-(لَعِــثَ. لَعَثــاً): جەســتە قورسو هێواشبوو/ خاوبوو.

(أَلْعَــث (م) لَعْثــاء (ج) لُعْــث): کەســێکە لەشقورسو خاوو خلیچك.

٢-(لَعْثَــمَ وتَلَعْثَم- في الأمــرِ): لە کارەکەدا وردبینیکردو شـینەییبوو پرکێشـیینەکرد/ باش لە کارەکەی رووانیو لەسەری وەستا.

(سَــأَلْتُهُ عَن شــيءٍ فَلَم يَتلَعْثَم): شــتێکم لێپرســی گورج وەلامیدامــەوەو منجەمنجی نەکردو لە سەری نەوەستا.

(مــا تَلَعْثَــم عَن شــي): بۆ شــتەکە گورج وەلامیدامەوەو درۆینەکرد.

(لَعْثَــمَ وتَلَعْثَــم): دەمــی تێکەڵوپێکەڵبوو/ منجەمنجیکرد.

لعــج: (لَعَجَ- الضَربُ فُلاناً. لَعْجاً): لێدانەکە ژانی بە فیسار گەیاندو پێستەکەی سووتاند.

(-الشــيءُ في صَدرِهِ): شــتێك (بــە دڵیدا بە مێشکیدا) هات.

(-الحُبُ أَو الحُزنُ فُــؤدَهُ): دڵداری/ ئەڤین یان خەفەت دڵیگرتو بەرینەدا/ سوێی بردە دڵیەوە.

(لاعَجَ-هُ الأَمرُ مُلاعَجَةً): کارەکە پەرێشانو شپرزەیکرد/ باری گرانکرد.

(أَلْعَــجَ- النارَ في الحَطَــبِ): ئاگری لە دارەکە بەردا.

(إلْتَعَــجَ): مەراقو خەفەت سـووتاندیو تای لێهێنا/ نەخۆشیخست.

(أَللاعِج (فا) (ج) لَواعِج): ١-ئەڤینو دڵداریی دڵسـووتێن ٢-ئەشـکەنجەو ئـازارو سـوێی دڵداریی.

(أَلْلُعْج): ١-هەمووو سـووتێنەرێك ٢-(ئازاری/ ژانی) لێدان ٣-سووتانەوە.

لعذ: (لَعْــذَمَ-في الأمــرِ): ورد لــه كارەكەی ڕوانیو شێنەیی تێدا کردو تیایدا وەستا.
(-عَنِ الكلام): لە قسەکردندا دەمی (تێکەڵو پێکەڵبوو/ سەرســامبوو دەمی تەتەڵەیکرد)/ ڕاڕابوو لە قسەکردندا.
(قَرَأَ فمــا تَلَعْذَمَ): خوێندیەوە بێوەســتانو منجەمنجکردن.
(«ماتَلَعْذَمنا شيئاً»): هیچمان نەخوارد.
(أَللَعْذَمِيُّ): هەتەر/ سوور لەسەر شت.
لعز: (لَعَزَ-هُ): پاڵپێوەناو تێوەیژەند.
(-تِ الناقةُ فَصيلَها): مێحوشــترەکە بەچکە تازەبووەکەی بە زمان لستەوە.
لعس: ١-(لَعَسَ-هُ لَعْساً): گەستی.
(لَعْــوَسَ- الطَعامَ) (عاميــةٌ): خواردنەکەی جو/ لە دەمیدا هێنایو بردی.
(«ماذَقْتُ لَعُوساً»): چەشەی هیچم نەکرد.
(أَللَعْــوَس (ج) لَعــاوِس): ١-خواردنێکی کەم ٢-زۆرخــۆر/ چڵێــس ٣-(ح) گــورگ (لەبــەر زۆرخۆریو چڵێسی).
(أَلْمُتَلَعِّس- مِــنَ الرِجال): پیــاوی (چڵێس/ زۆرخۆر/ ورگدراو).
٢-(لَعِسَ. لَعَســاً): لێوی ڕەشــییەکی جوانی پێوەبوو/ لێوی ڕەشییەکی جوانی بێت.
(أَلْعَــس (م) لَعْســاء (ج) لُعْــس): کەســێکە ڕەشییەکی جوان بە لێویەوە بێت.
(لَعِسَ-تِ الشَفَةُ): لێوەکە ڕەشییەکی جوانبوو.

(أَللُعْسَةُ): ڕەنگرەشییەکی جوانی لێو.
(أَلأَلْعَــس- مِنَ النَّبات): گیــای چڕی زۆر کە ڕەشدەنوێنێت.
(لَحْمٌ مَلعُوسٌ): گۆشتێکی سووری نەبرژاو.
٢-(تَلَعْسَــمَ- في أَمــرِهِ): لــە کارەکەیــدا بە سەرنجو هێواشو شێنەییبوو.
لعــص: ١-(لَعِــصَ- الأَمــرُ لَعَصــاً): کارەکە گرانبوو/ گیروگرفتی تێکەوت.
(تَلَعَّــصَ- عَلَينــا): کارەکەمــان لێگرانبوو/ لێمان گیربوو/ لێمان چووە بەست.
٢-(لَعِــصَ- الرَجُــلُ. لَعَصــاً): پیاوەکــە لە خــواردنو خواردنەوەدا چڵێســانە خواردیو تێر خواردنی بۆ نەبوو.
(-الرَجُلُ في الأكلِ والشُربِ): پیاوەکە چڵێسانە خواردیو خواردیەوە.
(لَعِص): چڵێسو تێرنەخۆر.
لعط: (لَعَطَ. لَعْطاً): پەلەیکرد/ خێرایکرد.
٢-(لَعَــطَ-تِ الإبِــلُ لَعْطــاً): حوشــترەکان لەملاولای خانووەکاندا لەوەڕان.
(-تِ الماشــيَةُ النَبــاتَ): ئاژەڵــەکان بە زمان گیاکانیان گرتو خوارد.
(إلْتَعَــطَ- تِ الإبِــلُ): لــە لەوەڕەکەیــان لە ماڵــەکان دوورنەکەوتنــەوە، لەوەڕگاکەیــان نزیك خانووەکانبوو نەچوونە دوورتر.
(أَلْمَلْعَــط (ج) ملاعِــط): لەوەڕگــای نزیــك خانووەکان/ دەوروبەری خانوەکان.

٣-(لَعَطَ-هُ. لَعْطاً): ناوەراستی ملی داخکرد.
(- هُ بأبياتٍ): بە چەند دێرێك هەڵبەست دایشت.
(-هُ بَسَــهْمٍ أو بِعَينٍ): تیرێکی تێگرت یان بە چاویەوە کرد.
(أَلْلَعْط (مص) (ج) أَلْألعاط): هێڵی سوور یان رەش ئافرەت بەرووی خۆیدا دەهێنێت.
(أَلْلُعْطَةُ): ١-داخی ناوەراســتی مل ٢-بە چەند دێرێك شیعر داشتن ٣-هێڵی زەرد یان رەش کە ئافرەت بەرووی خۆیدا دەهێنێت ٤-رەشــی لە پانتایی ملی مەڕ ٥-رەشــێکی مەیلەو سووری رووی هەڵۆ.
(أَلْلَعْطــاء): مەڕێــك کە رەشــی بــە پانتایی ملیەوە بێت.
٤-(لَعَطَ-هُ بِحَقِّهِ. لَعْطاً): دانەوەی مافەکەی دواخستو خایاندی/ دەستیدەستی پێکرد.
٥-(أَلْعَــطَ- الرَجُــلُ): پیاوەکــە بــە بناری شاخەکەدا رۆیشت.
(أَلْلُعْط (ج) أَلْعاط): شــوێنێکی بن دیوار یان بناری شاخ کە پەنای پێدەگرن پێدادەرۆن.
(لُعْطُ الرَملِ): بن لمەکە.
(لُعْطُ الجبل): بن شاخەکە.
لعــف: (أَلْعَــفَ وتَلَعَّــفَ الأَسَــدُ أو البَعيرُ): ١-شــێرەکە یان حوشــترەکە تەماشایەکیکردو ســەری دانەوانــدو تەماشــایەکیتریکردەوە ٢-دەمارگیر بووەو ئامادەی پەلامار بوو.
لعق: ١-(لَعِقَ- العَسَــلَ ونَحْــوَهُ. لَعْقاً ولُعْقَةً ولَعْقَــةً): هەنگوینەکــە یان شــتی وەهای بە پەنجە یان بە زمان لستەوە.
(لاعِق (ج) لَعَقَة): لێسەرەوە.
(لَعِقَ فُلانٌ إصْبَعَهُ): فیسار مرد.
(لَعَّقَ وأَلْعَقَ- فُلاناً العَسَــلَ): هەنگوینەکەی بە فیسار لستەوە.
(«رَجُــلٌ وَعِــقٌ لَعِــقٌ»): پیاوێکــی چنگیرو بەرچاوتەنگە.
(أَلْلُعْقَةُ) (مص): جارێك لستنەوە.
(«في الأَرضِ لَعْقَــةٌ مِــن رَبَيــعٍ»): کەمەکە گیایەکی بەهاریی بە زەویەکەوە هەیە.
(أَلْلُعْقَــةُ) (مص): ١-ئەوەی کە بە پەنجە یان بە کەوچکێك هەڵیدەگریت ٢-ئەو کەمەی کە دەلێسرێتەوە یان بە پەنجە هەڵدەگیرێت.
(أَللعاق): ئەو خواردنە ماوەیەی لە دەمتدایە دەیملچێنیت.
(أَلْلَعُوق): هەرچی دەلێسرێتەوە وەك هەنگوینو دەرمانو شتیتر ٢-کەمترین خۆراك کە لە دەمدا دەیملچێنیت.
(«مامَعَنا إلاّ لَعوقٌ»): بەشــی ملچاندنێکمان پێهەیە/ شتێکی کەممان پێهەیە.
(أَلْلَعُوقَة): چابوکیی‌و دەستســووکیی مرۆڤ لە کارکردندا (بە لێســانەوە) دەچوێنرێت کە سووكو خێرایە.
(أَلْمِلْعَقَــة (ج) مَلاعِــق): کەوچك/ چەمچە، ئەسکوێ.

٢-(أُلْعِقَ- النَسَّــاجُ الثَوبَ): بەرگچنەکە شاش بەرگەکەی چنی.
٣-(أَلْتُعِقَ لَونُهُ): ڕەنگی گۆڕا.
لعــل: (لَعَــلَّ): بەشــکو/ ئومێــدەوارم/ بە هیوام/ لەوانەیە/ چاوەڕێم/ ڕەنگە/ دەشێت/ ڕێتێدەچێت (لەو پیتانەیە کە وەك کردارن‌و بە کەڵکی بە ئومێدو بە هیوابوون دێت).
(لَعَلَّ الحَبيبَ قادِم): بە هیوام خۆشەویستەکەم بێت ٢-بۆ ترســان لە شــتێکی/ لە قەومانێکی ناخۆش: لەوانەیە/ ڕەنگە.
(«لَعَلَّ الشِــدَّةَ نازِلةٌ»): لەوانەیە سەغڵەتی‌و تەنگانە داباریتە ســەر ٢-بۆ پرسیارەو شتێکە ببێت یان نەبێت: تۆ بڵێی.
(«لَعَلَّهُ ذاهِب؟»): تۆ بڵێی ڕۆیشتبێت/ لەوانە بێت؟ دەبێت؟ (ما)ی دەچێتە ســەرو لە کاری دەخات.
(«لَعَلَّمــا أَضــاءَت لَكَ النارُ»): دەشــێت ئاگر، ڕووناکیت بداتێ. بۆت ڕووناك بکاتەوە. دەکرێت (لام)ەکەی فڕێبدەیت، لابەریت دەبێتە (عَلَّ)، خۆ ئەگەر (ي) قســەکەری بچێتە ســەر ئەوە هــەر (نونی‌و قایەکــەی) لێلادەبەن دەوترێت (لَعَلي ولَعَلَّني): بەشکو من.
(أَللَعْل) (فارسية): یاقووت.
لعم: ١-(أَللُعَم= أَللُعاب): لیکی دەم.
٢-(لَعَمَــظَ- اللَحْــمَ. لَعْمَظَــةً ولِعْماظــاً): گۆشتەکەی بە دان لە ئێسقانەکە کرانەوە.

(أَلْلُعْمَظ (ج) لَعامِظَة ولَعاميظ): ١-چڵێسی/ نەوسن‌و بەرچاوتەنگ.
(رَجُلٌ لَعْمَظَة): پیاوێکی زۆرخۆرو چڵێس.
(أَلْلُعْمُوظ (ج) لَعامِظَة ولَعاميظ): ١-بەرچاو تەنگك‌و چڵێس ٢ مشەخۆر ٣ کەسێکە کە ورگ بنێتە سەر خواردن‌و ورگی بخەملێنێت.
(أَلْلُعْمُوظَــة (ج) لَعامِظ ولَعامِيظ): بەرچاو تەنگی نەوسن/ چڵێس.
لعن: (لَعَنَ- فُلاناً لَعْناً): ١-نەفرەتی لە فیسار کرد/ ڕسوایکردو پڕ جنێویکردو چاکەو فەڕی لێدوور خستەوە ٢-دەریکرد/ پەریکرد.
(-نَفْسَهُ): نەفرەتی لەخۆیکرد وتی: نەعلەتی خودام لێبێت.
(لَعَّنَ- هُ. تَلْعِيناً): سزایدایە/ ئازاریدایە.
(لاعَــنَ- هُ لِعانــاً ومُلاعَنَــةً): هەردووکیــان نەفرەتیان لەیەککرد/ یەکتریان بە لەعنەتکرد.
(-الحاكِمُ بَيْنَها): دادوەرەکە دادوەرییکردن‌و بڕیاری خۆی بەسەریاندا سەپاند.
(تَلَعَّنَ وتَلاعَنَ- القَومُ): خوێشگەل نەفرەتیان لە یەکترکرد.
(إلْتَعَنَ): نەفرەتی لەخۆیکرد.
(-القَومُ): خوێشگەل لەعنەتیان/ نەفرەتیان لە یەکتریکرد.
(أَللاعِن) (فا): نەفرەتکەر/ لەعنەتکار.
(أَمــرٌ لاعِنٌ): کارێکە مایــەی نەفرەتهێنانە/ کارێکی لەعنەتاوییە.

(أللاعِنَةُ): چەقی ڕێگا.
(أَلْلَعْن) (مص): نەفرەتكردن.
(«أَبيتَ اللعنَ»): ئەمە سلاٌوو نزایەك بوو بۆ شـاكان لە پێش ئیسلامداو لە وڵاتی عەرەبدا دەكـرا) بـۆ كارێـك نەهاتویـت كـە مایەی نەفرەتت بێت كارێكـت نەكردووە كە مایەی نەفرەتبێت.
(أَلْلُعَنَةُ): ١-كەسـێكە كە خەڵك هەر نەفرەتی لێدەكەن ٢-كەسـێكە زۆر نەفـرەت لە خەڵك دەكاتو بەر لەعنەتیاندەكات.
(أَلْلَعْنَـة (ج) لِعـانٌ ولَعَنـات): ١-جارێـك نەفرەتكـردن ٢-نەفرەت/ لەعنـەت ٣-ئازار/ ئەشكەنجە/ سزا.
(أَلْلَعان واللَعانِيَة): كەسێكە نەفرەت زۆربكات/ فرە لەعنەتكەر.
(اللّعان): كەسێكە نەفرەت زۆر بكات.
(أَلْلَعـين المَلْعُون): نەفرەتلێكـراو/ لەعنەتلێكراو ٢-خوێڕیو بەرەڵا ٣-دەركراو/ پەركراو ٤-بەدووم/ شـووم ٥-چرووسـاوو لەشـداتەكاو ٦-ڕسـواكراو ٧-فەوتێنراو ٨-شەیتان ٩-داهۆڵی ناو كێڵگە بۆ پەلەورو درندە دەركردن لە كێڵگەدا دەچەقێنرێت.
(أَلْلَعينَة = الملعون): بەلەعنەتكراو/ نەفرەت لێكراو.
(أَلْمَلْعَنَة (ج) مَلاعِن): ئاودەسـت یان شوێنی خۆخاڵیكردنەوە ٢-چەقـی ڕێگا ٣-ئەوەی كە مایەی نەفرەتلێكردنە.

(أَلْمَلْعُـون (ج) ملاعين) (مفـع): ١-نەفرەت لێكـراو ٢-ژانێكـی توندو سـەختە تووشـی چارەوێ دەبێتو دەیكوژێت.
لعو: ١-(تَلَعَّى- العسلُ): هەنگوینەكە خەست بووەوە.
٢-(تَلَعَّى- اللُعـاعَ) (اي اوّل النباتِ): لە گیا تازە سەر دەرهاتووەكە لەوەڕا.
(ألعـى-تِ الارضُ): زەویەكـە سـەری گیای تازەی دەركرد.
(اللُعاع): گیای تازە دەرهاتوو.
٣-(اللاعـي): زۆر ترسـنۆك كە لـە هەموو شتێك دەتۆقێتو دەسڵەمێتەوە.
(اللاعية): ١-مێی وشـەی (اللاعي) ٢-(ن): شیرمار، دەوەنێكە گوڵێكی زەردی هەیە بۆنی خۆشە.
(اللعا): ١-چلیسـی بەرچاوتەنـگ ٢-بەیەكێك دەڵێـن كەوتبێـت (لعـاً لَكَ): خـودا هەڵت بستێنێتەوە/ بتژییەنێتەوە برەوت پێ بدات.
(لالعـاً لَـكَ): ئەمە نـزای خراپەیـە. خودا هەڵتنەسێنێتەوەو نەتژییەنێتەوە.
(أَلْلَعـاة (ج) لِعاء ولَعَوات) (ح): دێڵەسـەگ (لەبەر هەتەریی وای پێدەڵێن).
(أَلْلَعْـوُ (ج) لِعـاء): بەدرەوشـت بەدزمانی بەدخوازو بەرچاوتەنگ.
(أَلْلَعْـوَة (ج) لِعـاء ولَعَوات): ١-مێی وشـەی (أَلْلَعْو): ٢-دێڵەسـەگ لەبەر بەتەنگەوەهاتنی

٢-ڕەشیی دەوری گۆی مەمك.
(كَلْبَــةٌ أَو ذِئْبَــةٌ لَعْــوَةٌ): دێڵە ســەگێك یان دێڵــە گورگێك كە بەرچاوتەنگبێتو لەســەر خواردنێك شەربكات.
(لَعْــوَةُ الجــوعِ): پەرێشــانیی برســیەتی/ ئەوپەڕی برسیەتی.
(أَللُّعْوَةُ): ڕەشی ئەملاولای گۆی مەمك.
(أَلأَلعاء) (ع ا): ئێسقانی پەنجەكانو پێكان.
٤-لَعْوَقَ: سووكدەســتییو پەلەی لە كارەكەدا كرد.
(أَللَّعْوَق): كەمئاوەز/ ئاوەزسووك/ بێمێشك.
لغــب: ١-(لَغَــبَ ولَغُبَ و لَغِبَ. لَغْبــاً ولُغُوباً ولُغُوبــاً ولَغَبــاً): زۆر مانــدوو شــەكەتبوو/ گوڵۆڵەو پەككەوتە بوو.
(لَغَبَ- السَــيْرُ فُلاناً): ڕۆیشــتنەكە فیساری شەكەتكردو پەكیخست.
(-دابَّتَهُ): باری زۆری لە چوارپێكە لە وڵاخەكە ناو زۆری لێكرد تا شــەكەتیكردو پەكیخســت
٢-وڵاخەكەی شەكەتو پەككەوتە هاتە بەرچاو.
(أَلْغَبَ-السَــيْرُ فُلانــاً): ڕۆیشــتنی زۆر تەواو شەكەتیكرد.
(-فُلاناً): فیساری تەواو ماندوو و شەكەتكرد.
(تَلَغَّــبَ- الدابَّــةُ): وڵاخەكــەی شــەكەتو پەكەوتە هاتە بەرچاو.
(-الإِنســانَ أَو الحیــوانَ): مرۆڤەكــە یــان زیندەوەرەكەی دەركردو دووریخستەوە.

(-سَــيْرَ القَومِ): بــە پێ خوێشــگەلی برد تا شەكەتیكردنو پەكیخستن.
(-السَيرُ فلاناً): بە پێ ڕۆیشتن فیساری تەواو شەكەتكرد.
(تَلَغَّبَتْهُــم أَلأَســفارُ وتَلَغَّبَت بِهِــمُ القِفارُ»): گوزارو كوچی زۆر شــەكەتیكردنو پەكیخستن یان دەربەدەریكردنو لە وڵات دووریخستنەوە.
(أَللاغِب (فا) (ج) لُغَّب): بێتوانا/ پەككەوتە/ لاواز.
(«أَتانا ســاغِباً لاغِباً»): هاتە لامان برســیو شەكەتو هێزلێبراوو پەككەوتە بوو.
(أَللاغِبَةُ (ج) لَواغِب): مێی وشەی (أَللاغب): بێهێز.
(«رِياحٌ لَواغِب»): بابێهێزەكان/ كزەكان.
(أَللُّغْب واللُّغُوب): گەوجی بێتوانا/ بێهێز.
(أَللَّغَب) (مص): بێتوانایی/ بێهێزیی.
(«أَخَذَ بِلَغَبُ رَقَبَتِهِ»): پێیگەیشت.
(أَللَّغابَة واللُّغُوبَــة): ١-گەوجیی ٢-بێهێزیی/ بێتوانایی.
٢-(لَغَبَ- الكَلْبُ فِي الإِناءِ لَغْباً): ســەگەكە بە زمــان ئاوەكەی خواردەوە یان زمانی خســتە قاپەكەوەو تیایدا گێڕا.
٣-(لَغَبَ- القَومَ. لَغْباً): درۆی بۆ خوێشگەلكرد.
(-عَلَيهِــم): تێكیــدان/ قســەی درۆی بــۆ خوێشگەل كرد.
(أَللَّغْــب): ١-قســەی گــەنو خــراپ بێهوودە

٢-پەری گەن/ خراپ/ تێکدەر.

(سَهْم لَغْبٌ): تیرێك كە پەڕەكەی باش چەسپ نەبووبێتو خراپبێت.

(اَللَّغَـب واللَغِـب واللَغيـب): پـەری گەن/ خراپ.

(«أكْفِـف عَنَّا لَغَبَكَ»): قسـە هیچو پووچو ناشیرینەکانتمان بە گوێدا مەدە.

(اَللُّغـاب): تیرێکی باش دانـەدراوو پەرباش نەچەسپنەکراو/ تیری گەن/ خراپ.

لغـد: (لَغَـدَ- الإبِـلَ العَوانِدَ. لَغْـداً): ئەو حوشترەی لەرێ لایدابوو خستیەوە سەر رێو شوێنی نیاز.

(-ەُ عَـن كـذا): رێـی ئـەوەی لێگـرتو بەندیکرد.

(-فُلاناً): کێشـای بە گۆشتە زیادەکەی گوێی فیساردا یان گۆشتی ناو گەروویدا.

(اَللُّغـدُ (ج) ألغاد واللُغـدُود واللِغدِيد (ج) لَغاديد): پارچە گۆشـتێکە لە گـەرووداو یان لەوپـەری ناودەمـدا یان زیادەگۆشـتە لەناو گوێدا.

(اَلمُتَلَغِّد): زۆر فوشقیو دەمارگیر.

لغز: (لَغَزَ- الشيءَ): ڕووی شتەکەی وەرگێراو بارەکەی گۆڕی.

(-فِي يَمينِـهِ): پێچو پەنای لە سـوێندەکەدا کرد/ ڕاستیی شتەکەی بۆ سوێندخواردووەکە دەرنەخست.

(لَغَزَ وألْغَزَ- اليَربوعُ جُحْرَهُ): گورهەڵگەنەکە کونەکەی بە پێچو پەنا هەڵکەند.

(-فِي الكلام وألْغَزَ الكَلامَ): قسەکەی بە پێچو پەنا کردو دەرنەخست/ وەك مەتەڵ لێکرد.

(لاغَـزَ-ەُ مُلاغَـزَةً): بە پێچو پەنـاو هێما قسەیان لەگەڵ یەکدا کرد.

(اَللُّغـز واللُغَـز واللُّغَـز): ١-کونی (مشـك/ گۆرهەڵکەنە/ فۆری).

(اَللُّغَـز (ج) ألْغاز- مِنَ الكلام): قسـەی (بە پێچو پەنا/ نادیار/ مەتەڵ).

(الألْغاز): ١-ڕێیبەپێچوپەناوسەرلێدەرنەکراو ٢-هێما.

(اَللَّغّاز): سەر لە خەڵك تێکدەر/ گرفتارکەری خەڵك.

(اَللُّغَيْزاء واللُغَيْـزَى والأُلْغُوزَة- مِن الكلام): قسەی (مەتەڵشـێوەکە سەری لێدەرنەکرێت/ بە پێچو پەنا بێت)/ وەك گرێ بێت/ ئاڵۆز.

(اَلمُلْغَز- مِنَ الكلام): قسـەیەك وەك مەتەڵی لێکرابێت/ سـەری لێدەرنەکـەن، هێمابێت/ ئاڵۆز بێت.

لغـط: (لَغَـطَ- الحَمـامُ أو القَطـا. لَغْطـاً ولَغيطـاً): کۆترەکە گمانـدیو کورکورەکە/ قەتێکە خوێندی.

(لَغَطَ ولَغَّطَ وألْغَـطَ- القَومُ لَغطاً ولِغاطاً): خوێشـگەل کەوتنە (غەلبەغەڵـب/ ژاوەژاو/ دەنگەدەنگ).

(أَلْلَغْط) (مص): ناودەرگا.
(أَلْلَغْط والْلَغَــط (ج) أَلْغاط): غەلْبەغەلْبو ژاوەئــاو/ بەیەکداچوونـــی دەنــگ کە کەس تێینەگات/ دەنگەدەنگ.
لغــف: (لَغَــفَ- الرَجُلُ أَو الأَسَــدُ): پیاوەکە یان شـێرەکە چــاوی بڕییە ئەو شــتە/ تیژ تەماشایکرد.
(لَغِفَ- الإِنــاءَ لَغفاً): (قاپەکەی/ دەفرەکەی) لستەوە.
(-الإِدامَ): خواردنەکەی کرد بە پاروو و خێرا خواردی.
(لاغَفَ-هُ. مُلاغَفَةً): ١-ماچیکرد ٢-دۆستایەتیی لەگەڵدا گرت.
(أَلْغَفَ): چاوی بڕییە ئەوە/ تیژ تەماشایکرد ٢-بوو بە پاشدز ٣-پەلەیکرد.
-فُلاناً أَلادامَ: پێخۆرەکەی بۆ کرد بە پاروو و دەرخواردیدا.
أَلْلُغَفَةُ: پاروو.
(أَلْلَغیــف (ج) لُغَفاء): ١-پاشــدز/ کەسـێکە لەگــەڵ دزانــدا دەخــوات و کەلوپەلەکەیــان بــۆ دەپارێزێت، بەڵام خــۆی دزییەکە ناکات ٢-کەسوکار. یان دەستوپێوەندی پیاوەکە.
(أَلْلَغیفة): حەڵوای ئارد کە بە ڕۆندەکرێت.
(أَلْلُغْفَة): خوێشگەل کە دەبنە دزێکی بێویژدان.
٢-(أَلْغَف-هُ): کرداری ناشــیرین و زۆردارانەی لەگەڵدا کرد.

(-عَلَیهِ): قســەی زشــت و ناشــیرینی زۆری بەرامبەر کرد.
٣-(أَلْلَغْلَغَة): قسە بە ڕەوانیی نەکردن.
لغم: ١-(لَغَمَ- البَعیرُ. لَغْماً): حوشترەکە دەمی کەفیچەندو کەفەکەی دەرهاوردو فڕێدا.
(-هُ): ماچی دەم و لووتیکرد.
(لَغَمَ ولَغَّمَ- فُلاناً بِالطیبِ): بۆنی خۆش لە دەم و لووتی فیسار (هەڵسوو/ تێوەدا).
(تَلَغَّــمَ- بالطیــب): بۆنی خۆشــی لە دەم و لووتی خۆیەوە هەڵسوو.
(-القَومُ بِالكَلامِ): کەوتنە دەم و پل جوڵاندن و قسەکردن.
(-تِ الغَنَمُ بِالعُشــبِ وبِالشــرابِ): مەڕەکان دەموپلیــان/ دەموولووتیــان بەگیــاو ئــاوی خواردنەوە تەرکرد.
(أَلْلَغَم): ١-کەمەبۆنێکی خــۆش ٢-بن و ڕەگی زمان.
(أَلْلُغام): ١-کەفی دەمی حوشتر ٢-لیک و تف.
(أَلْلَغْماء): مەڕێکی دەم و چاو سپی.
(أَلْمَلْغَم (ج) مَلاغِم): دەم و لووت و ئەملاولایان.
(لَغَمَ- الرَجُلُ. لَغْمــاً): هەواڵێکی گەیاند کە لێی دڵنیا نەبوو.
(لَغَمَ. لَغْماً ولَغَماً): هەواڵی لە شــتێکی پرسی کە بۆی ساغنەبووەوە لێی ڕوون نەبوو.
(أَلْلَغیم): نهێنی.
٣-(لَغَــمَ- الأَرضَ أَو الحَجَــرَ لَغْماً): زەویەکە

یان تاوێرو بەردەكــە (هەڵتەكێنی/ لەغمی/ مینی) تێدا دانا.
(أَلْغُم (تركية) (ج) أَلْغام): هەڵتەكێن/ مین/ لەغم/ چاڵێك لەژێر قەڵایەكدا یان شوێنێكی لــەو بابەتەدا یان لەنــاو تاوێرێكدا بارووتو شــتی تەقەمەنی تێدا دادەنێــن دەتەقێنرێت ئەو شــوێنە دەرووخێت یــان هەڵدەتەكێتو ورد دەكرێت.
أَلْلُغــم: ئامرازێكــی لوولەكشــێوەیە یان خڕە لە تەقەمەنیــی بەهێز ســیخناخدەكرێت لە وشكانییەكدا، لە دەشتدا دەشاردرێتەوە یان لە دەریادا قایمدەكرێت ئەگەر تەنێكی بەربكەوێت دەتەقێتەوە یان بە كارەبا دەتەقێتەوە.
(أَلْلُغم الصوتي): (هەڵتەكێنی/ لەغمی/ مینی) دەنگیــی: لەغمێكە، جیهازێكــی دەنگوەرگرتنی پێوەیە دەنگــی پاڵنەری پاپــۆڕ وەردەگرێت بە فێڵێكی وا دامەزراوە كە پاپۆڕەكە لێی نزیكبووەوە ئەوس دەتەقێتەوەو پاپۆڕەكە هەڵدەتەكێنێت.
(لُغْــمُ الضَغــطِ) (تركیــة): (هەڵتەكێنی/ لەغمــی/ مینی) فشــار: ئەمەیان بە فشــاری ئاوەكــەی كــە پاپۆڕەكــە بــە تێپەڕینــی پەیدایدەكات دەتەقێت.
٤-(أَلْغِمَ- الذَهَبُ وما شــابَهَهُ مِن كُلِّ جَوهَرٍ مُــذاب): زێڕ یان شــتی لــەو بابەتــە كاتی توانەوەی جیوەی تێكەڵكراوە.
(مُلْغَم): زێڕو شتی لەو بابەتەی جیوە تێكەڵكراو.

(إِلْتَغَــم- الذَهَبُ): زێڕەكــە تێكەڵ بە جیوە بووە.
لغــن: (إِلْغانَّ- النَبــتُ): گیایەكە باڵای كردو بەگژیەكداچوو.
(-تِ الارضُ): زەویەكە گیای زۆر بوو.
(أَلْلَغْنُ): هەرمتــی هەرزەكاریی/ گەنجێتیی/ لاویی.
لغو: ١-(لَغا. یَلْغو- بِكَذا لَغْواً): لەسەر ئەوە دوا.
(لَغِيَ. یَلْغــى- بِأَمرِ. لَغىً): دڵی بە كارەكەوە نووساو حەزی لێكرد.
(-تِ الطَــیرُ باصواتها): باڵنــدەكان كەوتنە خوێندن/ خوێندیان.
(إِسْــتَلْغى- فُلاناً): فیســاری دواندو گوێی بۆ زمانەكەی شــلكرد تا بزانێت بــە چ زمانێك قسە دەكات.
(أَلْلَغا) (مص): دەنگ.
(أَلْلُغَــة (ج) لُغــىً ولُغــات ولُغــون): زمانی نەتەوەو زمانی ناو خەڵك كە پێیدەدوێن.
(لُغَويّ): زمانەوان.
(عِلْمُ اللُغَة): زانستیی زمان (دەشێت زانستیی زمانی عەرەبی هەموو بەشــەكانی زانســتیی عەرەبی بگرێتەوە).
(كُتُبُ اللُغَة): فەرهەنگەكانی زمان.
(أَهْلُ اللُغَة): ئەوانەن كە خەریكی زمانن، زمانناسی (لەوانەیــە وشــەی (لُغَة) لە وشــەی (لوغوس)ی یۆنانیەوە وەرگیرابێت كە (وشە) دەگرێتەوە).

(أَلْلَغُو): وەڕینی سەگ.

(أَلْلَغاة): دەنگ.

(أَلْلَغْــوى): خوێندنو دەنگــی زۆری (قەتێ/ کورکوڕ).

٢-(لَغا. يَلْغُو- الشيءُ):شتەکە پووچو بێهوودە دەرچوو.

(-الرَّجُــلُ): نائومێــد بوو/ ســەرنەکەوت/ هیوای بڕا.

(-عَنِ الطَّرِيقِ):لە ڕێگەکە لایدا.

(-لَغا. يَلْغى ولَغِيَ. يَلْغى- في قوله، لَغواً ولَغىً ولَغايَةً ولاغِيَةً ومَلغاةً):چەنەیدا/ چەنەبازی کرد/ ڕستی/ قسەی هەڵەو هیچو پووچیکرد/ بەبێ بیرکردنەوەو لێکدانەوە قسەیکرد.

(«هُمْ يَغْلونَ في الحســابِ):لە ژمێردا ئەوان هەڵە دەکەن.

(لاغى- الرَّجُــلَ. مُلاغاةً): گاڵتــەی لەگەڵ پیاوەکــەدا کــرد/ پێکــەوە کەوتنــە گەمەو گەمەبازی.

(أَلْغى- الشــيءَ): شــتەکەی هەڵوەشاندەوە/ تێکیداو وازی لێهێنا/ لایبرد.

(-فُلاناً):فیساری ناهومێد کرد/ بێهیوایکرد.

(أَللاغِيَةُ) (مص):ئەو قســەیەی کە بایەخی پێنــادەن/ بێکەڵكو هیــچو پووچەو کەڵکی لێوەرناگــرن. قســە بێت یان هەر شــتێکیتر بێت.

(کَلِمَةٌ لاغِيَةٌ):قسەی دزێوو ناشیرین.

(أَلْلَغــا):١-ئاخاوتنــی کەوتــوو و بێبایەخ ٢- قسەی هیچو پووچ کە کەس گوێی لێناگرێت/ قسەی بێهوودە.

(أَلْلَغْو) (مص):١-وتەی (بێجێ/ هیچو پووچ) چەنەبازیــی. کە کەس بایەخــی پێنادات یان کارێکی بێهوودە.

(«تَکَلَّمَ باللغوِ واشتَغَلَ باللغو»):قسەی هیچو پووچیکــردو بەکاری بێهــوودەوە خەریکبوو ٢-گوناهکردن لە سوێندا.

(أَلْلَغْــوى): چەنەبازیــی بێکەڵــكو کردارو کردەوەی بێهوودە.

(«إِسْــمَع لَغْواهُــم ولا تَخَــف طَغْواهُــم»): گوێ لە قســە هیــچو پووچەکانیان بگرەو لە دەسەڵاتیان مەترسە هیچیان لە باردا نییە.

٣-(لَغِيَ يَلغــى- بالماءِ لَغــىً): ئاوێکی زۆری خواردەوەو تینوێتی نەشکا.

(-بالشيءِ):بە شــتەکەوە نووساو بەرینەدا/ شتەکەیگرتو بەرینەدا.

الملحق:

لغو. (أَلإِلْغاء):هەڵوەشانەوە، لابردن.

(«إلغــاء عُقوبَة الإعدام»):هەڵوەشــانەوەی سزای لە (سێدارەدان/ هەڵواسین)/ لابردنی.

(«إلغــاءُ وظيفَــة»):لابردنــی فرمانێکی / کارێکی میریی.

(-في النَّحــو): لــە ڕێزمانــدا لابردنی کاری وشــەیەك لەســەر وشــەیتر چ بە دەنگو چ

لــه ڕێزمانیدا وەك («زَيدٌ ظَنَنــتُ قائِمٌ»): وەمزانی زەید بە پێوەیە/ وەستاوە («ماكان أحْسَــنَ زَيداً»): لێرەدا (كاری) ظَنَّ و (كانَ) پووچكراوەتــەوەو كاریــان لــە ڕســتەكەدا نەماوە.

لفّ: ١-(لَفَّ- الشيءَ. لَفّاً):١-شتەكەی (لوولكرد/ پێچایەوە) ٢-كلاّفەیكرد/ هەڵیكرد ٣-لوولیكرد ٤-یەكیخســتو كۆیكــردەوە/ گرموڵەیكــرد/ گولۆڵەیكرد.

(-المَيتَ في أكفانِهِ): مردووەكەی لە كفنەكەوە پێچایەوە/ مردووەكەی خستە كفنەكەوە.

(-الكَتيبَتَــين): لەجەنگەكــەدا دوو كەتیبە سەربازەكەی یەكخستو تێكەڵیكرد.

(-في الأكلِ): خواردنێكــی تێكــەڵو پێكەڵو پیسی خوارد.

(«إنْ أكَلَ لَفَّ وإن شَرِبَ إشْتَفَّ»): كە خواردی هەرچــی بێت لوولیــدەداتو دەیماشــێتەوە كــە خواردیشــیەوە چی لــە قاپەكــەدا بوو هەڵیدەقوڕێنێت.

(-الشيءَ بالشَّيءِ): شتەكەی لە شتەكەیترەوە لێكداو پێچایەوەو لوولیدا.

(-تِ الأشْــجارُ): درەختەكان لە یەك ئاڵاون/ بەیەكداچوون.

(-اللَّفَّــةَ) (عامیــة): مێزەرەكــەی یــان سەروبەستەكەی بەست.

(-لَفّاً ولَفَفاً): ڕانەكانی گۆشتن بوون.

(ألَفُّ (م) لَفّاء (ج) لُفٌّ): ڕانگۆشتنو قورس/ قەڵەو.

((لَفَّفَ = لَــفَّ): توند (پێچایەوە/ لوولیكرد/ هەڵیكرد/ گرموڵەیكرد).

(لافَّ- الصَقرُ الصَيــدَ): بازەكە نێچیرەكەی گرموڵە كردو خستیە ژێر پێیەوە.

(«الافَفْنا القَومَ»): تێكەڵی خوێشگەل بووین.

(ألَفَّ- الطائِرُ رَأسَهُ): باڵندەكە سەری بەژێر باڵیدا كرد.

(-الرجُلُ رَأسَــهُ): پیاوەكە ســەری خســتە جبەكەیەوە.

(تَلَفَّــفَ- في ثَوبِــهِ): خۆی لــە جلەكەیەوە ئاڵاند. یان جلەكەی لە خۆیەوە ئاڵاند.

(-عَلَيــهِ القَومُ): خوێشــگەل تێــوەی ئاڵان/ لێیكۆبوونەوە.

(تَلافَّ- القَومُ): خوێشگەل تێكەڵی یەكبوون.

(اِلْتَــفَّ- في ثَوبِــهِ):بەرگەكــەی لە خۆیەوە ئاڵاند/ پێچا/ خۆی لە جلەكەیەوە ئاڵاند.

(-عليه القَومُ): خوێشــگەل لێی كۆبوونەوە/ تێوەیئاڵان.

(-الشيءُ): شتەكە گرموڵە بوو بە یەكداچوو/ پێچیخوارد.

(-النَبــاتُ): گیاكە/ ڕووەكەكــە چنگی دایە یەكو بەیەكدا چوو.

(-لَهُ على حَنقٍ): دڵی لێی پڕ لەقینبوو/ زۆر ڕقی لێیبوو.

(أَلَــفَّ) (مــص):١-پێچانــەوە، لوولبــوون، گرمۆڵەبوون ٢- کۆمەڵ.

(جاؤوا بِلَفِّهِم) بەخۆیان و دەستودایەرەیانەوە هاتن.

(«جــاءَ القَومُ ومَنَ لَفَّ لَفَّهُم»): خوێشــگەل خۆیان و هەمــوو ئەوانەی خۆیــان لەوانەوە ئاڵاندبوو/ سەر بە ئەوان بوون هاتن.

(رَوضَةٌ لَفٌّ): باخێکی چڕی لە یەك ئاڵاو.

(أَلْلِفّ (ج) أَلْفاف ولُفُوف): پارت یان جۆرێك خەڵك ٢-خوێشــگەلی گردەوەبوو/ کۆمەڵبوو ٣-ئــەوەی لەملاولــەولا کۆدەکرێتــەوە/ لوولدەکرێــت ٤-باخێکــی چــڕی درەخــت بەیەکداچــووی گیاتێکئــاڵاو. باخچەیەکــی ڕووەك و گیاتێکئاڵاو.

(«جــاءَ القَومُ ومَــن لَفَّ لِفَّهُــم أَو لُفَّهُم»): خوێشگەل خۆیان و ئەوانە هاتن کە تێیانەوە ئاڵابوون و سەربەوانبوون.

(«جاؤوا أَلفافاً): بە کۆمەڵ هاتن.

(أَلْلفَّةُ) (عامیة): مێزەر یان سەروبەست.

(رَوْضَــةٌ لَفَّة): باخچەیەکــی ڕووەك لە یەك ئاڵاو/ بە گژیەکداچوو.

(أَلْلَفَــف): -پێچخواردنــی دەمارێکــی بازوو کــە پیــاو لــە کاربخــات ٢-زۆرخۆریــی و لە هەمەچەشــنە خواردنێك/ خواردن ٣ ئەوەی خوێشــگەل لەمــلاولاوە کۆیانکردۆتــەوە لوولیانکردووە/ پێچاویانەتەوە.

(أَلْلِفافَة (ج) لَفائِف): پێچەر/ سارغی/ ئەوەی بە قاچەوە دەپێچرێتــەوە/ هەڵپێچ/ دۆلاغ/ ســەرپێچ ٢-چەورییەکــە لە دڵــەوە دەناڵێت ٣-جگــەرەی پێچــراوە کــە ســیغارە تووتنی تێدەکرێت و دەپێچرێتەوە.

(أَلْلَفیــف):١-درەختێکــی زۆر بەیەکداچــوو لە شوێنێکدا/ دارســتان/ جەنگەڵ/ بێشەڵان ٢ کۆمەڵــە خەڵکێکــی زۆری هەمەلایەنــەو هەمەچیزە باش و خراپ و ڕەسەن و نارەسەن و بە هێزو دەســەڵاتدارو بێهێزو بێدەســەڵات/ تێکەڵ/ هەمەچیزە.

(طَعامٌ لَفیف): چێشــتێکی تێکەڵ (وەك هی سوالکەر یان مجەور).

(«هُوَ لَفیفُ فُلان»): ئەو (دۆست/ برادەر)ی فیسارەو تێکەڵیەتی.

(«جَمــعُ لَفیــفٌ»): کۆمەڵێکە هــی هەموو لایەکن و تێکەڵن.

(«جــاءَ القَومُ بِلَفیفِهِــم»): خۆیان و هەموو سەربەوانن و تێکەڵیانن هاتن.

(أَلْلَفیف (ج) أَلْفاف): چەند دەستەو تیپێکی سەربازیین.

(أَلْلَفیفَــةُ (ج) لَفائِــف):١-کۆمــەڵ/ گروپ/ دەستە ٢-جگەرەی پێچراوەی تووتن ٣-گۆشتی سەرپشتی حوشتر.

(أَلأَلَف (م) لَفّاء (ج) لُفّ):١-شــوێنێکی ئاوای پــڕ خەڵك ٢-دەمارێکی بــازووە ٣-زمانقورس

٣-لاڵەپەتــە كــە نەتوانیت ئــەوەی دەیەوێت دەریببڕێتو لە كاروباردا سستبێت ٤-كەسێكە برۆكانی یەكیانگرتبێت.

(رَوضَـــةٌ لَفــاءُ): باخچەیــەك كــە رووەكو گیاكەی بە گژیەكدا چووبن.

(فَخِذٌ لَفَّاء): ڕانێكی زلەو قەڵەو.

(التّلافیــف): گیــا/ رووەكی (بەســەریەكدا پێچخواردو/ تێكئالاو.

(-مِــنَ الأمعــاء والدماغ) (طــب): ڕیخۆڵە پێچخواردوو تێكئالاو یان مێشك پێچخواردوو/ پێچو لوولیی مێشكو ڕیخۆڵە.

(أَلَفّ): پێچخواردوو/ لوول.

مَلَــف أوراق الدعــوى في إصطلاح المحاكم): دۆسیەی دادگا (كۆمەڵە نوسراوێكە دەخرێتە فایلێكەوە).

(أَلمِلَف): بەتانیە/ پەتوو/ لێفە.

(-في إصْطِلاح عَلَماء الكَهُرُباثیة): لەلای زانای كارەباكان دەزگایەكە سیمی هەڵكراویە چەند جارێك لەسەر لوولەكێك یان بۆرییەك كە لە شــێوەی زەمبەلەك دەبێت بــۆ پەیداكردنی كارەبا دەبێت.

(أَلِلفاف): پەتوو یان پێچەر لە خۆوە دەپێچرێت.

(أَلَلْفوف) (ن): كەلەرم.

(مَلْفُوفَة): سەلكە كەلەرمێك.

٢-(لَفَّ-هُ حَقَّــهُ لَفاً): مافەكەی نەدایەو ڕێی وەرگرتنی لێگرت.

٣-(لَفْلَفَ): ١-لاڵەپەتەبوو/ قسەی بە گران بۆ دەكرا ٢-وێڵی خواردنو ئالیكبوو.

(-في ثَوبِهِ): جلەكەی لە خۆیەوە (پێچا/ ئالاّ) / لەبەریكرد.

(-القَضِیَّةَ): كێشــەكەی شــاردەوەو ونیكردو لێی بێدەنگبوو.

(تَلَفْلَــفَ بِثَوبِــهِ): بەرگەكــەی (لە خۆیەوە ئالاند/ لەبەركرد).

(أَللَفْلَــف واللفــلاف): بێهێز/ بێدەســەلات/ بێتوانا.

(أَلُلَفْلَــف): واللَفلَف واللَفْلاف): لاڵەپەتە كە قسەی بۆ نەیەتو كە قسەیكرد دەمی پڕبێت لە تفو زمانو دەمی پڕكات.

الملحق:

لفّ: (ألالتفاف): كۆبوونــەوە/ گردبوونەوە/ خڕبوونــەوە/ لە خولی شــتێك كۆمەڵبوونو چڕبوون.

(ألإلتفاف حَول شَخصِیَّةٍ سیاسیَّة):لە خولی/ دەوری كەسێتیەیكی ڕامیار گردبوونەوە/ لێی كۆمەڵبوون.

(-ا ع): لەسەربازییو جەنگدا پێچكردنەوەو ئابلووقەدانی دوژمن/ گەمارۆدانی.

(الإلتفــاف الزَهــری في عِلــم الأحیــاء): لە زیندەوەرزانیــدا لــە گوڵــدا لوولخواردنــی/ پێچخواردنــی گــەلاّ ڕەنگینەكانــی گــوڵ بەسەریەكدا كاتێك كە گوڵەكە خونچە دەبێت.

لفــأ: (لَفَأَ- العُــودَ. لَفْأً ولَفَــأً): چێوەکەی/ تووڵەکەی/ چیلکەکەی ڕووتکرد.

(-اللَّحْــمَ- عــنَ العَظــم): ئێســقانەکەی داماڵی/ گۆشــتەکەی لە ئێسقانەکە کردەوەو ئێسقانەکەی کراند.

(-هُ): لــە پاشــملە بــە خراپــە لێیــدوا/ غەیبەتیکرد.

(-هُ حَقَّهُ) (ضد):١-لە مافەکەی خۆی کەمتریدایەو لێیبڕی ٢-هەموو مافەکەی خۆی دایە.

(-تِ الريحُ السَحابَ عَن وَجهِ الأَرض): باکە گشت هەورەکەی ڕاماڵیو کردی بە سایەقە.

(إلْتَفَأَ- العُودَ): چێوەکەی/ تووڵەکەی پاککرد توێکڵەکەی لێکردەوە.

(ألْلفاء):١ خۆڵ/ گڵ ٢-شــتێکی کەم ٣-کەمتر لە مافی خۆ.

(ألْلفيئَــة (ج) لَفايــا ولَفيء): پلە گۆشــتی بێئێسقان.

٢-(لَفَأَ-هُ بالعَصا. لَفْأً ولَفَأً): بەدار لێیدا.

(-فُلانــاً عَن مُرادِهِ): نەیهێشــت فیســار بە نیازەکەی بگاتو گێڕایەوە.

٣-(لَفِئَ- الشَيءُ لَفَأً): شتەکە مایەوە.

(ألْفَأَ- الشيءَ إلْفاءً): شتەکەی هێشتەوە.

لفــت: (لَفَــتَ- الشــيءَ. لَفْتــاً): شــتەکەی خوارکردەوە/ بەلای ڕاستو چەپدا پێچی پێدا.

(-فُلانــاً عَن رأيــهِ): وایکرد فیســار واز لە ڕاکەی بهێنێت.

(-اللِحاءَ عَنِ الشَــجَرِ): توێکڵی درەختەکەی گرتەوە.

(-رِداءَهُ علــى عُنُقِهِ): عەباکــەی لە ملیەوە ئاڵاند.

(-الريشَ على السَّهم): پەڕەکەی لامسەرلایی بە تیرەکەوە کردو باشی پێوە نەکرد.

(الراعي الماشيَةَ): شــوانەکە لە ئاژەڵەکانیدا بێدەربەسانەو بێگوێدانە هیچیان.

(-الــكَلامَ): بێدەربەســانەو هەرەمەکیــی قسەیکرد.

(«لَفَتَهُ بِكَذا»): ئەوەی بەسەردادا/ دایە.

لَفَّــتَ- الشــيءَ: شــتەکەی خوارکــردەوە/ پێچیدا.

تَلَفَّــتَ- إلَيهِ: ئــاوڕی لێدایــەوە/ لای بەلادا کردەوە.

(إلْتَفَــتَ- إلَيــهِ): ئــاوڕی لێدایــەوە/ ڕووی بەلایەوە کرد.

(-بِوَجْهِهِ يمنةً ويسرَةً): ڕووی بەلای ڕاستو چەپدا وەرگێڕاو کرد.

(«لاتَلْتَفِــتْ لِفتَ فُــلان»): ئاوڕ لە فیســار مەدەرەوە/ تەماشای مەکە.

(ألْلفت):١-گەوج ٢-(ج) مانگا ٣ قڵیشی شتێکو تەنشتەکەی.

(«لِفْتُهُ مَعَهُ»): ڕووی بەلای ئەودایە.

(ألْلفَــتَ- في التيــس): خواریی (شــاخێکی/ قۆچێکی) سابرێنەکە.

(-في الإنسان): تەنگانە/ کەمدەستیی مرۆڤ.
(أَللَفَتَةُ): شوانێك کە هەمیشە لە ئاژەڵەکانی بدات.
(أَللَفات): گەوجی شرشێت.
(الأَلْفَت (م) لَفْتاء (ج) لُفْتٌ): ١-چەپلەر کە بە دەستی چەپ کاربکات ٢-گەوج ٣-سابرێنێك کە شاخێکی خواربووبێتەوە/ کەچبێت ٤-دەست بە هێزێك کە هەرچی بەردەست بکەوێت بایبدات ٥-خێل.
(أَللَفُوت): ١-دەروونئاڵۆزو سروشت نارەحەت ٢-ئافرەتی زمانبەد/ بەدخواز ٣-ئافرەتێك کە چاوی شێڵەوبێڵە بێت/ چاوی بجوولێت ٤-مێحوشتری بزێو لە دۆشینیدا.
(أَللَفيتَةُ): خواردنێکە بە ئاردو رۆن دەکرێت‌و توند دەبێت، بۆیە وا ناونراوە چونکە هەڵگێڕو داگێڕ دەکرێت.
(أَلمُتَلَفِّتَة) بەرزترین گرێی مل کە بە سەرەوە نووساوە.
٢-(أَللِفْت (ن)= السَلْجَم= شێلم): کشتێکە دەچێنرێت رەگی درێژە یان خرە پان دەبێتەوە، خواردنێکە پاش لێنانی زوو هەرسدەبێت زۆر دەچێنرێت‌و کاردەکرێت، پێشی دەوترێت (أَلسَلْجَم).
الملحق:
لفت: (أَللافتَة): دیدەئاگا: تەختەیەکە یان پارچە کوتاڵێکەو شتێکە لەو بابەتە ناوێکی پێوەیە یان دروشمێك لە شوێنە گشتیەکاندا بۆ ئاگاداریی‌و پروپاگەندە یان بۆ رادەربڕینێك هەڵدەواسرێت.
لفج: (أَلْفَجَ): ١-نابوتبوو/ هیچی بە دەستەوە نەما ٢-لە نەبوونیدا یان لە خەفەتدا خۆی بە زەویدادا خۆی پێوە مەڵاسکرد.
(-فُلاناً): فیساری ناچارکرد پەنابەرێتە بەر بێگانە/ خەڵکی دەرەکی.
(أَللَفَج): سەرشۆڕیی‌و زەبوونیی.
(أَلمُلفَج): ١-نابووت ٢-لە بێهێزیدا بە زەویدا کەوتوو.
(أَلمُسْتَلْفَج):١-نابووت ٢-لە ترساندل دڵکەوتوو/ رۆحچوو.
لفح: (لَفَحَ- فُلاناً بِالسَّيفِ لَفْحاً): شمشێرێکی پێداکێشا.
(-تِ النارُ أَو السَمُومُ بِحَرِّها فُلاناً. لَفْحاً ولَفَحاناً): تینی ئاگرەکە یان گڕەی گەرماکە دەمووچاوی سووتاند.
(نارٌ لافِحُ ولَفُوحٌ): ئاگرێکی سووتێنەر/ برژێنەر.
(«أَصابَهُ مِنَ الحَرِّ لَفْحٌ ومِنَ البَرد نَفحٌ»): گڕەی گەرماو سۆڵەی سەرمای بەرکەوت.
(أَللَفْح): هەڵکردنی بایەکی گراویی گەرم.
(نَفْح): هەڵکردنی بای سۆڵەی سارد.
(أَللُفّاح. أَلواحِدَةُ لُفاحَة) (ن): سێوە جنۆکانە، گیایەکی ژەهرینی کێویلەیە

تەمەندرێــژە گەلایەکی زۆری هەیە لەســەر رووی زەوی کۆمەڵدەبەســتن لــە کۆتایــی زســتاندا گوڵدەکات بەرێکی زەردی بۆنخۆش دەگرێت لە ترێ دەچێت زەردباوو بۆنخۆشــە دەرمانی ئارامدەری لێدەردەهێنرێت.

لفخ: (لَفَخَ-هُ فِي أَو على رَأسِهِ): (دای/ کێشای) بەسەریدا.

(أَللَّفخ) (مص): کێشــانو لێــدان بە هەموو سەردا.

لفظ: (لَفَظَ ولَفِظَ- الشــيءَ وبالشَّــيءِ من فَمِــهِ. لَفظــاً): شــتەکەی لــە دەم (فرێدایە دەرەوە/ هاویشتە دەرەوە).

(شــيءٌ لَفيظٌ ومَلْفوظٌ): شتێکی لە دەمەوە فرێدراو.

(-بالكَلام): قسەیکرد/ ئاخاوت.

(-فُلانٌ نَفْسَــهُ أَو عَصْبَهُ): گیانی دەرچوو/ گیانیدا/ مرد.

(عَصْبُــهُ= ريقُــهُ)): تفــی ناودەمــی کە بە دەمیەوە دەنووسێتو وشکدەبێت.

(-البَحْــرُ دابَّــةً): دەریاکــە لاکــی ولاخێکی فرێدایە ســەر ڕۆخەکەی/ هاویشــتیە ســەر قەراغەکەی.

(«لَفَظَــت إلَينــا البــلادُ أَهْلَهــا»): وڵاتەکە دانیشتووەکەی بۆ لای ئێمە دەرکردە دەرەوە.

(تَلَفَّظَ بالكَلام): کەوتە قسەکردن.

(أللافِظَة): ١-مێی وشــەی (أللافِظ) ٢-دەریا.

چونکە مرواریــی دەردەکات (ئــەو هێیە بۆ زیادرەوییــە) ٣-ئاش ٤-دنیــا/ جیهان. چونکە هەرچی لە سەریەتی تووریدەداتە ئەودنیا.

(لافِظَة): دەریا.

(أَللَّفــظ (مــص) (ج) أَلْفاظ): ١-وشــەو ئەو وشــانەی کە لە دەم دەردەچێــتو دەوترێت ٢-قسە/ وتە/ ئاخاوتن.

(أَللَّفْظَة) (ج) لَفَظات): وتەیەك یان وشەیەك لــە دەم بێتەدەر جارێك، دوان. وشــەیەك کە دەربرێتو لە دەم بێتەدەرێ.

(لايُقال عَن الأُقنوم الثاني لَفظَةُ الله بل كلمة الله»): بە حەزرەتی عیســا نالێن وتەیەکە لە دەمی خودا دەرپەڕیبێت بەڵکو دەڵێن وشــەی خودایە.

(أَللَّفظِي): ئەوەی پەیوەندی بە وتەوە بێت/ وتەیی.

(أَللُّفاظ): سەوزەوات.

(أَللُّفــاظ): ١ ئــەوەی لــە دەم هاوێژرابێــت ٢-ئەوەی وتراوەو بە گوێدا دراوە.

(أَللُّفاظة): قســەیەك/ وتەیە کە گوتراوەو لە دەم هاتۆتە دەرەوە.

(أَللُّفاظــة (ج) لُفــاظ ولُفاظــات): ١ ئــەو قســەیەی لــە دەم بێتــە دەرێ ٢-ئــەوەی لە دەمــەوە فڕێبدرێت ٣-بەر ماوەی ســەرخوان ٤-تۆزە ماوەیەکی هەر شتێك بێت.

(أَللَّفيظ): ١-فرێدراو ٢-بەگوێدادراو/ وتراو.

لفع: ١-(لَفَعَ- تْــهُ النارُ لَفعاً): گری ئاگرەکە بردی/ گری ئاگرەکەی بەرکەوت.

(-الشــيبُ رَأْسَــهُ): پیریــی ســەری هەموو سپیکرد.

لَفَّــعَ= (لَفَــعَ- الغُــلامَ): کورەکەی خســتە باوەشی/ گرتیە خۆی.

(«لَفَّعَ رَأْسَهُ»): سەری خۆی داپۆشی.

(تَلَفَّعَ): مووی سەری سپیبوو.

(-تِ النارُ): ئاگرەکە کڵپەیسەند.

(-تِ الحَرْبُ بِالشَرِّ): خراپەی جەنگ هەموو لایەك و هەموو کەسێکی گرتەوە.

(-القَــومُ على جَيــشِ العَدُوِّ): خوێنــگەل دوژمنــی گرتــە خــۆو پایەماڵیانکــردو تالآنیاکردن/ هیچیان نەهێشتن.

(-الرَجُلُ بِالثَوبِ والشَجَرُ بالوَرَقِ): پیاوەکە بە جل خۆی داپۆشــیو درەختەکەیش خۆی بە گەڵا داپۆشی/ گەڵای گرتەخۆی.

(أَلْتَفَــعَ- الرَجُل بالثَوبِ والشَــجَرُ بالوَرَقِ): پیاوەکە خۆی لە بەرگ هەڵکێشا/ خۆی خستە بەرگەکەیــەوە درەختەکەیــش بە گەڵا خۆی داپۆشی.

(-تِ الأَرضُ): زەویەکە گیاکەی داپیۆشی.

(أَلْتَفِعَ- لَونُهُ): ڕەنگی گۆڕرا.

(أَلْلِفــاع): ١-داپۆش، پێخەف، لێفە، پۆشــاك، بــەرگ ٢-دوو ســەری گوانــی پێشــەوەی مێحوشتر.

(أَللَفيعَــة واللفيعَــة): پارچەی زیــاد کە لە بەرگ دەدرێت.

(أَلتَلفيعَة) شــاڵو ملپێچ کە لە ســەرمادا لە ملەوە دەئاڵێنرێت.

(أَلمِلْفَعَة): عەبا یا هەر بەرگێك کە لە خۆتیەوە بپێچیت وەك فەرەنجیو شتیتر.

٢-(لَفَّعَ- فُــلانٌ): فیســار (زۆر خۆرییکرد/ زۆری خوارد).

(تَلَفَّــعَ- المالُ): ماڵیاتەکــە/ ئاژەڵەکە کەڵکی لەوەڕەکە بینی.

لفق: ١-(لَفَقَ- الثوبَ. لَفقاً): پارچە دڕاوەکەی جلەکەی لەیەکدایەوەو پێکەوە درووونیەوە.

(لَفَّــقَ- الحديــثَ): قســەکەی هەڵبەســتو ڕازاندیەوەو پڕیکرد لە شتی ناڕاستو ناڕەوا.

(-الشَــقَّتَين): دوو پارچەکــەی لەیەکــداو درووونیەوە.

(«لَفَّــقَ بَينَ الثَوْبَــين»): دوو بەرگەکەی بە درووون پێکەوە گونجاند.

(تَلَفَّقَ- بِهِ): ١-پێیگەیشت ٢-پێوەیلکا/ پێوەی پەیوەستبوو.

(-مابَينَهُــم): پێکیەوە گونجاندن/ نێوانیانی ڕێکخستو یەکیخستن.

(تَلافَقَ- القَومُ): کاروباری خوێنگەل ڕێکبوو/ گونجا/ تەبابوون.

(أَللِفق): دوو پارچە لە یەك بدرێنو بدورێن وەك دوو تەختــە دەوار پێکــەوە بدروێن یان

بەرگێك دوو پارچە بێتو بە یەکەوە بدروێن.
بــە دوو پیاو کە هەر بە یەکەوە بنو لە یەك جیانەبنەوە دەڵێن («هُما لِفقان).
أَللِفَــاق: دوو بەرگن یەکتری تــەواو دەکەنو پێکــەوە لەبــەر دەکرێن هــەر پارچەیەکیان پێیدەڵێن (لِفاق).
٢-(لَفَقَ- الأَمرَ. لَفْقاً): کارەکەی ویستو بۆی نەبوو.
(-الصَقْــرُ): بازەکــە بــۆ نێچیرەکــە نیرراو نەیگرت.
(لَفَّــقَ الرجُــلُ): پیاوەکە کارێکی ویســتو دەستگیری نەبوو، بۆی نەبوو.
(أَللَفَّاق): کەســێك نــەوەی دەیخوازێت (بۆی نەبێتو سەرنەکەوێت/ دەستگیری نەبێت).
لفك: (أللفِيك): چەپلەر.
(أللفيك والأَلْفَك): گەوج.
لفــم: (لَفَمَ-تِ المَــرأَةُ): ژنەکە دەمامکەکەی لەسەر لووتی قایمکردو لووتی شاردەوە.
(-تِ المَرأَةُ فاها): ڕووپۆشەکەی لەسەر دەمی قایمکردو دەمی خۆی شاردەوە.
(-هُ): پێچایەوە.
(تَلَفَّــمَ-تِ المَــرأَةُ): ژنەکــە دەمامکەکــەی توندکرد/ ڕووپۆشەکەی توندکرد.
(-بِعَمامَتِــهِ): بە مێزەرەکــەی دەمو لووتی خۆی هەڵبەست.
(إِلْتَفَــمَ-تِ المَــرْأَةُ): ژنەکــە دەمامکەکەی/ ڕووپۆشەکەی خۆی قایمکرد.
(أَللِفَــام): ڕووپۆش/ دەمامك کــە دەخرێتە سەر لووت.
لفو: ١-(لَفَا. يَلْفو- اللَحْمَ عَنِ العَظم. لَفْواً): گۆشتەکەی لە ئێسقانەکە کردەوەو دایماڵی.
(-فُلاناً حَقَّــهُ): مافەکەی تەواو بە فیســار نەدایەوەو لێیبڕی.
(أَللَفِيَّــةُ (ج) لَفايا): پارچە گۆشــتێك/ پلە گۆشتێك.
(أَللَفَاء): ١-خۆڵ/ گڵ ٢-بێبایەخو کەم ٣-ڕسواو نزم/ سووك/ هەموو شتێکی هیچو پووچ.
(«رَضِــيَ فُلانٌ مِنَ الوَفاءِ باللَفاءِ»): فیســار لەو هەموو مافەی وازیهێناو بە شــتێکی کەم قایلبوو.
٢-(أَلْفى- هُ إِلْفاءً): دۆزییەوە/ دییەوە.
(تَلافــى- الأَمــرَ): فریــای کارەکــە کەوتو چارەســەریکرد/ جێبەجێیکرد یان ڕاستی کردەوە.
(أَلتَلافِي) (مص): ١-فریاکەوتن/ چارەسەرکردن ٢-فریای تۆڵەسەندن کەوتن.
لقّ: ١-(لَقَّ- عَيْنَهُ لَقّاً): بە دەستی کێشای بە چاویدا.
(لاق (ج) لَققة): کەســێکە کە بە دەســت بە چاودا بکێشێت.
(أَللَقَّقَة): کەســانێکن کە بە لەپیدەســت بە چاوی خەڵکدا بکێشن.

(لاقَّ): کەسێکە کە بە چاودا بکێشێت.
٢-(أَلْلَق): ١-درزو قلێشــی زەوی ٢-زەوی بەرز ٣-هەمــوو زەویەکــی تەنگەبەری لاکێشــەیی ٤-چەنەباز/ زۆربڵێ/ قەرەچەن.
(أَلْلَقَة): چاڵی دەمتەسك.
(«رَجُــلٌ لَقَّاقٌ بَقَّاق»): پیاوێکــی (زۆربڵێ/ هەڵەوەڕ/ چەنەباز/ قەرەچەن).
٣-(لَقْلَــقَ- اللَقــلاقُ): حاجــی لەقلەقەکــە خوێندی.
(-تِ الحَيَّةُ): مارەکە زمانی دەرکێشا.
(لَقْلَقَ الشيءَ): شتەکەی بزواند.
(تَلَقلَقَ- الشــيءُ): شــتەکە کەوتە لەقەلەق/ جموجووڵ/ بزوا.
(أَللَقلَق (ج) لَقالِــق) (ح): ١-حاجی لەقلەق. باڵندەیەکی قاچو ملدرێژە لە لاقدرێژەکانە مار دەخواتو زیرەكو وریایە ناوە شــارراوەکەی: (أبو خُدَيج)ە ٢-زمان.
(أَللَقْلَقَة): ١-دەنگــی حاجی لەقلەق ٢-هەموو دەنگێکی لەرزۆکی شپرزە.
(«في لســانِهِ لَقْلَقَــةٌ»): زمانــی (دەیگرێت/ گرتنی تێدایە).
(حُروف اللَقلَقةِ): ئەم پیتانە گرتنی تێدایە (ب. ج. د. ط. ق).
(أَلْلَقْلاق) (ح): ١-حاجی لەقلەق ٢-دەنگەدەنگ و غەڵبەغەڵب/ ژاوەژاو.
(طَرْفٌ مُلَقْلَقٌ): سەرێکی/ لایەکی بە جووڵەو نەگیرساوە/ نەچەسپاو.
لقب: (لَقَّبَ- فُلاناً بِكَــذا): ئەو نازناوەی لە فیسار نا.
(لاقَبَ-هُ): نازنــاوی دزێوی لێنا/ بە نازناوی ناشیرینو ناتۆرە بانگیکرد.
(تَلَقَّبَ- بِكَذا): ئــەو نازناوە بوو بە نازناوی ئەو/ نازناوی (بۆ خۆی دانا/ لەخۆینا).
(تَلاقَــبَ- القَــومُ): خوێشــگەل نازنــاوی ناشــیرینیان لە یەك نا/ ناتۆرەی دزێویان لە یەکتری ناو پێی یەکتریان بانگکرد.
(أَللَقَــب (ج) أَلْقاب): نازنــاو. ناوی دووەمی ئەو کەسەیە کە لێیدەنرێت نازناوی باش یان خراپ.
لقح: ١-(لَقَــحَ- النَخلَ لَقحاً): دارخورماکەی تۆوڕێژ کرد. هەڵاڵــەی بە دارخورما مێکەوە کرد.
(لَقِــحَ-تِ الناقَــةُ ونَحْوَها ولَقَحــاً ولَقاحاً. لَقْحاً): مێحوشــترەکە یان مێیــتر کەڵیگرت/ تۆویگرت یان ئاوسبوو.
(لاقِح ولَقُوح): کەڵگرتوو یان ئاوســبوو/ یان تۆوگرتوو.
(لَقِــحَ-تِ المَرأَةُ أَو النَخلَةُ): ژنەکە ئاوســبوو یان دارخورماکە بەریگرت.
(-تِ الحَــربُ): جەنگەکــە بەرپا بــووەوەو ســەریهەڵدایەوە کە بۆ ماوەیەك بێدەنگبوو، کپبوو.

(لَهَدَ- دابَتَّهُ): ولاخەکەی شەکەت و لاواز کرد.

(-فُلانــاً): ١-تونــد پالــی بە فیســارەوەنا بۆ ئەوەی سەری پێ شــۆڕبکات ٢-کێشای بە بنی مەمکیــدا یان بنی شــانیدا ٣-توند بەدەســت گوشی و دەستی پێدانا.

(لَهَّدَ- فُلاناً): پالێکی توندی وای بە فیسارەوە نا تا سەری پێ نەوی بکات.

(أَلْهَدَ-هُ): زۆرو ستەمی لێکرد.

(-إلی الارض): بە پێی گــران بە زەوییەکەدا رۆیشت.

(-بــهِ): تیروتوانجــی تێگرت و ســووکیکردو مافەکەی کەمکردەوە.

(-بفُلان): فیساری گرت و ئەویتری تێبەردا.

(أَللَّهْد) (مص): ١-پیاوی لەشگران ٢-شەقبردنی سینەی حوشــتر بە بەرکەوتنی شتێك یان بە هۆیەکیــترەوە ٣-دەردێکە دەداتە پێ یان رانی خەڵك.

(أَللَّهيد): داماو/، پەککەوتەو لاواز.

(أَلمُلَهَّــد) (مفــع): نەخــۆش و کەنەفــت/ پەککەوتە.

(رَجُلٌ مُلَهَّدٌ): پیاوێکــی داماوی پەککەوتەو کەساس دەربەدەری دەرگایان.

٢-(لَهَدَ- الشــيءَ. لَهْداً): شــتەکەیخوارد یان لستیەوە.

(أَللَّهيدَة): حەڵوایەکە نە شلە هەڵقوڕێنرێت و نە توندە، بکرێت بە پاروو.

٢-(أَللُّهــاد): کات و باری گیانکەنشــتیی/ هی یەکێك کە لە گیانەڵادا بێت.

لهذ: ١-(أَللَّهْذَب): شــتی نەگــۆڕی جێگیر بوو بەند/ چەسپبوو.

(لَهْذَمَ-هُ): بڕی/ لەتیکرد.

(تَلَهْذَمَ-هُ): بڕی/ لەتیکرد.

(-الشيءَ): شتەکەیخوارد.

(أَللَّهْذَم (ج) لَهاذِم ولَهاذِمَة): تیغی تیژو بڕەر. شمشێرو نووکی نێزەو کەڵبەی تیژو بڕەر.

(أَللَّهاذِمَة): دزان.

لهز: ١-(لَهَزَ- الشــيءُ فُلاناً. لَهْزاً): شتێك لە فیساردا دەرکەوت.

(-القَــومَ): خۆیکــرد بەنــاو خوێنگشــەلداو تێکەڵیانبوو.

(-هُ الشــيبُ): ســپێتیی مووی ســەرو ریش لێیدەرکەوت/ دایە سەری.

(مُلْهوز): کەسێکە قژی و تووکی ماش و برنج بووبێت و پیری سەری تێکردبێت.

(-هُ بالرمح): نێزەکەی بە سنگیدا کرد.

(-فُلانــاً): ســیخورمەی لێدا یان بە مشــت کێشای بە ملی و بن گوێچکەیدا.

(-الفَصيــلُ ضَرعَ أُمِّهِ): بەچکە حوشــترەکە یان گوێرەکەکە لە کاتی مژینی دایکیدا سەری بە گوانی دایکیدا کێشا.

(لَهَّــزَ- هُ تَلْهيــزاً): بە مشــت بــە ملی و بن بناگوێیدا کێشا.

(اللاهِز) (فا): كۆسپ/ ڕێگر/ بەرگر. كۆسپ یـــان گرد دەبنە ڕێگر بـــەری ڕێگەكە دەگرن. خـــۆ ئەگەر دوو كێو لە یـــەك نزیك ببنەوەو نێوانیـــان وەك كۆلانێكـــی لێبێت ئەوە دەبنە ڕێگرو كۆسپ بۆ ڕێو هاتوچۆ.

(أللاهِـــزان): دوو شـــاخ نزیكـــی یەكببنەوەو ڕێگربن.

(أَللَّهِز): توند/ سەخت.

(أللِّهـــاز): پواز/ پارچە پێســـتێك یـــان پەڕۆ دەخرێتـــە كونـــی تـــەوەرەی بەكرەكـــەوە تا تەسكی بكاتەوەو توندی بكات.

(أَللَّهْـــزَة= أللِهْزِمـــة): ئێســـكێكی دەرپەڕیوی ســـەری كاكیلەیە لەژێر گوێدایە كەدوانن هی ژێر هەردوو گوێن.

(أللِّهَز): بە مشـــت كێشـــەر بە پشتی ملو بن گوێچكـــدا/ كەســـێكە بە مشـــت بـــە ملو بن گوێچكەدا بدات.

(أَللَّهُوز) (مفع): ١ لەشـــتۆكمە وەگ گۆشـــتی لەشـــی چنگی دابێتـــە یەك ١-لە بن ئێســـكی دەرپەڕیوی كاكیلەیدا نیشانە كراو.

٢-(لَهْـــزَم-هٌ): ١-هـــەردوو ئێســـقانی ســـەری كاكیلـــەی دەرپەڕیوی بنگوێی بـــری ٢-مووی سپی دایە هەردوو لای ڕوومەتی.

(أللِهْزِمَةُ (ج) لَهازِم): ئێســـكێكی دەرپەڕیوی ســـەری كاكیلەیە لەژێر گوێدایە كە دوانن هی ژێر هەردوو گوێن.

لهس: (لَهَسَ الشيءَ. لَهْساً): شتەكەی لستەوە یان سەری زمانی پێداهێنا.

(-الصَبيُ ثَدْيَ أُمِّه): كۆرپەكە گۆی مەمكگی دایكی (لستەوە/ زمانی پێداهێناو نەیمژی.

(-علـــى الطعام. مُلاهَســـةً): بـــۆ نانخواردن چاوچنۆكانە تەنگی بەوانیتر هەڵچنی.

لاهَسَ: جێی خۆیكردەوە.

(-القَومُ إلى الشـــيء): خوێشـــگەل بۆ شتەكە كەوتنە تەكانو تەنگو بەیەك هەڵچنین.

(أللاهِس (ج) أللَواهِس): كەســـێكە بۆ شـــت تەنـــگ بـــە خەڵـــك هەڵچنێت/ ســـووكەڵەو چابوكو بە هەڵپە بێت.

(أللُّهْسَةُ): شتێك كە بلێسرێتەوە.

(«مالكَ عِندي لُهْسَـــةٌ»): شـــتێكم لا نییە تۆ تەكانی بۆ بدەیت.

(أللُهـــاس واللُهاسَـــة): خواردنێكی كەم/ تۆزە خواردنێك.

٢-(لَهْسَـــمَ ما على المائدةِ): خواردنی ســـەر خوانەكەی هەموو (ماشییەوە/ خوارد).

(أللُهاســـم. الواحِدُ لُهْسُم): شێوە تەسكەكانی دۆڵو دەرە.

لهط: ١-(لَهَطَ- هُ. لَهْطاً): زللەی پێداكێشا.

(- ە بسَهم): تیرێكی تێگرت.

(-الشـــيءَ) (عامیـــة): بەپەلەو شـــپرزانە/ چاوبرسییانە. خواردنەكەیخوارد.

(-بە الأرضَ): دایبەزەویدا.

(-تْ أُمُّهُ بِهِ): دایکی ئەوی بوو.

(ألّلاهِط) (فا): ئاورشێنکەرو پاکەرەوەی بەر دەرگاکەیان.

٢-(لَهِطَ- الثوبَ. لَهْطاً): جلەکەیدروو.

٣-(لَهْطَةٌ- مِنَ الخَبرِ): هەواڵێك کە بیبیسیت بڕوای پێنەکەیت‌و بە درۆیشی نەخەیتەوە.

لهع: ١-(لَهِعَ- الرَجُـلُ. لَهَعاً ولَهاعَةً): لەگەڵ هەموو یەکێکدا درێژەی بە قسەدا.

(لَهِـع ولَهِـع ولَهيـع): کەسێکە لەقسـەدا درێژدادرەو فشەکەرە، خۆهەڵکێشە.

(-فِي الكَلامِ): خۆی هەڵکێشاو فشەیکرد.

(أَلْلَهاعَة): ١-بێئاگایی.

(أَلْلَهيعَة): بێئاگایی/ وریانەبوون.

(«رَجُلٌ فيهِ لَهيعَة»): ١-کابرایەکە لە جیهان بێئاگایـە/ هوشـیار نییـە/ حۆڵـە ٢-خاوو خلیچکیی ٣-تەمەڵیی بێئاگایی‌و بێدەربەسیی لـە کڕیـن‌و فرۆشـتندا بـە ڕادەیـەك کـە ژێرکەوێت‌و دەستیبڕن.

٢-(أَلْلَهيـع): درێژدادڕو ڕقـن لەگەڵ هەموو کەسێکداو خۆهەڵکێش.

لهـف: ١-(لَهِفَ- علـى مافاتَ لَهَفـاً): داخ‌و خەفەتی بۆ ئەوە خوارد کە لەدەسـتچووبوو/ کە تێپەڕیبوو، بۆی شپرزە بوو.

(لَهِف ولَهيف): شپرزەو داخلەدڵی ڕابوردوو/ لەدەستچوو/ سوێ لەدڵ.

(لُهِفَ. لَهْفاً): زۆرو ستەمی لێکرا.

(لَهِـفَ- فُـلانٌ نَفْسَـهُ أَو أُمَّـهُ): داخـی بۆ خۆیخـوارد یـان بـۆ دایکی، ناسـۆری چووە دڵەوە/ سوێی چەشت.

(«وا نَفْسـاه وأُمَيَّاه. وا لَهفَتاه»): هەناسەی بۆ خۆی هەڵکێشا وتی: هەناسەی ساردم داخی داخانـم بـۆ خۆم بـۆ دایکم/ چ ناسـۆرێك‌و سوێیەکبوو.

(«لَهَّـفَ أُمَّيـهِ»): داخ‌و ژانەدڵـی بۆ دایك‌و باوکیبـوو (لێـرەدا دایـك هێنراوەتـە پێش لەبری باوك چونکە دایك سـۆزو میهرەبانیی زۆرەو خەفەت زۆرتر دەخوات).

(«لَهْفتُ إليـكَ تَلْهيفاً»): هانام بۆ تۆ برد بە سوێمەوە بێیت.

(أَلْهَـفَ): (بەرچاوتەنگ/ شـپرزە) بوو/ بە پەرۆشبوو/ چڵێسبوو.

(تَلَهَّفَ- عَلَيهِ): داخی بۆ خواردو هەناسەی بۆ هەڵکێشا/ بۆی سووتا/ سوێ چووە دڵیەوە.

(إلْتَهَفَ فُلانٌ): ناسۆرو داخ‌و جەرگبڕین ئاگری ئاگری لە فیسار بەردا.

(-تِ النارُ): ئاگرەکە بڵێسەیسەند/ بەربووەوە.

(أَللاهِــف) (فا) (م) لاهِفَــة ولاهِف): ١-دڵپڕ لەسـوێ/ خەفەتبـار زۆرلێکـراوی بێچارەو دڵشکاو دەپارێتەوەو هانا دەبات.

(«هو لاهِفُ القَلْب»): سوێ لە دڵە/ دڵشکاو/ دڵسووتاوە.

(أَللاهِفَةُ (ج) لاهِفات ولَواهِف): مێی وشەی

(اَللاهِف): دڵسوتاو جەرگسووتاو/ (سوێ/ داخ) لەدڵ.

(أَلْلَهْف) (مص): ئەفسووسکێشان/ درێخخواردن/ سوێچوونەدڵ/ بەناسۆرەووە بوون/ گینگڵدان.

(یالَهْـفَ فُـلانٍ): داخەکـەم داخ بۆ فیسـار، ئەفسوس، هایش.

(«یالَهْفي عَلَیكَ ویا لَهْفَ ویالَهْفاً ویالَهْفَ أَرضي وسَـمائي عَلَیك ویا لَهفاه»): ئـای چ داخێکت هەیە، ئەفسوس بۆ تۆ درێخو داخ بۆ تۆ، جەرگی براوم، هایش چ سـوێیەکە/ بە داخەوە سـوێی هێندەی ئاسمانو زەویەکەم لە دڵە.

(أَلْلَهْفـان (م) لَهفـی (ج) لهافـی ولُهُـف): شـپرزەو/ پـەژارە داگرتوو/ سـوێ لـە دڵ/ خەمخواردوو ٢-خەفەتبار/ هەناسـەی سـارد هەڵکێش/ دڵ پڕ لە ژان.

(أَلْلَهْفَة): جاری داخ خواردن/ سـوێ چوونە دڵەوە/ ناسۆر چوونە گیانەوە.

(«یالَهْفَـةَ ویالَهفَتـاهُ ویالَهفَتَیاه»): هایش داخەکـەم، وەی داخـی داخانم/ ئەفسـوس/ درێخم بۆ ئەوەی بوو.

(أَلْلَهوف (م) أَلْلَهوفَة): شپرزە/ داخخواردوو/ پەژارەداگرتوو/ خەمبار/ خەفەتبار.

(أَلْلَهیـف (ج) لِهـاف): ١-بێچـارەو دامـاو ٢-پەژارەبار/ سوێ لەدڵ.

(رَجُلٌ لَهیـفُ القَلـب): پیاوێکـی دڵبرژاو/ دڵسووتاو/ جەرگبڕاو.

(أَلْلَهوف): ١-خەفەتبار و دڵ پڕ لە داخ بۆ ماڵێك لە دەستی چووبێت یان کۆستێکی کەوتبێت/ جەرگی سـووتابێت ٢-سـتەملێکراوێك هاوار بکات بپارێتەوەو هانا بەرێت.

(رَجُلٌ مَلْهوفُ القَلب): پیاوێکی جەرگسووتاو.

٢-(أَلْلَهوف (م) أَلْلَهوفَة): ١-درێژ ٢-ئەستوور.

لهـق: ١-(لَهَقَ ولَهِقَ- الشَـيءُ. لَهْقـاً ولَهَقاً): شتەکە زۆر سپیبووەوە.

(تَلَهَّقَ- الشيءُ): شتەکە تەواو سپیبووەوە.

(أَلْلَهـاق): ١-گا یـان مانگای سـپی ٢-هەموو سپییەك.

(أَبْیَضٌ لَهاقٌ): سپیەکی تەواو سپی/ زۆر سپی.

(بَقَرةٌ لُهاقٌ): مانگایەکی تەواو سپی.

(أَلْلَهِـق واللَهَق (م) لَهِقَـة ولَهَقَة (ج) لَهَقات ولِهاق): ١-گای زۆر سپی ٢-هەموو سپییەك.

(أَبْیَضٌ لَهِقٌ ولَهَقٌ): سپییەکی زۆر سپی.

(مُلَهَّقُ اللَّون): رەنگ سپی.

٢-(تَلَهَّقَ- الرَجُلُ): کابرا زۆر دواو قسەیکرد.

لهم: ١-(لَهِمَ- الشَـيءَ لَهْماً ولَهَماً): یەکسـەر شتەکەی قووتدا.

(-المـاءَ): ئاوەکـەی یەکبینـە (هەڵوقراند/ لووشدا).

(أَلْهَمَ-هُ الشيءَ): شتەکەی پێ قووتدا.

(-اللهُ فُلانـاً خَـیراً): خـودا شـتی خێـری خسـتە دڵیـەوەو چۆنیش دەسـتگیریدەبێت سەریشیخست.

(تَلَهَّمَ والتَهَمَ-الشَـيءَ): يەكسەر/ بە جارێك شتەكەی قووتدا.
(أَلْهام): ســوپایەكی بێشــومارو مەزن (وەكو هەموو شتێك بماشێتەوەو هەڵلووشێت).
(إِسْــتَلْهَمَ-اللّهَ خَيْراً): لە خودایخواســت كە سەرۆی بداتو فەری بخاتە دڵەوە.
(«أَسْــتَلْهِمُ اللّهَ الرَّشــادَ»): لە خودا دەخوازم ســەرۆی چاكــەم بــدات/ ڕێی ڕاســت بخاتە دڵمەوە/ ڕێی ڕاستم پیشان بدات.
(رَجُل لَهِمٌ ولَهَمٌ): زۆرخۆر/ بخۆر/ بەخۆرا/ چڵێس.
(أَلْلُهْمَةُ- مِنَ السُوَيق): قاوتی وشك.
(أَللِهَــمُّ): ١-چاكە زۆر/ فرەچاكــە ٢-خێرخوازو بەخشندەی چاك ٣-زۆرخۆر ٤-مرۆڤی لە پێشەوە بوو/ سەركەوتوو یان ئەسپی براوەو لە پێشەوە/ لە غارغارێندا زاڵ ٥-دەریای گەورەو فراوان.
(رَجــلٌ لَهِــمٌّ ولَهِمُّون): پیاوێكی قســەرەواو ڕا دروســتو بەخشــندەیەكی تــەواوو مەزن (ئەمانە بە ژن ناوترێت).
(رَجُلٌ لَهُومٌ): زۆر خۆر/ بەخۆرا.
(أَللُهَيْم): مەنجەڵی فراوان.
(أَلْلُهَيْم وأُمُّ اللُهَيْم): بچووككراوە ١-مەرگ ٢-تا ٣-وەی/ ئاپۆرە/ چورتوم/ بەڵا.
(أَلإِلْهام) (مص): سەرۆ/ سروش/ ئەوەی خودا دەیخاتە مێشــكو دڵەوە بۆ كردنی كارێك یان نەكردنیو وازلێهێنانی.

(أَلْلُهَــم والمُلْهَــم- مِــنَ الرجــال): پیــاوی (زۆرخۆر/ بەخۆرا).
٢-(أَلْتِهم- لَونُهُ): ڕەنگی تێكچوو/ ڕەنگی پەڕی.
٣-(أَلْلِهْم (ج) لُهوم): هەموو شتێكی تەمەندار/ بە تەمەن.
٤-(لَهْمَسَ- ماعلى المائِدَة): هەرچی لەســەر خوانەكە بوو خواردیو ماشییەوە.
٥-(أَلْلُهْموم (ج) لَهاميم): ١-مرۆڤی ڕەســەن/ جســن/ ئەســپی ڕەســەن ٢-ســوپای مــەزن ٣-ژمارەیەكــی زۆر ٤-هەوری بــە بارانی دڵۆپ گەورە گەورەو بەلێزمە ٥ مێحوشتری فرمشیر.
(لَهاميمُ الناس): ١-بەخشندەو خێرخوازەكانی خەڵك/ دەستوالآكان ٢-پیرەكانی خەڵك.
(أَلْلِهميم): ئەسپی پێشــكەوتووی پێشبڕكێو مرۆڤی سەركەوتوو و پێشكەوتوو.
لهــن: (لَهَــنَّ- القَــومَ ولِلْقَــوم): بەركوڵــی بەخوێشــگەلدا/ خواردنێكی بەخوێشــگەلدا پێش نانخواردن كە دڵیان خواردن ببات.
(أَلْهَــنَ-هُ): كەلــە گــوزار هاتــەوە شــتێكی پێشكەشكرد.
(تَلَهَّنَ- الرَجُلُ): پیاوەكە پێشخواردنی خوارد تا دڵی خواردنەكە بەرێت.
(أَلْلُهْنَةُ (ج) لُهَــن): ١-بەركوڵ یان ئەوەی كە دڵی خواردن بكاتەوە ٢-دیاری كە گوزاركارەكە پێشكەشــیدەكات ٣-ئەوەی بە گوزاركارەكەی دەدەیت كە هاتەوە.

لهــو: ١-(لَها. يَلهو. الرَجُلُ لَهــواً): ياريكرد/ گەمەيكرد/ وازييكرد.

(-بــهِ): ياريى پێكرد/ فريوخــواردووى ئەو بوو/ پێى رابوارد يان پێوەى بەند بوو.

(-تِ المرأةُ إلى حَديثِ الرَجُــلِ. لَهْواً ولُهُوّاً): ژنەكە قســەى پياوەكەى لاخۆشــبوو سەيرى لێهاتو دڵى بەكێشبوو.

(-عَنِ الشيءِ. لُهِيّاً ولِهياناً): ئاگاى لە شتەكە براو فەرامۆشيكرد ٢-ناوى شتەكەى نەهێنا.

(لَهِــيَ يَلْهى عَنهُ. لَهاً): لە بيرى خۆى بردەوە خــۆى لێبێئاگا كــردو نــاوى نەهێناو خۆى لێلادا.

(-بِكَذا): خۆشيويستو بەوەوە گرفتار بوو.

(«إلَهَ لَهُ كَما يَلهى لَكَ»): بۆ يەكێك بسووتێ كە بۆ تۆ بســووتێت/ ئەوچيت پێدەكاتو بۆ دەكات تۆيش هەروەكو ئەو بكە.

(لَهّــى. هُ عَــن كــذا تَلْهِيَةً): بە شــتيترەوە خلافاندىو لەوە لايداو ئەوەى لەبير بردەوە.

(-هُ بِكَــذا): بــەوەوە (خەريكيكرد/ ســەرى قالكردو هۆشى لەبەر برى.

(لاهــى- الشــيءَ مُلاهــاةً): لــە شــتەكە نزيكبووەوە.

(-الغُــلامُ الفَطامَ): منداڵەكە نزيكى لەشــير برينەوە بوو.

(-هُ): ١-لەيــەك نزيكبوونەوە ٢-لەگەڵ يەكدا تێكچوون.

(ألهــى- فُــلانٌ الشــيءَ. إلهــاءً): فيســار لە بێدەسەڵاتيدا وازى لە شتەكە هێنا.

(-هُ اللعِــبُ عَن كَذا): ياريكــردن لەوميلاداو خەريكيكرد.

(تَلَهّــى- بِكَذا تَلَهِّيــاً): بــەوەوە خەريكبوو رايبوارد ياريكرد يان لێيدووركەوتەوە.

(-بالشيءِ): بە شــتەكەوە خۆى خەريككردو وازى لێنەهێنا، يارى پێكرد/ پێى رابوارد.

(تَلاهى- بِالمَلاهي. تَلاهِياً): سەريكردە سەر رابواردنو پێوەى خەريكبوو.

(-القَومُ): خوێشگەل لەگەڵ يەكتريدا رايانبوارد.

(إلتهى- الرَجُلُ بِالشَيءِ): بە شتەكە ياريكردو رايبوارد/ پێوەى خەريكبوو.

(-عَنــهُ بغَــيرِهِ): خــۆى بە شــتى تــرەوە خەريككردو وازى لەوە هێنا.

(إسْــتَلْهى- صاحِبَــهُ. إسْــتِلهاءً): ١-چاومرێــى دۆستەكەيكرد ٢-وايلێكرد/ داواى لێكرد بوەستێت.

(أللَهْــو): ١-گەمە، رابواردن ئــەوەى كە كاتى پێدەبەيتە ســەر وەك گۆرانــىو هەڵپەڕينو ســەماو شــتى لەو بابەتــە ٢-ئەو شــتەى كە مرۆڤ چێژى لێوەردەگرێتو خەريكيدەكات ٣-منداڵ ٤-ژن كە لەگەڵيدا رابوێرێت ٥-تەپڵ.

(أللَهْوَةُ): ١-جارێك ياريكردن، رابواردن ٢-ژنێك كە لەگەڵى رابوێرن.

(فُلان لَهُــوٌّ عَنِ الخَيرِ): فيســار رابوێرەو لە چاكەوە زۆر دوورە.

(أَلأُلْهُوَّة والأُلْهِيَّة والتَلْهِيَة): مایەی خۆشـیو رابــواردنو ســەرگەمیو پێوەخەریکبوونو رابواردن.

(أَلْمَلْهى): ١-رابواردن ٢-دەمی رابواردن ٣-شوێنی رابــواردن/ رابواردنگــە/ تیاترۆ/ ســەماگە/ یاریگە.

(«هذا ملهى القَوم»): ئەمە شوێنی دانیشتنی خوێشگەلە.

(«هذا مَلهى الأَثافي): ئەمە شوێنی سێپایە.

(أَلمِلْهــی (ج) مــلاهٍ): ئامێــری پێرابواردنو یاریکردنو گەمەبەسەربردن.

(آلاتُ المَلاهي): ئامێرەکانی مۆسیقا.

٢-(أَلْهــی- الرَحــی وفِي الرَحــی ولِلرَحی. إلهاءً): بەدەست (دانی دەستارەکەیدا، یان دانی ئاشــەکەیدا/ دانی کردە دەمی ئاشەکەوە یان دەستارەکەوە تا بیهارێت).

(-الرَجُــل): پیاوەکــە باشــترینو زۆرترین خەڵاتی بەخشی.

(إسْــتَلْهى- الشيءَ. إسْتِلْهاءً): ١-لەو شتەی زۆر کرد ٢-فووتیدا.

(أَللّهــاة (ج) لَهَوات ولَهَيــات ولُهِيٌّ ولِهِيٌّ ولَهاً ولَهاءً ولِهاءٌ): زمانە بچکۆلە.

(أَللُهاء): نزیکەی/ هێندەی/ ئەوەندەی.

(«هُم لَهاءُ مائة»): ئەوان نزیکەی سەد کەس دەبن.

(أَللَهْوَة واللُهْــوةً (ج) لُهیً): ١-ئەو برە دانەی بەدەســت دەخرێتــە دەمــی دەســتارەکەوە بــۆ هارینــی ٢-باشــترینو زۆرترین خەڵاتو بەخشین کە دەدرێتو دەبەخشرێت ٣-چنگێك یان مشتێك پارە، ماڵ.

(أَللَهْوِيُّ): زمانە بچکۆلەیی.

(الحَرفان اللَهْوِيَّان): دوو پیتەکەی کە لەلای زمانــە بچکۆلەوە دەردەچن کــە پیتی (ق) و (ك)ن.

(أَللُهْيَة): بەخشــش یان باشــترینو زۆرترین بەخششو خەڵات کە دەدرێت.

٣-(لَهْــوَجَ): بــاش بــە تەنگــەوە نەهــاتو لامسەرلایی کارەکەی گرت.

٤-(لَهْــوَقَ وتَلَهْوَقَ- الرَجُــل. لَهْوَقَةً): خۆی بە شــتێکەوە نواندو هەڵکێشــا کــە نەیبوو وەکو بەخشــندەییو مەردایەتــیو پیاوەتیو دینداریی.

(-فِي العَمَــلِ و الـكَلام): زیادڕەویی لە کارو ئاخاوتنەکەیدا نەکرد.

(رَجُلٌ لَهْوَقٌ): کابرایەکە خۆی بە شــتێکەوە هەڵدەکێشــێت کە نییەتی شــتێك دەردەخات کە لە سروشتی ئەودا نییە خۆی بە شتێکەوە دەنوێنێــت کــە وا نییــە وەك دڵفراوانــیو بەخشندەییو پیاوەتی.

الملحق:

(لَهو. أَلْمَلْهاة (ج): مَلاهٍ): شــانۆگەرییەکە بە هەڵبەســت یان بە پەخشان شــانۆگەرییەکی

گاڵتەجارییەو پێکەنیناوییە بەوەی ڕەوشتو خوی سـەیری خەڵك پیشاندەدات یان ڕەخنە لەو کردارو ڕەفتارە سـەیرمیان بە شێوەیەك دەگرێت کە سەربەقور دەهێنێتە پێکەنین.

لو: لَو: ئەگەر/ گەر.
(لوجائَني لَأَكْرَمْتُهُ): ئەگـەر بهاتایە لام ڕێزم لێدەگـرت (مەرجەکـە بە جێنەهاتـووەو ئەو نەهاتـووە تا ڕێزی لێبگرم). یـان بۆ بارێکە کە ڕیگری هەبێتو هەر نەبێت وەك («لوكان زَيداً حَجَـراً كان جَماداً»): ئەگـەر زەید بەردبوایە بێگیان دەبـوو. یان بۆ حەزکردن دێت بە واتای خۆزگە. وەك («لَو تَأْتيني فَتُحَدِّثني»): خۆزگە بهاتیتایە ئەوسـا پێکەوە قسەماندەکرد، ئەگەر بهاتیتایە بەیەکەوە دەدواین. یان بۆ کەمکردنیش دێت بە واتای ئەگەرچی/ هەرچەندە
وەك («تَصَدَّقـوا ولَـو بِظِلـفٍ مُحْـرَقٍ»): خێربکەن ئەگەرچی بە لەتێك سمی ئاژەڵێك کە بۆ خێر سەربرابێت.
لَـوب: ١-(لابَ. يَلـوبُ – الرَجُـلُ أَو البَعيرُ. لَوباً ولُواباً ولَوَباناً): پیاوەکە یان حوشترەکە تینوبوو (دەڵێن: گوایـا بەملاولای ئاوەکەدا هاتووەو نەیگەیشتوەتێ).
(أَلَلوبَ واللَّوْب واللُّؤُوب واللُواب): تینوێتییەك کە نەشکێت.
(الأَبَ- الرَجُلُ. إلابَةً): پیاوەکە حوشترەکانی تینوویانبوو.

(أَلّلائِب (ج) لُؤُوب ولوب) (فا): تینوو.
(«إبِلٌ لُوبٌ ونَخلٌ لوبٌ ولَوائِبٌ»): حوشترانی تینـوو یان دارخورمای تینـووی دوور لە ئاو یان ئاوی لێدوور.
(أَلّلُواب) = أللعاب (مص): لیك.
٢-(لَوَبَ-ەُ. تَلْويباً): بۆنێکی وەك زەعفەرانی تێکەڵکرد یان تێی هەڵسوو.
(أَلّلاب): بۆنێکە وەك هی زەعفەران.
٣-(أَللابَــةُ (ج) لابــاتٌ ولابٌ): ١-زەوییـەك کە بـەردی ڕەشـی تێدابێت گوایا سـووتاوە ٢-گەلەحوشتری کۆمەڵبووی ڕەش.
(أَلّلوْب): ١-کوتەگۆشـت یـان پارچەیتر کە لە مەنجەڵدا بسوورێتەوە ٢-(ح)هەنگ.
(أَلّلوْبَــةُ) (ج) لُــوْبٌ): زەوییـەك بـە بـەردی ڕەش ڕەشـداگەراو ٢ خوێشـگەلێك لەگـەڵ خوێشگەلێکیتردا بن بۆ هیچ ڕاوێژیان پێنەکەن.
(أَلّلوْباء واللَوبِياء واللُوْبِيا) (ن): لۆبیا/ ماشە سپی.
(أَلّمُلَوَّب) (مفع): ئاسنی (لوولدراو/ لوول).
٤-(أَلّلَولَـب (ج) لَوالِـب): بورغـو. کـە نێرکەکەیەتیو شوێنی بورغوەکە مێکەیەتی داربن یان ئاسن.
(أَلّلَوْلَبِيُّ): شتێك لە شێوەی بورغودابێت.
(أَلّمُلَولَب): کلچێوك کە چاوی پێ دەرێژن.
لوت: (لاتَ. يَلُوتُ- الرَجُلَ. لَوْتاً): هەواڵەکەیدا بێ ئەوەی داوای لێبکەن.

(لاتَ- الخَبَرَ): نهێنییەکەی شاردەوە، نەدرکاندو نەگەیاندە شوێنەکەی.

(-فُلاناً): لە مافەکەی فیساری بڕی و هەمووی پێنەدایەوە.

(ألّلا ت): بتی قورەیش.

(لات): نییە (وەك(لَیْسَ) وایە.

(«ولاتَ حین مَناصٍ»): کاتی پەشــیمانیی و پەنابردن نییە.

لوث: ١-(لاثَ. یَلُوثُ العَمامَةَ علی رأسِهِ لَوْثاً): مێزەرەکەی یان سەروبەستەکەی بەسەریەوە (بەست/ ئالآند) و توندکرد.

(-الضَّبــابُ بالجَبَــلِ): تەمەکــە خولــی کێوەکەیداو دایپۆشی.

(-دارَهُ): خۆی خزاندە خانووەکەیەوەو خۆی هێشتەوەو دەرنەچوو.

(-بِفُلانٍ): پەنایبردە بەر فیسار.

(-بِهِ النَّاسُ): خەڵکان لێیکۆبوونەوە.

(-فُلانٌ): فیسار سووڕایەوە.

(-الشَّــيءَ): ١-شــتەکەی لــە دەمــدا جــوو ٢-شتەکەی تێکەڵکردو هەڵیشێلا.

(-ثَوْبَهُ بالطینِ): جلەکەی قوڕاویکرد.

(-في الأمرِ): سســتیی لــە کارەکەدا کرد وەکو لوول و خوار بووبێتەوە.

(-عَنِ الحاجَةِ): پێداویستیەکەی دەرەنگ پێخست.

(«لاثَ لَوْثــاً مِنَ الکلامِ»): قســەکەی هێناو برد/ پێچ و پەنای تێخست و دەرینەخست.

(لَوِثَ. یَلْــوَثُ - في الأمرِ. لَوْثاً): لە کارەکەدا خاوە خاویکرد/ تیایدا سستبوو.

(لَوَّثَ- الشيءَ. تَلْویثاً): شتەکەی تێکەڵکردو تێکهەڵشێلا.

(-التِبْــنَ بِالقَتِّ): کاکەی تێکەڵی گیا تەڕەکە کرد.

(-ثِیابَهُ بالطــینِ): بەرگەکەی قوڕاوییکرد/ جلەکەی پیسکرد.

(-الماءَ): ئاوەکەی لێڵکرد/ لیخنکرد.

(-الأمرَ): کارەکەی شێواند/ ئاڵۆز کرد.

(-فُلانــاً عَن کذا): نەیهێشــت بەلای ئەوەدا بچێت/ ڕێی ئەوەی لێگرت.

(ألاثَ- مالَهُ بِفُلانٍ إلاثَةً): ماڵەکەی/ داراکەی بە فیسار سپارد.

(ألْــوَثَ-تِ الأرضُ إلْواثــاً): زەویەکــە لەناو گیاوشکەکەوە گیای تەڕو تازەی دەرکرد.

(تَلَــوَّثَ- زَیدٌ بِعَمروٍ تَلَوُّثاً): زەید خۆی دایە پاڵ عەمرو خۆی تێهەڵسوو بە هیوای کەڵکێك وایکرد.

(-ثَوْبُهُ بالطینِ): جلەکەی پیس و قوڕاویبوو.

(إلْتــاثَ بِردائِهِ إلْتِیاثاً): ســەر بەرگەکەی لە خۆیەوە پێچایەوە.

(-بالدَمِ): خوێناویبوو.

(-علیهِ الأمرُ): کارەکەی (لێچەواشــەو ئاڵۆز بوو/ تێکەڵوپێکەڵ بوو).

(-البَعیرُ): حوشترەکە قەڵەوو بەهێز بوو.

(-في العَمَـلِ): له كارمكـەدا (خاوەخاويكرد/ شێنەييكرد).
(-في كَلامِهِ): له قسەكەيدا نەيتوانى بيانوو و بەڵگە بهێنێتەوە.
(-فُلاناً عَن كذا): رێى ئەوەى له فيسار گرت/ نەيهێشت بەوە بكات.
(نَباتٌ لائِثٌ): گياى له يەكئالاو.
(أَلُـوث): ١-زمانگيران له قسـەدا ٢-گەوجيى ٣-كەمەكە (شێتيى/ تێكچوون).
(أَلْوَث): ١-لەشخاويى/ سستيى.
أَلْوث (مـص): بيانوو و بەڵگـەى ناتەواوى نادروستو نارِوون.
(أَلُواث): ناردێك/ پەينكە، كە بە كەوڵەكەوە يان پنەكـەوە دەكرێت تـا هەويرەكەى پێوە نەنووسێت.
(أَلُوْثَـة): ١-لەشـخاوبوونەوەو درێژبوون بۆ حەوانەوە ٢-گۆشـتو چەوريـى زۆر ٣-خاوو خليچكيى ٤-زمانبەستن ٥-نيمچە شێتى.
(«رجُلٌ ذو لُوثَةٍ»): پياوێكى خاوو خليچكى بێتوانا/ هيچ له باردانەبوو.
(«بِهِ لُوثَةٌ»): شێتيەكى لەگەڵدايە.
(أَلْوْثَة): ١-جارێك مێزەربەستن ٢-گەوجيى.
(أَلُواثـە= أَلُواث): ١-پەينكـەى نانكردن كە نەيكەنـە سـەر پنەكە تـا گونكەكـەى پێوە نەنووسێت ٢-كەسێكە خۆى له هەموو كارێكو شتێكەوە دەئاڵێنێت ٣-كۆمەڵ.

(أَللَّويثَـة): كۆمـەڵ كـە لە هەمـوو خێڵو تيرەيەكبن.
(«إن المَجلِسَ يَجمَـعُ لَويثَةً مِـنَ الناس»): ئەنجومەنەكـە كۆمەڵێك خەڵكـن له هەمە خێڵێكن/ له خێڵێك نين.
(أَللَّيـث) (ن): رووەكێكـە هەڵزن (بنچينەى وشەكە (لَوْث)ە).
نَبـاتٌ لَيِّث: رووەكێكـە (چنگى داوەتەيەك/ لەيەك ئالاوە).
(أَلأَلْـوَث (م) لَوْثـاء (ج) لُوْث): ١-لەشـخاو ٢-سست ٣-زمانقورس ٤-كەودەن/ كەمئاوەز.
(ديمةٌ لَوثاء): خەرمانەى گيا كە بە گژيەكدا چووبنو ئالابنە يەك.
(أَلمَـلاث): ئـەو شـوێنەى كـە شـتەكەى تێدادەگێررێت.
(أَلمَـلاثُ وأَلمِلْـوَث (ج) أَلمَـلاوِث والمَلاوِثَـة والمَلاويث): خانەدانو گەورەى پايەدار كە بە دەوريدا دێنو پەنا دەبەنە بەرى.
(«هُم مَـلاوِثٌ»): ئەوان خانەدانى گەورەنو پەنادەرى خەڵكن.
(«إنَّهُ لَنِعْمَ المَلاثُ للضِيفان»): ئەو باشترين خانەدانو پەنادەرى ميوانانە.
(أَلمُلَيِّث): سست لەبەر قەڵەويى.
٢-(أَللائِث) (ح): شێر.
(أَلَّوث): ١-هێز ٢-خراپە/ بەديى ٣ برينەكان ٤-شەرو تۆڵەى كۆنەقين.

(اَلألْـوَث (م) لَوْثـاء (ج) لُـوْث): بەهێــز/ بەدەسەڵات.

لوج: (لاجَ. يَلوجُ- الشيءَ لَوجاً): شتەکەی لە دەمدا گێڕا/ هێناوبرد.

(أللُوجِسْـتيك) (ا ع) (يونانية): لە سـوپای ئەمڕۆدا کۆمیتەیەکی سـەربازییە، کارەکەی ئەوەیە کـە بـە زووترین کاتو بۆ شـوێنی پێویسـت ژمارە سەربازێك بە هەموو چەكو کەلوپەلی پێویستیەوە بگەیەنێتە ئەو شوێنە کە دەیانەوێت.

لوح: ١-(لاحَ. يَلُوحُ- الشـيءُ. لَوْحاً): شتەکە دەرکەوتو دیاربوو.

(-البَرقُ): هەورە برووسکەکە چەخماخەیدا.

(-النَجْمُ): ئەستێرەکە ورشەیهاتو دەرکەوت.

(-إلَيه): ئاماژەی بۆ کرد.

(-الشيءَ): شتەکەی دی/ بەرچاویکەوت.

(«لاحَـه بِبَصَرِه لَوحَةً»): بـە چاوی خۆی دی‌و پاشان لێی ونبوو.

(-العَطشُ أَو السَـفَرُ فُلانـاً): تینوێتیی یان گوزار فیساری گۆڕی.

(لَوَّحَ. تَلْويحاً): لە دوورەوە زۆر دوور بە هەر شتێك بێت ئاماژەی بۆ کرد.

(-بِسَيفِهِ): شمشێرەکەی ڕاوەشاندو بریقەی لێهێنا.

(-بِثَوبِهِ): جلەکەی بە هەوادا داو ڕایوەشاند تا ئاماژەی بۆ ئەوە پێبکات کە تەماشا دەکات.

(«لَـوَّحَ لِلْكلـبِ بِرَغيفٍ فَتَبِعَـهُ»): نانێکی بۆ سـەگەکە ڕاوەشـاندو پیشـانداو سەگەکە شوێنیکەوت.

(-الشـيبُ فُلاناً): مووی سپی سەری فیساری سپیکردو لێی دەرکەوت.

(-السَـفَرُ أو العطـشُ فُلانـاً): گـوزار یان تینوێتــی ڕەنگی فیسـاری پەڕانــدو گۆڕی‌و ڕەشی داگەڕاند.

(-فُلانــاً بالعَصــا أَو السَـيفِ أو السـوط أَو النَعــلِ): دار یــان شمشــێر یــان قامچی یان پێڵاوی لە فیسار هەڵبڕی‌و پێی لێیدا.

(-الشــيءَ بالنــارِ): شــتەکەی بــە ئاگــر گەرمکردەوە.

(-العِنَبُ) (عامية): ترێکە ماتەیداوە خەریکە پێدەگات.

(أَلاحَ- الشــيءُ. إلاحَةً): شــتەکە دەرکەوتو ئاشکرابوو.

(-البَرقُ): هەورەبرووسکەکە چەخماخەیدا/ درەخشا/ شەوقیدایەوە.

(-النَجمُ): ئەســتێرەکە کەوتە (ورشە ورش/ بریسکە بریسك).

(-بِسَــيفِهِ أَو ثَوبِــهِ): شمشــێرەکەی یــان بەرگەکەی ڕاوەشاندو ئاماژەی پێکرد.

(تَلَوَّحَ): دەرکەوتو ئاشکرا بوو.

(إسْــتَلاحَ- في الأمرِ. إسْــتِلاحَةً): ســەرنجی وردی لە کارەکە داو تێی ڕوانی.

(أَللائِحَة (ج) لَوائِح):١-مێی وشەی (اللائِح) ٢-دیمەن/ ڕوخسار.

(«نَظَرتُ إلی لَوائِحِهِ»)تەماشای دیمەنەکانیم کرد/ ڕوخسارە دیارەکانیمکرد ٣-لیستە کە کارە ژمێرییەکانی یان شتیتری تێدا تۆمار دەکرێت یان بەرنامەو پرۆگرامی تێدا دەنوسرێت.

(أَللَّـوح (ج) أَلْواح): تەختــەدار یان تەختە ئێسقانو هەر شتێکبێت/ دەپە.

(لَوحُ الجَسَـدِ (ج) أَلْــواح و (جج) أَلاوِيح): ئێسـقانەکانی لەش جگە لە ئێسقانی دەستو پێ یان هەر ئێسقانێکی لەش کە پانبێت وەك ئێسقانی دەفەی شان.

(«نَظَـرتُ إلی أَلواحِهِ»): تەماشــای دیمەنو ڕوخساریمکرد.

(أَلواحُ السِـلاحِ): دەمو شوێنی ئەو چەکانەی کە بریسکە بدەنەوە وەك هی شمشێرو نووکی نێزەو هیتر.

(أَللُّوح): هەوای نێوان ئاسمانو زەوی/ بەرگە هەوا.

(أَللَّياح واللِياح):١ بەیان ٢-گشــت شــتێك کە سپیبێت.

(يُقــالُ لِلتَوكيــد: أَبيضُ لَيــاحٌ وَلِياحٌ): بۆ چەختکردن دەڵێن ســپییەکی پاکی بێگەردو ڕوت ٣-(ح) گاکێویی (لەبەر سپێتییەکەی).

(أَلتَلاوِيــح) (عاميــة): تــرێ لە ســەرەتای ماتەدانیدا.

(أَلتَلْويحــات= الحَواشــي): ئــەو نووســینە زیادانــەو ڕوونکردنەوانــە کە لــە کەناری/ پەراوێزی پەرتووکەکەدا دەنوسرێت.

(أَلْمُلْتــاح): گۆڕراوێك کە بە هۆی خۆرەوە یان گوزارو شــتیترەوە بە ڕوخسارو لەشیدا گۆڕان هاتبێتو ڕەشداگەڕابێت.

(أَلمِلــواح):١-درێژ ٢-ئێســکچاك یــان دەپەی تۆکمەو پان ٣-تێقوپاو ٤-ئافرەتێك زوو بداتە باریــكو بنێســیی/ لەربێت ٥-کونــدە بەبوو قاچی دەبەستنەوە بۆ ئەوەی بازی پێبگرن.

(قِدْحٌ مُلَوَّح): تیرێك پێش پەر لێدانی بدرێتە بەرئاگر تا خۆشو چاکبکرێتو بگۆڕرێت.

٢-(لاحَ. يَلــوحُ- الرَجُلُ لَوحاً ولُوْحاً ولَواحاً ولُؤُوحاً ولَوَحاناً): پیاوەکە تینوویبو.

(إلْتاحَ إلْتياحاً): تینوویبوو.

(أَللُوح): تینوێتیی.

(إبلٌ لَوْحى): حوشترانی تینوو.

(أَلمِلْــواح والمِلْــوَح والمِلْيــاح (ج) مَلاوِيــح): دەموشك کە زوو زوو تینویدەبێت.

٣-(أَلاحَ- بِحَقِهِ. إلاحَةً): مافەکەی بردو خوارد.

(-فُلاناً): فەوتاندی/ مراندی.

٤-(أَلاحَ- مِنــهُ. إلاحَــةً): لێیترســاو ســڵی لێکردەوەو خۆی لێپاراست.

(-مِنَ القَول): لە قسەکەدا شەرمیکرد.

(أَلاحَ علی الشَــيءِ. إلاحَةً): پشتی بە شتەکە بەست/ متمانەی پێکرد.

لوخ: (لاخَ. يَلوخُ- هُ لوخاً): تێکەڵیکرد.
(إلْتاخَ- الشيءُ. إلْتياخاً): شتەکە ئاوێتە بوو.
(-العَجينُ): هەویرەکە هەڵات.
(أَللواخَـــةو واللِياخَة): کـــەرەی چەوری ناو شیرەکە.
لـــود: (لَودَ. يَلْوَدُ لَوَداً): خواریی‌و چەتوونیی کرد/ نافەرمانبوو.
(ألأَلْوَد (ج) أَلْواد):١-کەسێکی خوارو خێچ‌و چەتوون کە ســەر بــۆ فەرمــان دانەنوێنێــت/ نافەرمان‌و گوێرایەڵنەبێت ٢-ملی ئەستوور/ قەوی.
لــوذ: ١-(لاذَ. يَلـــوذُ- بالجَبَل. لَــوْذاً ولَواذاً ولِــواذاً ولُواذاً ولِياذاً): پەنایبردە بەر کێوەکە خۆی تێدا شاردەوەو ونکردو قایمکرد.
(-بالقَـــوم): خـــۆی کوتایە پاڵ خوێشـــگەل‌و پەنای بۆ بردن/ هانای بۆ بردن.
(-الطريـــقُ بالـــدارِ): رێگەکـــە گەیشـــتە خانووەکە.
(لاوَذَ- بفُـــلانٍ. لِواذاً ومُـــلاوَذَةً): پەنایبردە بەر فیسارو هانای بۆ برد.
(-القَومُ): خوێشگەل پەنایان بۆ یەکتری بردو هانایان بۆ یەکبرد.
(-القَومَ): دڵی خوێشگەلی ڕاگرت‌و لاواندنی.
(-بالقَوم): خوێشگەلی گێڕاو سووراندنیەوە.
(ألاذَ- بالجَبَل. إلاذَةً وبالقَوم): خۆی کوتایە ناو شـــاخەکەوەو خۆی تێدا شـــاردەوەو خۆی کوتایە پاڵ خوێشگەل‌و هانای بۆ بردن.

(-الطَريقُ بالدار): رێگەکە خولی خانوەکەی داو گەیشتێ.
(-تِ الدارُ بالطَريق): خانووەکە بەرێگەکەوە پەیوەند بوو.
(أَللَوْذ (مص) (ج) أَلْـــواذ): ١-ئەوەی دەوری/ خولی کێوەکە/ شـــاخەکە دەدات ٢-تەنشـــتی شاخەکە/ چیاکە/ کەژەکە/ کێوەکە.
(«إعْتَصَمَ بلَـــوْذِ الجَبَلِ وبألْـــواذِهِ»): خۆی کوتایـــە پـــاڵ‌و تەنشـــت شـــاخەکە ٣-پێچـــی دۆڵەکە.
(«نَزَلوا بلَوذِ الـــوادي»): لە پێچی دۆڵەکەدا دابەزین‌و دانیشتن ٤-کەنار/ لا.
(«فُـــلان يَطـــوفُ بألْـــواذِ البلادِ»): فیســـار بەملاولای وڵاتەکەدا دەگەڕێت.
(«هوَ لَوذُهُ»): ئەو لێوەی نزیکە.
(لِواذُ الشيء): نزیکیی یان نزیکەی شتەکە.
(«لي مِن الدَراهِمِ مِائَةٌ أَو لِواذُها»): سەد یان نزیکەی ئەوەندە پەنجاییم هەیە.
(لَوذانُ الشيء): لای شتەکە کەناری شتەکە.
(أَلتَلْواذ= المُلاوذَة): پەنابردن، دانەپاڵ.
(«لَهُمْ تَلْـــواذٌ»): پەنابۆیەك دەبەن‌و دەدەنە پاڵ یەك.
(أَلمَـــلاذ): قـــەڵاو پەناگـــا/ پەنـــا/ هاناگـــە/ حەشارگە.
أَلمَلْوذ (ج) المَلاوذ: پەشتەماڵ.
(أَلمَلْوَذَة= المَلاذ): پەناگا، حەشارگە، قەڵا.

٢-(لاوَذَ- فُلاناً. لِواذاً وملاوَذَةً):لەگەڵ فیساردا نارێکبوو/ ناتەبا بوون/ جیای یەکبوون.

(-عَنـــهُ): تەڵەکەبازیی لەگەڵدا کــرد/ ڕێی پێچوو پەنای لەگەڵدا گرت/ فێڵیلێکرد.

(أَلْلَوذانِيَّـــة): تەڵەکەبازیـــی/ ناراســـتیی/ پێچووپەناکردن/ فێڵکردن.

٣-(أَلـــلاذَة (ج) لاذُ):بەرگێکی ئاوریشـــمینی سوور.

لـــور: (أَلْلُـــوْر (ط) (فارســـية)= قریشـــه): لۆرك.

لوز: ١-(لازَ- إِلَيهِ. يَلوزُ. لَوْزاً):پەنایبۆبرد/ خۆی دایە پاڵی.

(أَلمَلاز):پەنا/ پەناگا.

(«إِنَّـــهُ لَعَوزٌ لَوزٌ»):نەداراو پەنابەرە/ نەبوو و هانابەر.

٢-(لازَ. يَلوزُ مِنهُ. لَوْزاً):خۆی (ڕاپســـکاند/ لێ ڕزگار کرد) هەڵات.

٣-(لازَ. يَلوزُ- الشيءَز لَوزاً):شتەکەیخوارد.

(لَـــوَّزَ- التَمرَ تَلْويـــزاً):بادامی خســـتە ناو خورماکەوە.

(أَللَوز) (ن):درەختی بادام/ چوالە یان کێوییە یـــان لە باخدا دەروێنرێت نـــاوك تاڵی هەیەو شـــیرینیش هەیە. قایمـــەو زۆر دەمێنێتەوەو خراپ نابێت. لە شیرینیکردندا بەکاردێت.

(أَلْلَـــوْزَة):ئاڵوو کە نزیـــك زمانە بچکۆلەیەو دوانن.

(أَلْلَـــوزِيّ):بادامیـــی/ ئـــەوەی لـــە شـــێوەی چوالەدایە.

(أَلْلَوزِينَج (ط) (فارســـية):لەبزینە، جۆرە حەڵوایەکە.

(أَرضٌ ملازَة):زەوییەك درەختی (چوالەی/ بادامی) زۆر بێت.

(أَلمُلَوَّز):خورمای باداماویی/ بادام تێخراو.

(وَجْهٌ مُلَوَّز):ڕوویەکی جوانو شێوە شیرین.

لوس: (لاسَ. يَلُوسُ- الشيءَ. لَوساً):شتەکەی چەشت.

(-الحَـــلاواتِ وغَيرَهـــا):بە دوای شـــیرینیدا گەڕاو خورادنی.

(لائِـــس ولَؤُس وكَـــوَّس وأَلْوَس):کەســـێکە بـــە دوای حەڵـــواو شـــیرینیدا دەگەڕێـــتو دەیانخوات.

(-الشَـــيءَ فِي فَمِهِ):شـــتەکەی لـــە دەمدا (بە زمان هێناو برد/ گێڕای).

(«هـــو لايَلوسُ كـــذا»):ئەو چەشـــەی ئەوە ناکاتو دەستگیری نابێت.

(أَلْلُـــوس):کۆی وشـــەی (أَللائِس) خواردن/ خۆراك.

(«ماذُقْتُ لَواساً»):چەشەی هیچم نەکردووە.

(أَلْلُواسَة):پاروو.

(«ماذُقتُ لَؤُوساً»):چەشەی هیچم نەکردووە. خواردنم نەخواردووە/ پـــاروو بە گەروومدا نەچووە.

لــوص: ١-(لاصَ. يَلُــوصُ لَوصــاً): له درزی دەرگــاوە یــان شــتێکی وەهاوە ســەرنجیدا/ تیلەیکرد.

(-عَنهُ): خۆی لێلادا.

(لاوَصَ. مُلاوَصَــةَ): لــە درزی دەرگاوە یان شوێنێکی وەهاوە ڕوانی/ تیلەیکرد.

(-إلَیــهِ): دزە چاویکرد وەك نیــازی کارێکی هەبێت.

(-فُلاناً عَن کذا): فیساری فریوداو لایدا.

(-الشَــجَرَةَ): ویســتی بیبڕێتەوە سەرنجی لە درەختەکەدا تا بزانێت لە کوێیەوەو چۆن بە تەور بیبڕێتەوە.

(ألاصَ- هُ علی الشيءِ إلاصَةً): خولی شتەکەی پێداو ویستی لێی بسێنێت.

(«ماألَصْتُ أن آخُذَ مِنهُ شیْئاً»): بە دەوریدا نەهاتووم بۆ ئەوەی هیچی لێبسێنم.

(تَلــوَّصَ. تَلَوُّصاً»): پێچپیخــوارد/ ئەمدیوو ئەودیویکردو/ خۆی هەڵگێڕو داگێڕ کرد.

(أَلمُلاوِص):(مەراییکەر/ ڕیاییکەر/ ماستاوکەر)ی فێڵباز/ تەڵەکەباز.

٢-(لَوَّصَ. تَلْویصاً): هەنگوینی پاڵاوتەیخوارد.

(أللواص): هەنگوینی پاڵاوتە.

٣-(ألّیصَ- الرَجُلُ): هێنرایە لەرزین.

٤-(أَلْلَوَص): ئازاری گوێ یان گەروو/ قورگ.

لــوط: ١-(لاطَ. یَلــوطُ- الحَــوضَ. لَوطاً): گۆلەکەی/ حەوزەکەی بە قوڕ یان چیمەنتۆو شتیتر سواغدا تا ئاو نەدەڵێنێت.

(-الشيءَ بالشيءِ): شتەکەی بە شتەکەیترەوە نووساند/ لکاند.

(«لاطَ الشــيءُ بِقَلْبي»): شــتەکە بە دڵمەوە لکا/ نووسا/ حەزملێکرد/ چووە دڵمەوە.

(-فُلانــاً بِفُــلانٍ): فیســاری بردەوە ســەر فیسارکەس و بە فرزەندی ئەویدانا.

(-فُلاناً بِعَینٍ أَو سَهْمٍ): کردی بە چاوەوە یان بەرتیریخست/ تیری تێگرتو بەریکەوت.

(لاطَ- الشيءَ): شتەکەیشاردەوە.

(-في الأمْرِ): لــە کارەکەدا پێیداگرتو هەتەر بوو زۆری تێداکرد.

(لَــوَّطَ- هُ بالطَیِّبِ تَلویطاً): بۆنی خۆشــی (پێوەکرد/ تێهەڵسوو).

(إلْتاطَ-هُ إلْتیاطاً): کردی بە زاڕۆڵەی خۆیو هی خۆیشی نەبوو.

(-حَوضاً): گۆلەکەی درز بڕ کرد.

(«إلْتاطَ بِقَلْبي»): چووە دڵمەوە/ بە دڵمەوە نووساو خۆشمویست.

(إسْــتَلاطَ-هُ إسْــتِلاطَةً): بــە درۆ کردی بە کوڕی خۆیو هی ئەویش نەبوو.

(ألَلاطَةُ): دارێکە دەیکەنە ڕایەڵی بنمیچ.

(لَعْطَــةُ) (عامیة) = ألْلاطَةُ أَلْلَوط) (مص): ١-سەربەرگ، عەبا، جبە ٢ شتی پێوە نووساو.

(«إني لأَجِدُ في قَلبي لَوطاً»): من خۆشەویستیی لە دڵمدایەو پێوەی چەسیوە.

(اَلاَلْـوَط): تـەواو پێـوە لـكاو/ نووسـاو/ چەسپیو.
«هُو أَلوَطُ بقلبي»: ئـەو زۆرتر (بە دڵمەوە نووساوە/ لە دڵمدایە).
(اَلْمُسْتَلاط): منداڵی بەخێوكراو/ هەڵگیراوە.
٢-(لاط. يَلُـوطُ- الإنسـانَ لَوطـاً): ١-لـە مرۆڤەكەیدا ٢-دەریكرد.
٣-(أَلْلَوْط): ١-سوود/ ریبا ٢-پیاوی سووكەڵە.
أَلْلِباط: سوودو سوودخواردن لە بنچینەدا ئەم وشەیە (أَلْلِواط)ە.
الملحق:
لوط: أَللِّواط: هەتیوباز/ نێرباز.
أَللُّوطِيّ: هەتیوباز/ بەچەباز/ نێرباز.
أَللُّواطِيَّة: هەتیوبازیی/ نێربازیی.

لوظ: (لاظَ. يَلُـوَظُ- هُ لَوْظاً): ١-داخیدایەو دەریكرد كاتێ لێی نزیكبووەوە ٢-بەربەرەكانێی كرد.
(إلتاظَ-ت الحاجَةُ): پێداویسـتیەكە سـەری نەگرتو دەستنەكەوت.
لوع: ١-(لاعَ. يَلُـوعُ-هُ الحُبُّ. لَوعاً): ئەڤین/ حەزكـردن/ دڵداریـی/ خۆشەویسـتیی دایەبزەویداو نەخۆشیخست.
(-تِ الشَـمسُ فُلانـاً): خۆر، هەتـاو ڕەنگی گۆڕیی، هەتاوبردی/ ڕەنگی پەڕان.
(-الرَجُلُ. لَوْعاً ولُووعـاً): زیرەكردوو بوو/ تۆقی/ یان بەرچاوتەنگو بەدرەوشتبوو.
(- لاعٌ): زۆر ترسـنۆك یـان بەدرەوشـتو بەرچاوتەنگ.
(لاعَ. يَلاعُ ويَلوعُ. لَوعَةً):١-دڵی سووتاو ئاگری پـەژارەو مەراق یان هـی دڵداریی تێبەربوو/ سـوێیبووەوە ٢ تۆقی یان وەرسـبووو ئارامی لەبەربرا یان نەخۆشكەوت.
(لَـوَّعَ-هُ الحُـبُّ. تَلْويعـاً): سـوێی دڵداریی نەخۆشیخست.
(«لَوَّع فُلاناً») (عامية): سوێی پێهێنایەوەو سزای پێچەشت.
(أَلاعَ- تْـهُ الشَـمسُ إلاعَةً): هەتـاو ڕەنگی (پەراند/ گۆڕی).
(-الثَديُ): گۆی مەمكەكە ڕەشهەڵگەڕاو ڕەنگی گۆڕدرا.
(إلْتاعَ- قَلْبُـهُ. إلتِياعاً): دڵی لە مەراقدا یان بە حەزو تاسە سووتاو سوێی لە دڵدابوو.
(أَلْلاعُ (ج) لاعُون ولاعَةُ وأَلْواعُ): ١-خەستە/ نەخـۆش/ بیمـار ٢-بێـورەو بێئـارام یـان زیرەكردوو.
«رَجُلُ هاعُ لاعٌ»: كابرایەكگی زیرەكردووی بێورەوتۆقیو.
(«هِـيَ هاعَـةٌ لاعَـةٌ»): ئافرەتێكـی زۆر ترسنۆكی بێورەو تۆقیوە.
(«رَجُلُ هائِعُ لائِعٌ»): پیاوێكی زۆر ترسنۆكی بێورەی ئارام لەبەربڕاو/ تۆقیو.
(أَللاعَـةُ (ج) لاعات): ژنی نەخۆش یان زۆر

ترسنۆكی بێئۆقۆەو بێورە.

(أَلْلَوْعَة): ١-جارێك نەخۆشكەوتن ٢-سوێی ژانەدڵی خەفەتو ئەوینو تاسەكردن ٣-خۆربردن.

(«فِي قَلبِهِ لَوعَةٌ»): گڕی سوێی ئەڤینی لەدڵدایە ٢-ڕەشیی گۆی مەمك ٤-جارێك بێورەو بێقەرارو بوونو وەرسبوونو ترسان.

٢-(أَللاعَةُ (ج) لاعات): دڵقایمی دڵپۆڵاو سەربەرزو مەرد.

لوف: ١-(لافَ. يَلوفُ الطَعامَ. لَوفاً): خواردنەكەیخوارد یان جووی.

(-تِ الدابَّةُ الكَلأَ): چوارپێكە پووشەكەیخوارد/ گیا وشكەكەیخوارد.

أَللُوف (ن): لفكە شامیی: دەچێنرێت گەڵاكەی لاكێشەییەو زۆر گەورە دەبێت گوڵەكەی زەردە بەرگێك دایدەپۆشێت وەك كەرەنا خۆی دەپێچێتەوە وەك لفكە تاڵەكانی دەئاڵێتە یەكو كە وشكبوو بۆ خۆشتن بەكاردێت.

(أَللَوف) (مص): خواردنێك یان گیایەك كە نەخورێتو حەزی لێنەكرێت.

أَلْلِيف: گیای وشك/ پووش/ پاوەن (وشەكە لە بنچینەدا (لَيوف)ە.

(«كَلأٌ مَلوف»): وشكە گیایەك بە باران شۆرابێتەوە.

٢-(أَللُوف الواحدةُ لُوفَة) (ن): ڕووەكێكە پەلدەهاوێتو خۆی بلاودەكاتەوە زۆر گەورە دەبێت گوڵی زەردی جوان دەگرێت بەری لاكێشەییو درێژكۆلە دەگرێت.

(أَللُوفى) (ن): ڕووەكێكە بۆ شۆریی/ ڕەوانیی كۆنبوو دەوەستێنێت.

(أَللُوفَة): پەینكە كە دەیخەنە سەر پنە یان كەوڵی نانكردن بۆ ئەوەی گونكەكە پێیانەوە نەنوسێت.

(أَللَوّاف): فەرشچن، بەرەچن.

لوق: ١-(لاقَ. يَلوقُ-هُ لَوقاً): نەرمیكرد.

(-الدواةَ): مەرەكەبەكەی چاككرد.

(«هو لايَلُوق عِنْدَكَ»): ئەو لەلات دانامركێ/ سرەوتی نییەو نامێنێتەوە.

(لَوَّقَ- الطَعامَ. تَلويقاً): خواردنەكەی نفیشكاویكرد/ كەرەی تێهەڵسوو.

(أَللُوق): هەموو شتێكی نەرمو شل چ خواردن بێت یان شتیتر.

أَللَوْقَةُ: جارێك شت نەرمكردن.

(«ماذاقَ لَواقاً»): هیچی نەرمی نەچەشتووە.

(أَللُوقَة وأُلُوقَة): كەرە/ نفیشك.

(أَلمِلْوَق): كەوچكی دەرمانساز.

٢-(لاقَ. يَلُوقُ- عِيْنَهُ لَوقاً): كیشای بە چاویدا.

٣-(لَوَقَ-هُ فَانْلَوَقَ) (عامية): خواریكردەوە ئیتر خواربووەوە.

(أَللَوَق): گەوجیی/ خواروخێچیی.

(أَلأَلْوَق): گەوجتر (عند العامة) خواروخێچتر.

٤-(أَلْلَوقَة): كاترْميْر.

(ذهــب فُــلانٌ لَوقَــةً): فيســار كاترْميْريْك رِوْيشت.

لوك: (لاكَ. يَلوُكُ- اللُقْمَةَ. لَوْكاً): پارووەكەی لەدەمدا بە شــيْنەيى جوو لــە دەمدا هيْناى‌و بردى.

(-الفَرَسُ اللجامَ): چارەويْكە لغاوەكەى هيْناو بردو پيْدانووسا.

(«هو يَلُوكُ أَعراضَ الناس»): ئەو لە ناموسى خەلْكى بە خراپە دەدويْت‌و پايەمالْى دەكات/ ناموسى خەلْكى دەشكيْنيْت‌و دەبات.

(أَلكني الى فُلان): لە منەوە پيْى بلْىْ نامەكەى منى پيْگەيەنە (لە بنچينەدا (أَلئِكني) يە.

(أَلْلَواك): ئەوەى كە دەجووريْت.

(ماذاقَ لَواكاً): هيچى نەجووە تا بيچيْژيْت.

لــول: ١-(أَلْلَــولاء): تەنگانــەو نەهامەتيى‌و زيان.

٢-(لَوْلا): ئەگەر نەبوايە.

(لَــوْلا زَيدُ لأكرمتك): ئەگــەر زەيد نەبوايە ريْزم ليْدەگرتيت.

(«لولا أَنتُــم لَكُنا مُؤمنــين»): ئەگەر ئيْوە نەبوونايــە ئيْمە خاوەنــبڕوا دەبووين، جارى وا هەيــە دەوتريْت (لَــولاي ولَولاك ولَولاهُ): (ئەمــە كەمتربيْــت) ئەگەر مــن. ئەگەر تۆ. ئەگەر ئەو نەبوايە.

(وتكــون للعــرض والتحريض): جــارى وا هەيە بۆ هاندانەو لەگەلْ فرمانى ڕانەبوردوو يان شــيْوە ڕانەبوردودا دەبىْ بيْت وەك (لَولا أَخرتنــي إلى أَجل قَريــب): دەبا بۆ دەميْكى نزيك دوات بخستمايە.

-(وتكونُ للتوبيخ والتَنديم): بۆسەرزەنشت‌و پيْداهەلْشاخان دەبيْت.

(لَولا جــاءوا عليه باربعة شــهداء): دەبوو چوار شايەتيان لەسەر بهيْنايە (لولا: لە (لو) و (لا) پيْكهيْنراوە.

٣-(أَلْلَولَب): ١-بورغو ٢-جەڕ، زەمبەلەك.

٤-(لَوْلى. لَولاةً): پشتى تيْكردو هەلاَت.

(«لولى مُدْبــراً»): دەبوو پشــتى تيْكردايەو هەلاَتايە.

لــوم: ١-(لامَ. يَلومُ-هُ في كذا وعلى كذا. لَوماً وملامــاً ومَلامَةً): ١-بۆ ئەوە/ لەســەر ئەوە سەرزەنشــتيكرد ٢-تــەرزە شــكيْنيكردو دلْى پەشــاند لەبەر ئەو كارەى كە نەدەبوو بيكات (لەبەر خۆى‌و لەبەر ئەوە قسەكەى پيْوت).

(لائِـــم): ١-لـۆمــەكــارو ســەرزەنـشــتـكـار ٢-تەرزەشكيْنكار.

(مَليم ومَلُوم): لۆمەو سەرزەنشتكراوو تەرزە شكيْنكراو.

(لَوَّمَ- هُ تَلْويماً): زۆر سەرزەنشتيكرد.

(لاوَمَ-هُ. مُلاومَــةً ولِوامــاً): سەرزەنشــتى يەكتريانكرد.

(ألامَ-هُ. إلامَةً): سەرزەنشتيكرد/ گلەيى ليْكرد.

(مُلیم): سەرزەنشتکەر.

(مُلام): سەرزەنشتکراو، گلەییلێکراو.

(اَلمَلامَة): گلەیی کردن یان سەرزەنشتکردن (ج) (مَلاوِم)

(-أَلامَ الرجُلُ): پیاوەکە کارێکیکرد کە سەرزەنشت بکرێتو هەڵگرێت/ قسەی بێتە سەرو هەڵبگرێت تەرزەشکێنی بکەن.

(تَلَوَّمَ تَلَوُّماً): خۆی تووشی سەرزەنشتکرد.

(تَلاوَموا): سەزرەنشتی یەکتریانکرد.

(اِلتامَ. اِلْتیاماً): قایلی سەرزەنشتییەکە بوو.

(اِسْتَلامَ: اِسْتِلامَةً): شایستەی سەزرەنشتکردنبوو/ هەڵیگرت گلەیی لێبکرێت.

(-اِلَیهِم): کارێکیکرد بەرامبەریان کە سەرزەنشتی بکەن.

(اللائم (ج) لُوَّم ولُوّام ولُیَّم (فا): سەرزنشتکەر. گلەییکەر.

(اَللائِمَة (ج) لَوائِم): ١-مێی وشەی (اَللائِم) ٢-سەرزەنشت/ گلەیی.

(اِسْتَحَقَّ اللا ئِمَة»: شایانی ئەوەبوو سەرزەنشتیی بکەن/ شایستەی گلەییلێکردنە.

(«جاءَ بِلامَةٍ»): سەرزەنشتی هێنایە سەر خۆی/ کارێکیکرد کە گلەیی لێبکەن.

(اَللَوم) (مص) : گلەیی یان گلەییو سەرزەنشت.

اَللَوَم: سەرزەنشتی زۆر/ گلەیی زۆر.

(اَللَومی واللَوماء): گلەیی/ سەرزەنشت.

(اَللَومَةُ): جارێك سەرزەنشتکردن.

(«جاءَ بِلَومَةٍ»): کارێکیکرد کە سەرزەنشت بکرێت.

(اَللُوْمَة): کەسێکە کە خەڵك سەرزەنشتی دەکاتو گلەیی لێدەکەن.

(اَلتَلَوُّم): تووشی گلەییو سەرزەنشتبوون.

(«لي فیه لُومَةُ»): گلەییەکەم یان سەرزەنشتیەکەم لەسەری هەیە.

(اَللُوَمَة): کەسێکە کە سەرزەنشتی خەڵك زۆر بکات.

(اَللَوّام): فرە سەرزەنشت فرەگلەیی.

(اَلنَفسُ اَللَوّامَة): دەروونی سەرزەنشتکار کە سەرزەنشتی خاوەن دەروونە پاکەکە دەکات گەر کارێکی بەد یان هەڵەیەك بکات. لێیدەپرسێتەوە.

(«أَنتَ أَلْوَمُ مِن فُلان»): تۆ لەو شیاوتری سەرزەنشتیت.

(اَلمُتَلَوِّم) (فا): کەسێکە کە خۆی بەر سەرزەنشتیسەرزەنشتکاران بخات بەوەی کاری هەڵەو خراپ دەکاتو گلەیی لێدەکرێت.

٢-(لِیمَ- بِهِ): رێی لێبڕاو نەهێڵرا بە ئەنجام بگات.

(اِسْتَلامَ الی ضَیفِهِ. اِسْتِلامَةً): چاك لەگەڵ میوانەکەیدا نەجووڵایەوە/ باش میوانداریی نەکرد.

٣-(لَوَّمَ. تَلْویماً لاماً): پیتی لامی نووسی.

(أَللامُ (ج) لامات): پیتی لام.
(أَللامِيُّ): لامیی.
(لامِيَّةُ العَجـم): هەڵبەسـتێکی لامییە هی (طُغرائي) یە.
(لامِيَّةُ العَـرَب): هەڵبەسـتێکی لامییە هی (شَنْفَري) یە.
٤-(تَلَـوَّمَ. تَلَوُّماً): بە دوای دەردەکەدا گەڕا تا بزانێت لە کوێدایە.
(-فِي الأَمـرِ): لـە کارەکەدا پەلـەی نەکردو تیایادا چاوەڕێبوو.
(أَلْمُتَلَوِّم): کەسێکە کە چاوەڕێکاری جێبەجێ کردنی پێویستیەکیەتی.
٥-(أَللاَّم (ج) لامات): ١-ترسێکی زۆرو تۆقین ٢-کەسـەکە خـۆیو کەسـێکیتر ٣-نزیکیـی ٤-هەموو شتێکی (سەختو گران/ توند).
(أَللامَة): ترسێکی زۆرو تۆقین.
(أَللامِيُـون) (ن): گەزنە درۆزنـە. گیایەکە گەڵاکەی چڕە گوڵێکی سپی یان پەمەیی هەیە لە شـوێنە چۆڵەکانـدا زۆرە. لەبەر جوانیی گوڵەکـەی دەروێنرێـت. گرنگتریـن جۆریان گەزنە سپییە.
(أَللامِيُّ) (ز): کەتیرەی درەختێکە سـپییەو دەجووڕێت.
(أَللَّوم): ترسێکی زۆرو تۆقین.
(أَللُّـوْم): دەرمانــی ڕەوانیی کــە لە درەختی گەزنە درۆزنە دەگیرێت.

لون: لَوَّنَ-الشيءَ تَلْويناً: شتەکەی ڕەنگکرد.
-البُسْرُ: خورمافەریکەکە ڕەنگیگرتو خەریکی پێگەیشتنە.
(«لَوَّنَ الشيبُ فيه»): سـپێتیی بەسەریەوە دەرکەوت، بە قژیەوە دەرکەوت.
(تَلَوَّنَ- الشيءُ): شتەکە ڕەنگیگرت/ ڕەنگێکی گـرت کـە لـە ڕەنگەکـەی زووی جیابـوو ٢-ڕەنگینبوو.
(-الرَّجُلُ): ڕەوشتو ڕەفتاری پیاوەکە گۆڕاو هەردەمە بە جۆرێکبوو.
(إِلْـوَنَّ. إِلْونانـاً): ڕەنگـی جیاجیایبــوو/ ڕەنگینبوو.
(أَلْلَـون (ج) أَلوان): ١-ڕەنگ، بۆیە، ئەوەی کە شتێك لە شـتێکیتر جیادەکاتەوە ٢-قەڵافەتو شـێوەو نیشـانەی ڕەنگی سـپێتییو ڕەشیو سـووریيو گەلێك ڕەنگیـترو جیاکەرەوەیتر ٣-جۆر، چەشن، ڕەنگاوڕەنگ، کاڵ، تێر/ تۆخ.
(«عِنـدَهُ لَونٌ مِـنَ الثِياب»): جۆرێك بەرگی هەیە/ جۆرە بەرگێکی هەیە.
(تنـاوَلَ كذا وكذا مِنَ الطَعامَ»): لەو ڕەنگەو لەو چەشنەو جۆرە خواردنەی خوارد.
(«أَتى بأَلوانٍ مِن الحَديث»): لە هەمەجۆرو بابەت قسەی هێناو برد/ کردی.
(أَلتَلْوين) (مـص): ١ ڕەنگکـردن، بۆیەکردن، ڕەنگینکردن٢-ڕەنگاوڕەنگبوون٣-پێشکەشکردنی هەمەڕەنـگ خـواردن بـۆ خۆشـیو چەشـە

٤-گۆڕینی شـێوە قسەکردن بە شێوەی جیاجیاو جۆراوجۆر.
(أَلْمُتَلَـوِّن) (فــا): بێبــار، هــەر جــارەی بە شــێوەیەك/ بە ڕەنگێك خۆی پیشــانبداتو ڕەوشت بنوێنێت.
لــوە: (لاهَ. يَلُــوهُ. وَتَلَــوَّهُ — السَــرابُ. لَوهــاً ولَوَهانــاً): تراویلکەکــە شــەکایەوەو بریسکایەوە.
(لَوْهُ السَــرابِ ولَوهَتُهُ ولُؤُوهَتُهُ): بریقەی/ بریسکەی تراویلکەکە.
(أللاهَة)) (ح): مار.
لوو: (لَوَى. يَلْــوي-هُ دَيْنَهُ وبِدَينِهِ. لَيّاً ولِيّاً ولَيَّاناً ولِيَّاناً): وامەکەی/ قەرزەکەی خایاندو ئەمڕۆ بە سبەی پێکرد/ دانەوەی دواخست.
(-فُلاناً بِحَقِّهِ): حاشــای لە ماف فیسار کرد/ نکوولێی لە مافەکەیکرد.
لَــوِيَ. يَلْوى- النَبْتُ لــوَى: گیاکە، ڕووەکەکە لوولبوو.
(-القِــدْحُ أَو الرمــلُ): تیرەکــە یــان لمەکــە خواربوو/ لاربووەوە/ چەمییەوە.
(-تِ المِعْــدَةُ أَو الظَهــرُ): گەدەکــە پێچــی پێداهــاتو ژانیکــردو پشــتەکە چەمییەوە/ خواربووەوە.
ظَهرُ لَوٍ: پشتی چەماوە/ خوار.
مِعــدَةٌ لَويــةٌ: گەدەیەکی ژانکــردووی پێچ پێداهاتوو.

(لَــوِيَ-تِ الحَيَّةُ): مــارەە خەپلەیبەســت/ گرمۆڵەبوو/ پێچیخوارد/ لوولبوو.
(لاوى-ت الحَيَّةُ الحيَّةَ. مُلاواةً ولِواءً): مارەکە لە مارەکەیترەوە ئاڵاو پێچیخوارد/ لوولیخوارد.
(أَلْوى- بِحَقِّ فُلان. إلــواءً): نکوولیی لە ماف فیسار کرد.
(-بِكَلامِهِ): بە پێچەوانەی ئەوەوە قسەیکرد/ بەرپەرچی قسەکەی ئەویدایەوە.
(-بِيَــدِهِ أَو بِثَوبِهِ): بەدەســتی یان جلەکەی ئاماژەی بۆ کرد.
(-بِهِ): بردی (وەك بەلای خۆیدا لایدابێت).
(-بما في الإناءَ): ئەوەی لە دەفرەکەدا بوو بۆ خۆی بردو بەسەر ئەوانیتردا زاڵبوو.
(-بهم الدَهرُ): ڕۆژگار فەوتاندنی.
(-البَقْلُ): سەوزییەکە سیسبوو.
(-النَبــتُ): ڕووەکەکــە، گیاکــە لاربووەوەو کەچبوو/ وشکبوو.
(-القَومُ): خوێنشــگەل بــەلای پێچی لمەکەدا ڕۆیشتن.
(-الرَجُــلُ): ١-کشــتی پیاوەکــە وشــکبوو ٢-خواردنە شاردراوەکەیخوارد کە بۆ خەڵکیتر دانرابوو ٣-ئاڵای میری دروو.
(-الأَميرُ لَهُ لواءً): میر تیپێکی ســوپای خستە ژێر دەستی ئەوەوە.
(-فُــلانُ اللــواءَ): فیســار ئاڵاکەی بەســتو بەرزکردەوە.

(تَلَـوَّى- الشَـيءُ تَلَوِّياً): شـتەکە کەچبوو/ خواربوو/ نوشتایەوە/ چەمایەوە.
(البَرقُ في السَّحابُ): بروسکەکە لە هەورەکەدا پێچپیخواردو تاویسەند.
(تَلاوَیـا): بەسـەریەکدا (پێچپانخـوارد/ لوولیانخـوارد/ ئالآنەیـەك) (ئەمـە لە مارو شتیتردا دەبێت).
(تَـلاوَوْا علـى فُـلان. تَلاوِیاً): لە فیسـار خربوونەوە/ کۆبوونەوە/ تێیمرووکان.
(إلْتَـوى القِدحُ أَو الرَمْلُ. إلْتِواءً): تیرەکە یان لمەکە (لار/ خوار) بووەوە/ پێچپیخوارد.
(-الشيءُ): شتەکە خواربوو/ لاربووەوە.
(-لَوِیَّـةً): خواردنی بە نهێنی بۆ خەڵك داناو شاردیەوە.
(-علیه الأَمرُ): کارەکەی لێ چووە بەست.
(إِسْتَلْوى- بِهِمُ الدَهرُ): رۆژگار فریکردن.
(أَللاوی (ج) لاوُون ولُواة) (فا): پێچخواردوو، لوولبوو/ تێئـالآو ٢-کەچبوو/ خوارەوەبوو ٣-گینگڵدەر/ تلاوتلکەر.
(أَللاویاء) (ن): جۆرە رووەکێکە.
(أَللِواء (ج) أَلْوِیَه وأَلْوِیات): ١-بەیداخ (دەڵێن بۆیە وا ناونراوە چونکە دەنوشـتێنرێتەووە لوولدەدرێت لە کاتی پێویسـتیدا هەڵدەکرێت —(ا ع) ٢-سـەرتیپ. پلەیەکی سـەربازییە لە ریزی وشەی (جَنرال)ە.
(-في التقسـیم الإداري): لـە دابەشـکردنی ولآتدا پارێزگایەو تیپێکی سوپایە.
(أَمیر اللواء): سەرتیپ.
(«بَعَثـوا بالسَـواءِ واللـواءِ»): هانایان هێنا فریامانکەون هانای فریاکەوتنیان نارد.
(أَللَّـواء (ح): ملگێـرە/ غەزایـی/ جۆرێکـە لـە دارکونکـەرە، مەلێکە سـەری دەگێڕێو بادەدات.
(أَلْلَوَّة= الشُوهَة): ١-دووریی ٢-ناشیرینی.
(أَللُوی): درۆو ساختەو قسەی نارەوا/ دەلەسە.
(أَللَّوی (مص): ١-پشـتخواریی/ چەمینەوەی پشت ٢-ژانی گەدە.
(أَللِوَی (ج) أَلْوِیَه وأَلـواء): لی کەڵەکەبووی پێچخواردوو.
(أَللَّـوِيُّ): ١-سـەوزەی سیسـبوو چونکـە کە سیسـبوو خواردەبێتـەوو بەسـەریەکدا لوولدەخوات ٢-گیای وشـکەوەبوو یان نیمچە وشك.
(أَللَّـوِيُّ) (ن): درەختێکـە پەلـی وەك گوریسـی دەگرێتو تێیدەئاڵێت یـان پیایدا شۆردەبێتەوە.
(أَللَّوِیَّـة) (ج): لَوایـا: خواردنـی پەنادراوو شـاردراوە بۆ خەڵك. وەکو لـەوان بۆ خەڵك گلدرابێتەوە.
(أَللِیَّة): خزمایەتی/ خوێشایەتی.
(أَلأَلـوی): (قۆچی/ شـاخی) خـوار ٢-کلکی خواربووی زگماکیی (ج) (لَيّ).

(- مِـنَ الطَريــق): رِێی دوورو نادیــار، رِێی هاتو نەهات.
(رَمــاهُ اللهُ بِأحــوى ألْوى): خــودا گرفتاری سەختترین وەیو چورتومیکرد.
(ألألــوى (م) لِيَــاء): مرۆڤــی کینــه له دڵو سەرســەخت کە بە شەرە قســە ناحەزەکەی لوولــدەدات ٢-ڤینلەدڵێــکو دوژمنێکــی سەرســەخت/ دوژمنێکی رِقاوی ٣-کەللەرەقو گیر ٤-تەریکێکی گۆشەگیر.
(ألْلَيَــاء): ١-مێی وشــەی (ألألــوى): ٢-زەویی دوورەناو وەکو لە ئاوەکە لایدابێت
(ألألواء)١:-ئەملاولای دۆڵ، دەرە ٢-کەنارەکانی وڵات.
٢-(ألْوى- فُلانُ إلْواءً): ئاواتی زۆریخواست.
٣-(ألْــلاؤُون والــلاؤُو): ئەوانــەی کــەوا/ کەسانێکی کەوا (کۆی وشەی (الذين)ەیە.
(الــلاءُ وألّلاتُ): ناوی بتێکــی عەرەبە پێش ئیسلام.
(أللاوِيــاء): ئاســنی داغ کــە داغــی وڵاخی پێدەکەنو پێی نیشانە دەکەن.
(أللاوِيُّ (ج) لاوِيُّون): لاویەکان کە لە نەوەی لاوی کوری یەعقوبی کوری ئیســحاقی کوری ئیبراهیم بوون.
(سَــفَرُ اللاوِيّــين): یەکێکە لــە گوزارەکانی حەزرەتی موسا کە پێنجبووە.
(أللُــوَّة واللِّية): دارعوود کە دەیســووتێننو خۆیانی پێ بۆنخۆشدەکەن.
(ألّلَــوى= اللاتــي): کــۆی (ألّتي)یــە ئــەو مێیانەی کە (ألْلَوِيُّ): ١-گیای وشــك یان گیای نیمچەوشکبوو ٢-کەچیی/ خواریی.
لوي: لَوى. يَلْــوي- الحَبلَ. لَيّاً ولَوْياً ولُوِيّاً): پەتەکەی/ گوریسەکەی باداو نوشتانیەوە.
(-الغُــلامُ): هەرزەکارەکە تەمەنی گەیشــتە بیست ساڵان.
(-عَــنِ الأمْرِ): لە کارەکەدا لەشــگرانییکرد/ سستیکرد.
(«لوتِ اللّيالــيَ لَفَّهُ على العَصَا»): شــەوان رابوردو ئەو هەر چاوەروانبوو - واتا پیربوو/ تەمەنی بەسەربرد.
(-أمْــرَهُ عَنِيَّ. لَيّاً ولَيّانــاً): کارەکەی لە من پێچایەوەو شاردەوە.
(-سِرَّهُ): رازو نهێنیەکەی شاردەوە.
(-الحُــزْنُ قَلْبَهُ): داخ دڵیبرد/ دڵشکســتبوو/ داخ دڵی برژاند.
(-عَلَيــهِ): میهرەبانیــی لەگەڵــدا نواند یان چاوەرێیکرد، ئاوری لێدایەوە.
(«مَــرَّ لا يَلوى على أحَد»): تێپەرِیو ئاوری لە کەس نەدایەوەو چاوەرێی کەسی نەکرد.
(-رَأْسَــهُ أو بِرَأْسِهِ): ســەرو رووی وەرگێراو پشتی کردە ئەو کەسە/ ئەوە.
(-تِ الناقَــةُ بِذَنَبِهــا): مێحوشــترەکە کلکی بزواند/ جووڵاند.

(-فُلاناً على فُلانٍ): فیسـاری له فیسار کەس له پێشتر گرت.
(«فُلانٌ لايَلْوی ظَهْرَهُ»): فیسـار قایمه پشت دانانەوێنێت.
(لَـوَّی- عَلَيهِ الأَمـرَ. تَلْوِيَـةً): کارەکەی لێ ئالۆزکرد، چەواشەکرد).
(«لَوَّی أَعْناقَ الرجالِ»): ملی پیاوەکانی بادا، واتا بەسەرایندا زاڵبوو.
(أَلْوی- برَأسِهِ إلواءً): سەری وەرگێڕا.
(-تِ الناقَـةُ بذَنَبِهـا): مێحوشـترەکە کلکی جووڵاند/ هێناوبرد.
(تَلَوَّی- الحَبلُ. تَلَوِّياً): پەتەکە/ گوریسـەکە بایخواردو نوشتایەوە.
(-تِ الحَيَّةُ): مارەکە پێچیکردەوە.
(إلْتَوی- الحَبلُ. إلْتِواءً): گوریسەکە/ پەتەکە بایخوارد، لوولبوو. نوشتایەوە.
(-الأَمرُ): کارەکە گرانبوو و چووە بەست.
(-عَنِ الأمـرِ): ڤنگگرانیی له کارەکەدا کرد/ سستییکرد.
(أَلْلِيَّة (ج) لِویً): جارێك پێچکردنەوە جارێك خواربوونەوە.
(مُلْتَوی الوادِي): پێچی دۆڵەکە.
(أَلمَلاوي): ڕێگای (پێچاوپێچ/ خواروخێچ).
(«سـلكوا المَلاويَ»): ڕێگە پێچاوپێچەکانیان گرت، ڕێگا به پێچو پەناکانیانگرت.
لیـأ. (أَلْيَـأَ-تِ الناقَـةُ): خاوەخاویکـرد.

سستییکرد.
لیـت: ١-(لاتَ. يَليـتُ-هُ عَن كـذات. لَيْتاً): ڕێگەی ئـەوەی لێگرتو نەیهێشـت بیگاتێو دەریکرد.
(-زَيداً حَقَّـهُ): له مافەکـەی زەیدی بڕیو مافەکەی کەمکرد.
(أَلاتَ-هُ عَن كذا إلاتَةً): لەوەی لاداو نەیهێشت بیگاتێ/ ڕێی ئەوەی لێگرت.
(«مـا أَلاتَهُ مِـن عَمَلِهِ شَـيئاً»): هیچی له کارەکەی نەبڕی.
٢-(لات= لأتَ): بڕوانە (لأتَ) = لَيسَ
(أَلْلِت (ج) أَلْيات): لامل.
لِيتان: هەردوو لامل.
لَيْـتَ: خۆزگـە (پیتی کارێکە کـە بە زۆریی نەبێتو نەیەتەدی.
(«لَيْتَ الشَـبابَ يَعـودُ»): خۆزگە گەنجێتی بگەڕایەوە/ بهاتایەوە (یان کارێكو ڕووداوێك کە کەم ڕوویدات).
(«لَيتَ العَليلَ صَحيحٌ»): خۆزگە نەخۆشەکە چاکبوایـەوە. ئەگـەر (ي) ڤسـەکەری پێوە بنوسێت دەبێتە (لَيتَني) کەمتریش دەوترێت (لَيتي) کە ئەمەیان دەگمەنە.
ليث: ١-(لَيَّثَ ولُيِّـثَ وتَلَيَّثَ – الرَجُلُ تَلَيُّثاً وتَلْيِيثاً): وەك شێری لێهات.
(لايَثَ-هُ مُلايَثَةً): ١-لەگەڵیدا شێرانە جووڵایە ٢-خۆی وەك شێر پیشـانداو نازی شێرانەیان

بەسەر یەکدا کرد.
(إِسْتَلْیَثَ): وەك شێری لێهات.
(أَللائِث) (ح): شێر.
أَلَّلیث (ح) (ج) لُیوث ومَلیثَة (ح): ١-شێر ٢-هێزو توندیی.
(أَلَّلیثَة (ج) لَیثات (ح): ١-مێشێر ٢-مێحوشترى توندو تیژ.
(أَلأَلْیَث (م) لَیثاء (ج) لِیث): ئازا/ دلێر/ نەبەرد/ جەربەزە. کە لە هیچ کوناکاتو لە هیچ نەگەرێتەوە.
(«هو أَلْیَثُ أصحابِهِ»): ئەو بەجەرگترینو نەبەردترینو بەرگەترین هاورێکانیەتی.
(أَلِمُلَیِث): زۆر بەهێزو قایم.
(أَلمُلَیَّث): قەڵەو.
٢-(أَلَّلیث (ج) لُیوث ومَلیثَة) (ح): ١-جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکە ٢-زمانزانو زمانپاراوو رەوانبێژ.
لیس: ١-(لَیِسَ. یَلْیَسُ- الرَجُلُ لَیَساً): ئازا بوو/ وێرای/ ورەی پەیداکرد.
(تَلَیَّسَ- الرَجُلُ): پیاوەکە توندوتیژ بوو/ قایمبوو/ بەتواناو بەهێز بوو.
(أَلأَلْیَس (م) لَیساء (ج) لِیس): ١-نەبەردێك/ جەربەزەیەك کە کۆ لە هیچ نەکاتو لە هیچ سڵ نەکاتەوە ٢-(ح) شێر ٣-حوشترێك کە هەر بارێکی لێبنێن هەڵیگرێت.
(قَومٌ لَیْسٌ ولُوْس): میللەتێکن، خوێشگەلێکن جەربەزەو نەبەرد.
٢-(لَیِسَ. یَلْیَسُ- عَنهُ لَیَساً): خۆی لێبێئاگا کردو پشتگوێیخست.
(تَلایَسَ- عَنهُ. تَلایُساً): چاوی لێنووقاندو خۆی لێ بەدوور گرت.
٣-لَیْسَ: نییە، نابێت/ نابێت.
٣-(لَیْسَ خَلْقُ اللهِ مِثلَهُ»): کەس نییە وەکو ئە و بێت.
(«لَیسَ زَیدٌ قائِماً»): زەید بە پێوە نییە.
(«جاءَني القَومُ لیسَ زَیداً»): خوێشگەل هاتن زەید نەبێت (لێرەدا بۆ هەڵاوێردنە).
(لَیس الطیب إِلا المسك): بۆن نییە هەر بۆنی مسك نەبێت یان وەك بۆنی مسك بێت.
(لَیسَ اللهُ بِظالِم): خودا زۆردار نییە/ ستەمکار نییە.
٤-(لَیَّسَ- الشيءُ بِالشيءِ) (عامیة): شتەکەی بە شتەکەوە نووساند.
(أَلْلَیسَین) (عامیة): سەرمبرشتو سەرە پارچەی ئاوریشم.
(لَیسِنَة): سەرمبریشتێکی ئاوریشم.
(أَلأَلْیَس (م) لَیساء (ج) لِیس): کەسێکە خۆی خزانبێتە ماڵەوەو نەچێتە دەرەوە.
(إِبلٌ لِیسٌ علی الحَوض): حوشترگەلێك کە چوونە سەر گولەکە بەرینەدەن.
المُلابِس: خاوو خلیچك/ هێواش/ لەسەرخۆ/ شێنەیی.

٥-(تَلايَسَ- الرَجُلُ. تَلايُساً): پیاوەکە بەرەوشتبوو.
(ألألْيَس (م) لَيْساء (ج) ليس): بەرەوشت/ رەوشتجوان.
ليص: (لاصَ. يَليصُ. لَيْصاً): لايدا.
(-الشيءَ): شتەکەی بزواند/ تەکانی پێدا تا هەڵیکەنێت/ دەری بکێشێت.
(ألاصَ- الشيءَ. إلاصةً): ١-شتەکەیلادا ٢-شتەکەی بزواند تا دەری بهێنێت.
(-فُلاناً عَن كذا): فیساری فریودا تا لەوەی بکات/ لە خشتەیبرد.
ليط: ١-(لاطَ. يَليطُ لَيْطاً): پێوەنوسا.
(-الشيءُ بِقَلْبِهِ): شتەکە (بە دڵیەوە نووساو حەزی پێلێکرد/ چووە دڵیەوە).
(-فُلاناً بِفُلانٍ): فیساری خستە پاڵ فیسار کەس و سەر بەویکرد/ بردیەوە سەر ئەو.
(«ما يَليطُ بِهِ النَّعيمُ»): خۆشیی و خۆشگوزەرانیی شایستەی ئەو نییە.
(لَيَّطَ-هُ بِهِ تَلييطاً): بەویەوە لکاند.
(ألاطَ-هُ إلاطةً): پێوەی نووساند.
(ألّلِياط): ١-گەچ و قسڵ ٢-ئاوی ناو گۆم ٣-رەنگ ٤-سوود (چونکە بەسەرمایەوە بەستراوە).
(ألّليط) (مص): ١-رەنگ.
(ألّلِيْط): رەنگ ٢-سروشت/ رەوشت ٣ پێست ٤-توێکڵ/ توێژی هەموو شتێك.
(«أتَيتُهُ ولِيطُ الشَمسِ لَم يُقْشَر»): گەیشتمە لای پێش ئەوە تەواو گزنگی خۆر بکەوێت.
(ألّلِيطَةُ (ج) ليط ولِياط وَألياط): ١-توێکڵی قامیش کە پێوەی دەنووسێت ٢-کەوان ٣ نێزە (دارە راستەکەی).
٢-(لاطَ. يليطُ- اللهُ فُلاناً لَيطاً): خودا نەفرەتی لە فیسار کرد.
ليع: (لاعَ. يَليعُ. لَيَعاناً): ١ بێزار بوو/ جارسبوو/ وەرسبوو/ هەراسانبوو/ بێتابوشتبوو ٢-زۆرترسا ٣-تۆقی.
(-الجوعُ فُلاناً لَوعَةً وَليعَةً): برسێتیی ئاگری لە فیسار بەردا.
(ألاعَ): بێزار بوو/ وەرسبوو/ هەرەسانبوو.
(رِيْحٌ لِياعٌ): بایەکی توند یان گەرم.
(ألّليعَةُ): جارێك وەرسبوون/ بێزاربوون/ جارێك ئاگرگرتنی برسێتی.
(لَيعَةُ الجوع): گرگرتنی برسێتی.
ليغ: ١-(لاغَ. يَليغُ-هُ الشيءُ لَيغاً): ابۆ لەژێر دەستهێنانی شتێك فریویدا ٢-پێچ و پەنای لەگەڵدا کرد تا شتەکەی لێبسێنێت.
(ألأَلْيَغ (م) لَيغاء (ج) ليغ): منجەمنجکەر/ کەسێکە کە خۆیشی نەزانێت چی دەڵێت.
(«دُرّي بِما عِنْدَكَ يا لَيغاء»): بەس منجەمنج بکەو چی لە دڵتایە بیڵێ ئەی مەکرباز.
٢-(تَلَيَّغَ. تَلَيُّغاً): خۆی گەوجکرد.
(ألّلَيَغ): گەوجیی تەواو.
ألِياغَة: گەوج.

(«رَجُلٌ لِياغَة»): پیاوێکی تەواو گەوج.
(ألألْيَغ (م) لَيغاء (ج) لِيغٌ): گەوج.
٢-دەوترێت «طَعامٌ سَـيِّغ لَيِّغٌ»: خواردنێکی خۆشەو بەگەردووداخۆش دەرواتە خوارەوە.
لیـف: ١-(لافَ يَليـفُ- الطَعـامَ. لَيفـاً): خواردنەکەی/ چێشتەکەی لرف لێدا/ خواردی.
٢-(لَيَّف- ت فَسِـيلَةَ النَخلِ. تَلْييفاً): برالەی دارخورماکـە توێکڵیکـردو ئەسـتوور بوو و ریشاڵی زۆر بوو.
(-فلان اللِيفَ): فیسار لفکەی دروستکرد.
(-المُلَيَّـف- فلاناً): ناتری گەرماوەکە پشـتی فیساری بە لفکە کراند/ شت.
(أللِيفانِيُّ): ١-شتێکە وەك لفکە/ ریشاڵیی.
(لحيةٌ ليفانية): ریشـێکی لفکەیی/ ریشێکی چرووپاو درێژ.
(أللِيف الواحدة لِيفَـة): توێکڵی دارخورماو شتی لەو بابەتە/ لفکە.
(لِحْيَـةٌ لِيفانِيَّة): ریشـی لفکەیی کە درێژو بڕژو زۆرو پانبێت.
(أَلمُلَيِّف): ناتری گەرماو کە پشـتی خەڵك بە لفکە دەشوات.
لیـق: ١-(لاقَ. يَليقُ- الـدواةَ. لَيْقاً ولِيقَةً): مەرەکەبدانەکـەی چاککـردو پارچەخوریی تێخستو مەرەکەبەکەی ڕێکخست/ چاککرد.
مَلِيقَةٌ: مەرەکەبدانی ئامادەکراو.
(-تِ الـدواةُ): مەرەکەبەکە بـاش بە پارچە خوریەکەوە نووساو گرتی.
(لاقَ- بِفُلان لَيْقاً ولِياقَـةً ولَياقاً ولَيَقاناً): خۆی کوتایە پاڵ فیسارو لێینەبووەوە.
(«مالِقْتُ بَعدكَ بِـأَرضٍ»): لە پاش تۆ خۆم بە هیچ خاکێکەوە نەگرت.
(«هذا أَمرٌ لايَليقُ بِـكَ ولا يَليقُكَ»): ئەمە کارێکە بۆ تۆ نەشیاوەو بۆ تۆ ناگونجێت.
(«فُلان لايَليقُ بِبَلَدٍ»): فیسار لە هیچ وڵاتێك، شارێکدا خۆی ناگرێتو ستارە ناکات/ پێوەی نانوسێت.
(لاقَ- بِـهِ الثَـوبُ): بەرگەکەی بـۆ بوو بە بەریبوو/ لێیهات/ بۆی گونجا.
(«مايَليقُ أَن تَفعَلَ كذا»): ئەو کردارە بۆ تۆ جوان نییەو شایانی تۆ نییە بیکەیت.
(لَيَّـقَ- الطَعامَ): چێشـتەکەی شـلکردەوە/ نەرمکردەوە.
(-الثَريدَ بِالسمنِ): ڕۆنی زۆری بە تریتەکەدا کرد.
(ألاقَ الدواةَ): مەرەکەبدانەکەو مەرەکەبەکەی چاککردو پارچە خوری تێخست.
(-فُلانـاً بِنَفسِـهِ): فیسـاری بـە خۆیـەوە بەندکرد.
(«مـا ألاقَتنـي البَصْـرَةُ»): لـە بەسـرەدا نەمامەوەو نەیگرتمە خۆی.
(«فُلانٌ لايُليقُهُ بَلَدٌ»): فیسـار هیچ شـارێك نایگرێتـە خـۆی/ سـتارە لە هیچ شـارێکدا

لە کاتی کەمئاویداو لە کارواندا. دەبوو ئاوەکە سـەر چەوەکە بکەوێت ئەوسـا یەکێك ئاوی ڕۆدەکـرد تا چەوەکە دەردەکـەوت ئاویتریان بەسـەردا دەکرد وەك جاری پێشوو یەکێکیتر ئاوەکـەی ڕۆدەکـردو ئاویتریـان دەکـردەوە قاپەکە بەو شـێوەیە هەموو لـەو ئاوە کەمە بەشی خۆیان دەخواردەوە.

٢-(مَقَلَ-هُ مَقلاً): تەماشایکرد/ سەیریکرد/ ڕوانی/ تێبڕوانی.

(«مَقَلَتهُ عَيني»): چاومکرد/ بەرچاومکەوت.

(«مامَقَلَت عَيناي مِثلَهُ»): چاوم شتی وەهای نەدیوە/ هی وەهام بەرچاو نەکەوتووە.

(اَلمُقلَـةُ (ج) مُقَـل): ١-گلێنـەی چـاو/ یان ڕەشـینەو سـپێنەی چاو ٢-هەموو چاو/ چاو خۆی.

٣-(اَلمُقْـل) (ز): درەختـی دۆم ١-دارێکـە لە ڕەگـەزی دراخورمـا قەدەکـەی لقـدارە لە بەرەکـەی جـۆرە دۆشـاوێك دەگیرێـت لـە نیوەدورگـەی عـەرەبو لە میسـرو سـودان دەروێت ٢-گەوەنی/ کەتـیرەی درەختێکە بۆ پزیشکیی بەکاردێت ٣-بەری درەختی دۆم.

مقە: ١-(مَقِهَ. مَقَهاً): چاو سووتەمەڕۆ بوو/ پێلوو سوورهەڵگەڕاوی کەمبرژانگبوو.

(أمْقَهُ): چاو سووتەمەڕۆ.

(اَلأمْقَهُ (م) مَقهاء (ج) مُقْه): کەسێکە پێڵووی چاوی لەبەر کەمبرژانگیی سوورهەڵگەڕابێت.

٢-(اَلمَقَـهُ): شـینێکی مەیلـەو سـپی (ئەوە بێزراوە/ ناشیرینە).

(اَلأمْقَـه (م) مَقهـاء (ج) مُقْـهُ): ١-دوور ٢-شـوێنێك درەختـی لێنەروێـت ٣-پیاوێك کەسێکە سەری خۆی هەڵگرێتو نەزانێت بۆ کوێ بچێت.

مقـو: (مَقـا. يَمقُـو- السَّـيفَ. مَقْـواً): شمشێرەکەی لووسو سافکرد.

(-الفَصيلُ أُمَّهُ): بەچکە کەتیرو توند/ تەواو دایکەکەی مژی.

(-الطَستَ): (تەشتەکە/ سوێنەکە)ی شت.

(مَقي يَمْقي- السَـيفَ مَقْياً): شمشـێرەکەی سافو لووسکرد.

مـك: ١-(مَكَّ- العَظمَ مَـكّاً): هەموو مۆخی ئێسقانەکەی هەڵمژی.

(-الشيءَ): شتەکەی فەوتاند.

(- غَريمَـهُ): واموەرگرەکـەی تەنگەتـاو کـردو نەرمیی لەگەڵدا نەنواند تا دوا فلسـی لێداواکرد.

(مَكَّكَ-علـى غريمِهِ): زۆری بۆ قەرزارەکەی هێناو پێی لێکردە کەوش.

(تَمَـكَّكَ وامْتَكَّ- العَظْـمَ): هەرچی مۆخ لە ئێسقانەکەدا بوو هەڵیمژی.

(-الفَصيـلُ مـافي ضَـرعِ أُمِّـهِ): بەچکەکە هەرچـی لە گوانی دایکیـدا بوو مژی/ دایکی چەکوچڕدا.

(اَلُمكاك والُمكاكة): مۆخی ناو ئێسقان. (نُخاع)

(عامية): مۆخی ئێسقان.

(اَلَمكُّوك (ج) مَكاكيك): (جام/ كاسە)ی ئاو پێخواردنەوە.

٢-(اَلَمكُّوك (ج) مَكاكيك): ١-كێشانەیەكە نزیكەی ٤٥ گرام دەبێت ٢-پارچەیەكی مەكینەی دروومانە (اَرمنية).

٣-(مَكْمَكَ- الرَجُلُ): خلبووەوەو ڕۆیشت.

(-المُخَّ): هەموو مۆخەكەی هەڵمژی.

(تَمَكْمَكَ- العظمَ): هەر مۆخێك لە ئێسقانەكەدا بوو هەڵیمژی.

مكث: (مَكَثَ- بِالَمكانِ مَكْثاً ومَكَثاً ومُكُوثاً ومُكْثاناً ومِكِيثى. وَميكثاءَ): لە شوێنەكەدا مایەوە. نیشتەجێبوو. چاوەڕێیكرد.

(ماكِث): ماوەو چاوەڕێكار/ نیشتەجێبوو.

(اَلُمكث والِمكْث): مانەوە/ نیشتەنیبوون.

(مُكْث مَكاثَةً): نیشتەنیبوو و چاوەڕێیكرد/ خۆی هێشتەوەو ڕێزی خۆیگرت.

(اَمْكَثَ-ه): هێشتیەوەو چاوەڕێی پێكرد.

(تَمَكَّثَ): چاوەڕێی كارێكیكردو بۆ ئەوە مایەوە/ ستارەیگرت.

(-بِالَمكانِ): لە شوێنەكەدا وەستاو خۆی خایاند/ ئۆقرەیگرت/ مایەوە.

(-فِي الأَمرِ): لە كارەكەدا شێنەییبوو. پەلەی لێنەكرد.

(اَلَمكيث (ج) مُكَثاء ومَكيثون = الماكِث): ١-خۆخایاندو چاوەڕێكەر/ ستارەگرتوو/ ئۆقرەگرتوو ٢-مرۆڤی شێنەییو سەنگین.

مكد: (مَكَدَ- بِالَمكانِ. مَكْداً و مُكوداً): لە شوێنەكەدا دانیشتو جێگربوو.

(ماكِد): نیشتەجێو جێگیر بوو.

(ماءٌ ماكِدٌ): ئاوێكی نەبراوەو هەمیشە لەبەر ڕۆیشتوو.

(ناقَةٌ ماكِدَةٌ وناقَةٌ مَكداء ومَكُود (ج) مُكُد ومَكائِد): مێحوشترێكی فرمشیر هەروەكو شیرەكەی نەبڕێت/ وشك نەكات.

٢-(اَلِمكْد): شانە.

مكر: ١-(مَكَرَ- الرَجُلَ وبِهِ): فێڵی لە پیاوەكە كرد/ فریویدا/ لاسیدا/ لە خشتەیبرد/ هەڵیخەڵەتاند/ دەستیبڕی.

(-اللّهُ فُلاناً): خودا سزای فیساری لەسەر فێڵبازییەكەیدا.

(ماكَرَهُ): فێڵی لێكرد/ گزیلێكرد/ فریویدا.

(اَمْكَرَ-ه): فێڵی لێكرد/ هەڵیخەڵەتاند/ بەهەڵەیدابرد.

(-هُ اللّهُ): خودا سزای فێڵەكەیدا/ دەستبڕینەكەیدا.

(تَماكَروا): فێڵیان لە یەكتریكرد.

(اَلماكِر (ج) مَكَرَة وماكِرون): فێڵباز/ فریودەر/ دەستبڕ/ هەڵخەڵەتێن/ لاسدەر.

(اَلَمكْر) (مص): ١-فێڵ/ فێڵبازی/ هەڵخەڵەتاندن/ دەستبڕین/ لە خشتەبردن/

فریودان ٢-سزای فێڵبازیی‌و دەستبڕین.
اَلمَكْرَةُ (ج) مَكرُوَ مُكور: ١-فێڵێك/ فریودانێك ٢-تەگبیرو فێڵ‌و پێچ‌و پەنا لە جەنگدا.
اَلمَكَّار والمَكُور: زۆر فێڵبازو بە پێچ‌و پەنا.
٢-(مَكَرَ- الثوبَ. مَكْــراً): جلەكەی بە قوڕە سوور ڕەنگكرد.
(-هُ): ڕەنگیكرد.
(مَكِرَ مَكَراً): سوور بوو.
(إمْتَكَــرَ وامْتُكِــرَ): بە (گڵە ســوور/ قووڕە سوور) ڕەنگ بوو.
(اَلمَكْر): قوڕە سوور/ گڵە سوور.
٣-(مَكَرَ- الأَرضَ مَكْراً): زەویەكەی ئاودا.
(اَلمَكْرَةُ (ج) مَكْرٌ ومُكُورٌ): جارێك ئاوداشتنی كشتوكاڵ.
(اَلمَكْــرَةُ) (ن): ١-ڕووەكێــك گیایەكــە گەڵای هەیــەو گوڵی نییــە، بۆیــە وای پێدەڵێن كە تێرئاوەو كەڵكی لە ئاوداشــتنەكە وەرگرتووە ٢-قەدێكی ئەستووری جوان‌و چاك چوێنراوە بە ڕووەكە بێگوڵەكە.
٤-(مَكَّرَ): دانەوێڵەی كۆكردەوەو شاردەوەو بۆ گرانیی هەڵیگرت.
٥-(اَلمِكْروسْكوب) (یونانیة) اَلمِجهر: میكرۆسكۆب.
مكس: (مَكَسَ. مَكْساً): گومرگیگرت.
(-فِي البَيعِ): لە فرۆشتندا نرخەكە داشكا.
(-هُ): ستەمی لێكرد.
(مُكِــسَ- الرَجُلُ): لە ســەوداو فرۆشــتندا كەمیان بە پیاوەكەدا.
(مـــاكَـــسَ-هُ. مِـكـاســاً ومُـمـاكَـسَـةً): ١-لە سەوداكردندا كەمی داو نرخەكەی شكاند ٢-چەندوچوونی زۆر لەگەڵدا كردو گیر بوو لە نرخداندا.
(تَماكَسَ- الرجــلان فِي البَيعِ): لە كڕین یان فرۆشــتندا لەگەڵ یەكدا چەندوچوونیان زۆر كردو هەردووكیان گیر بوون.
(اَلمَكــس (مــص) (ج) مُكُــوس): بــاج/ گومــرگ ١-پارەیەكبوو لە پێش ئیســلامدا لە كەلوپەلێك/ كالایەك دەســەنرا كە لە بازاردا دەفرۆشــرا، پارەیەك كە كارمەندانی میری لە كالاو كەلوپەلێكی دیاریكراوی دەســێنێت كە بفرۆشرێت یان بهێنرێتە شارەكانەوە.
(اَلماكِــس والمَكَّاس= صاحــب المَكس): باجگر یان گومرگومرگر/ باجسێن/ گومرگسێن.
مكــن: (مَكُنَ- عِندَ الأَمــيرِ): لای میر پایەی پەیداكردو بەرز بووەوە.
(-الشيءُ): شــتەكە بەهێــزو قایم بوو/ پتەو بنجبەستبوو.
(ماكِن): شتی پتەوو قایم‌و بنجبەست.
(مَكَّنَ-هُ مِنَ الشيءِ): تواناو دەسەلاتی بەسەر شتەكەدا پێدا.
(-مَكَّنَ الشيءَ): توانای بەسەر شتەكەدا شكا.
(تَمَكَّنَ): توانی‌و دەسەلاتیبوو.
(أَمْكَــنَ- الأَمرُ فُلاناً ولِفُــلانٍ): كارەكەی بۆ

ئاسانبوو/ بۆی لوا بیکاتو بەسەریدا زاڵبوو.
(«فُلانٌ لايُمْكِنُهُ النُّهوضَ»): فیسار ناتوانێت هەستێت.
(«أَمْكَنَنـــي الأَمــرُ»): کارەکەم بۆ ئاســانبوو جێبەجێمکرد.
(أَمْكَنَ-هُ مِنَ الشيءِ): تواناو دەسەلاتی کردنی شتەکەیدایە/ وایلێکرد کە بتوانێت دەسەلاتی بەسەر شتەکەدا بکشێت.
(تَمَكَّنَ-عنـــد الأَمير): لای میر پایەدار بوو و بەرزبوووەوە.
(-المَـكانَ وبِــهِ): لە شــوێنەکەدا جێی خۆی گرتو دامەزرا.
(تَمَكَّنَ واسْتَمْكَنَ- مِنَ الأَمرِ): توانای بەسەر کارەکەدا شکا کە ئەنجامی بدات یان کارەکەی دەستگیر بوو.
(أَلمُكْنَـــة): توانــا/ هێــز/ دەســەلات/ تــین/ لێهاتوویی.
(أَلمَكِنَـــةُ): توانـــین/ دەرەقەتهاتـــن/ ئاوزان. بەدەسەلاتبوون.
(أَلمَــكان (ج) أَمْكِنَة وأَمْكُن و (حج) أَماكِن): شوێن/ جێ/ جێگا.
(«هوَ مِــنَ العِلم بِمَكان»): ئەو لە زانســتدا دەستدارو پایەدارە.
(«هذا مَكانُ هذا»): ئەمە جێگای ئەمەیە.
(هذا مكانَ هذا): ئەمە (لە بری ئەمەیە/ لە جێگەی ئەمەیە).

(أَلمَكانَة (مــص) (ج) مَكانات): ١-پایە/ پلەو بەرزیــی جێگــا ٢-لەســەرخۆیی/ هێمنـــی/ شێنەییو سەنگینیی/ ئاغریی.
(«إِمْشِ على مَكانَتِــكَ»): وەك خۆت ئاغرو سەنگینانە برۆ.
(أَلمَكين): خاوەن پایەو پلەو جێ.
(«هــو مَكينٌ عِنــدَ الأَمير»): ئــەو لای میر خاوەن پایەیەو قسەی دەڕوات.
(أَلمَكينَة): هێمنیی/ شــێنەیی/ ســەنگینییو ئاغریی/ هێواشیی.
(«إِمْــشِ علــى مَكيْنَتِكَ»): لەســەرخۆو بە شێنەیی خۆت برۆ.
(«هوَ أَمْكَــنُ مِن غَيرِه»): ئــەو لە خەڵکیتر بەتواناترو دەسەلاتترو پایەدارترە.
(أَلمُتَمَكِّــن- في عِلم النحو): لــە رێزماندا بە ناوێك دەڵێن کە شــێوە پیت نەبێتو ســەرو بۆرو ژێر وەربگرێت.
(أَلمُتَمَكِّن الأَمْكَن) ئەو ناوەیە کە بشێت هەموو سەروبۆرو ژێرێك وەربگرێت لەگەڵ «تنوین» واتە: دوو ڤاتی ســەروبۆرەکە وەربگرێت وەك سَعدِ. سَعْدَ. سَعدُ. سَعْدٍ سَعْداً وسَعْدٌ.
(أَلمُتَمَكِّــن غيرَ الأَمْكَن في عِلــم النحو): ئەو ناوەیە کــە ژێردار نەبێــتو دووڤاتی بزوان وەرنەگرێت وەك ئیبراهیم یوسف.
(غـــير المتمكن في النحو) ئەوانەن وەکو پیتن وەکو (كَيفَ وأَينَ)

٢-(مَكِنَ-تِ الجَرادَةُ مَكَناً): کوللەکە گەرایدانا یان گەرا لە لەشیدا کۆبووەوە/ گەرایهەڵگرت.

(جرادَة مَكُون (ج) مِكان): کوللەی گەرادانەر یان گەراهەڵگر.

(أَمْكَنَ-تِ الجرادَةُ): کوللەکە گەرایدانا.

(المَكْن والمَكِن): گەرای/ هێلکەی کوللە.

(مَكْنَــة ومَكِنَــة) (ج) مَكْنــات ومَكِنات): (گارمیــەك/ هێلکەیــەك)ی کوللــەو هی لەو بابەتە.

الملحق:

مکن: (مَكْنَنَ- الشــيءَ): شــتەکەی ئامێرکار کــرد/ مەکینەکار کــرد/ شــتەکەی کرد بە مەکینە/ بە ئامێر.

(-الأعمــالَ): لە بــری مرۆڤ لــە کارەکاندا بەکارهێنا/ کارەکانی بە ئامێر ئەنجامدا.

(مَكْنَــنَ الزراعَــةَ أَو الصناعَــةَ): بۆ کردنی کشــتوکاڵو پیشەســازیی لــە بــری کرێکارو ئاژەڵ ئامێری بەکارهێنا/ بە ئامێر کارەکانی ئەنجامدا.

(المَكْنَــةَ): ئامێر بــۆ ئەنجامدانی کار لە بری مرۆڤ بەکاردەهێنرێت.

(الأَماكِــن المُقَدَّســة عِنــدَ المَســيحيين): شــوێنەوارە پــیرۆزەکان لای دیانــەکان خاکی فەلەســتینە کە حەزرەتی عیسای تێدا ژیاوەو حەج لەوێدەکەن گرنگترین شوێنیشــی شاری (ئورشەلیمە) واتا شاری قودسی پیرۆزە کە لە لای موسوڵمانانو دیانو جوولەکە بە پیرۆزی دادەنێــنو بە پیرۆزی دەگــرن. هەروەها لای عیســاییەکانو لای هەمــوان (بەیتلەحــمو ناسیرە)یش پیرۆزن.

(الإمــكان): توانــای کردنی کارێك، شــتێك/ دەسەڵاتو وزەو توانا.

(«لَيْــسَ فِي إِمكانــي أَن أَفْعَــلَ ذلــك»): لــە وزەمدا/ لە توانامدا نییە ئەو کارە بکەم/ ئەو کارە بە من هەڵناسێت.

(الإمْــكان): لەوانەیە/ دوور نییە/ دەشــێت/ ڕەنگە ڕووبدات.

(«إمــكان وقوع الحَــرب»): لەوانەیە/ دوور نییە/ ڕەنگە شەڕ بقەومێت/ ڕووبدات.

(«إمكان عَقد إتِّفــاق»): لەوانەیە پەیمانەکە/ گرێبەستەکە ببەسترێت/ ڕێکەوتنەکە ڕووبدات.

(إمــكان= الإحتمال): ئەوپــەڕی چاوەڕوانی ڕووداوە کــە ڕووبدات یان کەمتر چاوەڕوانیی دەکرێت.

(«إنَّني سَــعيدٌ على قَدْر ما بِإمكان رَجلٍ أَن يَكونَهُ»): من بەختیارم ئەوەندەی کە پیاوێك لە توانایدا بێت کارەکە ئەنجام بدات.

(الإمكان- فِي الفَلسَفَة): لە فەلسەفەدا ئەوەیە دەشێت کارەکە ببێت یان هەر نەبێت.

(الإمكانِيّات): هەموو تواناو دەسەڵاتێك.

(إمكانيــاتٌ ضَعيفَــة): کەمدەســەڵاتیی/ کەمتوانایی.

(ألإمكانِيــات): ئــەو هۆكارو ڕێگاو شــتانەی کە لەبەر دەســتدایە یان ئــەو وزەو توانایەی دەکرێــت کەڵکی لێ ببینرێــت. ئەوەی کە لە کەســێك یــان لە شــتێك دەســتگیر ببێت بۆ ئەنجامدانی کارێك.

(«عَـرَفَ إمكانِيَّاتِــه»): تواناو دەســەڵاتو بوونی زانی.

(إمكانِيات ألإنتاج»): توانای بەرهەمهێنان.

(أَلْمُمْكِــن): ئــەوەی کــە بتوانرێــت بکرێت/ بەشــتێك کارێك دەڵێن کە ڕووبدات بکرێت/ دوور نەبێت ڕووبــدات/ لەوانەبێت بێتەدی/ ڕەنگە/ زۆر دوور نییە/ دەشێت.

(«عَقدُ الإتِّفاق بَينَهُما أمرٌ مُمْكِنٌ»): پێکەوە ڕێکەوتنیان دوور نییە/ لەوانەیە ڕێکبکەون.

(«مِنَ المُمْكِن أن تَسْقُطَ الوزارَة»): لەوانەیە/ ڕەنگە/ هیچ دوور نییە وەزارەت بڕووخێت/ بکەوێت.

(«خِطَّــةُ مُمْكِــنٌ تَنفيذُهــا»): پلانێکــە دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت.

(أَلْمُمْكِــن): دەربڕەیــە، بــۆ ئەوپــەڕی یــان کەمترینی تواناو دەسەڵات.

(«حَصَلَ على المَبْلَغ المُمْكِن الحُصول عليه»): ئەو برە پارەیەی دەســتگیر بوو کە لە تواناداا بوو دەستگیری ببێت.

(«أَخَذَ مَعَهُ أكْبَر عدد مُمْكِن مِنَ الأشحاص»): لەگەڵ خۆیدا زۆرترین کەس کە توانرا ببیات بردی.

(أَلْمُمْكِن في الفَلْسَــفَة): لە فەلسەفەدا ئەوەیە کە دەشێت ببێت یان هەر نابێتو هەر نییە.

مکــو: ١-(مَكا. يَمكو. مَــكاءً ومُكُواً): بە دەم فیکەیکێشا.

(أَلْمُكَّاء (ج) مَكاكِــيّ) (ح): جورە باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی کلاوکوڕەیە بە ئاســماندا ڕاست بەرزدەبێتەوەو ڕێك دێتە خوارەوە سپیواشتە دەنگێکی خۆشی وەك فیکەی هەیە.

(أَلْمَكْوَة): بن/ قنگ.

٢-(مَكِــيَ. يَمكى-ت يَدُهُ. مَكاً): دەســتی بە هۆی کاری زۆرەوە ئاوی تێزا/ لە نێوان پێست گۆشتەکەیەوە ئاو کۆبووەوە.

(تَمَكّى-الفَــرَسُ. تَمَكِّياً): چارەوێکە لەشــی نیشتە سەر ئاوو ئەرەق.

(أَلْمَكى والمَكُو (ج) أمْكاء): کونە کەروێشــكو هی لەو بابەتە.

ملّ: ١-(مَلَّ- عَلَيهِ السَــفَرُ مَلاً): گوزارەکەی درێژەی کێشا.

(-الشــيءَ ومِنَ الشَــيءِ مَلَلاً ومَــلالاً ومَلَّةً ومَلالَةً): لە شتەکە بێزار بوو/ وەڕسبوو.

(أَمَلَّ- عَلَيــهِ السَــفَرُ): گوزارەکەی درێژەی کێشا.

(-هُ ألأَمــرُ وأَمَــلَّ عليــه الأمــرُ): کارەکەی لێگرانبوو تووشــی جاڕسییو بێتاقەتییکرد/ لێی وەڕسبوو.

(-هُ الشـيءَ): وايكرد له شتەكە بێزار ببێتو تاقەتی لێنەمێنێت.
(إسْـتَمَلَّ- الشـيءَ): له شـتەكە وەڕسبوو/ تاقەتی له شتەكە نەما.
(أَلَـلُّ) (مـص): وەڕسـیی/ بێتاقەتیـی/ جارسیی/ بێزاریی.
(رَجُلٌ مَـلٌّ): پیاوێكە بێتابوشـت/ وەڕس/ بێتاقەت/ هەراسان.
(أَلْمَلَّةُ): جارێك هەراسـانبوون/ بێزاربوون ٢- بێتابوشتبوون/ بێزاربوون/ وەڕسبوون.
(«رَجُـلٌ مَلَّـةٌ»): كابرایەكـە زوو (بێـزار/ وەڕس/ بێتاقەت/ هەراسان) دەبێت.
(أَلْمَلَلُ والمَلال): وەڕسیی/ بزاریی/ بێتاقەتیی/ بێتابوشتیی.
(أَلمالُولَـة والمَلاَّلَـة والمَلُّـول والمَلُّولَـة): (بۆ نێرومـێ): بێزار/ بێتابوشـت/ هەراسـان/ دڵتەنـگ/ خەمگـین (ة) ی وشـەكان بـۆ زیادڕەوییە).
(أَلْمَمْلُـول): وەڕسـكار/ بێزاركـەر. هـۆی دڵتەنگیی/ مایەی هەراسانیی.
٢-(مَـلَّ- الشـيءَ في الجَمْرِ مَلاًّ): شـتەكەی خستە ناو پشكۆكەوە.
(مَلاّل): كەسێكە شت بخاتە ناو پشكۆوە.
(مَمْلُول ومَلِيل): شتێكی له پشكۆنراو.
(مَـلَّ- السَّـهمَ بِالنـارِ): بە ئاگـر تیرەكەی سازاند.
(-اللَّحْمَ أَو الخُبزَ): گۆشتەكەی یان نانەكەی دایە بەرتین پشكۆكە بۆ برژاندن.
(مَلَّ. مَلاًّ): ١-وەڕسـبوو/ بێتاقەتبوو ٢-وەك لەسـەر ئاگر بێـت لەتاو نەخۆشـیی یان لە خەفەتدا كەوتە تەپاوتل/ گینگڵدان.
(-الشَّيءَ): شتەكەی هەڵگێڕوداگێڕ كرد.
(-المَحْمُـومُ): تاگرتووەكـە ئارەقیكـردەوەو كەوتە تەپاوتل.
(مَلَّلَ- الشيءَ تَمليلاً): شتەكەی (ژێرەو ژوور كرد/ ئەمدیوو ئەودیویكرد).
(تَمَلْـلَ): لـە خەفەتدا یان لەتاو نەخۆشـی تەپاوتلیكرد.
(-اللَّحْمُ على النار): گۆشتەكە لەسەر ئاگرەكە كەوتە چزەو جووڵە.
(-مِلَّةَ كَذا): سەر ئەو ئاینو ڕێڕەوە بوو/ بوو بە شوێنكەوتەی ئەو ئاینو ڕێڕەوە.
(إمْتَلَّ- الخُبزَةَ): لەسەر پشـكۆكە نانەكەی برژاند.
(-مِلَّةَ كذا): بوو بە شوێنكەوتەی ئەو ئاینو ڕێڕەوە.
(أَلْمَلَّة): ١-پشـكۆ ٢-ژیلەمۆی گـەرم ٣-ئارەقی تاگرتن.
(خُبْزُ المَلَّة): نانی سەر پشكۆ یان ژیلەمۆ.
(أَلمِلَّة (ج) مِلَل): ڕێباز/ ڕێڕەو یان شەریعەتی ئەو ئاینە.
(أَلْمَلِّي): نانی برژاوی ژیلەمۆی گەرم.

(أَمْلال): ١-تەپاوتلکردن بە هۆی نەخۆشییەوە یان لە داخو خەفەتدا گینگڵدان ٢-پشتیەشە ٣-گەرمیی ناو ئێسقان ٤-نارەقی تاگرتن.

(أَمَليل): ١-برژاوی ناو ژیلەمۆ یان پیشاوی ناو ژیلەمۆ ٢-چیۆیك/ چیلکەیەك ناگرەکەی پێ هەڵگێڕو داگێڕ بکرێت/ کۆڵەوژ.

(أَمَليل- مِنَ الطُرُق): ڕێگەیەك زۆر پێدا بڕۆن.

(رَجُلٌ مَليلٌ): پیاوێك خوَر برژاندبێتی واتا ڕەشی هەڵگەڕاندبێت.

(أَمَليلَة): ١-تای ناوسك و ناوەوەی لەش ٢-تینوێتییەکی زۆر کە گڕ لە پیاو بەردەدات.

(أَمُمَلّ- مِنَ الطُرُق): ڕێگەی زۆر بەکارهێنراوو زۆر پێدا ڕۆیشتوو.

(أَمَمْلول): بە ژیلەمۆی گەرم برژاو.

٣-(مَلَّ- في المَشي. مَلاًّ): لە ڕۆیشتنەکەدا پەلەیکرد.

(تَمَلَّلَ- في المشي): خێرایکرد.

(إِمْتَلَّ- في المَشي): لە ڕۆیشتنەکەدا خێرایکرد/ گورجبوو.

(إِنْمَلَّ): دزەیکردو بۆی دەرچوو.

٤-(مَلَّ- الثَوبَ. مَلاًّ): کۆکی جلەکەیگرت.

(أَمُلَّةُ (ج) مُلَلٌ): کۆکگرتنی جل پێش دروون و تەواوکردنی.

٥-(أَمَلَّ وأَمْلى- الكِتابَ على الكاتِبِ. إِمْلالاً وإِمْلاءً): نووسراوەکەی خوێندەوەو پێینووسی.

٦-(أَلمِلَّة (ج) مِلَل): ١-خوێنبایی کوژراو.

(أَمُلال): ١-پشتی کەاونەکە ٢-داری دەسکی شمشێر.

(أَمَلُّول. الواحِدَةُ مَلُّولَة) (ن): جەوتی بەڕووی ڕۆمیی کە کلاوەکەی/ جەوتەکەی پێستەی پێخۆشدەکرێت.

٧-(مَلْمَلَ-): خێرایکرد/ گورجبوو/ پەلەیکرد.

(أَمَلْمَلی): خێرا/ گورج/ پەلەکار.

(ناقَةُ مَلْمَلى): حوشترێکی گورج/ خێرا/ چابوك.

٨-(مَلْمَلَ-هُ المَرَضُ): نەخۆشییەکە تەپاوتلی پێدا/ گینگڵی پێدا.

(تَمَلْمَلَ): لە خەفەتدا یان بە هۆی نەخۆشییەوە لەسەر جێگەکەی تەپاوتلیکرد/ ئەمدیوئەودیویکرد/ گینگڵیدا.

(-الجالِسُ): دانیشووەکە ستارەی نەبوو هەر جارەی لەسەلا لایەکی دادەنیشت.

(أَمَلْمُول): کلچێوکی چاو ڕشتن. (بۆیە وا ناونراوە چونکە لە چاودا ئەمدیوو ئەودیوی پێدەکرێت.

٩-(أَمَلْمَلَة): ووتی فیل/ خەرتومەکەی.

(أَمُلْمُول): کونی لووت.

ملأ: (ملأَ-هُ. ملأً ومَلاءَةً ومِلاءَةً): پڕیکرد/ سیخناخیکرد.

(-الإناءَ ماءً وبالماءِ ومِنَ الماءِ): قاپەکەی پڕ کرد لە ئاو/ هێندەی کە دەیگرێت ئاوی تێکرد.

(إمْتَلأَ): پڕبوو.
(مَمْلوءٌ): پڕ/ سیخناخ.
(نَظَـرْتُ إلَيــهِ فَمَــلأَتُ مِنــهُ عَينـــي»): تەماشامکردو دیمەنی لام جوانو شیرینبوو.
(«ملأ عَلَيه الأَرضَ»): زەویی لێ هێنایەومیەك.
(مَلِيءَ ملأً): پڕ بوو.
(ملآن): پڕ/ لێوانلێو.
(مَلُؤَ. مَلاءَةً ومَلاءاً): پڕبوو.
(مَلُؤَ ويَمْلِيءَ. مَلاءَةً): تووشی هەلامەتبوو.
(ملأً-هُ تَمْلِئَةً): تەواو پڕیکرد (ئەو گرتنە بۆ زیادرەوییە).
(ملأَ- فِي قَوسِهِ): کەوانەکەی تەواو ڕاکێشا.
(أَمْلأَ-هُ): تووشی هەلامەتیکرد.
(مَلآن): تووشبووی هەلامەت/ هەلامەتگرتوو.
(أَمــلأَ- فِي القَوسِ): کەوانەکــەی درێژکردو ژێکەی توند ڕاکێشا.
(تَملأَ): پڕبوو.
(-تِ المرأةُ): ژنەکە بەرکۆشی بەست.
(امْتَلأَ- مِنَ الطَّعامِ والشَّــرابِ وغَيرِهِما): لە خواردنو خواردنەوەو شتیتر تێربوو/ گەدەی پڕبوو.
(إسْــتَملأَ —فِي دَيْنِــهِ): وامەکــە بڕوایەکــی تەواوی بۆ پەیداکرد.
(اَلمالِيءُ): پڕکردوو/ پڕ.
(رجُلٌ مالِيءٌ) پیاوێکە مەزن پیاو لە تەماشاکردنی تێر نابێت/ چاوی پێ ڕۆشندەبێتەوە.

(شابٌ مالِيءُ العَينِ): لاوێکە شۆخ بە بینینی چاو ڕۆشندەبێتەوەو دڵ دەکرێتەوە.
(المِلْءِ (ج) أَمْلاء): ئەوەی کە قاپ دەیگرێت/ تەواو پڕ.
(«يَنامُ مِلءُ جفنهِ»): ئاسوودەیە تێر دەنوێت.
(فُلان مِلءُ كِســائِهِ): قەڵەوەو پــڕ بە پڕی جلەکەیەتی.
(أَلَمَــلأَ (ج) أَمْلاء): ١-گــەورەو پیاو ماقوڵانی میللەت کە سامدارنو چاو لە تەماشاکردنیان تێرنابێت ٢-چاوچنۆکیی ٣-گومانو بۆچوون.
(«ماأَحْسَــنَ ملأَ بَنى فُلان»): ئای کە فیسار بەرە کە بەرەو شــتن هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا خۆشە.
(أَلملأ الأَعلى): فریشتەکان جیهانی گیانەکانی سەروو.
(أَلْملاء والمُــلأَة): هەلامەتگرتن لە پڕبوونەوە وەرگیراوە.
(أَلمِلأَة (مص)١-شێوەی پڕبوونو چۆنیەتیی پڕبــوون ٢-پڕبوونــی گــەدە بە خــواردنو خواردنەوە.
(أَلمُلاءَة): گرتنی هەلامەت.
(أَلمــلآن (م) مَــلأَى ومَلأنــة (ج) مُــلاء): ١-بەرگێکــی دوولا کــە بە ســەریەکدا بدرێت ٢-بەرگێکە کە تا ئەژنۆیە، بەرکۆش.
(أَلمَلآنَــة (ج)( مِــلاء): ١-پــڕ/ ســیخناخ ٢-هەلامەتگرتوو/ هەلامەتاوی.

(أَلمَلــيء والمَلِــيُّ (ج) مِلاء وأَمْلِئـــاء ومُلأَاء): دەوڵەمەندی بە دەسەڵاتو دەسترۆیشتوو.

(هــوَ أَمْلأُ القَــوم): ئەو لە هەمــوان داراترو دەسترۆیشتوترە.

(«فُــلانٌ أَمْلأُ لِعَينــي مِن فُلان»): فیســار لەبەرچــاوی مــن لــە هەمــوو شــتێکدا لە فیســارکەس چاوڕوونکــەرەوەو تەواوتــرو شۆخترو باشترە.

٢-(ملأَ-هُ على أَلأَمْر. مَلأً وملأَةً ومِلأَةً): لە کارەکەدا پشتگیرییکردو لەگەڵیدا بوو.

(مالأَ-هُ على الأَمر): لە کارەکەدا یارمەتیداو کۆمەکیکرد.

(تَمالأَ-القَــومُ علــى الأَمرِ): خوێشــگەل بە هــەرەوەز کارەکەیانکــرد/ بــۆ ئەنجامدانی کارەکە کۆبوونەوەو پێکەوە ئەنجامیاندا.

(أَلمَــلأُ (ج) أَمــلاء): ١-کۆمەڵــی خوێشــگەل ٢-ڕاوێژو تەگبیرکردن.

«ماکان هــذا الأَمرُ عَن ملإِ مِنــا»: ئەم کارە دوور لە ڕاوێژو تەگبیرو کۆمەکی ئێمە نەبوو.

ملت: (مَلَتَ- هُ. مَلْتاً): بزواندنیو شلۆقیکرد.

ملث: (مَلَثَ-هُ. مَلْثاً): ١-دڵی بە بەڵێنێك خۆشکرد کە نەیویســت بەڵێنەکە بباتە سەر/ لاسیدا ٢-بە هێواشی لێیدا.

(-الظَّلامُ): تاریکداهات بەڵام زۆر تاریك نەبوو.

(-هُ بالشَّــرِّ): تووشــی وەزندیکرد/ توشــوی خراپەیکردو تێیئاڵاند.

(مالَــثَ-هُ مِلاثــاً ومُمالَثَةً): یــاری پێکردو هەڵیخەڵەتاند/ لەخشتەیبرد/ فێڵیلێکرد.

(مَلْثُ اللَّيل ومَلْثُهُ): سەرەتای تاریکیی شەو.

(أَلمَلَثَــةُ): ســەرەتای تارکیی ســەرلەئێواریو خۆرئاوابوون.

ملــج: ١-(مَلَجَ ومَلِــجَ- الصَبِيُّ أُمَّــهُ مَلْجاً): کۆرپەکە گۆی مەمکی دایکی بەســەری لێوی گرتو مژی/ ملچاندی.

(أَمْلَجَ-هُ): مەمکیدایە/ مەمکی پێدا.

(إِمْتَلَجَ مافي الثَدي): چی شیر لە مەمکەکەدا بوو مژی.

(أَلمُلُج): ١-کارۆژلەی شــیرەخۆر کە شــیردەخوات ٢-بەرخۆلەکان.

أَلمَليــج: شیرەخۆرە.

٢-(أَلمالِج (ج) مَوالِج) (فارسية): ماڵەی سواغدان.

(أَلمُلْج (ج) أَمْلاج): ناوکی بەری داری (موقل) داری دۆم.

(أَلمليــج): پیاوی مەزنو پایەدار.

(أَلأَمْلَج): ١-چۆڵەوانی کە ڕوومکی تێدا نەبێت ٢-دەرمانێکە کە بەری درەختێکە لە هندستان زۆرە (فارسيە).

(أَلأُملــوج (ج) أَماليج): ١-پەلی تەڕو ناســك. دەشــلێن ڕیشــەی درەختەکە بەژێــر گڵەوە دەکرێــت بــۆ ئــەوەی نەرمبێتــەوە ٢-(ن) درەختێکە لە بیاباندا هەیە ٣-گەڵایەکە وەکو گەڵای داری سەرروودایە.

ملــح: ١-(مَلَحَ- الطَّعامَ مَلْحــاً): خوێی کرده چێشتەکەوە.
(-الماشيَةَ): گڵو خوێی به ئاژەڵەکەدا.
(-الطائِرُ): مەلەکە باڵندەکە خێرا خێرا باڵی بەیەکدا دا.
(«مَلَــحَ اللهُ فيه»): خودا ژیانی خۆشــکردو فەرو بەرەکەتی خستە گوزەرانییەوە.
(مَلَحَ ومَلُحَ- الماءُ مُلوحَةً ومَلاحَةً ومُلوحاً): ئاوەکە سوێر بوو.
(ألماءُ مَليحٌ ومالِحٌ): ئاوەکە ســوێرە (ئەوەی دواوەیان کەمترە).
(مَلِحَ. مَلَحاً): زۆر شین.
(مَلَّحَ- الشيءَ): خوێی بە شتەکەدا کرد.
(-الطَّعــامَ): خوێی زۆر کردە چێشــتەکەوە سوێریکرد.
(-السَــمَكَ ونَحْــوَهُ): خوێی بە ماســیەکەوە کردو سووریکردەوە.
(- الدابَّةَ): خوێی لــە دەمو لێوی چوارپێکە هەڵسوو.
(-الماشِيَةً): خاكو خوێی بە ئاژەڵەکە دا.
(مالَــحَ-هُ مِلاحاً ومُمالَحَــةً): نانو نمەکیان پێکەوە خوارد.
(«هو يَحْفَظُ حُرمَــةَ المُمالَحَةَ»): ئەو نانو نمەکی لەبەرچاوە.
(مالَــحَ- فُلانــاً): پێکەوە شــیری دایکێکیان مژیو خوارد.

(أَمْلَحَ (- الماءُ): ئاوە شیرینەکە سوێر بوو.
(-الشيءُ): شتەکە زۆر شینبوو.
(-الطَعامَ): چێشتەکە سوێر بوو.
(-تِ الإبِلُ): حوشــترەکان چوونە ســەر ئاوە سوێرەکە.
(-الراعي الإبِلَ): (شوانەکە/ حوشترەوانەکە) ئاوی سوێری بە حوشترەکاندا.
(تَمَلَّــحَ- الرَجُــلُ): خوێی عەمــار کرد یان بازرگانیی بەخوێوە کرد.
(-البَعيرُ): حوشترەکە قەڵەو بوو.
(إمْلَحَّ- الكَبشُ): بەرانەکە سپیبوو.
(ألمِلْح (ج) مِلاح (ك): خوێ.
(مُلَيحَة): خوێیەکی بچووك/ وردە خوێ. خوێ تەنێکە بە گۆڕین هایدرۆجینی ترشۆکەکە بە کانزایەك وەك خوێی چێشــت کە چێشتی پێ خۆشدەکرێت پەیدادەبێت(دەکرێت بە مێو نێر) لەبەر سپێتیەکەیشیەتی کە وا ناونراوە.
(ألمِلْــح (ج) مِلْــح ومِلْحَة وَمِــلاح وأملاح): ١-قەڵەویــی ٢-بــەز/ چەوریی ٣-شــیرەخۆرە ٤-نمەكو پەیمانو پێزانین.
(«بَينَهُما مِلْحٌ»): نانو نمەك لە نێوانیاندا هەیە.
(«فلان مِلْحُهُ على رُكْبَتَيهِ»): فیســار نمەك بە حەرامە/ سپڵەو پێنەزانە. یان شەرانییە. دەیشــوترێت: («مِلحُهُ على ذَيلِهِ»): ســپڵەو پێنەزانە.
(ماءٌ مِلحٌ): ئاوی سوێر.

(ماءٌ مالِحٌ): ئاوی سوێر.
(أَلمَلح): ١-ڕەنگی خۆڵەمێشیی ٢-ڕەنگی کەوەیی ٣-شینێکی تێر ٤- سپیو ڕەشی تێکەڵ.
(أَلمُلحَة): ١-سپیو ڕەشی تێکەڵ ٢-شینێکی زۆر تێر ٣-پیتو فەڕ.
(أَلمِلحَةُ): سوێریی.
(بئرٌ مِلحَةٌ): ١-چاڵاوێکی سوێر ٢-بە ئابڕوویی‌و بەپەیمانیو بەنمەکیی.
(«بَينَهُما المِلحَة»): پەیمانو نانو نمەکیان لە نێواندایە.
(أَلمَلحَة): ١-جارێك سوێربوون ٢-قوڵاییو بەشی زۆری ئاوی دەریا.
(أَلمِلاح): ١-بایەك کە پاپۆڕی پێ بڕوات ٢-نووکی نێزە/ ڕم.
(أَلمَلاحَة): ١-سوێربوون سوێریی ٢-جوانییو خوێنگەرمی/ قەشەنگیی.
(أَلمِلاحَة): ١-دەریاوانیی/ کەشتیەوانیی/ پاپۆڕەوانیی ٢-هونەرو لێزانینی گوزارکردن لە دەریاو ڕوبارو ئاسماندا.
(مِلاحَةٌ نَهْرِيَة وملاحَةٌ جَوِيَة»): کەشتیەوانیی ناو ڕوبارو فڕۆکەوانی.
(أَلمَلاّح): ١-خوێفرۆش یان خوێدار ٢ پاپۆڕ لێخوڕ یان فڕۆکە لێخوڕ (لە وشەی (**مِلاح**)ەوە هاتووە کە بای پاپۆڕ پاڵ پێوەنەرە.
(أَلمَلاّح) (عند العامة): زوقم کە بە شەو دەبارێت.

(مَلاّحوالجَو): فڕۆکەوانەکان.
(أَلمُلاّح الواحِدَةُ مُلاّحَة) (ن): ڕووەکی خوویی، ڕووەکێکە لە شوێنێکی شۆرەکاتدا دەڕوێت لە ڕووەکە ترشەکانە.
(أَلمَلاّحَة): ١-کانەخوێ ٢-شوێنی خوێفرۆشتن.
(أَلمُلاّحيّ والمُلاحيّ): ١-جۆرە ترێیەکی سپیی بۆڵ درێژە ٢-جۆرە هەنجیرێکە.
(أَلمُلاّحِيَّة): پاپۆڕەوانیی/ فڕۆکەوانیی.
(أَلمُلوحَة): سوێریی.
(أَلمَليح- مِنَ الماء): ئاوی سوێر/ سوێراو.
(سَمَكٌ مَليحٌ): ماسیەکی سوێرکراوی سوورەوەکراو.
(أَبو مُلَيح) (ط): خواردنێکە لە نانو خەیارو پیازو مەعدەنووسو گەڵێك سەوزەیتر دروستدەکرێتو بەترشی سماق مزردەکرێتو ڕۆنە شلەی پێدا دەکرێتو تێکەڵدەکرێت خەڵکە ڕەشۆکەکە پێیدەڵێن: (فَتُوش).
(أَلأَمْلَح): ئاورنگ/ شەونم کە بە شەو دەکەوێتە سەر سەوزایی (لەبەر سپێتیی وا ناونراوە).
(أَلأَمْلَح (ج) مُلْح): ڕەنگ خۆڵەمێشیتر/ ڕەنگ کەوەییتر.
(کَبشٌ أَمْلَح): بەرانێکە ڕەشە سپی بە سەرەوەیە.
(أَلمَلْحاء (ج) مَلْحاوات): ١-مێی وشەی (أَمْلَح) ٢-کەتیبەیەکی/ دەستەیەکی گەورەی سوپا.
(أَلمَمْلَحَة): خوێکان/ کانی خوێ.

(اَلمَلَحَة): خوێدان.

(اَلتَمَلِّح): خوێدار یان خوێفرۆش.

٢-(مَلَحَ- الرَجُلَ. مَلْحاً): له پاشمله به خراپه ناویهێنا/ غەیبەتیکرد.

٢-(مَلُحَ. مَلاحَةً ومُلُوحَةً): جوانو خوێنگەرمو شێوه شیرینبوو.

(مَليحٌ ومُلاحٌ ومَلاَّحٌ): جوانو شێوه شیرین/ خوێنگەرمو دڵرووونکەرەوه/ قەشەنگ.

(مَلَّح وأمْلَحَ المُتَكَلِّمُ): قسەکەرەکە قسەخۆشو قسه بەتامبوو/ قسەنەستەقبوو/ قسەی خۆشیکرد.

(«فُلان يتظَرَّف ويَتَمَلَّح»): فیسار خۆی به قسه قوتو قسه خۆش پیشانداو نواند..

(إسْتَمْلَحَ-الشيءَ): شتەکەی جوانو ڕێکوپێک هاته بەرچاو یان لای وابوو.

(«ما أمْلَحَهُ وما أُمَيْلَحَهُ»): ئای که جوانو دیمەنشیرینه (بۆ سەرسورمانەو بەلاوه سەیربوونه).

(اَلمَلَح): هەواڵی سەیرو سەمەره.

(اَلمِلْح (ج) مِلَح ومِلَحَة ومِلاح وأمْلاح): ١-جوانییو شێوه شیرینیی ٢-زانست ٣-زانایان.

(اَلمُلْحَةُ): ١-شکۆییو سامداریی ٢-قسەیەکی خۆشو چێژدارو دڵگوشادکەر.

(اَلمُلَحَةُ): قسەی خۆشو دڵکەرەوەو بەتام.

(اَلمُلاح (ج) مُلاحُون): شێوه جوانو قەشەنگ.

(اَلمَلاحَة): جوانییو ناسکیی/ قەشەنگیی.

(رَجُلٌ مَلاَّحٌ (ج) مَلاَّحون): پیاوێکی قۆشمەو قسەخۆشو شێوه شیرین.

(اَلمَليح (م) مَليحَة (ج) مِلاح وأمْلاح): ١-قەشەنگو ناسکو شێوه شیرین/ جوان ٢-قۆشمەو قسەخۆش.

(اَلأمْلَح (ج) مُلْح): ١=جوانتر/ قەشەنگتر ٢-قسەخۆشتر/ قۆشمەتر.

(اَلأُمْلُوحَة مِنَ الكَلام): قسەی چاکو خۆشو قۆشمەو چێژدار/ سوێرو بەتام.

٤-(إمْتَلَحَ): ڕاستو درۆی تێکەڵکرد.

(إمْلاَّحَ- النَّخْلُ): فەریکه خورماکەی زەردو سوورهەڵگەرا.

٥-(اَلمِلاح): ١-چاکەت ٢-توورەکەی ئالیکی وڵاخ.

اَلمَلحاء (ج) مَلْحاوات): داری ڕووتەن که گەڵای پێوه نەمابێت/ گەڵاى هەڵوەریبێت.

ملخ: ١-(مَلَخَ- الشيءَ. مَلْخاً): شتەکەی به دان یان به چنگ گرتو ڕایکێشا.

(تَمَلَّخَ-الشيءَ): شتەکەی له شوێنی خۆی هەڵکەند/ دەرکێشا.

(إمْتَلَخَ- الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا/ هەڵکێشا.

(-يَدَهُ مِنَ القابِضِ عَلَيهِ): دەستی له دەستی ئەوه کردەوەو دەرهێنا که گرتبووی.

(-السَيفَ): شمشێرەکەی (گورج/ خێرا) هەڵکێشا.

(«مَرَّ بِرمحٍ مَركوزٍ فَامْتَلَخَهُ»): بەلای نێزەیەکی چەقیودا ڕابورد هەڵیکێشا.
(اَلمَليخ): بێهێز/ لاواز/ کز.
٢-(مَلَخَ- الفَرَسُ. مَلْخاً): چارەوێکە یاریکرد/ کەوتە هەڵبەزو دابەز.
(-في الباطِلِ): لە ناراستیدا گێرەیدەکرد/ هەر خەریکی کاری ناڕەوابیبوو.
(مالَخَ-هُ مِلاخاً ومُمالَخَةً): لەگەڵیدا هەر خەریکی بازیی‌و لاسدان‌و مەرایبیبوو.
(اَلمَلاّخ): مەرایبیکەر/ ماستاوکەر/ ڕووپاما/ کلکەسووتەکەر.
٣-(مَلُخَ- الطعامُ. مَلْخاً ومَلُخ. مَلاخَةً): (چێشتەکە/ خواردنەکە) ترشاو خراپبوو.
(تَمَلَّخَ- الشيءُ): شتەکە گەنبوو/ خراپبوو.
(اَلمَليخ): ١-خواردن یان شتێری گەنبوو/ خراپبوو/ ترشاو ٢-خواردنی بێتام/ ناخۆش.
(مُمْتَلَخُ العَقلِ): مێشك تێکچوو.
٤-(مَلَخَ- الرَّجُلُ. مَلْخاً): ١-پێیهەڵگرت‌و خێرا ڕۆیشت/ تیژ هەنگاوینا/ ڕایکرد ٢-هەڵات.
(عَبدٌ مَلاّخٌ): بەندەیەکە/ کۆیلەیەکە زوو زوو لە خاوەنەکەی هەڵبێت‌و ڕابکات.
٥-(اَلمُلوخِيَّةُ) (ن): تۆڵەکە جووڵەکانە. ڕووەکێکی ساڵانەیە لە بنەڕەتدا هی هندستانە بەرێکی لاکێشەیی‌و گوڵێکی وردی زەردی هەیە گەڵاکەی بە چێشت دەکرێت لە سپێناخ دەچێت کە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستداو بە تایبەتی لە میسردا زۆر بەکاردێت لە وڵاتە گەرمەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دەچێنرێت جۆرێکی لە هندستان هەیە کە توێکڵەکەی بادەدەن‌و دەرێسن پێیدەڵێن (جووتە): گوش.
ملد (مَلَدَ- الشيءَ. مَلْداً): شتەکەی (درێژکردەوە/ ڕاکێشا).
(مَلِدَ- الغُصْنُ. مَلَداً): پەلی درەختەکە نەرمبوو لەرییەوە.
(مَلَّدَ- الأَديمَ): پێستەکەی نەرمکرد.
(-الرَّيُّ الغُصْنَ): ئاودانەکە (لقەکە/ چڵەکە)ی نەرم‌و تەڕو تازە کردەوە.
(اَلمَلَد (ج) أَملاد): ١-گەنجێتیی ٢-نەرمیی‌و تەڕوتازەیی‌و لەرینەوە ٣-تێرو تەسەلی‌و خۆشیی.
(اَلمَلَدان): ناسکیی لق‌و لەرینەوەی.
(اَلمَلْد والأَمْلَد والأُمْلُد والأُمْلُود والإِمْليد والأُمْلُدان والأُمْلُدانِيُّ): ١-ناسکیی‌و تەڕیی چڵی درەخت‌و لەرینەوەی ٢-خەڵکانێکی نەرم‌و نۆڵ‌و ناسك.
(شابٌ أُمْلُود وشَبَّانٌ أَماليد): گەنجێکی نەرم‌و شل‌و ناسك. لاوانێکی نەرم‌و ناسك.
(اَلمَلداء (ج) مُلْد): مێی وشەی (الأَمْلَد)
(أُمْلُود وأُمْلُودَة وأُمْلُدانِيَّة): ژنێکی ناسکی نەرم‌و نۆڵ.
ملذ: ١-(مَلَذَ- فُلاناً مَلْذاً): نێزەی بە فیساردا کرد.

(-الفَــرَسُ): چارەوێکــە هــەردوو دەســتی هاویشتو غاریکرد/ توند دایە غار.

٢-(مَلَذَ- الرَجُلَ. مَلْذاً): پیاوەکە درۆیکرد.

(-الرَجُــلَ. مَلْذاً ومَلاذَةً): بە قســەی خۆش پیاوەکەی لاســداو فاێلیکرد بــە کردەومیش هیچی بۆ نەکرد.

(مَلِذَ-الظَـلامُ مَلَذاً): تاریــك داهات، واتە نە تاریكو نە رووناك بوو.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە دۆستایەتیەکەی ساختە بوو ئەوەی دەریدەبڕی لەگەڵ هی دەروونیدا جیابوو.

(ألأمْلَذ والمَلَذان والمَلَذانــي والمَلاذَنيُّ والمَلاذ والمِلْوَذ): کەســێکە کە لە دۆســتایەتیەکەیدا ڕاست ناکات/ ساختەبازە.

ملز: ١-(مَلَزَ مَلْزاً): دواکەوت.

(إمَّلَزَ- عَنهُ): لێی دواکەوت.

٢-(مَلَزَ- بالشيءِ. مَلْزاً): شتەکەیبرد.

(مَلَّزَ-هُ عَنهُ): لێیرزگار کرد.

(-الشيءُ عَني): شتەکەم لەدەست دەرچوو.

(أمْلَــزَ وامْتَلَــزَ-هُ): ١-لــە چنگــی دەرهێناو فراندی ٢-بردی.

(تَمَلَّــزَ-هُ): ١-لە چنگــی دەرهێنــاو فراندی ٢-بردی.

(-مِنهُ): لێیرزگار بوو.

(إنْمَلَــزَ وامَّلَــزَ- مِنهُ): لەدەســتی بەربوو/ دەرپەڕیو ڕزگاریبوو.

(ألَمِلِز- مِنَ الرجال): پیاوی بازوو ئەستوور.

(ألَمــلاَّز): ١-کەســێکە شــت زۆر بفرێنێــت ٢-(ح) گورگ.

ملس: ١-(مَلَسَ- الشــيءَ): شتەکەی لە بنو بێخ دەرهێناو هەڵیکەند.

(-الرَجُلَ بِلِسانِهِ): بە زمانی لووس پیاوەکەی لاسداو خۆی لای بردە پێشەوەو مەراییکرد.

(-الإبلَ): حوشترەکانی توند ڕادا/ لێخوڕی.

(مَلِسَ ومَلُسَ. مَلُوسَــةً ومَلاسَةً): سافبوو/ لووسبوو.

(أملَس): ساف/ لووس.

مَلَّسَ-هُ مِنَ الأمرِ): لــە کارەکە دەریپەڕاند/ دەریکرد.

(-الشــيءَ): شــتەکەی لووســکرد/ شتەکەی سافکرد.

(-الأرضَ): زەویەکەی تەختکرد.

(أمْلَــسَ-تِ الشــاةُ): مەرەکــە خورییەکەی هەڵوەری/ لێبووەوە.

(تَمَلَّسَ): لووسبوو.

(-مِــن بَــينِ القَومِ): لــە نێوان خوێشــگەل دەرچوو.

(-مِــنَ الشَّــرابِ): لە مەســتیی شــەرابەکە دەرچوو/ بەریدا.

(-مِــنَ الأمــرِ): لــە کارەکــە دەرپــەڕیو ڕزگاریبوو.

(إمْلأَسَ): لووسبوو/ سافبوو.

(-مِنَ الأمرِ): لە کارەکــە ڕزگاریبوو و فوتار بوو.
(أَلَلَــس (ج) مُلُــوس وأَمْــلاس و (جــج) أَمالیس): شوێنی تەختو لووس.
(أَلَلْســى): مێحوشــتری زۆر خێرا (چونکە وا گورج دەڕوات هیچ شتێك ڕێگەی پێناگرێت).
(«بایَعَهُ المَلَسى»): پێیفرۆشت بە یەکجارەکی بێگەرانەوەو مەرج.
(أَلمَلاَّسَــة والمِمْلَسَــة): زەوی تەختکــەر (تەختەیەکە زەویی پێ تەختدەکرێت).
(أَلأَمْلَس (م) مَلساء): لووس/ ساف.
(أَلمَلْساء): شەراب یان مەیەك کە خواردنەوەی بە گەروو خۆشبێت.
(أَلأَلِفُ المَلْســاء): نەلفی نەرم وەك هی وشەی (کِتاب).
(سَنَةٌ مَلْساء (ج) أَمالیس وأَمالیس): ساڵێکی وشكو بێگیاو بەرهەم/ وشکە ساڵ.
(أَلمَلِیس): لووس/ ساف.
(ألإمْلیس والإمْلیسة (ج) أَمالیس وأَمالیس) (شاذ): بیابانێکی وشکوبرنگ نە ئاو نە گیای تێدا نەبێت.
٢-(مَلَــسَ وأَمْلَسَ- الظَلامُ مَلْســاً): تاریكو ڕوون تێکەڵاوبوون/ تاریك داهات.
(مَلَــسُ الظَّــلامِ): تاریکداهاتــن (لــە نێوان خۆرئاواو تاریکداهاتندایە).
(«جاءَني مَلَسَ الظَّلامِ»): کاتێك هات بۆ لام تاریکداهاتبوو.
(أَلمُلَیســاء): ١-دەمــی نێــوان خۆرئاوابوونو تاریکی شەو ٢-نیوەڕۆ/ نیوەی ڕۆژ.
ملــش: (مَلَشَ- الشَــيءَ مَلْشــاً): شــتەکەی بەدەست پشکنی وەکو بۆ شتێك بگەڕێ.
(-الرِیــشَ) (عامیة ســریانیة): پەڕەکەی (هەڵکەند/ هەڵکێشا).
(أَلمالُــوش (ج) مَوالیش) (ح) (عامیة): مڵە: کرمێکــە بنی ڕووەك دەقرتێنێتو ڕووەکەکە دەمرێت.
ملص: (مَلَصَ- بِسَــلْحِهِ مَلْصــاً): ڕیقنەکەی فڕێداو هەڵدا.
(مَلِصَ- الشــيءُ مِن یَدِهِ مَلَصاً): شتەکەی لە بەر لووسی لەدەست خزا.
(«مَلَصَتِ السَــمَکَةُ مِن یَدي»): ماســیەیکە لەدەستم خزاو فرتەیکرد.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە دەرپەڕیو هەڵات.
(أَمْلَــصَ-تِ الحامِلُ): ســکپڕەکە منداڵەکەی لەبارچوو.
(مُمْلِص (ج) مَمالِص): ژنی منداڵ لەبارچوو.
(أَمْلَصَ- الشيءَ): شتەکەی خزاند/ خلیسکاند.
(تَمَلَّــصَ وانمَلَــصَ وامَّلَــصَ- مِنــهُ): لێی دەربازبوو/ لێی ڕزگاربوو.
(-الشيءُ مِن یَدي): شتەکەم لەدەست ترازا/ خزا.
(أَلَلْص): ڕووت.

(أَمَلَّـص) (مـص): ١-خز/ لـووس ٢-خزان/ دەربازبوون.
(أَمَلِّص- مِـنَ الحِبـال ونَحْوَهـا): (پەت/ گوریس)ی لووس و خز کە لەبەر لووسـی بە دەستەوە بەند نابێت و ناگیرێت.
(سَـمَكَةٌ مَلِصَة): ماسـییەکی خز/ لووس کە زوو لەدەست دەترازێت/ دەردەفرتێت.
(أَمَليـص= المَلِـص): ١-لـووس ٢-منداڵـی لەبارچوو.
(الأَمْلَص): تەڕی نەرم.
(رَجُلٌ أَمْلَصُ الرأسِ): پیاوی سەرلووس سەر رووتاوە.
(أَلمِلاص): ژنێکە کە هەر منداڵی لەباردەچێت.
(أَلمُمْلَص): کۆرپەلەی لەبارچوو.
ملط: ١-(مَلَـطَ- الحائَط مَلْطاً): دیوارەکەی بە قوڕ سواغدا.
(-الشَعَرَ): قژەکەی تاشی.
(-تِ الحامِلُ جَنينَها): سکپڕەکە کۆرپەلەکەی بە ناکامیی فڕێداو لەباریچوو.
(مَلَط ومَلُطَ- الغُلامُ. مُلوطاً): مێردمنداڵەکە ڕەسەن و باوکی نەدەزانرا/ نارەسەنبوو.
(مَلِـطَ. مَلَطاً ومُلْطَةً+ أَمْلَط): کۆسـتە بوو لەشی مووی پێوە نەبوو.
(مَلَّطَ- الحائَط): دیوارەکەی بە قوڕ سواغدا.
(مالَطَ-هُ مُمالَطَةً): تێکەڵیکرد.
(أَمْلَـطَ-تِ الحامِـلُ جَنينَهـا): سـکپڕەکە کورپەلەکەی (فڕێدا/ لەبارچوو).
(-ريشُ السَّهْم): پەڕی تیرەکە کەوت.
(-الرَجُلُ): پیاوەکە سـوختبوو/ نەدارا بوو/ هەژار بوو.
(تَمَلَّطَ- الشيءُ): شتەکە لووسبوو/ سافبوو.
(-السَّهْمُ): تیرەکە بێپەڕ بوو.
(إمْتَلَطَ-الشيءَ): شتەکەی بە دزییەوە برد.
(أَلمِلْط (ج) أَمـلاط ومُلُوط): ١-پیاوی ناپاك کە متمانەی هیچی پێناکرێت ٢-نارەسـەن کە نازانرێت باوکەکەی کێیەو چ ڕەسەنێکە.
(أَلمِـلاط (ج) مُلُـط): قـوڕ کـە سـواغی پێدەدرێت.
(الأَمْلَط (ج) مُلْط): کەسێکە لەشی (بێتووك/ کۆستە) بێت.
سَهْمٌ أَمْلَطُ: تیرێکی بێپەڕ.
(أَلمَليط): ١-کەسـێکە کە لەشـی لووس و بێ تـووك بێـت ٢-کورپەلـە کە هێشـتا تووکی لێنەڕوابێت.
(سَهْمٌ مَليطٌ): تیرێکی بێپەڕ.
(أَلمِلاط- مِنَ النوقِ): مێحوشـترێك کە هەر بەراویتە بێت.
٢-(مَلَّطَ- الشاعِرُ): هۆزانڤانەکە/ شاعیرەکە نیـوە دێڕە شـیعرێکی دانـاو یەکێکیتر بۆی تەواوکرد.
ملـع: ١-(مَلَـعَ- الشـاةَ مَلْعـاً): مەڕەکـەی کەوڵکرد.

(مَلَـع- الشَـيءَ) (عاميـة): شـتەکەی (دوولەتکرد/ هەڵدری/ پەکاڵاکردەوە).
(-الفَصيـلُ أُمَّـهُ):گوێرەکەکـە یان بەچکە حوشترەکە دایکەکەی مژی.
(أَمْلَـعَ وانْمَلَـعَ-تِ الناقَـةُ):مێحوشـترەکە خێرایکردو چابوکانە ڕۆیشت.
(إمْتَلَعَ- الشاةَ):مەرەکەی کەوڵکرد.
(-الشيءَ):شتەکەی بە دزییەوە برد.
(-تِ الناقَةُ):خێرایکردو سووکەڵە بوو.
(أَلْمَلْع) (مص)٢-کەوڵکردنی ئاژەڵی سەربڕراو ٢-گـورجو سـووکەڵە بـوو لـە ڕۆیشـتندا ٣-گەلەکۆمەکێ.
(هُـم عَلَيه مَلْـعٌ واحِدٌ):هەمـوو پێکەوەوە دوژمنانە گەلەکۆمەکێیان لێکرد.
(أَلمَلاع):بیابانی بێرووەك و گیا.
(جَمَلٌ مَلوعٌ (م) مَلوع):١ حوشتری چابوك/ خێرا.
(عُقابٌ مَلوعٌ):هەڵۆیەکی گورجرفێن.
(أَلمَليـع):بیابانێکی بێگیـا (بۆیە وا ناونراوە چونکە حوشتر تیایدا باش غاردەکات).
(أَلمَليع (ج) مُلُع):مێحوشترو چارەوێی گورج/ خێرا.
(أَلميلَع)٢-جرتو فرتکەر بەملاولادا ڕۆیشتوو ٢-مێحوشترو چارەوێی خێرا/ گورج.
٢-(أَلمَيْلَع):درێژ.
ملغ: (مالَـغَ-هُ ممالَغَةً):گاڵتەی ناشـیرینو بێشەرمانەی لەگەڵدا کرد.
(تَمَلَّـغَ- فِي كَلامِـهِ):قسـەی گەوجانـەو بێشەرمانەیکرد.
(تَمالَغَ- بِهِ):قسـەی سووکی پێوتو گاڵتەی پێکرد.
(أَلمِلغ (ج) أَمْلاغ والمالِغ (ج) مُلاَّغ والأَمْلَغ (م) مَلْغاء (ج) مُلْغ):گەوجی بێهەستو شەرم کە قسەی ناشیرینو قۆڕو بێحورمەتانە بکات.
(أَلْمُلُوغَـةُ): بێئابڕوویـیو بێڕەوشـتیی/ بێناموسیی و گەوجیی لە قسەکردندا.
ملـق: ١-(مَلَـقَ- الشـيءَ مَلْقاً):شـتەکەی نەرمکرد.
(-الشـيءَ):شـتەکەی (لەناوبرد/ فەوتاند/ سڕییەوە).
(-الثوبَ):جلەکەی شت.
(-الوَلَدُ أُمَّهُ):منداڵەکە دایکەکەی مژی.
(مَلِقَ- الخاتَمُ فِي الأُصْبُعِ مَلَقاً)ئەموستیلەکە لەبەر گەورەیی لە پەنجەدا شلبوو.
(-هُ ومَلِـقَ لَهُ ومالَقَهُ):خۆیی بە دەم لێبردە پێشـەوەو مەراییکرد سەرشـۆڕانە زمانی بۆ گێڕاو ئەوەی دەیوت لە دڵیدا نەبوو.
(مَلَّقَ- الأَرضَ أَو الحائِطَ):زەویەکەی قورداو هیلەسـاویکرد یـانماڵەیکـرد/ دیوارەکەی قورداو ماڵەیکردو سافو لووسیکرد.
(أَمْلَقَ):هەر داراییەکـی هەبوو لەناویبرد تا خۆی هەژار کرد.

(-الدَّهْـرُ مالَـهُ): رۆژگار هەمــوو داراکەی لەدەستداو هەژاریخست.

(-الثوبَ): بەرگەکەیشت.

(-منهُ): لەدەستی دەرچوو.

(تَمَلَّـقَ- الرَجلَ ولِلرَّجُـلِ. تَمَلُّقاً وتِمْلاقاً): مەرایی بۆ پیاوەکە کرد/ کوزکەشـی بۆ کرد/ ڕیایی بۆ کرد.

(مَلِقَ-هُ): مەرایی بۆ کرد.

(-تِ المَـرأةُ العِلْـكَ بِفيها): ژنەکە بنێشـتی جوو.

(إمْتَلَقَ-الشيءَ): شتەکەی دەرهێنا.

(إنْمَلَقَ): ١-لووسبوو/ سافبوو ٢-تەختبوو.

(-منهُ): لێیدەربازبوو/ بەرەلا بوو/ دەرپەڕی/ خۆی لێ ڕاپسکاند.

(-الخِضـابُ): بۆیەکە/ ڕەنگەکە چووەوەو سـپی بووەوە.

(إسْـتَمْلَقَ- الوَلَدُ أُمَّهُ): منداڵەکە دایکەکەی مژی.

(إمَّلَقَ): سافو لووسبوو.

(-منهُ): فرتەی لەدەستکرد/ دەرپەڕی.

(ألمَـالِـق):١- المـمْـلَـق (فـارسـيـة) مـاڵە ٢ تەختەیەکە دوو ولاخ ڕایدەکێشێت تا زەوی پێ تەختبکرێت.

(ألمَلَـق) (مـص): ١-مەرایی ٢-دۆسـتایەتیو خۆشەویسـتیی ٣-میهرەبانیـی زۆر ٤-نـزاو پاڕانەوە ٥ زەویی تەخت.

(ألمَلِق): لاواز/ بێتوانا/ کز.

(ألمَلِق والمَلاَّق): زۆر مەراییکەر/ ماستاوکەر/ ڕیاییکەر.

(ألمَلَقَةُ): بەردی هیلەساو/ بەردی لووس.

(ألمِمْلاق): ١-زۆر هەژار/ نابووت/ نەدارا/ زۆر نەبوو ٢-زۆر (مەراییکەر/ ڕیاکار).

(ألمَمْلَـق والمِمْلَقَـة): تەختەیەکـی پانــە گا ڕایدەکێشێتو زەویەکەی پێ تەختدەکرێت.

٢-(مَلَـقَ- الرَجُـلُ. مَلْقـاً): پیاوەکە خێراو توند ڕۆیشت.

(ألمَلَق): غارو تاوی زۆر خێراو خۆش.

(«لهذا الفَـرَسُ مَلَقٌ»): ئەم چارەوێیە غاری خۆش توندو خێرای هەیە.

(فَـرَسٌ مَلِـقٌ (م) مَلِقَةٌ): ١-ئەسـپێکە یان ماینێکـە خێرایـەو سەرکێشـە متمانــەی پێناکرێت ٢-تیژڕەو.

(ألمَليق): گورج/خێرا/ بەتاو.

(«رَجُلٌ أو فَرَسٌ مَليقٌ»): پیاوێکی زۆر خێرا یان چارەوێیەکی بەتاوو خێرا.

٣-(مَلَقَ ومَلَّقَ-هُ بالعَصا مَلْقاً): بەدار لێیدا.

ملـك: ١-(مَلَكَ- الشـيءَ مَلْكاً ومُلْـكاً ومِلكاً ومَلَكَةً ومَمْلَكَةً ومَمْلُكَةً): شتەکەیکرد بە هی خۆی/ بوو بە خاوەنی شـتەکە/ خاوەنداریی شتەکەیکرد.

(-علىالقَوم): بووبەسەرۆكوفەرمانڕەوایان/ دەستی بەسەردا گرتن.

(-على فلانٍ أَمْرَهُ): دەستی بەسەر کاروباری فیساردا گرت.
(-نَفْسَهُ): خۆیگرت/ بەسەر خۆیدا زاڵبوو.
(-المَرأة): ژنەکەی مارە کردو بوو بە خاوەنی.
(-العجــينَ مَلْكاً): هەویرەکەی تەواو شـێلاو خۆشیکرد تا یەکیگرت.
(مَلَّكَ-هُ الشيءَ): ئەویکرد بە خاوەنی شتەکە.
(-العَجــينَ): تــەواو هەویرەکــەی شـێلاو خۆشیکرد.
(-القَومُ فُلاناً عَلَيهم): میللەتەکە فیســاریان کرد بە شای خۆیان.
(-هُ امرَأَةً): ژنێکی لێ مارە کرد.
(-فُلاناً أَمْرَهُ): فیســاری لە کاروباری خۆیدا ئازاد کــردو کاروبارەکەی دایە دەســت ئەوو لێیگەڕا.
(مُلِّكَ-تِ المَرأَةُ أَمْرَها): دەســتبەردانی ژنە/ تەڵاقدانی ژنەکە درایە دەست خۆی.
(أَمْلَكَ-هُ الشــيءَ): شــتەکەیکرد بە هی ئەو/ ئەویکرد بە خاوەنی شتەکە.
(-القَومُ فُلاناً عَلَيهم): خوێشگەل/ خەڵکەکە فیساریان کرد بە شای خۆیان.
(-فُلانــاً أَمْــرَهُ): فیســاری ڕەهــا کــردو لە کاروباریدا ئازادیکرد/ سەربەستیکرد.
(-هُ المَرأَةَ): ژنەکەی لێ مارە کرد.
(تَمَلك-الشيءَ): بوو بە خاوەنی شتەکە.
(-على القَوم): بوو بە شای میللەتەکە.

(تَمالَــكَ عَن كَــذا): خۆی لە شــتەکە کەنار گرتو خۆی لێ دوور گرت/ وازی لەوە هێنا.
(«ماتَمالَكَ أن فَعَــلَ أَو عَن أَن فَعَلَ ذلك»): خــۆی بۆ نەگــیراو ئەو کارەی هــەر کرد/ لە کردنی ئــەو کارە خۆی بــۆ جڵەوگیر نەکراو کردی.
(إمْتَلَكَ- الشــيءَ): بوو بە خاوەنی ئەو شتە/ ئەو شتە بوو بە هی ئەو.
(اَلمالِك) (فا): خاوەن/ ماڵخۆ.
(ج) (مُلَّك ومُلاّك): خاوەن ماڵ/ خێو.
اَلمَلْك (مص): بە خاوەنبوون.
(ج) (مُلُوك وأَملاك): خێو/ خاوەن موڵك.
(اَلمُلْــك (ج) أَمــلاك ومُلُوك): ١-ئــەوەی کە مرۆڤ دەیبێــتو هەڵیدەســووڕێنێت/ دارا/ ســامان/ موڵكو ماڵ ٢-مەزنییو دەســەڵات/ فەرمانڕەوایی/ پاشایی ٣-کەمەکە ئاوێك.
(اَلمِلْك) (مص): خاوەنداریێتیی.
(«مالَهُ مِلكٌ»): خاوەنی هیچ شــتێك نییە/ هیچ شتێکی نییە کە خاوەنداریێتیی بکات.
(«هــذا مِلك يَميني»): ئەمــە هی منەو من خاوەنیمو هەڵیدەسووڕێنم.
(«لَيسَ لَهُ مِلكٌ»): ئاوی نییە.
(«أَعطاني مِن مِلكِــهِ»): لەوەی کە هەیەتی ئەوەندەی دامێ کە لە توانایدا بوو.
(«طال مِلكُــهُ»): کۆیلەیەتیەکــەی درێژەی کێشا.

(مِلكُ الطَّرِيق»): ناوەڕاستی ڕێگا یان ئەوسەری ڕێگا (لە هەموو ئەوانەدا (میم)ەکە دەشێت (سەر) یان (بۆر) یان (ژێر)ی ببێت.

(مُلُكُ الدابَّة: الواحِد) (مِلاك): پێی چوارپێ/ ولاخو جلەوەکەی/ ڕابەرەکەی.

(مِـلاك): پێیەکی چوارپێو جلەوەکەی/ ڕابەرەکەی.

(«مالَـهُ مُلُـكٌ»): هیچ شتێکی نییە کە خاوەنیبێت.

(اَلَمَلَكْ): ١-فریشتەیەکی ئاسمان/ مەلایکەتێک ٢-ئەوەی کە مرۆڤ هەیبێت.

(«مالَـهُ مَلَكٌ»): خاوەنی هیچ شتێک نییە وتراوە: (الماءُ مَلَكُ أَمـر): ئاو کارسازێنە (چونکە ئەگەر خوێشگەڵ ئاویان پێبێتو هەیبێت هەموو کارێکیان بۆ دەچێتە سەر.

(اَلَمِلك (ج) مُلوك وأَملاك): ١-خودای مەزنو بەرزو باڵا ٢-خێوی موڵک/ خاوەنی موڵک ٣-سەردارو خاوەن دەسەڵات بەسەر (خێڵێکەوە/ هۆزێکەوە یان وڵاتێکەوە یان میللەتو نەتەوەیەکەوە).

(اَلَملاك): تواناو دەسەڵاتو ڕاگر.

(مَلاكُ الأَمر): دەسەڵاتو تواناو ڕاگری کارەکە.

(اَلقَلبُ مَلاكُ الجَسَد): دڵ تواناو ڕاگری لەشە.

(المـلاك (ج) مَلائِكَة ومَلائِك): فریشتەی ئاسمان (وشەکە سوککراوەی (مَلأَك)ە.

(اَلِملاك): قوڕ ٢-(في اصطـلاح الحكومات): زاراوەیەکە کە میری دایناوە بەو کۆمەڵە کارمەندانە دەڵێن کە کاروباری میریی لە بەشێکدا دەبەن بەڕێوەو پایەی خۆیان هەیەو تیادا دامەزراون.

(«أُدْخِـلَ فُلانٌ في ملاك الجَيش أَو في الملاك الحكومي»): فیسار لەسەر میلاکی سوپا ناونوسکرا/ دامەزرا یان لەسەر میلاکی میریی ناوزەد کرا/ نوسرا/ دامەزرا.

(مِلاكُ الأَمر): ڕاگری کار/ پێکهاتەی کار.

(اَلمَلْكَةُ والمُلْكَـةُ): ١-موڵک/ خۆیی/ ئەوەی کە ئەبیت بە خاوەنی.

(اَلمَلَكَـةُ= المُلْكُ): موڵک/ خۆیی/ ئەوەی کە ئەبیت بە خاوەنی.

(«هو مَلَكَـةُ يَميني»): مـنماڵخۆی ئەوم/ خاوەنی ئەومو دەسەڵاتم بەسەریدا هەیە ٢-بەهرە نیشانەیەکە لە دەروونیدا چەسپیوە.

(«عند فلان مَلَكَةُ النَّقد»): فیسار بەهرەی ڕەخنەی هەیە.

(مَلِكَةُ النَّحل): شاهەنگ.

(اَلمَلاكَة والمِلاكَة والمُلوكَة): موڵک.

(اَلمَلَكوت): ١-موڵکی مەزن ٢-نگینو دەسەڵات.

(اَلمَلَكوت السَّماويّ) (سريانية): شوێنی پیاوە پیرۆزەکانە لە ئاسماندا.

(اَلمَلَكِيُّ (م) مَلَكِيَّة): شاهانە.

(اَلمَلَكِيّون): ئەوانەی سەر بە شان/ لایەنگرانی شان.

(أَلَمِيك (ج) مُلَكاء): خاوەن موڵك/ ماڵخۆ.
(ألأُملوك= المُلوك): شاکان/ پاشاکان.
(أَلمَمْلَكَـة والمَمْلُكَـة (ج) مَمالِـك): ١ـنگینو دەسەڵاتی شـاو کۆیلەکانی ٢ـئەوەی کە لەژێر دەسەڵاتی شادایە کە وڵاتو دانیشتوانی وڵاتو چەكو جبەخانەیە.
(أَلمَمْلُوك) (مفع) (ج) مَماليك): کۆیلە/ بەندە.
(ممالیـك مصـر): کۆمەڵێـك کۆیلەبوونو تورکبـوونو شەرکەسـیبوونو مەغۆلبـوون ئەیوبیـەکان لە سـەربازیو سـوپادا کاریان پێکـردن هەندێکیـان گەیشـتنە وەرگرتنی دەسـەڵات لـە میسـرداو ماوەیەك میسـرو سـوریەو بەشـێك لـە ئاسـیای بچووکیـان بەڕێوەبرد بەرەنگاری سـەلیبیەکانو مەغۆل بوونو عوسمانیەکان لەناویانبردن.
٢-(أَلمُلْك =حَـبُّ الجُلبـان): پۆلکە خاتوونە گیایەکە بەرەکەی لە ماش دەچێت.
(أَبو مالِك): ١ـبرسـێتیی یان پیریی ٢-(ح)= (مالك الحَزين): شـینە شـاهۆ (باڵندەیەکە دەچێتە ناوەوە).
(أَلمَلِيكة): ١ـرۆژنامە ٢ـپەرە کاغەز.
(الأُمْلُوك) (ح): جۆرە مارمێلکەیەکە کە لەناو لمدا دەبێتو دەژی.
الملحق:
ملك: أَلمِلْكِيَّة: المِلك والتَّمليك): بە خاوەنبوون/ خاوەنداریی.

(«بِيَدي صَـكُّ مِلْكِيَّة هذه الأَرض»): تاپۆی خاوەنداریی ئەم زەویەم بەدەستەوەیە.
(أَلمِلْكِيَّة): مافی بەکارهێنانو هەڵسـووڕاندنی تـەواو تایبەتیـی ئـەو موڵکەیـە لـە لایەن خاوەنەکەیەوە.
(نَزعُ المُلْكِيَّة): لێسەندنەوەی ماف بە خاوەنبوونی/ خاوەندارێتیی/ داماڵینی خاوەندارێتی.
(نَقـلُ المُلْكِيَّة): گوێزانـەوەی خاوەندارێتیی موڵکێك لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر.
(تَقسـيم المُلْكِيَّة): بەشـکردنی خاوەنداریی موڵکێك.
(مُلكِيَّة خاصَّة): خاوەندارێتیی تایبەتی.
(أَلتَمَلُّك): دەسـت بەسـەردا گرتنی شتێكو کردنی بـە هی خۆ (بـە زۆریی بە نـارەوا) زەوتکردنی ئەو شتە/ دەستبەسەرداگرتنی.
(«تَمَلُّـك مالَ الغَـير»): داگیرکردنی شـتی خەڵكو زەوتکردنی.
(إكتِسـاب المُلْكِيَة شرعاً): بەڕەواو یاسایی بە خاوەنبوون/ بەدەسـتهێنانی خاوەندارێتی لە ڕووی یاساوە.
(«تَمَلُّك عَقار»): بە خاوەنبوونی خانووبەرەو زەویو زار.
(«قانون تَمَلُّك الأجانب»): یاسای خاوەندارێتی بێگانەکان.

---

ملن: (أَلمَنْخُوليا) (يونانية) (السَـوداوِيَّة): ماخۆلان= ماخۆلیا (دەردێکە شێرزەیی مێشکە

له داخو ناسۆرەوە/ خەفتەوە پەیدا دەبێت.
ملو: ١-(مَلا-البَعيرُ يَمْلُو. مَلْواً): حوشترەکە توند رۆیشتو دایە غار.
(مَلَّى-هُ اللهُ عَمرَهُ): خودا تەمەنی درێژ کردو خۆشیی بەوە دایە/ پێدا.
(-هُ اللهُ حبيبَهُ): خودا تەمەنێکی درێژو خۆشی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دایەو بەسەربرد.
(يُقالُ لِمَن لَبِسَ الجَديدَ) («أَبْلَيتَ جديداً و تَمَلَّيتَ حَبيباً»): بە یەکێك کە بەرگێکی تازە لەبەرکات دەڵێن: بەرگی تازە کۆن بکەیتو تا سەر بە خۆشی لەگەڵ خۆشەویستەکەت بیت.
(مُلِّيَ وتَمَلَّى- عُمْرَهُ): تەمەنی درێژ بووو بە خۆشی بردیە سەر.
(-حَبيبَهُ): ماوەیەکی درێژ بە خۆشیی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا رایبوارد.
(أَملى- اللهُ فُلاناً عُمْرَهُ. إملاءً): خودا تەمەنی درێژی بە فیسار داو خۆشیشی تێدا دایە.
(-البَعيرَ ولِلبَعيرِ): پەتەکەی بۆ حوشترەکە شلکردو بەری بۆ بەرەڵا کرد.
(-اللهُ الظالِمَ ولَهُ): خودا (مۆڵەتی بە زۆردار دا/ ماوەی بەزۆردار دا).
(-لَهُ في غَيِّهِ): ماوەی گومراییو ستەمو یاخیبوونی درێژەپێدا.
(-عَلَيهِ الزَمَنُ): رۆژگاری ئەو درێژەی کێشا.

(اَلمَلا (ج) أَملاء): ١-بیابان/ چۆڵەوانییەکی پانو بەرین/ دەشتێکی کاکی بەکاکی ٢-رۆژگارێکی دوورو درێژ.
(اَلمَلاة (ج) مَلاً): بیابانێکی گەرم/ تاوسێن.
(اَلمَلاوَة والمِلاوَة والمُلاوَة والمَلْوَة والمِلْوَة والمُلْوَة): سەردەمێکی رۆژگار.
(اَلمَلَوان الواحِدُ مَلاً): شەوو رۆژ.
(اَلمَلِيّ): ١-ماوەی ژیان ٢-سەردەمێکی دوورو درێژ.
(إنْتَظَرْتُهُ مَلِيّاً): ماوەیەکی زۆر چاوەڕێمکرد.
(«مَرَّ مَلِيٌّ مِنَ اللَّيلِ»): بەشێکی درێژی شەو تێپەری یان سێیەکی شەو تێپەری.
(اَلإمْلاء (مص) (ج) أَمالٍ وأَمالِيّ): ماوەدانو دواخستن.
٢-(أَمْلى- عَلَيهِ الكِتابَ): ١-کتێبەکەی/ نامەکەی پێنووسیەوە/ ئەم پێیوتو ئەو نووسیەوە.
(إسْتَملى-ه الكِتابَ): داوای لێکرد کتێبەکەی پێبنوسێتەوە.
الاملاء (ج) أَمالٍ وأَمالِيّ): ١-قسەکانو کورتەی قسەکان ٢-ئەوەی دەوترێت بنوسرێتەوە.
(اَلأَملاء (ج) اَلأَمالِيّ): (چاوگە) پێنووسینەوە.
(أَملى الكِتابَ): نامەکەی پێنووسییەوە/ ئەو خوێندیەوەو ئەمیش نووسییەوە.
٣-(اَلمَلا (ج) أَمْلاء): خوڵەمێشی گەرم.
٣-(ملي: اَلمِليار (ع ح): هەزار ملیۆن (فرنسية).

(المليون (ج) مَلايــين) (ع ح): هەزار هەزار (فرنسیه).

الملحق

(ملم. الِلّيم): پارەیەکی میسرییە کە دەکاتە هەزاریەکی جونەیهی میسری.

ملي: (أَلِمِليشـيا): سـوپای میللی/: جاشپۆلیس تیپی هاونیشتمانیین مەشقی سەربازیان پێدەکەن بۆ پشتگیریی سوپا یان هی پۆلیسی میریی.

مَمّ: (مِمَّ): لەچی (لە (من) و (ما)ی پرسیار پێکهاتووە).

ممـث (أَلَمَمـوث): (ح): مەمـوس (فیلێکـی گەورەیـە تـووك چڕ دووشـفرەی گـەورەو چەمـاوەی هەیـە، زوو لە چاخی سـەهۆلیدا لـە ئەوروپـادا دەژیـا پـاش ئەوەیـش لـە سـیبریادا ژیـاوەو لاشـەیان لەناو سـەهۆڵدا دۆزیوەتەوە مرۆڤی پێـش مێژوو دیویەتیو وێنەی لە تەنشـتەوە کێشاوەو لەسەر دیواری ئەشکەوتەکان وێنەکە بینراوە.

مِن: (مِن): بـە گەلێك واتا دێـت ١-(إبتداء الغايَـة في الزمان والمَكان): سـەرەتای کاتو شوێنی نیازو ڕووداو.

(مَرِضَ مِن يَـوم الجُمُعَةِ) (لە-وە)لە ڕۆژی هەینییەوە نەخۆشکەوتووە.

(«سار مِن بَيروت»): لە بەیروتەوە ڕۆیشت.

٢-(التَبعيض) (لە). بە واتای هەندێك.

(«مِنهم مَن أَحْسَنَ ومنهم مَن أَساءَ»): لەوانە هەندێکیـان چاکەیانکـردو هەندێکیشـیان خراپەیانکرد.

٣-(التعليل): بە واتای هۆ دێت.

(«ممـا خَطيئاتِهـم أُغْرِقـوا»): بـە هۆی گوناهەکانیانەوە نوقومکران.

٤-(أَلبَدَل): لەبری/ لەجیاتی.

(«أَتَرضَونَ بِالحياةِ الدنيا مِن الآخِرَة»): ئایا لەبری ئەوە دنیا بەم دنیایە قایل دەبن؟

٥-(ويأتى مرادِفاً الباءَ): بە واتا (ب) دێت.

(«يَنْظـرون مِن طَرَفٍ خِفِي»): بە دزییەوە تەماشادەکەن.

٦-(ويُفيدُ مَعنى الفَصـل): بۆ جیاکردنەوە دێـت: («واللهُ يَعلَمُ المُفسِـدَ مِـنَ المُصْلِح»): خـودا پیاوخراپو پیـاوی باش دەناسـێتو جیایاندەکاتەوە.

٧-(ويكون زائِداً): زیاد دەبێت.

(«ماجاءَنـي مِـن رَجُـلٍ»): هیـچ پیاوێك نەهاتۆتە لام.

٢-(مَنْ): بۆ مەرجە (للشرط)

(«مَنْ يَعْمَلْ خَيراً يُجزَ بِهِ»): هەر کەسـێك چاکە بکات پاداشتی دەدرێتەوە.

(مَنْ): (اسم استفهام): بۆ پرسیارە.

(«مَنْ أَتى؟»): کێ هات؟

(مَنْ): اسم موصول مشتركاً واكثر استعماله للعاقـل): نـاوی گەیەنـەرەو بـە زۆریی بۆ ئاوەزدار بەکاردێت.

(يَسجدُ للهِ مَن في السَماواتِ ومَن في الأَرضِ»): ئەوەی لە ئاسـماندایەو ئەوەی لـە زەویدایە کورنووش بۆ خودا دەبات.

(مَــنْ: نَكِرَة موصوفة): نەناسـێك بە (مَن) ناسراوبێت.

(«مَرَرتُ بِمَن مُعجِبٌ لَكَ»): بەلای یەکێکدا رۆیشـتم کە تۆ لای ئەو پەسند بوویت (ئەمە وەکـو ئەوە وایــە کە بڵێیت بــەلای پیاوێکدا رۆیشتم).

(مــنّ): (مَنَّ- عَلَيــهِ بِكَذا مَنّــاً ومِنِّينى): ئەوەی بە خەڵات دایە بێئەوەی ماندووبێت.

(مَــنَّ- عَلَيهِ. بِمــا صَنَعَ مَنّــاً ومَنَّةً): نازی ئەوەی بەسەردا کرد کە بۆیکردووە. باسیکرد کەچـی بۆ کردووەو بۆی ژماد: کە چاکەیەکی لەگەڵــدا کــردووە وەك بڵێت ئــەوەم دایتێو ئەوەم بۆ کردویت. ئەو منەتبەســەرداکردنە، دڵی پێیدەشکێتو شکاندنە.

(مانَّ-هُ مُمانَّةً): بۆ ئەنجامی کارێك ئەمسەرو ئەوسەریکرد/ رارابوو/ دوودڵییکرد.

(تَمَنَّنَ- فُلانٌ فُلاناً تَمَنَّنَ- عليه): فیسار بە نازو منەت بەسەرداکردن فیسارکەسی شکاندو توانجی تێگرت.

(إِمْتَــنَ عَلَيهِ بِمــا صَنَــعَ إِمْتِنانــاً): نازی ئەوەی بەســەردا کرد کە بۆیکردووە/ دایەوە بەچاویداو باســیکردو ژماردی کە چیو چی بۆ کردووە.

(-عَلَيهِ بِكَذا): ئەوەی بە خەڵات دایە/ پێدا.

(-فُلاناً): هەرچی بە دەستیەوە هاتو هەیبوو بە فیساریدا.

(إِسْتَمَنَّ-هُ): داوای چاکەو پیاوەتیی لێکرد.

(اَلْمَنّ) (مص): ١-خەڵات/ بەخشــیش/ چاکە/ پیاوەتی ٢-گەزۆ.

(مَــنُّ بَني اســرائيل): ئەوەی کــە خودا بە موعجیزە بۆ جوولەکەی باراند لە دەشتدا کە بیخۆن.

(اَلْمِنَّــة (مص) (ج) مِنَن): ١-چاکە/ پیاوەتی/ بەخشش.

(«لَهُ عَلَيَّ مِنَّــةٌ أَو مِنَنٌ»): چاکەو پیاوەتیی بەســەرمەوە هەیــە ٢-کەســێکە کــە نــازو منەتکردنــی چاکە یان پیاوەتییەك بەســەر خەڵکدا بکات.

(اَلْمِنَّــةُ تُهَــدِّمُ الصَنيعَــة»): منەتکــردن/ نازبەســەردا کــردن خێــری چاکــە دەباتو تێکیدەدات.

(اَلْمُنَّــة (ج) مُنَّة) (ضد): ١-هێــز ٢-لاوازیی/ بێهێزیی.

(اَلْمَنّان (م) مَنّانَــة): ١-خێرخواز/ چاکەکارو بەخشندەی گەورە ٢-لەناوە پیرۆزەکانی خودای مەزنە ٣ کەســێکە کە بە منەتو شکاندنەوە شت بە خەڵك بدات.

(اَلْمَنون والْمَنونَة (م) مَنُون): سوپاســگوزارو پێزان (ئەو (ت)یەی بۆ زیادرەوییە).

(أَلمَنــين (ج) مُنُن وأَمِينَّة) (ضد): ١-بەهێز/ بەتوانا ٢-بێهێز/ بێتوانا ٣-نەوپەڕی بوون.
(«بَلغتُ مَمْنُونَهُ»): هەرچی لەدەستیدا بوو پێمگەیشتو وەرمگرت.
(«أنا مَمنونٌ لَكَ») (عامية): من سوپاسگوزاری تۆم/ قەرزاری پیاوەتییو چاکەی تۆم.
٣-(مَنَّ- الرَجُلَ مَنّاً): بێهێزو بێتواناپکرد.
(-الحَبلَ): گوریسەکەی پچڕی.
(-الشَيءَ): شتەکە کەمیکرد.
(-الناقَـةَ): بە کاروانی زۆر مێحوشترەکەی لاوازکرد.
(مَنَّـنَ- الناقَـةَ. تَمْنيناً وبِها): بـە کاروان مێحوشترەکەی لاواز کرد.
(أَمَـنَّ وتَمَنَّنَ- الرَجُـلَ): پیاوەکەی بێهێزو بێتوانا کرد/ هێزی لەبەر بڕی.
(أَلمُنَّةُ (ج) مُنَن) (ضـد): بێهێزیی/ لاوازیی ٢-بەهێزیی خورتییو بەتوانایی/ هێز/ توانا.
(أَلمَنُون): ١-مردن (چونکە ژمارەکەمدەکاتەوەو کۆمەك دەبڕێت) (وشـەکە مێیەو دەیشکرێت بەنێر).
(«ذَهَبَت بِهِم المَنون»): مەرگ بردنی.
أَلمَنون: ٢-ڕۆژگار.
رَيبُ المَنون: لێقەومانو نەهامەتیی ڕۆژگار/ بەسەرهاتو ئازاری ڕۆژگار.
(أَلمَنـين (ج) مُنُـن وأَمِنَّـة): لاواز/ بێهێز/ بێتوانا.

(كَأَنَّ الدَّهْـرَ مَنَّهُ): وەك ڕۆژگار هێزی لەبەر بڕیبێت (ضد) ٢-بەتاونا/ بەهێز.
(أَلمَنين): تۆز/ گەرد یان تۆزێکی هێواش کزی ناوبەناوو پچڕپچڕ.
(أَلمَمْنُون) (مفع): بڕاو/ پچڕاو/ ناوبەناو.
المَنــون (ضد): ١-بێهێز/ لاواز/ کز/ بێتوانا ٢-بەهێز/ بەتوانا/ بەخۆوەبوو.
٣-(أَلمَـنّ (ج) أَمنـان): مەنێـك. بـۆ پێوانە یان کێشـانە کە سـێ یان چوار کیلۆ یان پتر دەبێت.
(أَلمِنَنَة) (ح): ١-جاڵجاڵۆکە ٢-(ح)ژیشکە مێ.
(أَلمَنُونَة) (ح): جاڵجاڵۆکە.
منــأ: ١-(مَنَــأَ- الجلـدَ. مَنْأً): پێسـتەکەی خۆشکرد.
(أَلمَنيئَــة): ١-پێسـتێکی تـازە خۆشـەکراو ٢-دەباخانە/ شوێنی خۆشەکردنی پێستە.
(أَلمَمْنَأَة): ڕەشە زەوی.
٢-(مَنَأَ- فُلاناً مَنْأً): وەك ئەویکرد/ ڕازیبوو وەك فیسار بکات.
منـج: (المانجـا أَو المانغا) (ن): درەختێکە لە وڵاتە گەرمەکاندا هەیە بۆنی خۆشە بەرەکەی خۆشەو دەخورێتو دەیشگوشرێت.
(أَلمانــرُو) (ن): درەختێکـە بەرەکـەی دوو خەپلەیــە لە قەراغ دەریاداو لــە وڵاتی هێڵی کەمەردا دەڕوێت.
(أَلمَنجَنيق والمنجليق (ج) مَجانِق ومَنجيقات)

(يونانية): مەنجەنيق (ئامێرێك/ چەكێك)ی جەنگ بووە ئاگرو گوللەو بەردو شتیتری پێ هەڵدراوەتە سەر دوژمن.

منــح: (مَنَــحَ-هُ الناقَــةَ وكُلَّ ذات لــبن. مَنحاً): مێحوشــترەكەو هەموو شــیردەرێكی بەخێوكــراوی بــە شــیرو تــووكو خوریو بەچكەو هەموو شتێكەوە پێبەخشی.

(أَلمَنْحَــةُ والمَنيحَــة (ج) مِنَــح ومَنائِــح): بەخشــش/ خەڵات/ پێشكەشكراو مێحوشترو ئاژەڵیــتر بێــت بــە خــۆیو ســەروبەریەوە بدرێت.

(مَنَحَ-هُ الشــيءَ): شــتەكەی هەروەها دایەو پێبەخشی.

(مانَــحَ-هُ. مِناحــاً ومُمانَحَةً): شــتیان بە یەكتری بەخشی.

(-تِ العَينُ): چاوەكە سەرومڕ فرمێسكی ڕژاند.

(-تِ الناقَةُ): مێحوشترەكە بە زستانیش هەر شــیریدا پاش ئەوەی حوشــترەكانیتر شیریان برا.

(أَمْنَحَ-تِ الناقَةُ): مێحوشترەكە نزیكی زانو شیردانبوو.

(مُمْنِح): ئاژەڵ یان مێحوشترێك كە خەریكی زانو شیردانبێت.

(تَمَنَّحَ-المــالَ): (دارا/ مــاڵ)ی بــە خەڵكــی بەخشی.

(إِمْتَنَحَ- الرَجُلُ): بەخششەكەی وەرگرت.

(أُمْتُنِحَ-مالاً): ڕۆژێی (درایە/ پێدرا).

(المَنيح: إِمْتَنَحَ- المَنيحَ): شتەكەی خواست.

(إِسْتَمنَحَ-هُ): داوای بەخششی لێكرد.

(أَلمِنْحَة (ج) مِنَح): بەخشش.

(أَلمَنّاح): بەخشندەیەكی دڵفراوان.

(أَلمَنُوح): مێحوشترێك كە بە زستانیش شیر بدات پاش ئەوەی كە حوشترەكانیتر شیریان دەبرێت.

(أَلمَنيــح): تیرێكــی قومارو گــرەوە كە هیچ ناباتەوە.

(أَلمانِح): مێحوشتری بە زستان شیردەر پاش ئەوەی ئەوانیتر وشكدەبن.

(مَطَرٌ مُمانِح): بارانێكی سەرومڕ.

(ريحٌ مُمانِــح): بایەك كــە بارانێكی بێپچڕ بهێنێت.

منــد: (أَلمَنْدَريــن (ن) = لیَمــون= یوســف أَفَنــدي): لالەنگــی درەختێكــە بەرەكەی لە پرتەقــاڵ بچووكترەو خۆشــە توێكڵەكەی بە گۆشتەكەیەوە نانووسێتو زوو پاكدەكرێت لە چینەوە هاتــووە لەو وڵاتانەدا دەڕوێت كە پرتەقاڵی تێدا هەیەو دەڕوێت.

(مُنذُ ومُذ): لەو كاتەوە/ لەو ساوە/ لەو كاتەدا/ لەو ساتەدا/ ماوەیەكە/ دەمێكە/ لەمێژە/ بەم نزیكانــە (بۆ ئەمانە هەمــوو دەبێت بە پێی كاتی ڕابوردوو یان ڕانەبوردوو).

(مارأَيتُــهُ مُنــذُ يَــومِ الأَحَــدِ): لــە ڕۆژی یەكشەممەوە نەمدیوە.

(رَأيتُـهُ مُنذُ شَـهرِنا): لەم مانگـەدا دیومە (چونکە فرمانەکەی ڕانەبوردووە).

(«مارَأيتُـهُ منذُ ثلاثَـةِ أيـام أو إلى ثلاثَة أيام»): لە سـێرۆژەوە یان بۆ سێ ڕۆژ دەبێت نەمدیوە.

(«مارأيتُهُ مُنـذُ يَومان»): بـۆ دوو ڕۆژێك دەچێت نەمدیوە.

(«مازِلـتُ أبغي المـالَ مُذ أنا يافـع»): لەو کاتەوە کە لاو بووم حەزم لە سامانە.

(مُذ): سوککراوەی (مُنذُ)وە.

منــز: (اَلمَنيزيـوم) (ك): تەنێکی سـادەیە. کانزایەکی سـووکەو سـپیی زیوینە کە سووتا گــرو شـەوقێکی زۆرو تیـژ دەدات بۆ هەندێ ئاوێتەو بومبای سووتێنەر بەکاردێت، هەندێ لە پێکهاتەکانی لە پزیشـکیدا بەکاردێت وەك: سلفاتی مانیزیوم، کە بۆ ڕەوانکردن بەکاردێت

منع: (مَنَعَ-ه الشيءَ ومِنهُ وعَنهُ): ١-شتەکەی لێگرت/ دەسـتی نایە بەری نەیهێشـت بگاتە شتەکە/ لە شتەکەی بێبەشکرد ٢-شتەکەی لێ قەدەغە کرد/ دەسـتی لە شتەکە پێهەڵگرت/ وازی پێلێهێنا.

(-هُ القاضـي عَـنِ المـيراث): دادوەر/ قازی دەسـتی بەسـەر بەشـە میراتەکەیدا گرتو نەیهێشت دەستی بۆ بەرێت.

(-هُ عَنِ الدَعوى): نەیهێشت سکاڵاکەی بکاتو ڕێی لێگرت.

(-جارَهُ): دراوسێکەی پاراستو بەرگریی لێکردو نەیهێشت زۆری لێبکەن/ زیانی پێبگات.

(مَنُعَ مَناعَةً ومَناعاً): بەهێزو توانا بوو.

(-الحُصْـنُ): قەڵاکـە سـەختبوو نەتوانـرا زەفەری پێبەرنو بیگەنێ.

(-الشـيءُ): شـتەکە دەگمەنـەو زەحمەتو گرانبوو دەست نەدەکەوت.

(مَنيـع): ١-دەسـتگیر نەبـوو/ شـتێك کـە دەستنەیگاتێ/ دەستنەکەوێت ٢-قایم/ سەخت.

(مَنَّـعَ-هُ الشـيءَ ومِنهُ وعَنهُ): ١-شـتەکەی لێبەریکرد/ لێبێبەشـکرد ٢-وازی پێ لێهێنا/ لێیقەدەغە کرد دەستی پێ لێهەڵگرت.

(-هُ القاضـي عَـنِ الميراث): دادوەر دەسـتی بەسـەر بەشـە میراتەکەیدا گرتو نەیهێشت بەلایدا بچێت.

(-هُ عَنِ الدَّعوى): نەیهێشت سکاڵاکەی بکاتو دەستی نایەبەری.

(مانَعَ-هُ): بەرگریی لێکردو پاراستی.

(-هُ الشـيءَ): لەسەر شـتەکە بە گژیدا چوو نەیهێشت دەستی بۆ بەرێت.

(تَمَنَّعَ- عِنَ الشَـيءِ): وازی لە شتەکە هێنا/ دەستی لە شتەکە هەڵگرت.

(-بِقَومِهِ): ١-پەنایبردە بەر خوێشـگەلەکەی ٢-بەوان بەهێز بوو/ پشتی بەوان قایمبوو.

(تَمانَعا): ١-دووانەکە بەریـان لەیەکتریگرت ٢-بەرگرییان لە یەککرد.

(-عَــن أَنفُســِهما): دووانەکــە بەرگریــان لەخۆیانکرد.

(إِمْتَنَع- عَنِ الشَــيءِ): وازی لە شتەکە هێنا/ بۆ شتەکە نەچوو.

(-بقَومِهِ):١-خۆی دایە پاڵ خوێشگەل/ پەنای بردە بەر خوێشگەل ٢-پێیان بەهێز بوو.

(-الشيءُ): شتەکە دەگمەنبوو/ دەستکەوتنی گرانبوو.

(اَلمانِــع (فــا) (ج) مانعــون ومَنَعَــة): ١-قەدەغــەکار/ رێگــر/ نەهێــڵ ٢-چرووك/ دەستقووچاو.

(- (ج) مَوانِــع): قــۆرت/ کۆســپ تەگەرە/ بەربەست/ بەرهەڵستکار/ ئەوەیە کە ناهێڵێت دەستت بگاتە شتەکە/ وازت پێ لێدەهێنێت.

(اَلمَنْع (ج) مُنوع) (ح): قرژاڵ.

(رَجُــلٌ مَنِــعٌ): پیاوێکــە خــۆی لــە شــت دەگرێتەوە/ خۆی لە شت دوور دەگرێت.

(اَلمَنَعَــةُ والمِنْعَــةُ): هێزێکە کــە جڵەوگیریی دەســتدرێژی لەســەر خەڵکــدەکات/ رێــی دەستدرێژیی نادات.

(اَلمَنَعَةُ (ج) مَنَعات): نگینو هێز/ دەسەڵات.

(«لَهُم مَنَعاتٌ»): قەڵای بەرگرییان هەیە کە دوژمن ناتوانێت زەفەریان پێبەرێت/ دەستیان بۆ بەرێت.

(مَناعِ= إِمْنَعْ): مەهێڵە، بەریگرە.

(اَلمَناعَــة) (طب): بەرگریــی لەش بەرامبەر بــە میکرۆبی نەخۆشــی وەك هــی ئاوڵە کە پەیدایدەکات یان خۆی سروشتیی دەیبێت.

(اَلمَنّــاع): ١-بەرگرێکــی قایــمو بەتوانا/ زۆر بەرگریکار ٢-زۆر رژدی دەستقوچاو.

(اَلمَنُــوع): ١-نەهێڵێکی توندوتیــژ ٢-رژدێکی تەواو پیسکە/ دەستقووچاو.

(اَلمَنعی= إِمْتِناع): بەلادانەچوون/ لێدوورکەوتنەوە.

(اَلمَنیع (م) مَنیعَة): قایمو ســەخت/ پتەوو بەهێزو تۆکمە کە دەرەقەتی نەیەن.

(حُصْــنٌ مَنیــعٌ): قەڵای ســەختو قایم کە دەست نەیگاتێ.

منــو: ١-(مَنا. یَمْنُو- الرَجُــلَ بِکَذا. مَنْواً): پیاوەکــەی تــووشو گرفتــاری ئــەوە کردو تاقیکردەوە.

(اَلرجلُ مَمْنُوٌّ بِکَــذا): پیاوەکە بەوە گرفتار بووەو تاقیکراوەتەوە.

(اَلمَنا): پێوانەیەکە یان سەنگێکە بە ئەندازەی دوو رەتڵ یان ١٦٨ مســقاڵ. (مَنیان ومَنْوان): دوانیەتی.

(ج) أَمْناء وأَمُــن ومُنِيٍّ): ئەوە کۆیەکەیەتی پێشی دەوترێت: (اَلمَنْاة).

(«داری مَنــا دارِهِ»): خانووەکــەم بەرامبەر خانوەکەیەتی.

(مَناة): بتێکە هی (هُذَیل وخزاعة)بووە لە نێوان مەکەو مەدینەدا بووە.

(اَلمُنُوَّة= الأُمنیة): ئاوات.

٢-(ألمانَويَّة): ڕێڕەوێکــە (مانی) داینا دەڵێت دوو هێــز هەیە چاکــەو خراپــە. ڕووناکیو تاریکی لە بەربەرەکانیدان.

مني: ١-(مَنى. يَمنى- اللهُ الخَير لفلان. مَنْياً): خودا فەڕو چاکەی بۆ فیسار ڕەخساندو دا.

(-هُ مَنياً): تاقیکردەوە.

(«مَناهُ الله بِكَذا»): خودا تووشی ئەومیکردو گرفتاربوو.

(مُنِــيَ- لِكَــذا): بۆی گونجا/ بــۆی لوا/ بۆی بوو/ تیا سەرکەوت.

(-بكَذا): تووشی ئەوە بوو و بەوە تاقیکرایەوە.

(مَنَّى- الرَجُلَ الشيءَ وبالشَّيءِ. تَمْنِيَةً): وای لە پیاوەکە کرد کە ئاوات بۆ شتەکە بخوازێت بــە تەمــای ئەومیکــردو کردیە ئــارەزوو و خۆزگەی.

(أَمْنــى- الدِمــاءَ. إمنــاءً): خوێنیڕشــت/ خوێنیکرد.

(-الحاجُّ): حاجیەکــە هاتە (مینا) یان تیایدا دابەزیو مایەوە، کە شــوێنێکە لەمەکە (بۆیە وا ناونراوە چونکە خوێنی تێدا دەکرێت، واتا ئاژەڵی تێدا ســەردەبڕرێتو دەیشــڵێن ئەوە لــەوەوە هاتووە کە دەوترێت: (منى الله عليهِ الموت»): خودا مردنی لەســەر داناوە. چونکە قوربانی لەو شوێنەدا دەکرێت.

(تَمَنَّى- الشــيءَ): شتەکەی ویستو خۆزگەی بۆ خواست/ ئاواتەخوازی شتەکە بوو.

(ألمَنى= القَدَر): دانراو لە لایەن خوداوە.

(-الكِتــابَ): نامەکــە یــان کتێبەکــەی خوێندەوە.

(«هذا شيءٌ رويتَهُ أَم شيءٌ تَمَنَيتَهُ»): ئەمە شتێکە گێراتەوە یان بە ئاواتیەوە بوویت.

(تَمَنَّى- الرَجُلُ): درۆیکرد.

(-الحَديــثَ): بــە زمانــی پێغەمبــەرەوە فەرموودەیەکی هەڵبەست.

(إمْتَنى الشــيءَ إمْتِناءً): شتەکەی هەڵبەست، لە خۆیەوە وتی/ دروستیکرد.

(- الحــاجُّ): حاجییەکە هاتــە (مونا)و لەوێ دابەزی.

(ألمَنى): ١-نیاز/ ئامانج ٢-مردن ٣-ئەوەی خودا دایناوەو بڕیویەتیەوە.

(«أنا راضٍ بِمَنَــى اللهِ»): من بەوە قایلم کە خودا بڕیویەتیەوە.

(«هو مِنّي بِمنى ميــلٍ»): نێوانی منو ئەو میلێکە/ ئەو لە منەوە میلێك دوورە.

(ألحَيَــوان المَنَــوِيّ): خانــەی تــۆو، نێــرە/ خانۆکەیەکی ئاســتەمە وردێکی تۆوە نێرەی زیندەوەرانە لە گونی نێرەکاندا پەیدادەبێت. کلکــدارە توخمی نێرمیە کە بە هۆی کلکیەوە دەتوانێت بگاتە هێلکۆکــەی مێکەو لەگەڵیدا یەکبگرێتو ژیان دروست ببێت بە یەکگرتنی ناوکی هەردووکیان ئەوە ڕوودەدات.

(ألمُنْيَة والمِنيَة (ج) مُنىً ومِنَىً): ١-خواســت/

مەبەســت/ ئاوات/ ئارەزوو/ حەز/ ئەوەی کە دڵ بیەوێت.

**(اَلمَنِيَّة (ج) مَنايا):** مــردن/ مەرگ (چونکە بۆمان بڕراوەتەوە).

**(الأُمْنِيَة):** درۆ (چونکە درۆزن خۆی قســەکە دروستدەکاتو دەیڵێت.

**(- (ج) أمــانٍ وأمانــي):** ١-خواســت/ ئاوات/ ئارەزوو/ ئەوەی دڵ دەیەوێت.

**(اَلتَمَنِّيــات):** ئەوەی کە ئاواتی بۆ دەخوازێت بۆی ســووتاویت/ ئــەو کارانەی کــە بۆی بە ئومێدیت/ بە هیوایت ببێت.

**٢-(مانى- الرَجُــلَ. مُماناةً):** ١-دڵی پیاوەکەی ڕاگرتو باش لەگەڵیدا هەڵسووڕاو چاوەڕوانیکرد ٢-پاداشتی دایەوە ٣-لەگەڵیدا هەڵیکرد.

**(-الرَفيــقَ):** لەگەڵ هاوڕێکەیــدا بە (نۆرە/ سەرە) سواری وڵاخە بوون.

**٣-(اَلمَنيهُــوك) (ن):** مەنیهــۆت: دەوەنێکــە دەشــتەکی لــە بەرازیلــدا هەیەو لــە وڵاتە گەرمەســێرەکاندا دەڕوێنرێتو لە ڕەگەکەی نیشاشتەیەك دەردەهێنن پێیدەڵێن (تاپیۆکا) و بۆ وڵاتی جیهان دەنێردرێت.

**مَه: مَهْ:** کرداری داخوازییە «إسم فعل امر» بە واتای: مەکە. بەسە. وازبهێنە. دەیشوترێت «مَهٍ».

**مَــهَ: ١-(مَــهَ- الإبِــلَ مَهــاً):** بەزمیــی بــە حوشترەکەدا هاتو لەگەڵیدا نەرمبوو.

**(مَهِهَ- الشيءُ. مَهَهاً):** شتەکە نەرمبوو.

**(اَلمَهاهُ):** ١-نەرمو نۆڵو ناسكو جوان ٢-چاك/ باش ٣-هاوڕێ لە ڕۆیشتنو شتیتردا.

**(اَلمَهَــه):** ١-هــاوڕێ لــە ڕۆیشــتندا ٢-هیــوا ٣-هێواشی/ لەسەرخۆیی/ هێمنیی.

**٣-(مَهْمَهَ-هُ عَنِ السَــفَرِ):** نەیهێشــت گوزار بکات.

**(-فُلاناً):** بە فیساردا هەڵشاخاو پێیوت: «مَهْ مَه»: بەس بەس.

**(تَمَهَّهَ- عَنِ الشــيءِ):** وازی لە شتەکە هێناو بەلایدا نەچوو.

**(اَلمَهْمَــهَ والمَهْمَهَةَ (ج) مَهامِــه):** ١-بیابانێکی چۆڵی دوور ٢-وڵاتێکی وشكو چۆڵ.

**مهت: (اَلمَهْتَر والمِهْتَار):** میرو والی (فارسین).

**مهج: ١-(مَهَجَ- مَهجاً):** ڕوخساری گەشایەوەو ڕوونبــووەوەو جوانبــووەوە کە لە پێشــدا وا نەبوو.

**(-الوَلَدُ أُمَّهُ):** منداڵەکە مەیکی مژی.

**(اُمْتُهِجَ- الرَجُلُ):** گیانی یا دڵی دەرهێنرا.

**(اَلماهِــج) (فا):** ١-شــیری ڕووتو ســاغ کە ئاوی تێنەکرابێت ٢-چەوری بەزی تەنكو شیری ساغ.

**(اَلمُهْجَــةُ (ج) مُهَج أو مَهَجَــات):** ١-خوێن یان خوێنی دڵ ٢-گیان.

**(مُهْجَةُ كُلِّ شيءٍ):** پوختەو گەوهەرو باشترینی هەموو شــتێك/ نایابترینو چاکترینی هەموو شتێك.

(الأُمْهُـــج والأُمْهُوج والأُمْهُجان) (ن): شـــيرى ساغى ئاوتێنەكراو.
٢-(رَجُـــلٌ مَمهُـــوجُ البَطـــن): پیاوێكـــى ورگداكەوتوو.
مهــد: ١-(مَهَدَ- الفراشَ مَهْـداً): نوێنەكەى راخستو چووە سەرى.
(-لِنَفسِـــهِ): كارى كردو رەنجـــى بۆ خۆیداو دەستگیریبوو.
(مَهَّدَ- الفِراش): نوێنەكەى راخســـتو چووە سەرى.
(-الأمرَ): كارەكەى رێكخســـتو ئاســـانكردو چاككرد.
(-لَهُ العُذرَ): پۆزشـــى بۆ هێنایەوە/ بیانووى بۆ هێنایەوە، دڵى دایەوە، دڵنەوایى كرد.
(-لِفلان عُذرَهُ): پۆزشـــى لە فیسار وەرگرت/ بیانووەكەى لێوەرگرت.
(-لِنَفسِـــهِ خَیراً): فەرو شتى چاكى بۆ خۆى رەخساندو دەستگیرى خۆیكرد.
(تَمَهَّدَ- الفِراشَ): نوێنەكەى راخست.
(-لَـــهُ الأمـــرُ): كارەكەى بۆ خۆش و ئاســـان و لەبار بوو.
(-الرَجُلُ): تواناى پەیداكردو بەدەسەڵاتبوو.
إمْتَهَدَ- الشيءُ: شتەكە پانبوو/ تەختبوو.
(-الرَجُلُ): رەنجیداو دەستگیربوو.
(إسْتَمهَدَ- فِراشاً): نوێنێكى راخست.
(المَهد (ج) مُهُوْد): بێشكە/ لانكە/ جۆلانە.

(المَهْد): زەویى نەرم.
(المُهْـــد (ج) مِهَدَة وأمهاد. والمُهْدَةُ (ج) مُهَد): زەویى تەختى رێكى نەرم.
(المِهـــاد (ج) مُهُـــد ومُهُد وأمْهِـــدَة): ١-نوێن/ شوێنى نوستن/ خەوگە ٢-زەویى نشێو/ نەرم.
٢-(المَهید): (نفیش/ كەرە)ى پوختو ساغ.
ماءٌ مُمَهَدٌ: ئاوى شیلەتێن.
(المُمَهَّد): ئاسانكراو/ ئامادەكراو.
مهـــر: ١-(مَهَـــرَ- الشـــيءَ وفیهِ وبِـــهِ. مَهْراً ومُهُوراً. وَمهاراً ومَهارَةً): لە شتەكەدا كارامە بوو/ شـــارەزا بوو (پێى/ تیایـــدا)/ زانا بوو/ قاڵبوو.
(ماهِـــر): شـــارەزا/ كارامـــە/ قـــاڵ/ لێزان/ لێهاتوو.
(«مَهَـــرَ في العِلـــمِ»): لە زانســـتدا (زانا بوو/ شارەزا بوو).
(مَهَـــرَ- في صِناعَتِهِ): لە پیشەســـازییەكەیدا قاڵبوو/ شارەزاو لێهاتوو بوو.
(ماهَـــرَ-ه. مُماهَرَةً فَمَهَرَهُ): لە وەســـتاییدا بۆربۆرێنیانكردو بەسەریدا زاڵبوو/ بەزاندى/ لەو كارامەتر بوو.
(تَـــمَـــهَّـــرَ): ١-كـــارامـــە بـــوو/ شـــارەزا بـــوو ٢-مەلەیكرد.
(الماهِـــر (ج) مَهَرَة): ١-كارامە/ زانا/ شـــارەزا ٢-مەلەوانى چاكو شارەزا.
(الإبلُ المَهْرِیَـــة (ج) مَهارى ومَهارِ ومَهارِيّ):

حوشــتری مەهری. (مهره کــوری حەیدان بوو عەرەبی یەمەن بوو دەڵێن حوشــترەکانی هێندە خێرا بوون هیچ حوشترێکی تر پیایاندا نەدەگەیشت) واتە حوشتری زۆر خێرا.

٢-(مَهَرَ- المَرْأةَ مَهْــراً): مارەیی بە ژنەکە دا یان مارەیی بۆ دیاریکرد.

(أمْهَــرَ- المَــرْأةَ): ١-مارەیی بــە ژنەکە دا یان مارەیی بۆ دیاریکردو بڕییەوە ٢-بە مارەییەکی دیاریکــراو دای بە شــوو و لــە پیاوێکی مارە کرد.

(مُمْهَرَة): ژنێکی مارەکراو.

(ألمَهْــر (مص) (ج) مُهُــور ومُهُورَة): مارەیی ژن لــەو داراو ماڵەیە کە پێشــەکی دەیدەنیو پاشەکیشــی هەیە کاتێك کە لە پیاوێکی مارە دەکەن.

(«هذا مَهْرُ ذلك»): ئەمە لە بریتیی ئەوەیە.

(ألمَهيرَةُ مِنَ النِّســاءِ (ج) مَهائِر): ژنی ئازادو مەستوورەی مارەییگران.

٣-(مَهَّرَ): جوانوویەکی ویست یان جوانوویەکی ڕاگرت.

(أمْهَــرَ-تِ الفَرَسُ): ماینەکــە جوانوویەکی مێچکە یان نێرەی هەبوو.

(ألمُهْــر (ج) مِهار وأمْهار ومِهــارَة (م) مُهْرَة (ج) مُهَر ومُهَــرات ومُهُرات) (ح): ١-جوانوو نێــرە یان مێچکە ٢-جوانوویەك یان بەچکەی وڵاخیتری ماڵی.

٢-(ج) (مِهْرَة): بەشی سەرەوەی ئێسقانی سنگ.

٤-(ألمُهْــر (ج) مِهْــرَة): ١-بــەری گوژاڵــك ٢-(ح)بەچکــەی کۆترەکێویلــە/ گاکۆتــر ٣-مۆر (فارسیە) ئەوەی کە نووسینی پێمۆردەکرێت.

(مَهَرَ الكِتابَ): نووســینەکەی مۆرکرد مۆری پێدانا/ لێدا.

(ألمَهرِيَّة): گەنمەسوورە.

٥-(ألمِهْرَجان): ئاهەنگی گەورە/ جەژنی فارس وشەکە لە دوو بەش پێکهاتووە.

(مِهْر): خۆشەویستی.

(جــان): گیــان واتــە: (مَحبَــةُ الــرُّوح): ١-خۆشەویستیی گیانی ٢-ئاهەنگی گەورە.

مهــز: (مَهَــزَ-هُ بِيَــدِهِ مَهْــزاً): بەدەســت پاڵپێوەنا.

مهــش: (مَهَــشَ-هُ. مَهْشــاً): ١-ســووتاندی ٢-ڕووشاندی.

(إمْتَهُش): سووتا.

مهص: (مَهَّصَ- الثَوبَ): جلەکەی پاككردەوەو سپیکردەوە.

(تَمَهَّصَ- في الماءِ): خۆی بە ئاوەکەدا کرد.

(إمهــاضَّ-تِ الأَرضُ): زەویەکــە ڕووەكو گیاکەی فەوتا.

(مَهضــاء): زەوییــەك (گیــاو ڕووەکەکــەی فەوتابێت/ ڕووتبووبێت).

مهق: (مَهِــقَ-تِ الخَيلُ مَهْقــاً): چارەوێکان غاریانکرد.

٢-(مَهَقَ- الفَيصَلَ. مَهْقاً): گوێرەکەکە یان بەچکە حوشترەکەی ئاودا.

(تَمَهَّقَ- الشَّرابَ): ناوبەناو شەربەتەکەی خواردەوە.

٣-(مَهِقَ. مَهَقاً): زۆر سپیبوو سپیەکی بێبریقە.

(اَلمَهَق) (مص): سەوزیی ئاو.

(اَلأَمْهَق (م) مَهقاء (ج) مُهْقٌ): سپێتیەکی تەواو/ زۆر سپی بەڵام شەوقدار نەبێت وەك گەچو شتی لەو بابەتە.

(اَلمُهْقَةُ): ڕەنگی زۆر سپیی کە شەوق نەداتەوە.

مهك: ١-(مَهَكَ-هُ. مَهْكاً): لووسیکرد/ سافیکرد.

(مَهَكَ ومَهَّكَ- الشيءَ): شتەکەی زۆر ورد هاری.

(اِمَّهَكَ- الرَّجُلُ): کابرا گۆشتەکەی کەمیکردو کابرا سووکەڵە بوو.

(مَهْكَةُ الشَّبابِ ومُهْكَتُهُ): جوانییو ناسکیی گەنجێتی.

(اَلمَهُوك): کەوانی نەرم.

(اَلمُمَهَّك والمُتَمَهِّك): گەنجێکە لە هەرەتی جوانییو تاف لاویدایەو لاویی لێدەتکێت.

(شابٌ مُمَهَّكٌ): لاوێکە خوێنی قولپدەدات.

(اَلمُمَهَّك): درێژی شپرزەو هەڵەشە.

٢-(مَهَكَ- في السَّيرِ. مَهْكاً): پەلەی لە ڕۆیشتندا کرد.

(تَمَهَّكَ- في العَمَلِ): کارەکەی باشکردو چاك ئەنجامیدا.

(تَماهَكَ- القَومُ): خوێشکەل بە گژیەکدا چوون لەگەڵ یەکدا تەواو کردیان بە هەرا.

(اِمْهَكَ- في العَدوِ): توند ڕایکردو خۆی گوشی.

مهل: ١-(مَهَلَ وتَمَهَّلَ- في العَمَلِ. مَهْلاً ومُهْلَةً): لە کارەکەدا شێنەییکردو لەسەرخۆ بوو پەلەینەکرد.

(مَهَّلَ وأَمْهَلَ-هُ الدَّينَ): دانەوەی وامەکەی دواخستو چاومرێی پێکرد.

(-الرَّجُلَ): لەگەڵیدا نەرمیی نواندو دڵی ڕاگرت.

(اِسْتَمْهَلَ-هُ): ١-داوای لێکرد لەسەری ڕابوەستێتو چاوپۆشی دواخستنی کارەکەی لێبکات ٢-داوای لێکرد لەگەڵیدا شێنەیی بێت.

(اَلمَهْل) (مص): ١-دڵنەرمییو دڵڕاگرتن ٢-مۆڵەتدان ٣-حەوانەوە/ پشوو ٤-هێواشی/ لەسەرخۆیی/ شێنەیی.

(«مَهْلاً وعَلى مهلٍ= أَمْهِل): هێواشبە/ لەسەرخۆبە (بۆ تاكو جووتو کۆو نێرو مێ وا دەوترێت).

(اَلمَهَل): ١-بەزەییو دڵنەرمیو خۆشەویستی ٢-لە کارەکە بگەیت پێش ئەوەی تێهەڵچێت.

(اَلمُهْلَةُ) (مص): ١-لەسەرخۆییو نەرمیی.

(«مَشــی علی مُهْلَتِهِ»): به شێنەیی ڕۆیشت ٢-کەرەسەو شتی پێویست.

(«خُذِ المُهْلَةَ فِي أمرِكَ»): (کەرەسەو کەلوپەلی پێویست/ تفاق)ی کارەکەت وەربگرە/ ئامادە بکە.

٢-(مَهــلَ- الرَجُــلُ. مَهَلاً): پێشــەنگبوو لە چاکەکردندا.

(ماهِل): پێشەنگی چاکەخوازان.

مَهَّــلَ وأمْهَــلَ- فِي الأمــرِ: لە کارەکــەدا زۆر کۆششیکردو شوێنی گلەیی نەهێشتەوە، گلەیی نەهێنایە سەر خۆی.

(المَهَل): باپیرانی پێشووی پیاوەکە ٢-پێشکەوتن/ لەبەرەوەبوون/ لەپێشەوەبوون.

(«فُلانٌ ذو مَهَل»): فیســار لە چاکەو خێردا لە پێشەوەیە.

(أخَذَ علی فُــلانٍ المُهْلَةِ»): لە تەمەنی زۆری یان لە ڕەوشتی جواندا پێش فیسار کەوت.

٣-(المَهْل والمُهَل): کێمو خوێناوی مردوو.

(المُهْل): ١-ناوە بۆ کانزاکانی وەك زیو، ئاســن، مس ٢-ئەو کانزایانەی کە توابێتەوە ٢-قەترانی ڕوون ٣-شلەڕۆنی ڕوون ٤-ژەهر/ کێمو زووخاو ڕچکاوی مردوو ٥-خۆڵەمێشــی بە نانەوە لکاو ٦ نــاوكو توێکڵی زەیتوون، پاش گووشــینی، واتە: خڵتەو تڵپەکەی.

(المُهْلَة):١-پزیشـکی ئاگر کە لە خۆڵەمێشــدا دەمێنێتەوە ٢-قەترانی ڕوون.

(المُهْلَةُ والمَهَلَةُ والمِهْلَة والمَهَلَة): خوێنو زووخو زرچکاو بە تایبەتی هی مردوو.

(المُتَمَهِّل- مِن الرجال): پیاوی درێژ/ قووچ.

(المُتَمَهِّل): کەسێك بە تابوشتو بە حەوسەڵە بێت یان لە کارکردندا شــێنەییو لەســەرخۆ کار ئەنجام بداتو بەدیقەتبێت.

مهــم: (مَهْما): هەرچەندێــك/ هەرچەندە/ هەرچی/ هەر دەمێك.

(«مَهمــا يَزُرْني زيدٌ أكرِمُــهُ»): هەردەمێك زەید سەرم لێبدات من ڕێزی لێدەگرم.

(«مَهما تَفْعَلْ أفْعَــل»): هەرچی تۆ بیکەیت منیش دەیکەم.

مهن: (مَهَنَ- الرَجُلَ مَهْنــاً ومَهْنَةً ومِهْنَةً): کارگوزاریی پیاوەکەیکرد/ خزمەتیکرد.

(-مَهْناً): لە پیشەکەیدا کاریکرد.

(-الرَجُــلَ): لــە پیاوەکەیــداو ماندویکردو ڕەتاندی.

(-الثَــوبَ): ١-بەرگەکەی ڕاکێشــا ٢-جلەکەی پەرپووتکرد.

(مَهُنَ. مَهانَةً): ســووك/ ڕسواو بێبایەخبوو/ بێتوانا بوو.

(ماهَــنَ-هُ: مماهَنَــةً): پێــوەی خەریکبوو/ کردی.

(أمْهَنَ-هُ) ١-بەکاریهێنا ٢-ڕەتاندیو بێتابوشتیکرد/ بێهێزیکرد.

(اِمْتَهَنَ- الشيءَ): ١-شتەکەی سوککرد.

(-الرَجُـلَ): كارگوزاریــی بــه پیاوەكە كرد/ ئیشی پێكرد/ خزمەتی پێكرد.
(إمْتَهَــنَ وامْتُهِــنَ- الرَجُــلُ): پیاوەكە (بۆ كارگوزاریی/ بۆ خزمەتكــردن) بەكارهێنرا/ كاری پێكرا/ بوو بە كارگوزار، خزمەتكار.
(اَلمِهْنَــةُ والمَهْنَــةُ والمَهَنَة والمَهِنَــةُ (ج) مِهَن ومُهَن): ١-پیشــه ٢-كار/ ئیــش/ كارگوزاریی/ خزمەت ٣-كارامەیی لە كارگوزارییو كاردا.
(«قامَتِ المَرأةُ بِمِهْنَةِ بيتِها»): ژنەكە ماڵەكەی هەڵپەرداوتو ڕێكیخست/ كاری ماڵەكەیكرد.
(«مامِهْنَتُكَ هاهُنا»): كارت بێرە یان لێرە چییە.
(«هــو في مِهْنَةِ أَهْلِهِ»): ئــەو خەریكی كارو كارامەیی خێزانەكەیەتی.
(«خَرَجَ في ثيــابِ مِهْنَتِهِ»): بە جلی كارەوە دەرچووە دەرەوە.
(اَلماهِــن (فا) (ج) مُهَّــان ومَهَنَــة ومِهان): نۆكەر/ خزمەتكار ٢-كۆیلە/ بەندە.
(-(م) (ماهِنَــة (ج) مَواهِــن): ١-كارەكــەر/ كەنیزەك ٢-كۆیلەی ژن/ ئافرەت.
(اَلمَهين (ج) مُهَناء): ســووك/ ڕسوای بێتوانا/ بێدەسەڵات ٢-بوودەڵەی بێڕاو جیانەكەرەوەی چاكو خراپ.
الملحق:
مهن: (اَلمِهَني): پیشەكار/ خاوەنپیشە.
(توجيهٌ مِهَني): ئاراستەكردنی پیشەیی.
(اَلتَّعليــمُ المِهَنــي): فێركردنــی پیشــەیی فێركردنێكی بیردۆزمیی/ تیۆریانەو كردارییی كــە قوتابیەكە بۆ پیشــەیەكی دەســتیی یان بازرگانی یان پیشەسازیی ئامادە دەكات.
(اَلضَميرِ المِهَني): ویژدانی پیشــەیی: ئەوەیە كە خاوەن پیشــەكە لــە كارەكەیدا ڕاســتو دروســتبێتو بەتەنگەوە بێت. لە كارەكەیدا وردبێــتو ئەركــە پیشــەییەكەی بــاش بەجێبهێنێتو دەغەڵیی تێدا نەكات.

مهو: ١-(مَها. يَمهو- الرَجُلُ. مَهْواً): توند لە پیاوەكەیدا.
٢-(مَها. يَمهُــو-تِ البَقَرَةُ الوَحشــيَّةُ مَهاً): مانگا كێوییەكە ڕەنگی سپییەكی پاكبوو.
(مَهُوَ- اللبَنُ أَو السمنُ. يَمْهُو مَهاوَةً): شیرەكە یان ڕۆنەكە ڕوونبوو.
(مُهوٌ): ڕوون.
(اَمْهــى- اللبَنَ): ئاوی زۆر كردە شــیرەكەوە/ ڕوونیكردەوە.
(-القِدرَ): ئاوی زۆر كردە مەنجەڵەكەوە.
(-الحَديدَةَ): ئاسنەكەی هێند كوتا تا تەنكبوو یان تیژیكرد.
(-تِ العَيْــنُ): فرمێســك بــە چاوەكــەدا هاتەخوارێ/ چاوەكە فرمێسكی ڕشت.
(-القِدحَ): خواریی تیری گرەوەكەی ڕاستكردەوە.
(-الفَرَسَ): ١-هەوساری ئەسپەكەی درێژكرد ٢-غارێكی زۆری بــە چارەوێكە كرد تا ئارەق بكاتەوە.

(أَلمَهِيُ): نارەق بە ئەسپکردنەوە.

(أَمهى- الحَبْلَ): پەتەکەی شلکرد.

(-فُلانٌ): فیســار ستایشــێکی زۆریکرد/ زۆر هەڵینا.

(«حَفَــرَ- البئرَ حتى أمهــى»): چاڵاوەکەی هەڵکەند تا گەیشتە ئاو.

(أَلمَهْو) (مص): ١ چەوی ســپی ٢-شیری ڕوون کــە ئــاوی زۆر تێدابێت ٣-مــرواری ٤-بلوور/ کریســتاڵ (بۆیــە وا ناونراوە چونکە ســافو روونــە وەك ئاو) ٥-تەرزە ٦-فەریکە خورما ٧-شمشێری تەنك.

(أَلمَهاة (ج) مَها ومَهَــوات ومَهَيات): ١-بلوور/ کریستاڵ ٢-گاو مانگا کێویی کە چاوی گەورەو جوانە چاوی مرۆڤی پێدەچوێنن ٢-خۆر.

مهي: ١-(مَهــى- الشَــفْرَةَ أَو الحَديدَ. يَمهى ويَمْهي مَهياً): ئاســنەکە یان دەمی تیغەکەی تەنککرد.

(-الشــيءَ): ١-شتەکەی شــێواند ٢-ڕەنگەکەی گۆڕی.

(أَمهى وامتَهى- الشَــفْرَةَ أَو الحديدَةَ): دەمی تیغەکەی یان ئاسنەکەی تەنککرد.

(إسْــتَمْهى- الفَــرَسَ): تــاوی تــەواوی بــە چارەوێکەدا.

(-القَومُ): ڕیزی دوژمنیان دڕیو ڕاویاننان.

٢-(مَهْيَم): وشەیەکی پرســیارە واتا: چۆنیت؟ یان چیت لێبەسەرهاتووە یان دەنگوباس چییە.

موء: (ماءَ- السِــنَّورُ يَمُوءُ مُؤَاءً): پشــیلەکە میاواندی.

(مُؤُوءُ): میاومیاو کردوو/ میاواندو.

(أَمْوَأَ- السَنَّورُ): پشیلەکە میاواندی.

(-الرَجُلُ): پیاوەکە وەك پشــیلە میاواندی/ لاسایی پشیلەیکردەوە.

(أَلمائِيَّة والمائِيَة والمائِئَة) (ح): پشــیلە نێرە/ گوربە.

موب: (أَلمُوبَذ والمُوبَذان) (فارسية): ١-دادوەرو پیاوی دینیی ئاگرپەرســتەکان ٢ فەیلەسوف ٣-کارامەی لێزان/ شــارەزای هەموو شــتێك/ هوشیارو ژیر.

مــوت: ١-(ماتَ. يَموتُ مَوْتــاً): مرد/ گیانی دەرچوو/ گیانی سپارد.

(-تِ الريحُ): باکە کپبوو/ کەوت.

(-تِ النــارُ): ئاگرەکــە دامرکایــەوەو خۆڵەمێشەکەیشی ساردبووەوە.

(-تِ الحُمَّى): تاکە سووکبوو.

(-الحَــرُ أَو البَردُ): گەرماکە یان ســەرماکە تەشقی شکا یان نەما.

(-الثَوبُ): بەرگەکە کۆنبو و دڕا.

(-المَكانُ مَواتاً ومَوَتاناً): شــوێنەکە مرد واتا: نە خانەی تێدا ماو نە کەس/ بوو بە وێرانە.

(-الطَريــقُ): ڕێگەکــە مــرد کەســی پێــدا نەڕۆیشتو وازی لێهێنرا.

(«ماتَ فَوقَ الرَحلِ»): بەســەر کورتانەکەوە

خەوی قورس بردیەوە.
(مَوَّتَ-ە): مراندی.
(مــاوَتَ- قِرنَــهُ. مُماوَتَــةً): لــە ئارامگرتنــدا هاوکوفەکەی بۆردا/ بەزاندی/ لەو بە ئارامتر بوو.
(أَماتَ-هُ. إماتَةً): مراندی.
(-نَفْسَــهُ): دەروونــی خۆی مراند/ بەســەر دەروونو ئارەزووی خۆیدا زاڵبوو.
(-غَضَبَهُ): رقی خۆی خــواردەوەو مراندی/ دایمرکاند.
(-الرَجُلُ): کورێکی یان چەند کورێکی مردو مردن.
(-تِ الناقَــةُ أَو المَــرأَةُ): مێحوشــترەکە بەچکەیەکــی مرداربــووەوە یــان ژنەکــە زارۆڵەیەکی مرد.
(مُميــت ومُميتَــةٌ): حوشــتری بەچکــە مردارەوەبــوو یــان ژنــی سکســووتاو (ج) (مَماويت).
(أَمــاتَ- القَومُ): دەردی کوشــندە کەوتە ناو ئاژەڵی خوێشکەلەوە.
(- القــومُ): مرداربوونەوە کەوتە ئاژەڵەکانی خوێشکەلەوە/ خەڵکەوە.
(-اللَحــمَ): گۆشــتەکەی زۆر برژانــد یــان کوڵاند.
(أُميتَ اللَفْظَةُ): وشەکە مردو بەکارنەهێنرا.
(«ماأَمْوَتَهُ»): ئــای کە چەند پەکیکەوتووەو لاواز بووە.

(تَماوَتَ): ١-خۆی کرد بە مردوو/ بەدرۆ خۆی مراند ٢-خۆی پەککەوتەو بێتوانا نیشاندا.
(إسْتَماتَ. إسْتِماتَةً وإســتِماتاً): ١-مردنی بە ئــاوات خواســت/ داوای مردنیکــرد بۆ خۆی ٢-بۆ شــتەکە بە هەمــوو لایەکدا چوو/ خۆی بۆ مراند.
(-الشَيءُ): شتەکە شلو خاوبووەوە.
(-الثَوبُ): جلەکە کۆنبوو درا.
(أَلمائِت): کەســێکە لە گیانکەنشــتدا بێت/ لە سەرەمەرگدا بێت.
(«مَوتٌ مائِت»): مردنێکی سەخت.
(أَلمَوْت): مردن/ گیاندەرچوون.
(أَلمَوتُ الأَحْمَر): مردن بە کوشتن.
(أَلموتُ الأَبيض): مردنی ئاســایی یان مردنی لەناکاو.
(أَلمَوتُ الأَسْوَد): مردن بە خانکاندن.
(أَلموتَةُ): مردن.
(أَلمُوْتَةُ): ١-جۆرە شێتییەکە ٢-فێ لێهاتن/ فێ کە لە مرۆڤ دێت.
(أَلمَــوات) (مص): ١-مــردوو/ بێگیان/ ئەوەی گیانی تیانەبێت ٢ زەوییەکی چۆڵ کە کەسو ئاوەدانیی تێدا نەبێت یان بێکەڵکبێت.
(أَلمَوَتان): دەردی کوشندەی ئاژەڵو چوارپێیان/ قڕی ئاژەڵو چوارپێیان.
(«هــذا مَوتانُ الفُــؤادِ»): ئەمە بێمێشــکە/ گێلە.

(م) (مَوتانة): ئافرەتی گێل/ بێمێشك.

(أَلْمَوْتان: أَلْمَوَتان أَلْمُوَتان): ١-مردن ٢-زەوییەك كە ئاوانەكرابێتەوە ٣-شتی بێگیان.

(«إشْتَرِ مِنَ المَوتانِ ولاتَشتَرِ مِنَ الحَيَوان»): شتی بێگیان وەك زەوی‌و خانوو بكرەو ئاژەڵ‌و چوارپێ‌و كۆیلە مەكرە.

(أَلْمَيِّت (ج) أَموات ومَوتى ومَيْتُون والمَيِّت (ج) مَيِّتُون (م) مَيتَة ومَيِّت ومَيِّتَة (ج) مَيْتات ومَيِّتات): ئەوەی كە گیای دەرچوە/ مردووە.

(أَلْمَيْتَةَ (ج) مَيْتات): ١-مێی وشەی (أَلْمَيْت) ٢-ئاژەڵێك كە لە خۆیەوە مرداربێتەوە یان بە شێوەیەكی ناشەرعی كوژرابێت/ سەربرابێت.

(أَلمِيتَة): باری گیاندەرچوون/ شێوەی گیاندان.

(«ماتَ مِيتَةً صالِحَةً»): مەرگێكی چاكانەو پیاو چاكانەیكردو مرد.

(ماتَ مِيتَةَ سوءٍ): مردنێكی بە ئەشكەنجەوە كردو پیاوخراپانە گیانی دەرچوو.

(أَلْمَيْتُوتَة): مردن/ مەرگ.

(ألإماتَة) (عند المسيحيين): لای دیانەكان خۆمرانــدن ئەوەیە حەزو ئارەزووی دەروون بمرێت هەندێك خواردن نەخوات‌و دووركەوێتەوە لە چێژی ژیان‌و خەریكی خوداپەرستی بێت.

(أَلْمَمَات): مردن یان دەمی مردن/ كاتی مردن.

(أَلْمُمات- مِنَ اللفظ): وشەی مردوو كە بەكارنەهێنرێت.

(خَطِيئَةٌ مُمِيتَةٌ): گوناهێكی گەورەی وا كە ئاسوودەو خۆشـیی لە دڵ‌و دەروون ببرێت‌و ژیان لەو كەسە تاڵبكات/ گوناهێكی كوشندە.

(أَلْمُستَميت) (فا): ١-مەرگخوازێكی كۆڵنەدەر/ پێشمەرگە. كۆ لەمەرگ نەكردە/ كەسێكە لە جەنگدا لە مردن سڵنەكات ٢-بۆ ئامانجێك شێتگیر بێت‌و شێتیش نەبێت.

٢-(إسْتَماتَ إسْتِماتَةً وإستِماتاً): قەڵەو بوو كە لە پێشدا لاواز بوو.

٣-(أَلْمُسْتَميت): پەردەی ژێر توێكڵی هێلكە یان سپێنەی هێلكە.

موث: (ماثَ- الشيءَ بالشَّيءِ. يَمُوثُ. مَوْثاً ومَوَثاناً): شتەكەی تێكەڵی شتەكەیتر كرد.

(-الشيءَ في الماءِ): شتەكەی لە ئاوەكەدا تواندەوە.

(إنْماثَ): تێكەڵبوو و توایەوە.

موج: (ماجَ- البَحرُ. يَمُوجُ مَوْجاً ومَوَجاناً): دەریاكە هەستاو كەوتە شەپۆلدان‌و شەپۆلەكانی بەرزبووەوە.

(-القَومُ): خوێشگەل كاروباریان بەیەكداچوو/ تێكەڵ‌و پێكەڵبوو ئاڵۆزكا ٢-دایان بەیەكداو رژانە یەك.

(-عَنِ الحَقِّ): لە راستیی‌و هەق لایداو رووی وەرگێرا.

(تَمَوَّجَ- البَحْرُ): دەریاکە کەوتە شـەپۆلدانو هەستان.

(أَلَمـوْج (مـص) (ج) أمـواج): شـەپۆل. شەپۆلدان.

(مَوجَة (ج) مَوجات): شەپۆلێك.

(مَوجَـةُ الشَـباب): هەرەتـی لاویـی/ تاق گەنجێتیی‌و خوێنگەرمیی.

(أَلموجات المُسْتَقِرَّة) (ف):شەپۆلە جێگیرەکان ئەوە دیاردەیەکە لە ئەنجامی بەیەکداچوونی دوو لەرەوەیە کە کارێك‌و توانایەکیان هەیەو لەسەر هێڵێکی راست دەروون بە دوو ئاراستەی پێچەوانە بەیەك. ئەگەر ئەو شەپۆلە جێگیرە بەیەك ئاراستە روویدا هەندێك پنتی جێگیر دەبێـت پێیدەوترێـت گـرێ. وە هەندێـك لـەو پنتانە لـە جێگیریەکـەوە دوور دەبن‌و پێیاندەڵێن ورگ.

(أَلمَوَّاج):فرە شەپۆل.

الملحق:

مـوج: (مَـوَّجَ- النَسـيجَ): چنراوەکـەی رەنگشـەپۆلکرد/ رەنگینکـرد/ وایلێکرد کە شـەپۆلی رەنگ بداتەوە/ بەپێی بەرکەوتنی رووناکیـی رەنگـی جیـا یـا بنوێنێـت‌و دڵبگەشـێنێتەوەو لـە جوانیـدا چـاو روون بکاتەوە.

---

مـوخ: (مـاخَ- الغَضَـبُ. يَمـوخُ. مَوخاً): توورەییەکە (نیشتەوە/ دامرکا).

موذ: (أَلمـاذُ) (أَصْلُـهُ مَوَذ): رەوشـتجوان‌و خۆشمەشرەب‌و دەروونپاك.

(أَلماذِيُّ):١-هەنگوینی سپی یا هەنگوینی چاك ٢-هەمـوو جۆرە چەکێـك ٣-قەڵغانی نەرم لە دەستداو ئاسان هەڵسورانی‌و بەکارهێنانی.

(أَلماذِيَةُ):١-قەڵغانی نەرم‌و ئاسان هەڵسورانی ٢-مەی.

مور: ١-(مارَ- البَحْـرُ يَمورُ. مَوراً): دەریاکە هەستاو کەوتە شەپۆلدان.

(-الدَمُ على الأَرض):خوێنەکە بەسەر زەویدا کشاو بڵاوبووەوە.

(-الدَمَ):خوێنەکەی رژاندو کشاندو بڵاوکردەوە.

(-الشَـيءُ):شـتەکە خێرا/ گـورج دەرپەری رۆیشـت بەملاولادا تەکانیدا، وەك تیرێك کە بجەقێتە دارێکەوە.

(-السَـنانُ في المطعـونِ):سـەری نێزەکە لە تێچەقیوەکەدا گەرا.

(-التُرابُ):خۆڵەکە هەستا.

(-تِ الريحِ التُرابَ وبِالتُرابِ)باکە خۆڵەکەی ورووژاندو هەستاند.

(-الصوفَ عَنِ الجَسَدِ):خوریەکەی هەڵکێشا/ لێیکردەوە.

(أمارَ- الدَمَ):خوێنەکەی رژاند.

(-السَـنانَ في المَطْعـونِ):(سـەری رمەکە/ نێزەکە)ی پێداکردو لـە لەش تێچەقیوەکەدا گێرای/ بایدا.

(-تِ الريـحُ التُـرابَ): باكـه خۆڵەكـەی ورووژاندو هەستاند.
(تَمَوَّرَ): كەوتە هاتوچۆو گەران.
(-الشَـعرُ): قژەكـه بەملاولادا بە راسـتو چەپدا هاتووچوو.
(-الشيءُ): شتەكە كەوتە شپرزەییو جووڵەو شەپۆلدانێكی خێرا.
(تَمـوَّرَ- الوَبْرُ ونَحْوَهُ عَنِ الدابَّةِ): مووەكەو خوریەكەو شـتی لـەو بابەتە لـە چوارپێكە بووەوەو وەری.
(إنْمارَ- الشَعْرُ): قژەكە وەری/ لێبووەوە.
(إمْتارَ- السَّيفَ. إمتياراً): شمشێرەكەی هەڵكێشا.
(اَلمائِر (فا) (م) مائِرَة (ج) مائِرات ومَوائِر): ئاوەز سووك/ ئەقڵسووك/ گێل.
(سَهْمٌ مائِر): تیرێكی سووكەڵەو تێچەقیو.
(اَلمَـوْر): ١: خێرایی ٢-رۆیشـتنی لەسـەرخۆ/ هێـواش ٣-رێگـەی تەختـی خـۆش چونكە خەڵكێكی زۆر بەسەریدا گوزەر دەكەن.
(اَلْمُوْر): ١١-تۆزی هەستاوی ناوهەوا ٢-خۆڵ كە با هەلیبسێنێتو گێژی بداتو بە ئاسمانیدا ببات.
(اَلْمُوْرَة): خوریی هەڵوەریوو هەڵكێشراو.
(اَلْموارَة= المُورَة): ١-خوریو شتیتری هەڵوەریوو هەڵكێشـراو ٢-شتێك لە شـتێكیتر ببێتەوەو لێیهەڵوەرێت.
(مارَت): هەڵـوەری ٢-شـتێكی لێدەبێتەوەو شتێكیشی دەمێنێتەوە.

(اَلْمَوَّار): زۆر شەپۆلدەر.
(ريحٌ مَوارَة وأرياحٌ مورٌ): باوبڕی تۆزو گەرد هەڵسێن.
٢-(اَلْمُوْر) (ح): جۆرە مەرێكە.
٣-(مار وماري): وشـەیەكی سـریانییە واتا: گـەورە/ ئاغا بـە زۆری بۆ پیـاوە پیرۆزەكان بەكاردێت بۆ مێ دەوترێت: (مُرْت).
٤-(اَلمَـوْرَج) (فارسـية): وشـەیەكە خەڵكە رەشـۆكەكە بـۆ (نَـوْرَج) واتـا جەنجـەر بەكاریدەهێنن.
٥-(اَلْمُورِكْـس) (ح): گیاندارێكـی نەرمـی سـەدەف (لەپكە) دارە قاچی ناوسكیی هەیە. دەمێكـی گـەورەی هەیـە لەشـی دركاوییە شلەیەكی سـووردەردەدات هەرە كۆنەكان بە تایبەتی فینیقیـەكان رەنگێكی ئەرخەوانیان لێدەگرتو دروستدەكرد.
اَلمَـوز: ١-(اَلمَـوْز): هِندیـة): ١-داری مـۆز درەختێكـە گـەڵا پـانو درێـژ. بەرەكـەی بەهێشـووە جـۆری زۆرە. هەیەتـی مزرە لە وڵاتـە گەرمەكانـی ئەفەریقـادا دەروێنرێت دەیكەن بە چێشت یان ئاردی لێدروستدەكەن. جۆرێكیتری شیرینە لەو وڵاتانەدا دەروێنرێت كە گەرماكـەی مامناوەندیە وەك هی دەریای ناوەراسـتو بەرەكەی بابەتێكـی بازرگانیی جیهانییە ٢ بەری درەختی مۆز.
(اَلمَوَّاز): مۆزفرۆش.

٢-(ألمَوْزَج (ج) مَوازِج ومَوازِجَة) (فارسية): پێڵاو.

موس: ١-(مــاسَ- الرَأسَ. يَموسُ. مَوســاً): سەرەکەی تاشی/ سەری گوێزانتاشکرد.

(ألماس) (يونانيــة. ألمازة (عامية): بەردێکی گرانبەهای زۆر شەوقدارە لە هەموو بەردێکی تر بەنرخترو گرانترە لەبەر سەختیی هێڵی پێ بەسەر هەموو تەنێکدا دەکێشرێتو دەهێنرێت هیچ نییە کە هێڵی بەسەردا بهێنێت.

(«رَجُلٌ ماسٌ»): کابرایەکە بێعارەو گلەییو تەشەر هیچ کاری لێناکات.

(ألمُوسى (ج) مَواس ومُوْسيات): گوێزان کە لە پۆلایە بۆ سەرتاشــینو موو تاشین بەکاردێت (بە مێو نێر دەکرێت).

٢-(ألمُوســيقى) (يونانية): مۆسیقاو ساز (ف ج) هونەری گۆرانییو بەزمو ساز.

(موزيــكا) (عاميــة): بەهەندێــك ئامێری گۆرانیو بەزم دەوترێت/ ساز (یونانیە).

(ألمُوسيقيّ): مۆسیقاژەن/ سازەند/ مۆسیقار.

٣-(ألمُوسلين) (فرنســية): جۆرە چنراوێکی نەرمی تەنکی لۆکەیە.

مــوش: (ماشَ. يَموشُ- الكَــرْمَ): داوای ئەو ترێیەیکرد کە پاش رنینی پێوەیمابوو.

(ألمــاش) (ط): ١-مــاش/ ماشــە رەش کە بە چێشــت لێدەنرێت (ماشَــةٌ): دەنکە ماشێك ٢-پەڕۆو پاتاڵێکی ناوماڵ کە بە کەڵك نەیەت.

موص: (مــاصَ- الشــيءَ يَمــوصُ مَوصاً): شتەکەی هەڵگلۆفتو دەستی لێخست.

(ماصَ ومَوَّصَ- الثَوبَ): هێواش جلەکەی شت.

(ألمَوْص) (مص): ١-کا ٢-شتن.

(ألمُواصَــة): ئــەوەی جل یان دەفــری/ قاپی پێدەشۆرێت.

الملحق:

موصل: (ألمُوصيلــين): چنراوێکی تەنکە بە ناوی موسڵەوەیە کە شارێکە لە عێراقدا.

موع: (مَوعَةُ- الشَــباب): ســەرەتاو هەرەتی لاویی/ گەرمو گوری گەنجێتیی.

موغ: (ماغَ- السِــنَّورُ. يَموغُ. مَوغاً مَوَاغاً): (پشیلەکە/ گوربەکە) میاواندی.

موق: ١-(ماقَ- الرَجُــلُ يَموقُ. مَوْقاً ومُوُقاً ومَواقَةً ومُؤُوقاً): ١-پیاوەکە گەوجێتییکرد/ کارێکی بێهۆشییکرد ٢-فەوتا/ مرد.

(تَمــاوَقَ): خــۆی گــەوج پیشــاندا/ خــۆی گەوجکرد.

(إنْماقَ. إنْمياقاً): گەوجبوو.

(ألمائِق (ج) مَوْقى): ١-گەوج.

(«هو أحْمَقُ مائِق»): ئــەو گەوجێکی تەواو گەوجە ٢-فەوتاو.

(ألمُــوْق (مص) (ج) أمــواق): گەوجێتیی لە کەودەنییەوە/ گێلییەوە.

٢-(ماقَ- المَبيعُ يَموق. مَوقاً): فرۆشــراوەکە هەرزانبوو.

(-الطَعامُ): (خواردنەکە/ چێشتەکە) بێبازار بوو.
٣-(أَلمُوْق (ج) أَمواق): ١-تۆز/ گەرد ٢-مێرولەی باڵدار ٣-رێی فرمێسك لە چاودا ٤-سەرپێڵاو/ پێڵاوێکە بەسەر پێڵاوێکی تردا لەپێدەکرێت.

مول: ١-(مالَ. يَمولُ. مَوْلاً ومُؤُولاً): دارا بوو دەوڵەمەند بوو یان سامانەکەی زۆرتر بوو/ داراتر بوو.
(-هُ. مَوْلاً): ماڵیدایە/ دارایدایە.
(مالَ. يَمالُ. مَوْلاً ومُؤُولاً): دارا بوو/ سامانەکەی زۆربوو/ دەوڵەمەند بوو/ بوو بە خاوەن سامانێکی زۆر.
(مَوَّلَ-هُ): کردی بە (خاوەنمایە/ خاوەندارا).
(أَمالَ-هُ. إمالَةً): دارایدایە، ماڵیدایە.
(«ماأَمْوَلَهُ»): ئای کە دارایە/ خاوەنسامانە.
(تَمَوَّلَ- المالَ): خۆی دارا کرد/ مایەی پێکەوەنا/ خۆی دەوڵەمەند کرد.
(تَمَوَّلَ واستَمالَ): خۆی دارا کرد یان مایەو داراکەی زۆر بوو.
(أَلمال (ج) أَموال): ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەیبێت، دارا، پارە، خانووبەرە/ سامان/ کاڵا لەلای خێڵەکییەکان ماڵاتە واتا ئاژەڵو حوشترو هەموو چوارپێیەك کە دەیانبێت (دەکرێت بە مێو نێر) دەڵێن: (خَرَجَ إلى مالِهِ): بۆ لای زەویو زار یان حوشترەکانی دەرچوو/ چوو.
(أَلمال (ج) مالَة ومالُون): دارا زۆر/ زۆر دەوڵەمەند.
(رجُلٌ مالٌ): پیاوێکی دارا/ ساماندار/ دەوڵەمەند.
(م) مالَةٌ (ج) مالَة و مالات: ژنێکی ساماندار/ دارا/ دەوڵەمەند.
(أَلمالِيَّة): دارایی. سامانداریی.
(أَلمالِيَّة): دارایی/ ماڵی.
(أَلمَوّل والمَيِّل): دارایەکی قورس/ ماڵدارێکی قورس/ زۆر دەوڵەمەند.
(أَلمُوَيْل): دارایەکی کەم/ سووکە دەوڵەمەند.
٢-(أَلمال) (ع ح): دووجای ژمارە.
(أَلمُوْل) (ح): جاڵجاڵۆکە.
مُولَة: جاڵجاڵۆکەیەك.
الملحق:
مول: (أَلمُمَوِّل): پارەدەر/ دراودەر/ کەسێکە پارەو ماڵی پێویست بخاتە (کارێکەوە/ پرۆژەیەکەوە).
(مُمَوِّل مَشروع): پارەو ماڵدەری پرۆژەیەك.

---

موم: ١-(مِيمَ- الرجُلُ مَوْماً): تووشی سینە پالوو بوو یان پیسترین ئاوڵە بوو کە هەموو لەشی دەبێتە برینێكو هەڵدەئاوسێ.
مَموم: تووشبووی ئەو جۆرە ئاوڵەیە.
أَلمُوْم (طب): دەردی سینە پالوو یان پیسترین ئاوڵە کە هەموو لەشی دەبێتە برینو بلق.
٢-(مَوَّمَ. ميماً): میمێکی نووسی.

٢-(أَلْمُوم= الشَّمْع): مۆم.

(أَلْموماء والْمومــاة (ج) أَلْمَوامــي): بیابانێکی فراوان یان چۆڵەوانییەکی بێئاو.

(أَلْمُومياء) (فارسیة): ١-دەرمانێکە ٢-مێوکردنی/ پاراســتنی لەشــی مردوو بە ڕێگەی میسرییە کۆنەکان.

مون: ١-(مانَ ومَــوَّنَ. يَمونُ. مَوناً ومَؤُنَة): ئازووخەیدا، تفاقیدا، دەســتەبەری پێبژێیو ئازووخە بوو.

(مائِن): ئازووخەو تفاقدەر.

(تَمَوَّنَ): ١-خــۆراكو پێبژێی بۆ خۆی عەمار كــرد ٢-(خانــەوادە/ خێزان)ەكــەی خــۆی تێروتەسەلكرد.

(أَلْمُؤْنَــة (ج) مُــوَن): ئازووخــە/ خۆراك كە هەڵدەگیرێتو عەمار دەكرێت.

(بَيــتُ الْمُؤْنَة): (گەنجینــە/ عەمار)ی ڕۆنو شــلەڕۆنو تفاقی خۆراك یــان ئازووخەدان، ڕۆندان.

(أَلْمَــوَّان): ئازووخــەدەر/ كەســێكە ئازووخە ئامادەو پەیدادەكاتو دەیدات.

٢-(مــانَ- الأَرضَ. يَمُــونَ مَونــاً ومُؤْنَــةً): زەویەكەی بۆ كشتوكاڵ هەڵدڕیو كێڵای.

الملحق:

مــون: (أَلتَّمْويــن): كەلوپــەلو خۆراكدان/ پێبژێــیو تفاقــدان، ئەوانــەی كــە زۆر پێویستن.

(تَموين السوق): بازار لە خۆراكو كەلوپەلو تفاق پڕكردن.

(مَخــزَن تَموين): عەماری/ گەنجینەی كاڵاو خۆراكو پێبژێی/ بژێوی.

(أَلتَّمْويــن): پێشكەشــكردنی ســەرومڕێی ئازوخەو تفاقو چەكو جبەخانە بە ســوپاو یان گەلەگەمێی یان ئازووخەو تفاقو پێبژێی كۆبكرێتەوەو بە شارو شوێن دابەشبكرێت.

(مَركــز التمويــن): (بنكــەی/ مەڵبەندی) دابەشكردنی پێبژێیو ئازووخەدان.

(قَطعُ طــرق التَّمويــن): بڕینو بەســتنی ڕێگەی ئازووخەو تفاقدان.

(تَأمــين ضَروريــات العَيــش لِلشَّــعب في بعــض الظــروف): دابینو مســۆگەركردنی پێویســتیەكانی ژیانی گەل لە هەندێك كاتی تەنگانەدا.

(وزارة التَّموين): وەزارەتی تفاقو ئازووخەدان.

(تَمَــوَّنُ طائِــرةٍ بالوَقــود): بەنزیــن بــە فڕۆكەدان.

---

موه: ١-(ماهَ- الرَجُلَ. يَمُوهُ مَوْهاً): ئاوی بە پیاوەكە دا بیخواتەوە.

(ماهَ- الشَــيءَ بِالشَــيءِ): شــتەكەی تێكەڵی شتەكەیتر كرد.

(-تِ البئــرُ. يَمــوهُ ويَمــاهُ. مَوهــاً وماهَةً ومُؤُوهــاً): چاڵاوەكە ئاوی زۆر بوو/ ئاوەكەی ژیایەوە.

(-تِ السَفينَةُ): ئاو چووه پاپۆڕەکەوە.
(مَوَّهَ- المَكانُ): ئاو لە شوێنەکەدا (کۆبووەوە/ ژیایەوە)/ شوێنەکە ئاودار بوو.
(-القِدرَ): ئاوی زۆر کردە مەنجەڵەکەوە.
(-الشـيءَ بماءِ الذَهَبِ أَو الفِضَّةِ ونَحْوَهما): زاخاوی شـتەکەی بە زێڕ یان زیو یان شتیتر دایەوە/ ڕووکەشیکرد.
(-عَلَيهِ الأَمرَ أَو الخَبَرَ): کارەکەی لێگۆڕیی‌و چەواشـەیکرد بـە درۆ ڕازاندیـەوە یـان پێچەوانەی ڕاستیی هەواڵەکەی دایە/ پێوت.
(أَمـاهَ وأَمْـوَهَ- الرَجُـلَ. إماهَـةً وإِمواهاً): ئاویدایە بیخواتەوە.
(-الحوضَ): ئاوی لە گۆلەکەدا کۆکردەوە.
(-الدواةَ): ئاوی کردە مەرەکەبدانەکەوە.
(-البِئـرَ): ئـاوی لـە چاڵاوەکە هەڵکێشـاو دەرهێنا.
(-السكّينَ): چەقۆکەی ئاودا.
(-الشيءَ): شتەکەی تێکهەڵدا.
(-الشيءُ): شتەکە تێکهەڵبوو.
(-تِ السَّماءُ): بارانی چاکی باراند.
(-تِ الأَرضُ): ئاوی سەر زەویەکە زۆر بوو.
(تَمَوَّهَ): ١-ئاودار بوو ٢-شتەکە زاخاودراو بوو ٣-کارەکە یان هەواڵەکە هەڵگەڕاو چەواشەکراو بوو.
(-العِنَبُ): ترێکە ئاوی گرتە خۆی‌و خەریکی گەیینبوو.

(-المَـكانُ بالبَقـلِ): شـوێنەکە بە سـەوزە داپۆشراو ڕەنگی گۆڕا.
(اَلماءُ): ئاو (لە بنچینەدا وشەکە (مَوَهٌ) بووە.
(مُوَيْه): ئاویچکە.
(مائِيٌ ومـاوِيٌ وماهِيٌ (ج) مِيـاهٌ وأَمواهٌ): ئاویی.
(مـاءُ الوَردِ وماءُ الزَهرِ): گـولاو/ ئاوی ئەو گوڵەی کە بە دڵۆپاندن دەگیرێت.
(مـاءُ الوَجـهِ أَو مـاءُ الشَـبابِ): جوانیی‌و گەشیی‌و ڕەنگ‌و ڕووی هەرەتی لاویی.
(مـاءُ السَّـيفِ): بریـق‌و بـاق‌و ڕەونەقـی شمشێر.
(بَناتُ الماءِ): ئەو باڵندانەی کە فێرە ناو ئاون/ باڵندەی ئاوی.
(إبنُ الماءِ): تاکە باڵندەیەکی ئاوی.
(اَلماءُ الأَزرَق) (طب): ئاوی ڕەش کە پەردەیەکە لەسـەر بیلبیلەی چـاو پەیـدا دەبێت‌و چاو کوێردەکات.
(اَلماه= الماء): ئاو.
(ماهِيّ): ئاویی.
(رَجلٌ مـاهُ الفُؤادِ): پیاوێکـی زیرەکردووی بێمێشـك (وەك دڵـی ئـاوی تێدابێـت نەك خوێن).
(اَلماءَة= الماءُ): ئاو.
(مُوَيهَة): چکەئاوێك/ چۆرە ئاوێك.
(اَلماهَةُ) (طب): ئاوڵە.

(بئرٌ ماهَةٌ): چالاَویَکی بە ئاو/ فرەئاو.
(المائِيَّـةُ مِنَ الشَـجَرِ): شـيلەی درەخت کە خۆراکی تیـا دەتویَتەوەو دەیگەیەنیَتە هەموو لایەکی درەختەکە.
(الماهِيَّةُ (ج) ماهِيَّات): میَی وشەی (الماهي).
(الماوِيَّـةُ (ج) مـاوِيّ): ئاویَنـە لـە ئـاوەوە وەرگـیراوە لەبەر روونی هـەروەك ئاوی پیَدا بروات.
(الماوِيَّةُ- مِنَ الشَّـجرِ= المائِيَة): ئەو شـيلەو ئاوەی بە گیانی/ بەناو درەختەکەدا دەرواتو خۆراکی دەداتیَ.
(الْمُوَهَـةُ والمُواهَـةُ- مِنَ الوَجهِ): گەشـیی‌و جوانیی‌و رەونەقی دەموچاو.
(رَكِيَّةٌ مَيِّهَةٌ): چالاَویَکی/ ئاودار/ فرەئاو.
(الأَمْوَه): ئاودارتر.
(«البِئرُ هـذه السَّـنَةَ أَمْوَهُ مِمـا كانَت»): چالاَوەکە ئەمسـالَ لە جاران ئـاوی زۆرترە/ ئاودارترە.
(المُمَوَّهَةُ) (مفع): ١-چاوی تانەگرتوو ٢-شـتی زاخاو دراو ٣-کارو هەوالَی چەواشەکراو.
(التَمويه) (ا ع)= (کاموفلاج): سەر لە دوژمن تیَکدان بەوەی کە چەکەکان بشاردریَتەوە یان لە دەرخسـتنی چەکی جەنگدا ئەوە بکریَت. شویَن‌و بابەتی لیَ بگۆردریَت.
٢-(الماهِيَّة (ج) ماهِيَّات): مانگانەی کریَکارو کارمەکەرو نۆکەر/ کارگوزار وشەکە لە (ماه)ی فارسـییەوە وەرگیراوە کە مانگ دەگەیەنیَت (عامية).
(ماهِيَّةُ الشـيءِ): راستی‌و چۆنیەتی شتەکە/ لە (ماهو) وە وەرگیراوە.
الملحق:
موە: (التَّمويه): تیَهەلَسوون‌و گۆرین.
(التَمويه بِماء الذَهَب أو الفِضَّةِ): زاخاودانی شت بە زیَر یان زیو.
(التَمويه): راستیشـاردنەوەو رووکەشکردن/ داپۆشـینی بـار، شـت/ لەخشـتەبردن/ چەواشەکردن.
(تَمويـه الأَخْبـار): هـەوالَ هەلَگیَرانەوەو شاردنەوەی راستیی هەوالَەکە.
(التَمويه (ا ع): شـاردنەوەی چەکی جەنگ‌و سـەربازەکان‌و چاووراوکـردن لـە دوژمن بە گەلیَك شیَوەو ریَگا، بۆ نهیَنیکردنیان‌و جۆری شـەبەیخونکردنی لە نـاکاوی دوژمن تا لەپر بدەن بە سەریاندا.
(تمويه مُدَرَّعات): شاردنەوەی زریَپۆشەکان لە دوژمن‌و گۆرینی شیَوەیان.

---

میث: (ماتَ. یَمیثُ. مَیثاً): مرد.
مث: (ماثَ- الشـيءَ في المـاءِ. يَميثُ. مَيْثاً): شتەکەی لە ئاوەکەدا تواندەوە.
(مَيَّثَ- الشيءَ في الماءِ): شتەکەی لە ئاوەکەدا تواندەوە.
(-الرَجُلَ): پیاوەکەی سەرشۆرو کەساسکرد.

(تَمَيَّثَ- الشــيءُ في الماءِ): شتەكە لە ئاوەكەدا توايەوە.

(-الرَجُلُ): پیاوەكە سەرشۆڕو كەساسبوو.

(-تِ الأَرضُ): زەویەكەی خوساندەوە/ بارانی لێباری.

(-تِ الحرارَةُ): گەرماكە شكاو فێنكیكرد.

(إنماثَ- الشــيءُ في الماءِ. إنْمياثاً): شتەكە لە ئاوەكەدا لێكترازاو توایەوە.

(إمْتاثَ- الرَجُلُ): تووشی ژیانێكی نەرمبوو.

(-الأَقِــطَّ): كەشــكەكەی كــردە ئاوەكــەوەو تواندیەوەو خواردیەوە.

(-الشــيءَ في المــاءِ): شــتەكەیكردە ئاوەكەوە تواندیەوە.

(ألمَيِّث): نەرم.

(شَيءُ وعَيشٌ مَيِّثُ): شتێكی نەرمو ژیانێكی نەرمو خۆش.

(أرضٌ مَيثــاء): نەرمــەزەوی بێچەوو بەردو لم.

(ألمُسْتَميث): ئەو پێستە تەنكەی كە لەژێر توێكڵی هێلكەكەدایەو بە سپێنەی هێلكەكەوە نووساوە.

میج: (ماجَ- الشــيءُ. يَميجُ. مَيْجاً): شتەكە بەیەكداچوو و تێكەڵبوو.

میــح: ١-(مــاحَ. يَميحُ مَيْحــاً ومَيحوحَةً): بە مشت ئاوی هەڵێنجا.

(-أَصحابَهُ): بە مشــت ئاوی بۆ دۆســتەكانی هەڵێنجا/ دەرهێنا.

(-الرَجُلَ): سوودی بە پیاوەكە گەیاند.

(-هُ عِنــدَ الأَميرِ): لای میر قســەی خێری بۆ كردو پەڕاندیەوە.

(«مِحْني عند الأَميرِ»): لای میر قسەی خێرم بۆ بكەو بمپەڕێنەرەوە.

(-هُ مَيْحاً ومِياحَةً): دایە/ پێیدا/ پێیبەخشی.

(إمْتاحَ- الماءَ): بەمشت ئاوی هەڵێنجا.

(-الرَجُلَ): هاتە لای پیاوەكەو داوای چاكەی لێكرد.

(-هُ الحَرُّ أَو العَمَلُ): گەرماكە یان كاركردنەكە ئاوی پێدەردا/ ئارەقی پێكردەوە.

(إسْتَماحَ-هُ. إسْــتِماحَةً): شتێكی لێخواست/ داوای بەخشیشیكرد یان داوایلێكرد شەفاعەتی بۆ بكاتو قســەی باشــی لای میر بــۆ بكاتو پشتگیریی بكاتو بۆی بپاڕێتەوە.

(المائِح (ج) ماحَة والمَيَّاح): كەسێكە كە بە مشت ئاو بە خەڵك بدات یان هەڵییەنجێنێت.

٢-(ماحَ. يَميــحُ- الرَّجُلُ مَيْحاً ومَيْحُوحَةً): بــەلارو لەنجە وەك مراوی بەڕێوە ڕۆیشــتو تەماشای سێبەری خۆی كرد.

(-تِ الريــحُ الشَــجَرَةَ): باكــە درەختەكەی هێناوبرد/ لاریكردەوە.

(مَيَّــحَ- الغُصنُ أَو الســكرانُ تَمْييحاً): چڵە درەختەكــە شــەكایەوە یــان سەرخۆشــەكە بەلارەوە لارەوە ڕۆیشت.

(مايَحَ-هُ. مُمايَحَةً): تێكەڵاویبوو.

(تَمَيَّـــحَ): ١-بــه كــهش‌و فــش‌و خۆبادانه‌وه رۆیشت ٢-خۆی به ڕاست‌و چه‌پدا بادا.
(تمايَـــحَ): بــه گه‌نجه‌فــه‌وه خۆی بــادا یان به‌لاره‌وه لاره‌وه رۆیشت.
مید: ١-(مادَ. یَمیْدُ. مَیْداً ومَیَداناً): له‌رزی‌و شپرزه بوو چاوی گێژو وێژ بوو.
(«مادت بــه الأرضُ»): زه‌ویه‌كه له‌به‌رچاوی خولایه‌وه.
(-الغُصنُ): چڵه‌كه له‌رییه‌وه.
(-الرَجُلُ): ١-به گه‌نجه‌فه‌و خۆبادانه‌وه رۆیشت ٢-به هۆی سه‌رخۆشی یان سواربوونی پاپۆره‌وه‌و ماشێنه‌وه سه‌ری گێژیخواردو دڵی تێكه‌ڵهات.
(تَمَيَّـــدَ-تِ المَـــرْأةُ): ژنه‌كه بــه له‌نجه‌و لارو خۆبادانه‌وه رۆیشت.
(تمايَـــدَ): خواربــووه‌وه كه‌وتــه له‌ره‌له‌رو له‌رزین‌و له‌رینه‌وه.
(ألمائِـــد (ج) مَیْـــدى): ١-لار/ خـــوار/ كـــه‌چ ٢-كه‌سێكه تووشی ســه‌رگێژه‌و دڵتێكه‌ڵهاتن بێــت به هۆی سه‌رخۆشــییه‌وه یان له پاپۆرو ترومبیل‌و شتی وادا.
(غُصنٌ مائِد): لقێكی چه‌ماوه/ خوار/ لار.
(ألمائِـــدَةُ (ج) مَوائِد ومائدات): مێی وشـــه‌ی (المائِد) ٢-زه‌وییه‌كی بازنه‌یی.
(ألمَيْـــدَةُ): ١-جارێـــك له‌رزیـــن‌و له‌رینـــه‌وه/ به‌مــلاولادا (كه‌وتــن/ هاتــن) ٢-جارێـــك باییبوانه‌رۆیشــتن ٣-جارێك سه‌رگێژه‌گرتن به هــۆی سه‌رخۆشــییه‌وه یان ســواربوونی پاپۆرو ترومبیل‌و شتی وه‌هاوه.
(ألمَيَّـــاد (م) مَيَّادَة): لــه‌رزۆك زۆر به له‌ره‌و شه‌كانه‌وه.
(ألمَيْـــدان والمِیْدان (ج) میادیـــن): مه‌یدان/ گۆڕه‌پـــان/ كـــۆڕ. بـــۆ یـــاری‌و پێشــبڕكێ‌و ئه‌سپسواریی.
(ألمَيُود): بزێو.
(غُصُـــونٌ مُیَّدٌ): لقه شــۆڕه‌كان/ كه‌چه‌كان/ خواربووه‌كان.
٢-(مـــادَ- الرَجُـــلَ. یَمیدُ. مَیْـــداً ومَیَداناً): ١-سه‌ری له پیاوه‌كه‌دا/ دیده‌نییكرد ٢-چاكه‌ی له‌گه‌ڵدا كرد.
(إمتـــادَ. إمْتیـــاداً): خـــواردن‌و ئازووخـــه‌ی كۆكرده‌وه‌و داوایكرد.
(«إمتادوهُ فمادَهُم»): داوای خواردن‌و شتیان لێمكرد ئه‌ویش داینێ.
(ألمائِـــدَةُ (ج) مَوائِد ومائِدات): ١-خوان/مێز كه خواردنی له‌ســـه‌ر بێت ٢-چێشت‌و خواردن ٣-ژووری نانخواردن.
(ألمِیدَةُ): ١-خواردن/ چێشت/ خۆراك ٢-خوان كه خواردنی له‌سه‌ر بێت.
(ألمُمْتاد): خوازلۆك/ هه‌میشه داواكاری شت.
٣-(مَیْدَ= بَیْدَ): به‌لام.
(مَیـــدى): بۆ ئه‌وه/ له‌به‌ر ئـــه‌وه/ له پێناوی ئه‌وه‌دا.

(«فَعَلَهُ مَيدى ذلك»): لەبەرئەوە ئەوەیکرد/ بەرامبەر بەوە ئەوەیکرد.

(«داري بَمَيدى دارِه»): خانووەکەم بەرامبەر خانوەکەیەتی.

(مَيداءُ الشيءِ): ئەندازەی شتەکەو برەکەی.

(«هذا مَيـــداءُ ذاك وبمَيدائِـــهِ»): ئەمە بە ئەندازەی ئەوەیـــەو هێندەی ئەوە/ بە قەدەر ئەوەیە/ بری ئەوەیە.

مـــير: ١-(مارَ وأمـــارَ عيالَهُ. يَمـــيرُ. مَيْراً): خواردنو ئازووخەی بۆ خێزانەکەی هێنا.

مايَرَ-هُ مُمايَرَةً: ئازووخەی بۆ هێنا/ دایە.

إمْتـــارَ (- لِعيالِـــهِ أو لِنفسِـــهِ): خـــواردنو ئازووخـــەی بـــۆ خێزانەکـــەی یـــان بۆ خۆی کۆکردەوە.

(ألمائِر (ج) مُيَّار ومَيَّارَة): خۆراکو ئازووخە پەیدا کارو کۆکەرەوەی.

(ألمَيْـــر) (مـــص): ١-کۆکردنـــەوەی خـــۆراك ٢-خۆراك/ ئازووخە.

(«ماعِنْدَهُ خَيرٌ ولامَيرٌ»): نە ئێستا هەیەتیو نە دواییش دەیبێت.

(ألمَـــيرَةُ (ج) مِيَـــر): خـــۆراك/ ئازووخە کە مرۆڤ هەڵیدەگرێت/ گەنجینەیدەکات.

(ألمَيَّار): ئازووخەهێنو پەیداکەری.

٢-(مـــارَ- الصَوفَ يَميرُ. مَـــيراً): خوریەکەی شیکردەوەو جیایکردەوە.

(-الدواءَ ونَحوَهُ): دەرمانەکەی تواندەوە.

(أمارَ الصوفَ): خوریەکەی بەدەســـت یان بە شانە شیکردەوە.

(ألدواءَ ونَحوَهُ): دەرمانەکە یان شـــتی وەهای تواندەوە.

(-أوداجَهُ): رەگی گەردنی بری.

(ألمُـــوارَة): وردە تاڵـــە خوریـــی وەریـــو کاتی شیکردنەوەی.

٣-(مايَرَهُ. مُمايَرَةً): لاســـایی هەڵســـوکەوتو کرداری ئەویکردەوەو وەك ئەویکرد.

٤-(مايَرَ-هُ ممايَرَةً): بەرهەڵستیکرد.

(تَمايَرَ- مابَينَ القَوم تَمايُراً): زمانبەدیی لە نێوانیاندا کردو تێکیـــدان/ لەیەکی بەردانو لەیەکیکردن.

میز: ١-(مازَ- الشيءَ يميزُ مَيزاً): ١-شتەکەی لە هیتر جیاکردەوە ٢-لە شتیتری لە پێشتر گرت.

(-فُلانٌ): فیسار لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر چوو.

(مَيَّزَ وأمازَ- الشـــيءَ): ١-شـــتەکەی لە شتیتر جیاکـــردەوە ٢-لە شـــتیتری لەپێشـــتر گرتو بەچاکتریزانیو دانا.

(تَمَيَّزَ): لە شتیتر جیابووەوەو لاکەوت.

(-فُلانٌ مِنَ الغيظِ): لە رقاندا شەقیبرد.

(تَمايَـــزَ- القَومُ): ١-خوێشـــکەل بڵاوبوونەوە ٢-لەیەکبـــوون/ پەرت پەرت بـــوون ٣-لەگەڵ یەك کەوتنە ململانێ.

(إنمازَ. إنميازاً): ١-لەهیتر باشـــتر بوو/ چاکتر بوو ٢-جیابووەوەوو لاکەوت.

(إمتــازَ. إمتيــازاً):١-له هيــتر جيابووەوەو لاكەوت ٢-لەهێتر باشتر بوو/ پەسەندتر بوو.

(-القَومُ): خوێشگەل لە یەکتری جیابوونەوە.

(إسْــتَمازَ إِســتِمازَةً): لە هیــتر جیابووەوەو تەریکبوو ٢-لاکەوت/ لایدا.

(اَلمَيْز والمَيِّز): بازوو ئەستووروبەهێز.

(الإمتياز (مص) (ج) امتيازات) پەسندێتیی/ جیایــی/ جیاوازیــی/ پەســندکردنو ئاوردانەوەیەکی تایبەتی کە کاربەدەستێك یان میریی لە یەکێکــی دەداتەوە یان لە کۆمەڵێك بۆ فرۆشتنی جۆرە کالایەك یان گرتنی کارێك بــە پێی مەرجی دانــراوو تایبەتــی بێت بە ومرگرەکەو کەسیتر بۆی نەبێت بیکات.

(اَلتَمییز): جیاکردنەوەی دوو شــت لە یەك/ جیاکاریی.

(اَلتَمییز):١-هێزێکی دەروونییە یان ئاوەزییە واتای پێدەزانرێت ٢-بەشــێکە لە بەشــەکانی ڕێزمانی عەرەبی.

(سِنُ التَمیز) تەمەنی هوشیاربوون کە مرۆڤ گەیشتێ چاکەو خراپە لە یەك جیادەکاتەوە.

(مُمَیِّز): جیاکار/ دیاریکار/ جیاکەرەوە.

(مُمَیَّز): جاکراوە/ پەسندکراو.

٢-(اَلمیزاب): پلووسك.

میس: ١-(ماسَ وتَمَیَّــسَ- الرَجُلُ. یَمیسُ. مَیْســاً ومَیَســاناً): پیاوەکە بــە گەنجەفەو خۆبادانو لەخۆباییبوونەوە ڕۆیشت.

(مائس ومَيَّاس ومَيْسان ومَيُوس): کەسێکە بە گەنجەفەو لەخۆباییبوونو خۆبادانەوە بڕوات.

(مَیَّسَ- الثَــوبَ): دامێنی بــۆ جلەکە کرد/ پاشینی بۆ کرد.

(اَلمَیس):١-کورتــان ٢ مژان/ دارێکە لە نێوان جووتە گا جووتپێکراوەکەدایە.

(اَلمَیَّاس)(ح):١-شــێری لەخۆبایی‌و خۆربادەر ٢-(ح) گورگ.

(اَلمَیْسان (ج) مَیاسین): هەموو ئەستێرەیەکی زۆر ورشەدار.

٢-(اَلمَیْس): جۆرە مێوژێکە.

(اَلمَیْســة): درەختی تــاووك (ن) درەختێکی هەمیشــە ســەوزە گەڵاکەی دانداره ســەری دانەکەی درێژو تیژە بەرێکی هەیە دەخورێت بەڵام خۆش نییە. بۆ جوانی دەروێنرێت.

میش: (ماشَ- الشَيءَ بَالشَيءِ یَمیشُ. مَیشاً): شتەکەی تێکەڵی شتەکەیتر کرد.

(-النافَةَ): مێحوشترەکەی نیومدۆشکرد.

(-الخَبَــرَ): نیــوەی هەواڵەکــەی گەیانــدو نیوەکەیتری نەدرکاندو نەوت.

(«ماشــوا الأَرضَ مَیْشَةً»): بە سەر زەوییەکەدا یان بە لای زەوییەکەدا ڕۆیشتن.

٢-اَلماش: ماش

میــط: ١-(ماط.یَمیــطُ عَــن کــذا. مَیْطاً ومَیَطانــاً): لــەوە کشــایەوە/ لاکــەوتو لێیدوروکەوتەوە.

(«مِطْ عَنا يا فلان»): لێماندووركەوەرەوەو خۆتمان لێلادە ئەی فیسار.

(-هُ وماطَ بِهِ): ١-لایداو دووریخستەوە ٢-ڕەواندی/ دەریكرد.

(-الرَجلُ): ستەمیكرد/ زۆرداریيكرد.

(«ماط عَلَيَّ في حُكْمِه»): بڕیاری زۆردارانەی بەسەرمدادا/ لە بڕیارەكەیدا ستەمی لێكردم.

(-فُلاناً): بە فیساردا هەڵشاخاو پاڵی پێوەنا.

(-الشيءُ): شتەكە ڕۆیشت.

(مَيَّطَ- بَيْنَهُما. تَمييطاً): لە نێوانیاندا هاتوچۆیكرد.

(مايَطَ- بَيْنَ الشَيئَين) لەدوو شتەكە یەكێكیانی بە باشتر لەویتر دانا/ هەڵیسەنگاندن.

(أَماطَ عَن كذا. إماطَةً): وازی لەوە هێناو لێیدوروكەوتەوە.

(-هُ): ١-لایدا/ لایبردو دورویخستەوە ٢-ڕەواندی/ دەریكرد.

(تَمايَطَ- القَومُ): ١-نێوانیان تێكچوو ٢ لەیەك دوروكەوتنەوەو لەیەكبوون.

(اَلمِياطُ): ١-پاڵپێوەنانو دوورخستنەوە پێداهەڵشاخان ٢-لاربوونەوە/ لادان بەلایەكدا ٣-پشتتێكردنو دووركەوتنەوە.

(اَلهياط هو الإقْبال والدُنُوّ) بەرەو ڕووچوون لەیەك نزیكبوونەوە.

(«أَصبحوا في هياط ومياط»): كەوتنە هاتوچۆو شپرزەییەوە.

(اَلمَيَّاط): گەمەبازێكی بێكار.

٢-(«ماعِنْدَهُ مَيطٌ»): هیچ شتێكی نییە.

(«إمتَلأَ حتى لايجد مَيطاً»): وا پڕ بوو هیچیتر ناگرێت.

(«أَمرٌ ذو مَيطٌ»): كارێكی زۆر توندو گران.

ميع: ١-(ماعَ- الشيءُ. يَميعُ. مَيْعاً): شلبووەوەو توایەوەو بەسەر زەویدا كشاو بڵاوبووەوە.

(«السَرابُ يَميعُ»): تراویلكەكە بەسەر زەویدا شەپۆلدەداتو هەڵبەزودابەزیەتی.

(-ت ناصيَةُ الفَرَس): تووكی ناوچەوانی چارەوێكە درێژو پەخشبوو/ هاتەخوارێ.

(-الفَرَسُ): چارەوێكە كەوتە ڕەوت.

(ماعَ وتَمَيَّعَ وانماعَ- السمنُ. تَميعاً): ڕۆنەكە توایەوە/ شلبوو وەك ئاوی لێهات.

(مائِع (م) مائِعَة): تواوە.

(اَلفِضَّةُ تتمَيَّعُ في البوتَقَةِ) زیوەكە لە بۆتەكەدا «شوێنی تواندنەوەكەیدا» دەتوێتەوە.

(مَيَّعَ- الغازَ تَميعاً): گازەكەیكرد بە شلە ئەویش بە ساردكردنەوەو پەستان خستنەسەری/ پەستاوتنی.

(أَماعَ- الشيءَ. إماعاً وإماعَةً): شتەكەیكرد بە شلاو/ بە شلە.

(اَلمائِع): شلە/ پێچەوانەی بەستوو/ تواوە.

(اَلمائِعَةُ (ج) مَوائِع): ١-مێی وشەی (اَلمائِع) ٢-تووكی تەوێڵی چارەوێ كە درێژو

پەخشبێتو بێتە خوارێ ٢-جۆرە گەوەنێکە لە درەخت دێتە دەرێو بۆ بۆنخۆشی بەکاردێت.
(أَلْمَيْعَةُ):١-ڕۆیشتنو کشانی شتێکی شلی ڕژاو ٢-گەوەنێکی بۆنخۆشە لە درەخت دێتە دەرێو بۆ بۆنخۆشی بەکاردێت.
(أَلْمَيعَةُ السائِلَة) (ن):درەختێکی ئەمریکیە جوانە، گەوەنێك دەردەکات کە پێیدەڵێن عەبەری شل. شلەیەکی بەلسەمی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکیی بەکاردێت.
(مَیعَةُ الشيءِ):سەرەتای شتو ڕیشەی شت.
(مَیعَةُ الشَّباب):هەرەتی لاویی/ گەرمەی تاقی گەنجێتی.
(مَیعَةُ السَکر):سەرەتای سەرخۆشبوونو مەستیی.
(«مَیعَةُ الفَرَس»):سەرەتای ڕەوت یان غارکردنی چارەوێ.
(أَلمائِـع):١-گەوج/ بێهەست ٢-شلە/ تواوە ٣-شلەپەتە.
الملحق:
میك: (أَلمیکادو):١-نازناوی قەراڵی ژاپۆنە ٢-کۆشکی قەراڵی ژاپۆن.

میل: ١-(مالَ- إلی المَکانِ یَمیلُ. میلاً وتَمْیالاً ومَیَلاناً ومَیْلولَةً ومَمالاً ومَمیلاً):لایدایە شوێنەکە.
(-الی الشيءِ أَو الشَخصِ):دڵی بە شتەکەدا چوو/ حەزی لە شتەکە کرد یان دڵی بە لای کەسەکەدا چوو و خۆشیویستو لایەنگیریکرد.
(-عَنِ الطَریقِ): لە ڕێگەکە لایداو بەجێیهێشت/ وازی لێهێنا.
(-الحائِطُ):دیوارەکە خواربووەوە.
(-الحاکِمُ في حُکمِهِ):دادوەرەکە لایەنگیریکردو ستەمی لە بڕیارەکەیدا کرد.
(-عَلَیهِمُ الدَهرُ): ڕۆژگار لەگەڵیاندا سەختییناندو تووشی چورتومیکردن.
(-بِفُلان):بەسەر فیساردا زاڵبوو.
(-الشيءَ):شتەکەی (لار/ خوار) کردەوە.
(«فُلان لاتَمیلُ عَلَیه المِربَعَةُ»):سلنگەکە ناگاتە فیسار واتا ئەو لە سلنگەکە بەهێزترە.
(مالَ-تِ الشَمسُ مُیولاً):خۆر داکەوت یان خەریکی ئاوابوونبوو.
(-النَهارُ أَو اللَیلُ):ڕۆژ یان شەو خەریکی تەواوبوونبوو.
(«مالَ بِنا الطَریقُ»):ڕێگەکە بەخوارد ا بردینیەوە دووریخستینەوە.
(مَیِلَ مَیَلاً):هەر لە دروستبوونیەوە خواربوو.
(أَمْیَل):خوار لار (لەوانەیە لە دروستکردنیەوە وا کرابێت.
(مَیَّلَ- الشيءَ تَمیلاً):شتەکەی خوارکردەوە/ لارکردەوە.
(-في الأَمرِ)گومانی لە کارەکەدا بوو.

(-بَـيـنَ الأمـرَيــن): ڕاڕابــوو لە نێــوان دوو شتەکەدا/ دوو کارەکەدا کامیان هەڵبژێرێت!؟

(«قَرَّبَ لــه الطعــامَ فَمَيَّلَ فيــه لِقِلَّتِهِ»): خواردنیــان بۆ دانا ڕاڕابــوو بیخوات یان هەر نەیخوات چونکە خواردنەکە کەمبوو.

(مَيَّلَ (عامية) = (مالَ)

(مايَلَ هُ - مُمايَلَةً): ١-پەلاماریداو دڵی بەلایدا چوو و خۆشیویستو لایەنگرییکرد.

(«مايَلَنــا المَلِــكُ فَمــا يَلْناهُ»): شـا سـۆزی بۆمــان جــووڵاو ڕووی تێکردیــنو ئێمەیش خۆشمانوسیتو کۆمەکمانکردو پیشتمانگرت.

(مالأَ-هُ): ٢-خۆشیویستو لایەنگیریکرد.

(-بَينَ الشَيئَين): لە نێوان دوو شتەکەدا ڕاڕا بوو کامیان هەڵبژێرێت.

(أمالَ- الشيءَ إمالَةً): شتەکەی خوارکردەوە.

(-يَدَهُ بِالفَرسِ): جڵەوی چارەوێکەی شلکرد کە بە هەوەسی خۆی بڕوات.

(-القــارِيءُ): خوێنەرەکــە دانی تــەواوی بە سەرو بۆری وشەکاندا نا.

(-تِ المَــرأَةُ): ژنەکــە پەچەکەیــلاداو ڕووی خۆی دەرخست.

(تَمَيَّلَ- في مَشـيِهِ. تَمايُلاً): بــە خۆبادانو لەخۆباییەوە ڕۆیشت.

(تَمايَلَ-في مَشيِهِ): بە گەنجەفەو خۆبادانەوە ڕۆیشت.

(-الجُلُ عَنِ الفَرَسِ): جلی چارەوێکە لەسەر پشتی چارەوێکە خواربووەوە.

(«-بَينَ القَومِ تَمايُلٌ»): خوێشــگەل ناکۆکن شەڕو ئاژاوەیان لە نێواندایە.

(إسْتَمالَ. إستِمالَةً): لاربووەوە/ کەچبوو.

(إسْـتَمالَ-فُلاناً وبِقَلْبِهِ): ١-دڵی بە فیسارداو بۆ لای خــۆی ڕاکێشــاو نەرمیکــرد ئەویش خۆشویســتو دڵیدایە ٢-ســۆزو میهرەبانیی ئەویخواست.

(-مافِي الوِعاءِ): چی لە قاپەکەدا بوو بردی.

(-الطَعامَ ونَحْوَهُ): خۆراکەکەی یان شتەکەی بە مشت پێوا یان بە باڵ ئەندازەیگرت.

(أَلمائِــل (ج) مُيَّــل ومالَــة (م) مائِلَــة (ج) مائِــلات ومَوائِل) (فا): کــەچ/ خوار/ لادەر ٢-پەیوەندیدار ٣-دڵپێدەر/ ڕووتیکردوو.

(مَيلُ كَوكَبٍ ما) (فك): ئەو گۆشــەیەیە کە پەیدادەبێت لە نێوان ڕووی تەختی ئاسمانو ئەو هێڵە ڕاستەی نێوان هەسارەکەو زەوی.

(دائِــرَةُ المَيل) (فــك): بازنەیەکــی مەزنی گۆی ئاســمانە کە بە هەردوو جەمسەری گۆی زەویدا تێدەپەڕێت.

(أَلمَيّــال (م) مَيّالَــة): ١-زۆر (ئارەزوومەند/ لاداو/ حەزکــردو) ٢-زۆر خواربوو/ داشــکاو/ کەچبوو.

(ألإمالَة): کەچکردن/ خوارکردنەوە/ لارکردنەوە.

(في القــراءَة): لە خوێندنەوەدا ســەر بەلای ژێرداو ئەلف بەلای (ی)دا دابشکێنێت.

(ألأمَيَــل (م) مَيْــلاء): ١-خوارتــر/ كەچتر/ داشــكاوتر ٢-لێژتــر ٣-ئارەزوومەندتــر، بەسۆزتر/ دڵبۆچوتر.

(ألأميــل): ١-خانــووی خوار/ دیــواری خوار ٢-ســوارێك بە لایەكی زینەكەدا خواربێتەوەو خوار دانیشێت ٣-زیرەكردوو/ زۆر ترسنۆك.

(ألَميــلاء): ١-مێــی وشــەی (ألأميــل) ٢-لمــی كەڵەكەبوو و بەگژیەكداچوو و خواربوو.

(شَجَرَةٌ مَيلاء): درەختێكی لق‌و پۆپ زۆر.

٢-(ألَميــل (ج) أميــال وأميُــل وميُــول) (يونانيــة): ١-كلچيوك كە بۆ چاورشــتنە ٢-ميــل/ نەشــتەر ئامێرێكــە نەشــتەرگەر بە برينەكەيدا دەكات تا بزانێت برينەكە چەند قووڵە ٣-منارەيەكە لە شــوێنێكی نادیاردا بۆ رێبواران دروســتدەكرێت تا بــە هۆيەوە رێ دەركەن‌و بزانن ماوەكە چەنــدە ٤-ماوەيەكە ســنووری دياری نييە: دەڵێن تــا چاو بركات ئەوەندەيە ٥-دووريی چوار هەزار باڵ.

(ألَميلُ الهاشــمِي): ميلێكی هاشمی هەزار باڵ كە هەردوو دەوست بكرێتەوە (لاتينيە).

(ألَميلَةُ (ج) مِيَل): (حەل/ كات) و ســەردەم/ چاخ.

(ألَدَهرُ مِيَلٌ): رۆژگار چەرخ‌و داو‌و دەزگايەكە دەسوورێتەوە/ رۆژی لە دوايە.

مين: ١-(مانَ. يَمينُ. مَيناً): درۆيكرد.

(مائِنٌ ومَيَانٌ): درۆزن.

(تَمايَــن- القَومُ): خوێشــگەل درۆيان لەگەڵ يەكدا كرد.

(ألَمَيْن (ج) مُيون): درۆ.

(«أكْثَــرُ الظُنــون مُيُــونٌ»): زۆرترينی لە لاوابوون گومان‌و درۆيە.

(مُتمايِنُ الوُدِ): كەســێكە خۆشەويســتيی‌و لاواندنەكەی ساختەيە/ بەدرۆيە/ فێڵە.

٢-(مــانَ- الأَرضَ. يَمينُ مَينــاً): زەويەكەی كێڵا.

(ألَمان): گاسن كە زەوی هەڵدەدرێت.

٣-(ألَمينــا (ج) مَوان ومَوانــيء) (يونانية): ئەسكەلە لەنگەرگای پاپۆر.

(ألَمينــاء (ج) مَــوان ومَوانِيء): ١-ئەســكەلە ٢-مينا. مادەيەكی رەقی شووشــەيیە ســواغی پێدەدرێت (فارسيە).

ميە: (ماه- السَيفَ وغَيرُهُ مَيْهاً ومَيهَةً بماءِ الذَهَب): شمشێرەكەی بە زێر زاخاو دايەوە.

(-فُلاناً): ئاوی بە فيساردا بيخواتەوە.

(-تِ البِئرُ): بيرەكە ئاوی زۆر بوو.

(-الرَكِيَّــةَ. مَيْهَــةً وماهَــةً ومَيْهــاً): ئاوی چاڵاوەكەی زۆر كرد.

(الماهَةُ والمَيهَةُ): زۆربوونی ئاوی چاڵاوەكە.

(ألأمْيَهُ): ئاوی زۆرتر.

(ألبِئرُ أمْيَهُ مِمَــا كانَت): چاڵاوەكە/ بيرەكە ئاوی لە جاران زۆرتر بوو.

ميی: (مَيَّ ومَيَّة ومَيَّا): ناوی ژنانن.